١٦

زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

# بەداڕوخانی موسڵمانان

## جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟!!

چاپی دووەم

ئارامی گەڵاڵی

کردویەتی بەکوردی





بەداڕوخانی موسڵمانان

جیهان چ زیانێکی لێکەوتووە

## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین.
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیان لە گشت کوت و بەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکڕەوی و ڕەوتگەرایی.
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسڵمانی کورد، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکارییانەی هەبێ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردووە.

دەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیرو ڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نییە ئێمە پابەندی هەموو بیرو بۆچوونەکانیان بین.

با دەستووریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت:

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

التفسير

# بەدارڕوخانی موسڵمانان

# جیهان چ زیانێکی لێکەوتووە؟!!

ئەبولحەسەن عەلی ئەلحەسەنی نەدوی

نوسیویەتی

ئارامی کەلالی

کردویەتی بەکوردی

پێداچونەوەی

نەوا محمد سعید



بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

ناوی کتێب بە عارەبی: ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين؟!!

ناوی نوسەر: أبو الحسن علي الحسني الندوي

نۆرەو ساڵی چاپ: چاپی سێزدەمی یاسایی- ١٩٩٩

چاپخانەی: دارالقلم – دمشق.

ناوی کتێب بەکوردی: بە داڕوخانی موسڵمانان جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟

ناوی وەرگێڕ: ئارامی گەلاڵی

پێداچونەوەی وەرگێڕان: نەوا محمد سعيد

پیتچنین: نوسینگەی تەفسیر بۆ کۆمپیوتەر

نەخشەسازی: جمعە صدیق کاکە

نۆرەی چاپ: دووەم

ساڵی چاپ: ١٤٢٩ك – ٢٠٠٨ز

تیراژ: ١٥٠٠

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر ژمارەی سپاردنی ( ٣٣١ )ی ساڵی ٢٠٠١



بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشەکی وەرگێڕ

سەید ئەبولحەسەنی نەدوی زانایەکی خواناسو مامۆستایەکی بلیمەتو هزرڤانێکی فرەوان و نوسەرێکی فرەزانو ئیسلامپەروەرێکی کۆڵنەدەر و بانگخوازێکی بە ئەزمونە، بە دەیان گەشتی ئەنجام داوە و لە سەدان کۆڕو کۆبونەوەو کۆنگرەدا بەشدار بوەو وتاری خوێندۆتەوە، بە هەزاران پەرتوکی بەسەرکردۆتەوە، چەندین گوندو شارو وڵاتی دنیای بینیوەو تێی گەییوە، بە سەدان پەرتوکی بچوكو گەورەو جۆراوجۆری بە هەر سێ زمانی ئوردیو عەرەبیو ئینگلیزی نوسیوە، بەڵام نۆبەرەو شاگوڵی هەرهەمویان ئەم پەرتوکە ناوازە و شیرینەیە، پیاو کە دەیخوێنێتەوە ئەوجا دەزانێ سەید ئەبولحەسەن چەند شایەنە بۆ ئەو شانو شکۆو پێزانینەی کە لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیدا پێشکەشی کراوەو لە هەر شوێنێك بوە رێزی گیراوەو ویستویانە نیشتەجێ بێو بە چەند رۆژو مانگێك هاودەمێتی تاسەیان پێنەشکاوە. پیاوێکی نورانیو روحسوك، خوێن شیرنو روخۆش، عەرەبی زانێکی زمان پاراوی رەوانبێژ، خێوی[1] وتووێژی بەتاموچێژ، کە دواوە بیسەران وەك شیلەی گوڵ وتە بە ئابوتابەکانیان[2] هەڵمژیوە، کە نوسیویە خوێنەران وەك پەروانە بە دەوریدا گەڕاون.

سەید ئەبولحەسەن روپەڕەکانی شاگوڵەکەی بە شیلەی وتە هەنگوینیەکانی داڕشتوە، لە وشە دەوڵەمەندیدا وەك فەرهەنگە، لە دەربڕیندا کارامەیەو لە بەرگەوە بۆ بەرگ —مەگەرچۆن ئەگەرنا- رستەی دوبارەو سێبارە نەکردۆتەوە، قەت لە هیچ شوێنێك هەناسەی سوار نەبوەو پێچوپەنای نەکردوە تا شت لە بیر خۆیو خوێنەرانی بباتەوە، قەت بڕوا ناکەم بەرەمەکی رستەیەکی دانابێ.

---

١ خێو: خاوەن.

٢ ئابوتاب: جوان و رێك.

منیش، منی کەمئەزمونو هێشتا کاڵ کە چەند ساڵێك لەمەوبەر چل-پەنجا لاپەڕێکی ئەم پەرتوکەم خوێندبۆوەو لە پەرتوکە هەرە بەکارو کاریگەرەکانی شەهید سەید قوتبو مامۆستا محمد قوتبو گەلێ پەرتوكو نامیلکەی تریش دەمدی گەلێ جاران ئاماژەیان بۆ کردوەو وتەیان لێ خواستوە، پەرتوکەکەم لەلادا گەورەتر و گرینگتر دەبو، جا کە بۆم هەڵکەوت وەریگێڕم لەبەر خوێنگەرمیو لە خۆشییان گوێم پێنەدا لەبەردەم چ شاخێکی سەخت دەوەستمو تەمام وایە پێی هەڵگەڕێم !

بەڵام بە سەد ئەستەمی کە پێی هەڵزنام[1].. بڕوا بکەن سەید ئەبولحەسەن چەند دودڵ بوەو ترساوە لە بارەی بابەتێکی ئاوەها بنوسێ من سەد ئەوەندە دودڵی دەیگرتمو دەترسام وەریگێڕم، ئێستاکەش ئەو ترس و دودڵیە بەری نەداوم، چونکە نازانم توانیومە نەخش بە نەخشی سەر ئەو شاخە هەزار بە هەزارە هەڵکرێنم و وشە وشە و رست بە رستی هەڵوەشێنمو سەر لە نوێ بە تانوپۆیەکی کوردانەوە نەخشێکی جوانی لێ پێك بێنم؟.. بڕوا ناکەم!. جار بوە تاشەبەردو وردە بەردی وای بەسەر داداوم بۆ چەندین سەعاتو ڕۆژ نەمتوانیوە خۆم سارێژ کەم . جا نازانم لەم سەرکەوتنە سەرکەوتومە یان بەسەر دەمدا کەوتومە ؟!.

١٤ / ٩ / ١٩٩٩

**ئارامی گەلاڵی**

---

١ پێهەڵزنین: پێهەڵگەڕان.

## سەربردەی ئەم پەڕتوکە

## کە نوسەر خۆی دەیگێڕێتەوە

الحمدلله ربّ العالمين والصّلاة والسّلام على رَسُولِهِ الأمين وَعلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجمَعين ومَنْ تَبِعَهُمْ بِإحسَان الى يوم الدّين.

رەنگە زۆر لە خوێنەرانی هێژا نەزانن ئەم پەرتوکە نۆیەرەی بەرهەمەکانم‌و سەرەتای مێژوی پەرتوك نوسینم بێ. من کە ئەم پەرتوکەم نوسی تەمەنم سێ ساڵی تێدەپەڕاند[1]. بەڕاستی ئەم کارە لە شان‌و شکۆی یەکێکی وەك منی تەمەن فەریك‌و دور لە مەڵبەندی وێژەو رۆشنبیری زمانی عەرەبی گەورەتر بو. من لە هیندستان لە دایك بوم‌و لەوێش پێگەیشتم‌و دەستم بە خوێندن کرد. تا ئەو کات خوا رێکی نەخستبو هیچ سەفەرێك بۆ دەرەوەی هیندستان بکەم. یەکەم گەشتی پیرۆز کە خوا بە نسیبی کردم گەشتی بەجێگەیاندنی فەرزی حەج بو لە ساڵی (١٣٦٦ك : ١٩٤٧ز) واتا دوای سێ ساڵ لە دانانی ئەم پەڕتوکە. لە راستیدا نوسینی ئەم پەڕتوکە خۆلێدانێکی زانستی بو، هێشتا بۆی ئامادە نەببوم‌و بارتەقای ئەو کارە نەبوم. ئازایەتی دەویست لەم بابەتەوە بنوسم کە شایەن بە قەڵەمێکی بە بڕشتترو ئاوەزێکی بەرهەراوتر[2] و ئەزمونێکی قاڵتر بو، بەڵام خوا مەیلی لەسەر چ بێ هەر ئەو دەبێ.

لە ناخەوە تاسەیەکی[3] نادیارو چەلومل دەیبزواندم‌و نەمدەتوانی فەرامۆشی بکەم، دەتگوت یەکێك پاڵەستۆم دەدا تا لەم بابەتەوە شت بنوسم، خۆ ئەگەر راوێژم بە ئاوەزم کردباو متمانەم بکردبایە سەر ئەزمونی نوسەران‌و لە ڕیزو

---

(١) دانانی ئەم پەرتوکە لە ساڵانی (١٣٦٣-١٣٦٤ك):(١٩٤٤-١٩٤٥ز) بو.

٢ ئاوەز: عەقڵ　　بەرهەراو: بەرفرەوان.

٣ تاسە: حەزرەت.

شوێنپایەی زانستی ئەوانم روانی بایە، بێسۆ[1] خۆم زەوت دەکردو ئەم بیرۆکەیەم وەلا دەناو تاسەکەم دەڕەویەوە. دیسان ئەگەر ئەم مەسەلەیەم بۆ هەر یەکێك لە زانایانی هۆشمەندو نوسەرانی پایەداریش باس کردبا ئامۆژگاریان دەکردم خۆم نەخەمە ناو ئەو شەڕو شۆڕە زانستیو ئاوەزییەوە. بەڵام خێری تێدابو راوێژم بە کەس نەکرد. دکتۆر محمد ئیقبال گوتەنی: ((مەرج نیە خێر لەوەدابێ گشت جارێك راوێژ بە ئاوەزت بکەی بۆیە لە هەندێ کاروباردا ئاوەزت وەلانێو گوێی بۆ مەگرە، چونکە ئاوەز لە شەڕی ترسناکدا ترس دەخاتە دڵتو پێت دەڵێ خۆت لەو جۆرە ئەزمونە تاڵو سەختانە وەدور بگرە)).

ئەو ژێدەرە[2] عەرەبیانەش کە هەر دەبوایە بیانکەمە سەرچاوەی پەرتوکەکەم ژمارەیان کەم بو، چونکە جەنگی دوەمی جیهانی هێندەی بەسەر رانەبوری بو، پەیوەندی نێوان هیندستانو وڵاتانی عەرەبیش لە تەنگژە دابو و خەریکبو بپچڕێ. هیندستان زۆر کەم کەلوپەلی زانستیو ژێدەری مێژوییو رۆشنبیریی عەرەبی دەهاورد کە بە گشتی سەرجەم وڵاتانی عەرەبیو بە تایبەتیش وڵاتی میسریان گەشاندبۆوە. بەڵام ژێدەری زانستی بە زمانی ئینگلیزیو ئوردی زۆر بونو بەدەستیشم دەکەوتن. لوکنهو- شاری زانستو رۆشنبیری -چەندین پەرتوکخانەی گەورەو دەوڵەمەندو تازەترین چاپکراوی ئینگلیزیو ئینسکلۆپیدیای زانستی لە ئامێزدا بو، منیش پەیوەندیم لەگەڵیاندا هەبو و پەرتوکم لێ دەخواستو دەمخوێندنەوە، سودم لە گەلێك پەرتوکخانەی تاکەکەسانیش وەردەگرت. هەروەها یەکێك لەو هۆکارو رێخۆشەکیانەی خوا بۆی رەخساندمو وایکرد ئەم پەرتوکە بێتە بەرهەم ئەوەبو کە ماوەیەکی کەم بەر لە نوسینی پەرتوکەکە زۆر بە تاسەو بە شێوەیەکی قوڵو فرەوان مێژوی ئەوروپام لە لایەنی رامیاریو کۆمەڵایەتیو ئاینو خورەوشتو ژیارو رۆشنبیری خوێندبۆوە. بە شێوەیەکی تایبەتیش لە بابەتی ململانێی نێوان ئاینو زانست و ئاستانەو

---

١ بێسۆ: بێگومان.
٢ ژێدور: سەرچاوە.

کەنیسەم تۆژیبوەوە. لە مێژوو پەرەسەندنی خوڕەوشتی ئەوروپاو ئەو هۆکارانەشم کۆڵیبوەوە کە وایان لە ئەوروپا کردوە بەم قالبە تایبەتیە دابڕێژرێ‌و سەرەنجامەکەشی بەم شێوە ماددەپەرستیە بگات، کە لەگەڵ ئەمەشدا کارگەرێکی توندو فرەلایەنیشی لەسەر رۆژئاواو رۆژهەڵات‌و روڕەوتەکەیان جێهێشتوە.

وێڕای ئەمانە مێژوو ئاین‌و بزاڤو فەلسەفەگەلی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی‌و مێژوی ئیسلام‌و موسڵمانان‌و مێژوی عەرەبی سەردەمی نەفامێتی‌و سەردەمی ئیسلامیشم لە رێی پەرتوکانی تایبەت بەم بابەتانەو لە رێی شیعرو ئەدەبدا خوێندبوەوە، رۆشنبیریەکی ئاینی‌و ئەدەبی‌و مێژوناسیشم هەبو و لە پەرتوکخانە گەورەکەی نەدوەی زانایان‌و لە پەرتوکخانە تاکەکەسیەکاندا ژێدەریش وەدەست دەکەوتن‌و سەروسۆراخێکی بەردەوامیشم بە بزاڤی وەرگێڕان‌و بڵاوکراوەکانی نێو نیمچە کیشوەری هیندستان هەبو و هەمیشە گۆڤارو رۆژنامەی زانستی ئاست بەرزو تیژو تۆژینەوەی زانستیشم دەخوێندەوە، بۆیە نوسینی پەرتوکێکی لەم بابەتەوە -بەشێوەیەکی رێژەیی- بۆ من هاسانتر بو.

شتێکی‌تر کە هانی دابم‌و رێی بۆ خۆشکردبم پێکهاتەو بونیادی بڕوادارانەم بو، پێم وابو پەیامی ئیسلام بە سەرکردایەتی محمد ﷺ پەیامێکی جاویدانە[1] و لە گشت سەردەمێکیشدا هەردەبێ ئەو موحەممەدە رێبەری سەرجەم گەلانی سەر زەوی بێ. پێم وابو ژیاری رۆژئاواو مگێز[2]ی گەلانی رۆژئاوایی لە سروشتەوە کەموکوڕیان هەیەو قەت لێشیان جیا نابێتەوە، تەنانەت لە سەرکردایەتیەکەشیاندا بەرجەستە بوەو رەنگی داوەتەوە. هەڵبەت برا گەورەکەم : دکتۆر سەید عەبدولعەلی ئەلحەسەنی- ئەمینداری نەدوەی زانایان وای پەروەردە کردم، کە ئەو هەردو رۆشنبیری ئیسلامی‌و رۆشنبیری رۆژئاوایی هاوچەرخی لەخۆدا کۆکردبۆوەو سەرمەشقێکی ناوازەی هەردو مەیدان بو، فامێکی قوڵیشی

---

١ جاویدان: هەمیشەیی، هەتاهەتایی.
٢ مگێز: مزاج.

لە بارەی ئیسلامو هاوسەنگیەکی هزری[1] دور لە هەمو جۆرە زێدەڕۆیی‌و توندگریەکیشی هەبو ... هەمو ئەو هۆکارانە وایان کرد سود لە خوێندنەوە هەمەجۆرو جارویار دژ بە یەکەکانم ببینم کە بۆ زۆربەی خوێنەرانی هزر کاڵ تێکەڵی‌و پێکەڵی پەیدا دەکات، بەڵام من چەندین دەرەنجامی ئیجابیم وەدەست دێنا ((مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ))(النحل:٦٦)، بیروباوەڕیشم لە بارەی ئیسلام ڕەگاژۆتر[2] دەبو و دڵنیا و دڵنیاتر دەبوم کە هەر ئیسلام شایستەیە لە هەمو سەردەمێکدا سەرکردایەتی بگرێتە دەست، بڕواشم بە محمد ﷺ زیاتر دەبو کە هەر خۆی ((دواهەمینی پێغەمبەرانو پێشەوای هەموانو روناککەرەوەی ڕێگایانە)).

لە ڕاستیدا هەستم بە بایەخو ناوازەیی‌و ترسناکی بابەتەکەو کەمی تێشوو نەوتەمەنی خۆمو کەمی یارمەتیدەرانم دەکرد، بەڵام ئازاد نەبوم ناچار بوم، وەك بڵێی ورتە ورتێك لە دەرگای ویژدانم بداتو پێم بڵێ چار نیە دەبێ لەم بارەوە پەرتوکێك هەبێ.

یەکێك لەو هۆیانەی سەرنجی خەڵکانێکی زۆری بەلای پەرتوکەکەدا کێش کردوەو زۆر کەسی خرۆشاندوە بابەتە تازەو ناوازەکەیەتی کە بریتیە لە ((بە داڕوخانی موسڵمانان جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟)). ئایا دەبێ موسڵمانان پەیوەندیەکی توندیان بە چارەنوسی مرۆڤایەتی‌و بە ڕەوشی جیهانەوە هەبێ تا ڕەوا بێ بگوترێ بە داڕوخانی موسڵمانان جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟ یاخود جیهان چ قازانج دەکاتو مرۆڤایەتی چ پەروبومێك دەچنێ ئەگەر موسڵمانان پێشبکەونو جڵەوی سەرکردایەتی مرۆڤایەتی بگرنە دەست ؟

خەڵك لەو سەردەمو لەسەردەمی بەر لە دانانی پەرتوکەکەش وا ڕاهاتبون لە ڕوانگەی مێژوی جیهانەوە سەیری موسڵمانان بکەنو وەك گەلێکی ئاسایی‌و سای نەتەوەکانی‌تر تێی بڕوانن، بەڵام نوسەری ئەم پەرتوکە ئازایەتی وەبەرخۆ ناو

---

[1] هزر: بیر، فکر.
[2] ڕەگاژۆ: ڕەگ داکوتان.

کەوشەنی[1] کێشراوی تێکشکاندو لەو جوغزە لاسائامێزەیە دەرچو کە بە دەوری دانەرو نوسەرانی عەرەب‌و عەجەم هەڵچنرا بو، نوسەر هەوڵی دا لە روانگەی موسڵمانانەوە لە جیهان بڕوانێ . هەڵبەت مەودای نێوان ئەم دو ڕوانینە وەك نێوانی ئەرزو ئاسمانە و، لەگەڵ ئەم ڕوانینە گەلێك جیاوازە کە لە سۆنگەی جیهان‌و روداوەکانی و لە سۆنگەی پەرەسەندنی مێژووەوە لە موسڵمانان بڕوانێ‌و پێی وابێ موسڵمانانیش سای سەرجەم گەلان گەلێکن‌و لە چوارچێوە گشتی‌و فرەوانەکەی روداوەکانی جیهان دەرناچن. بۆیە پێڕەوی گشتی هزری‌و نەشم‌وشێوازی هەمیشەیی تۆژینەوەکان لەم چەشنە بون کە ئایا موسڵمانان بەسەبارەتی فلان روداو چ زیانێکیان لێکەوت؟ بە سەبارەتی دوابڕانی فلان حکومەتەوە چ زیانێکیان لێکەوت؟ بە سەبارەتی راپەرینی نوێی رۆژئاواوە چ زیانێکیان لێکەوت؟ بە سەبارەتی شۆڕشە مەزنەکەی رۆژئاوا چ زیانێکیان لێکەوت؟ بە سەبارەتی نەمانی خەلافەتی عوسمانیەوە چ زیانێکیان لێکەوت؟ بە سەبارەتی ئەوداگیرکاریانەی رۆژئاوا لەمەڕ قوللەو قەلاّی ئیسلام‌و موسڵمانان کردونیەتی چ زیانێکیان لێکەوت؟ بە سەبارەتی لاوازی ئابوری‌و رامیاری‌و هێزی سەربازی‌و کەمی چەکەوە چ زیانێکیان لێکەوت؟

خەڵك دەقی بەم شێوازە وێنەکێشراوە گرتبو. بەڵام خوای گەورە ئیلهامی منی دا و سینەی گوشاد کردم تا بە نەشمی[2] (بە داڕوخانی موسڵمانان جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟) بنوسم. کە ئەوەی تێدا دەفامرێتەوە وەك بڵێی موسڵمانان هۆکارێکی کاریگەری جیهان بن‌و ئەوان نەك هەر کار لە رێڕەوی روداوی هەرێمێکی دیاریکراوی جوگرافی یان ناوچەیەکی تایبەتی رامیاری بکەن بگرە کار لە رێڕەوی گشت روداوەکانی جیهانیش دەکەن.

---

١ کەوشەن: سنور.
٢ نەشم: اسلوب.

ئاخۆ راست بێ ئەگەر بگوترێ موسڵمانان لە شوێنکارێکی[1] وا دان کە جیهان بە داڕوخانی موسڵمانان زیانی لێبکەوێ؟ ئایا موسڵمانان لەو ئاستە دان کە بە دەستکێشانەوەیان لە بواری سەرکردایەتیکردنی جیهان و پاشکەوتنیان جیهان زیانی لێبکەوێ؟

من لەوە دەترسم ئەو نوسەرە ئیسلامیانەی کە هەڵوێستی شکۆدارانەو رابردوی سەربەرزانەشیان هەیە بەم جۆرە بیر نەکەنەوە و نەڵێن: بەڵێ راستە، موسڵمانان لەم ئاستە دان!. بێگومان شێواندنو تەماشاکردنی مێژوی ئیسلامی لە گۆشەنیگایەکی تەسکەوە، هەروەها ئەو پێکهاتە کەموکوڕەش کە نەوەی نوێی رۆشنبیر توشی بوە بەربەستو تەگەرە دەخەنە بەردەم زۆربەی توێژەرەوانو وایان لێدەکەن کێشەی موسڵمانان بە کێشەی جیهانو مرۆڤایەتیەوە گرێ نەدەنو بڵێن: موسڵمانان لە کوێو سەرکردایەتی جیهان لە کوێ؟ موسڵمانان وا هەژارو زەبونو بەرحوکمی رۆژئاواو بەرەژێری شۆڕشە تازەکان..! کەنگێ[2] راستە چارەنوسی جیهانو مرۆڤایەتی بە چارەنوسو واقیعی موسڵمانانەوە ببەسترێتەوە؟!. ئەوکات زۆربەی خەڵك بڕوایان نەدەکرد کە موسڵمانان بایەخو ترسناکیو کاریگەریان هەبێو لە شوێنپایەکی وادا بن کە شایستەی ئەم تۆژینەوەیە بنو نوسەر لەم بارەوە پەرتوك بنوسێو لە مەودای زیانەکانی جیهانی مرۆڤایەتیو جیهانی هاوچەرخ بکۆڵێتەوە کە بە هۆی داڕوخانی موسڵمانانەوە دوچاری هاتون. بابەتەکە زۆر ترسناك بو، تۆژینەوەکە نیمچە سەرچڵیەکی[3] گەرەك بو.. بەڵام خوای بەرزو تاك یارمەتی دام.

بە دودڵیو ترسێکەوە ئەم پەرتوکەم دانا، چونکە لە بواری داناندا نوێ بومو دەگەڵ زمانی عارەبی[4] تازە سەرەتاتکێو ئاشنایەتیم پەیدا دەکرد، چونکە من

---

١ شوێنکار: موقع.

٢ کەنگێ: کەی، چ کاتێك.

٣ سەرچڵی: مجازفة، مغامرة.

(٤) نوسەر پێشتریش ئەو پەرتوکانەی دانابو: زنجیرەی ((قصص النبيين للأطفال)) (١-٢)، ((القراءة الراشدة)) (١-٢-٣). ((مختارات من أدب العرب)). کە هەمویان پەرتوکی پرۆگرامی

لـە دەرەوەی مەڵبەنـدی ڕۆشـنبیری عـەرەبی‌و مەڵبەنـدی زانـستە ڕەسـەنەکانی ئیسـلامی لە دایك بومەو ژیانم بەسەر بردوە. ئەوەشم بە خەیاڵدا دەهـات ئـاخۆ ئەم پەرتوکە لە ژینگەی عەرەبی‌و ئیسـلامیدا جێی خۆی دەکاتەوەو ڕێـزی لـێ دەنرێ یان نا؟ بۆیە ناوەڕۆکی پەرتوکەکەم کـردە لیـستێك‌و بـۆ (ئەحمـەد ئـەمین بەگ)م نارد کە سـەرۆکی لیژنـەی دانـان‌و وەرگێـڕان‌و بڵاوکردنـەوە لـە میـسرو سـەرۆکی کـارگێڕیی ڕۆشـنبیریش بـو لـە جامیعـەی وڵاتـانی عەرەبیـدا. کـە پەرتوکەکانی بەڕێزیشیان بە تایبەتی ((فجر الاسلام))و ((ضحی الاسلام))ەکـەی سەرنجی خوێنەران‌و توێـژەرەوانی بـەلای خۆیـدا وەرچـەرخاند بـو و لـە نێوەنـدە زانستیەکاندا دەنگی دابۆوە. بەخۆشم پێیان سەرسام بوم‌و زۆر بە قـوڵی دیراسـەم کردبون، لە زۆربەی جێگاکانەوە بە پەسـندەوە لە هەندێ جێگەشـدا بـە ڕەخنـەو ڕای جیـاوازەوە شـتم لەسـەر نوسـیبو، هـەروەها بـە نەشـم‌و شـێوازە پوخـت و ڕەوانەکەشی کەمەندکێش بوم کە دەگەڵ سرشتی مرۆڤ هەنگاوی هەڵدەگرت، پـێم باش بو پەرتوکەکـەم لـەم دەزگـا زانـستیەوە بێتـە چـاپکردن‌و بڵاوبیێتـەوە کـە نرخێکی زانستی گەورەیان لە ڕۆژهەڵاتی عـەرەبی پێـشکەش دەکـردو دەکـەن، گەنج‌و ڕۆشنبیرو هەوادارانی توێژینەوەی زانستی‌و لێکۆڵینەوەی بابەتیانـەش بـە گەرمی پێشوازییان لە بڵاوکراوەکانیان دەکـرد. ئـیتر مـن نـەمزانی ئـەو چـەند لاپەڕەیەی کە ناردبوم‌و پێناسەیەکی تێکڕایی لە بارەی پەرتوکەکەوە تێـدابو چـی بەسەرهات، ئەمەش لەملاوە بوەستێ کە نوسەر کەسـێکی نەناسـراو بـو و هـیچ ئاسەوارێکی زانستی‌و هیچ تکاخوازو پەسندکەرێکیشی نەبو.

بەڵام لە پڕو نەکاوێکدا نامەیەکم بە دەست گەیشت داوای لێکردم وێنەیـەکی لەبەرگیراوەی پەڕتوکەکەی بۆ بنێرم، منیش بەشێکی پەرتوکەکەم بۆ ڕەوان کرد.

دیاربو بابەت‌و تێزو تۆژینەوەکانی پەرتوکەکەو سـەربابەتە لاوەکیـەکانی کـە ئاماژەیان بە ناواخنەکەی دەکرد شوێنێکی پەسندی لە لای دکتۆر پەیدا کردبـو،

---

خوێندن بون بۆ ئەو ڕۆڵە موسڵمانانەی کە لە پەیمانگە ئاینیەکانی هیندستان زمـانی عـەرەبیان دەخوێند .

بەڵام دکتۆر لەوە دەترسا پەرتوکەکە لە خامەی زانایەکی ئاینیو رۆشنبیرێکی دور لە جیهانی رۆژئاواوە وەبەرهەم هاتبێ و شەقلێکی[1] ئاینیو زمانەوانی خەستو قورسی -وەك زاناکانی ئەزهەرو پەیمانگە کۆنەکانی ئاینی- بەخۆوە گرتبێ. بۆیە پرسیبوی ئایا نوسەر سودی لە سەرچاوە بیانیەکان وەرگرتوە؟ جا کە وەڵام بە (بەڵێ) بو و نوسەر ناوی سەرچاوە ئینگلیزیەکانی بۆ هەنارد، دکتۆر دڵی ئاوی خواردەوەو هەواڵی دامێ کە لیژنە بڕیاری داوە بە چاپی بگەیەنێ، سەرسامیشی لەبارەی ناوەرۆكو لایەنی ئەدەبی پەرتوکەکەوە دەربڕی بو، ئەو رۆژەی کە نوسەر ئەم نامەیەی لەلای دکتۆرەوە پێگەیشت یەکێکە لە خۆشترینو شادترین رۆژەکانی تەمەنی نوسەرو قەت تا ئەمڕۆش لە بیری نەکردوە.

پاشان چەند مانگێك تێپەڕی بێئەوەی بزانم سەرەنجامی پەرتوکەکەم بە چ گەیشتوە. لەو ماوەیەشدا لە ساڵی (١٩٣٦ك-١٩٥٠ز) بۆ جاری دوەم سەردانێکی حیجازم کرد، لەوێ لەلای باڵوێزی سوریایی: ئوستاد (جواد المرابط)-ئەندامی کۆڕی زانیاری لە دیمەشق دانەیەکی چاپکراوی پەرتوکەکەم دیتو لێم بو بە مزگێنی، کە ئەویش ماوەیەکی کەم بەر لە سەردانێکیدا بۆ قاهیرە دەگەڵ خۆی هێنابوی. جا بێئەوەی بزانێ وا لەگەڵ نوسەر دەدوێ سەرسامی خۆی بۆ هزرو بیری قوڵو رەسەنی زانایانی هیندی دەردەبڕیو پەرتوکەکەشی دەکردە گەواهی وتەکانی. هەڵبەت لە حاڵێکی وادا کە نوسەری گەنجی نەونوس[2] لە ناکاو یەکەمین بەرهەمی زانستی خۆی ببینێ کە لە گەورەترین مەڵبەندی بڵاوکردنەوەدا چاپ کرابێ هەمو کەسێك دەزانێ چ خۆشیو شادیەك دڵو دەرونی دەگەشێننەوە. نوسەر پەرتوکەکەی لە جەنابی باڵێوز خواستو پێی گوت دوای خوێندنەوە بۆتی دەگەڕێنمەوە . بەڵام نوسەر ئەوەشی لێبوە نەکاوێك کە ئەو پێشەکیە کورتەی دکتۆر ئەحمەد ئەمین بۆ پەرتوکەکەی نوسیبو ئەو بڕستەی تێدا نەبو کە لە نوسەرێکی گەورەی ئیسلامی وەکو دکتۆر

---

١ شەقڵ: مۆرك، طابع.

٢ نەونوس: تازەنوسەر.

(ئەحمەد ئەمین)ی پێشبینی دەکرد، وێڕای ئەمە زۆر بە وریاییشەوە تێڕوانینی خۆی لە بارەی نوسەرو نوسراوەکەوە دەربڕی بو. شتێکی سەیر نەبو هەرچەندە لەسەر دڵی نوسەریش گران بو- چونکە ئەوانەی پێشەکی بۆ پەرتوکێك دەنوسن مەرج نیە، لەمەڕ ناوەڕۆکەکەی بەجۆش‌و خرۆش بن. جۆش لە کاتێکدا دەبێ کە بابای پێشەکی نوس دەگەڵ هزری پەرتوکەکە بە وەرام بێ‌و بڕوایەکی قوڵی پێ هەبێ. مەرج نیە هەمو توێژەرەوەیەکی زانستی‌و نوسەرێکی گەورە — ئەگەرچی لە پلەی دکتۆر (ئەحمەد ئەمین بەگ)یش دابێ — پێی وابێ بە داڕوخانی موسڵمانان و دەستکێشانەوەیان لە سەرکردایەتی و ئاراستە کردنی جیهانی؛ جیهان زیانی پێ گەییبێ‌و مرۆڤایەتی توشی بەدبەختیەکی زەبەلاح بوبێ. چونکە ئەم جۆرە بیرکردنەوەو لێکدانەوەیە بۆ مێژو نەشەو شێوازێکی تایبەتەو مەرج نیە گشت دانەرو توژەرەوەیەك قەناعەتی پێ هەبێ. ئۆباڵ ناخرێتە ئەستۆی دکتۆر ئەحمەد ئەمین —و نکوڵیش ناکرێ کە کردوکۆشێکی بەڕێزانەی بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو پەرتوکە تەرخان کردوە تا لە لایەن لیژنەی دانان‌و وەرگێڕان‌و بڵاوکردنەوەی بابەت‌و پەرتوکە پەسند کراوەکان چاپ بکرێ — بەڵام ئۆباڵ دەخرێتە ئەستۆی دانەرەوە کە هیوای زۆر دوری لە دکتۆر دەخواست و شتی وای لێ‌چاوەڕوان دەکرد کە زەمینەی هزرو زانستەکەی بۆ ئەم جۆرە لێکدانەوەیە هەموار نەبوە و بارودۆخی پەروەردەو خوێندنیشی یارمەتی نەداوە بەم شێوازە بیر بکاتەوە. پاشان رەنگە دکتۆر ئەحمەد ئەمین بە یەکێك لە ئوستادو گەورە دانەرو ئەدیبانی نەوەی نوێ هەژمار بکرێ‌و پەروای[1] لەوەدا هەبوبێ — کە مافی خۆشیەتی پەروای هەبێ -شان‌و شکۆیەکی پتر بە نوسەر بدا کە ئاشنایەتی لەگەڵدا نیەو لێی رون نیە زانستەکەی لە چ ئاستێکدایەو ناشزانێ زاناو هاوڵاتیانی وڵاتەکەی بە چ دیدێك لێی دەڕوانن، نەبادا بڵێن کاڵایەکی رەونەقدارو قەشەنگی پتر لە نرخ‌و پایەی خۆی بەباڵادا بڕیوە. خوا بیبورێ و لەباتی نوسەرو

---

١ پەروا: ترس، باك. خشیة، خوف.

خوێنەرەکانیشی بە باشترین ڕێزانە[1] پاداشتی بداتەوە. چونکە بەڕاستی ئەو وایکرد ئەم پەرتوکە بگاتە نێو ناوەندە زانستیە روناکبیرەکان، کە نرخێکی ئەوتۆ بەو پەرتوکانە نادەن کە لە دەزگایەکی ئاینیەوە دەردەچن .

دانەر لە یەنایەری ساڵی (١٩٥١ز)دا دوای دومانگ یان پتر لە دەرچونی ئەم پەرتوکە گەشتێکی بۆ میسر کرد، لەوێدا دیتی پەرتوکەکە خۆی گەیاندۆتە نێوەندە زانستیو ئاینیەکانو شوێنپایەکی وای پەیدا کردوە دانەر هەرگیز پێشبینی شتی وای نەدەکرد بەڵکو خەونی پێوە دەدیت، چینێکی بەرفرەوان لە رۆشنبیرو خەمخۆرانی دۆزو راپەڕینی ئیسلامیو رابونی موسڵمانان خوێندبویانەوە، (ئیخوانولموسلمین) کە هێندە نەبو دەستیان لە بەربینگی شل کرابو و تازە گاگۆڵەیان دەست پێدەکردەوە، دەتگوت ئەم پەرتوکە لە ساتو شوێنی گونجاوی خۆیدا خۆی رۆناوەو لەگەڵ هەستو بانگەوازەکەیان هاوئاوازو ئاوێزان بو. ئیخوانولموسلمین بە خەستو قوڵی زامدار کرابون، ئیمام (حەسەنی بەننا) شەهید کرابو و کۆمەڵەکەشی هەڵوەشێنرا بو، لەم کاتەدا ئەم پەرتوکە وەك هەتوانو خەمرەوێنێك بو، بەڵکو وەك چەکێکی زانستی بو لە دەستیانو داکۆکیان پێ لە هزری خۆ دەکردو وەك بارگەبەخشێك بو بۆ پاتری جموجۆڵو چالاکیان . لە زیندانەکان خوێندبویانەوە و بڕیاریان لەسەر دابو بیکەن بە ماددەیەکی پرۆگرامی خوێندنو خوێندنەوەیان، لە هۆڵی دادگاکانیشدا هەندێ دەربڕینی پەرتوکەکەیان بە گەواهی هێنابۆوە. لەبەرئەوە پێشوازیەکی گەرمو گوڕو پڕ لە خۆشەویستیان لە دانەر کردو پەرتوکەکە بوە باشترین پێناسی دانەری تازە میوان و، بوە ڕیخۆشکەرێك بۆ متمانە پێکردنو قسە لەگەڵدا کردنی.

نوسەری گەورەی ئیسلامی؛ ئوستاد سەید قوتب لە ریزی پێشەوەی ئەوانە بو کە پێشوازیان لەم پەرتوکە کرد و بایەخێکی زۆری پێداو قوتابیو براکانی هان دەدا بیخوێننەوە، رۆژێکیان [2] دانەر بانگهێشتێکی لە ئوستاد سەید قوتبەوە

---

١ ڕێزانە: پاداشن.

(٢) ئەو رۆژە (٩/٨/١٣٧٠ك: ٢٥/نیسان/١٩٥١ز) بو .(مذكرات سائح فی الشرق العربی).

پێگەیشت تا لە کۆڕی جومعانەی نێو ماڵی خۆی لە (حُلوان) بەشدار ببێ. کۆڕەکە هەرجارەی لە بارەی بابەتێکی ئیسلامیەوە بو یان یەکێك پەرتوکێکی دیراسە دەکردو پوختەکەی لەوێدا بۆ بەشداربوان دەخوێندەوە پاشان گفتوگۆیان لەسەر دەکرد. بابەتی ئەو رۆژە (ماذا خسر العالم) بو، یەکێك لە قوتابیەکانی کە دەرچوی زانکۆی (فؤاد الاول) بو پوختی کردبوەوە. دانەریش بە بەڵێ وەڵامی بانگهێشتە بەرێزو خۆشەویستەکەی دایەوە کە وەك رێزلێنانێك بو بۆ کردو کۆشە زانستیەکەی نێو پەرتوکەکەو گەورەکردنو پێزانینێکیش بو بۆ خودی دانەر. دانەر لە کۆڕەکەدا ئامادە بو و لە وتووێژەکەشدا بەشداری کرد، وەڵامی هەندێك لەو پرسیارانەشی دایەوە کە وەك دانەرێك ئاراستەی دەکرا.

دانەر هەر لەوێدا ئەوەی بە بیردا هات داوا لە ئوستاد سەید قوتب بکات بە خامە خواناسو بە برستەکەیو بە نەشمو شێوازە ئامانجدار و زانستیەکەیەوە، پێشەکیەك بۆ پەرتوکەکە بنوسێ. ئەویش بە گەرمی و بە دڵخۆشی وەڵامی دایەوەو پێشەکیەکی بەهێزو بەپێزی بۆ نوسیو بەهای پەرتوکەکەی بەرزتر کرد.

هاوکات لەگەڵ ئەمەدا ئوستادی پایەدارو زانای بڕوادار: دکتۆر موحەممەد یوسف موسا-ئوستاد لە زانکۆی (اصول الدین)ی ئەزهەرو سەرۆکی کۆمەڵەی ئەزهەر بۆ دانانو وەرگێڕانو بڵاوکردنەوە داوای لێکردم [1] ئەگەر رێگە هەبێ چاپی دوەمی هەڵەبژێرکراو لە لایەن کۆمەڵەکەی ئەوانەوە بێتە چاپکردن- کە خۆشی یەکێك بو لەو کەسانەی زۆر بەم پەرتوکە سەرسام بونو ئاماژەی پێدەکردو خەڵکی هان دەدا بیخوێننەوە-، دانەریش بە دڵی شادو بە سوپاسەوە رێگەی پێدا. بۆ ئەم مەبەستە دکتۆر چو رەزامەندی لە دکتۆر ئەحمەد ئەمین وەرگرتو پێشەکیەکی جوانیشی بۆ نوسی، لە پێشەکیەکەدا دیارە دکتۆر هزری پەرتوکەکەی بەدڵەو پەسندی کردوە. هەروەها دکتۆر (ئەحمەد شەرباصی) برادەریشم — کە یەکێکە لە زانایانو ئوستادانی ئەزهەر- لە سەردانێکیدا زانیاری تەواوی لە بارەی بنەماڵەو ژینگەو شێوازی پەروەردەبونو خوێندنو

(١) ئەمەیان لە (٣/ حوزەیران / ١٩٥١ز)بو.

ژیانو سەربردەی دانەر وەرگرت، بیٚئەوەی دانەر بزانیٚ بۆ چیەتی. پاشان لیٚی کردە موفاجەئەو مەقالەیەکی لە بارەی دانەرەوە بەناوی (برام ئەبولحەسەن) لیٚ پیٚکهیٚنا. تا دەرچونی چاپی دوەمیش لە سالّی (١٩٥١ز) دانەر بەمەی نەزانی بو. ئیتر دوای ئەم چاپە چاپیتروو وەرگیٚراویتر بە زمانگەلی رۆژهەلاٚتو رۆژئاوایی لیٚدەرچو..فەرمو ئەمەش چاپی سیٚزدەمی یاسایی. ئەمە بو کورتەو باسوخواسی راستەقینەو بیٚپیٚچوپەنای سەربردەی ئەم پەرتوکە. لەسەرەتاو لە کۆتاییدا چاکە هەر چاکەی خودایە .

**ئەبولحەسەن عەلی ئەلحەسەنی نەدوی**

**نەدوەی زانایان – لوکنهو**

**٢٠ – رەجەب – ١٤٠١ك**

**٢٥ – مایۆ – ١٩٨١ز**

# پێشەكی چاپی هەشتەم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد المرسلين وخاتم النبيين محمد وآله وصحبه أجمعين، ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين.

منیش وەكو هەر نوسەرو دانەرێكیتر وەكو هەر كەسێكیتر كە بانگەواز بۆ هزرێك رادەگەینێو كار بۆ بانگەوازێك دەكات بە نوسینی پێشەكی چاپی هەشتەمی ئەم پەرتوكە شادو ئاسودەم . كاتێك چاپی یەكەمی لێ دەرچو پێشبینیم نەدەكرد ئەم هەمو نۆرە چاپانەی بەدوادا بێت، لە خولیام نەبو پێشوازیەكی وا گەرمو گوڕی لێبكرێتو بەم شێوەیە بە جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبێتەوە و، خەڵكیش وا بەدوایدا بگەڕێنو پەرتوكخانە ئیسلامیەكانیش مونافەسە بكەن لە بڵاوكردنەوەیداو بۆ ئەم هەمو زمانەش وەربگێڕدرێو بەهەر زمانەش چەندین چاپی لێ دەرچێتەوە[1]، هەڵبەت ئەم رێزو دەنگدانەوەیە بە یارمەتی خواوە بو. هەروەها بەڵگەیە كە خەڵك پەرتوكەكەیان قبوڵ بوەو بە پیرەوەچونێكی روحامێزیان دەگەڵ هزرو مەبەستی پەرتوكەكەدا هەبوە.

یەكێك لە سەیروسەمەرەكان ئەوەیە كە ئەم پەرتوكە هەرچەندە یەكەمین بەرهەمی نوسەرە كە بە زمانی عەرەبی نوسیویەتیو ئەم هەمو نۆرەچاپانەشی لێ دەرچوە[2] كەچی وەكو بەرهەمەكانیتر بەشی شایستەی خۆی لە هەڵەبژێریو زێدەكاری وەرنەگرتوە، تەنها چاپی سێیەم نەبێ كە كەمێك زێدەی خراوەتە سەر.

---

(١) تا كاتی نوسینی ئەم وشانە: وەرگێڕدراوە ئینگلیزیەكەی سێ چاپی لێ درەچوە، وەرگێردراوە فارسیەكەی شاری (قوم)ی ئێران دو چاپی لێ دەرچوە. وەرگێڕدراوە ئوردیەكەش چاپی شەشەمی لە ساڵی ١٩٦٨ دەرچو.

(٢) جێی ئەسەفە هەندێ پەرتوكخانە بێئەوەی ودم لە نوسەر بخوازنو نوسەر ئاگای لێبێ پەرتوكەكەیان چاپ كردۆتەوە، بۆیە پوختەكاری و هەڵەبژێرییان تێدا نەكراوە، تەنانەت لە هەندێ چاپدا لاپەڕو بابەتەكانیش جێگۆڕ كراون .

ئەم پەرتوکە هەر چاپێکی لێ دەردەچو، بێئەوەی هەڵەبژێری و زێدەکاریشی تێدا بکرێ، زو دەفرۆشراو لە بازاڕدا نەدەمایەوە، نوسەریش دەرفەتی بۆ هەڵنەدەکەوت چاوی پێدا بخشێنێتەوە. نوسەر هەندێ راوبۆچونو زانیاری تازەی لەلادا کۆببوەوە بەڵام بڵاوکارەکان لەبەر زو سەرفبونو داواکاری زۆری خەڵکی چاوەڕێیان نەدەکرد هەڵەبژێری تێدا بکاتو زێدەکانی بخاتە سەر، بۆیە هەمو چاپەکان بە هەمان شێوەو وەکو چاپی سێیەم بون.

کار وا رۆیی تا خوا کردی لە موحەڕڕەمی ساڵی ١٣٩٨ بەرامبەر بە مارس/ئەپرل -١٩٦٩ کە (دار القلم)ی کوێتی ویستی چاپێکیتری لێ بڵاوبکاتەوە، دەرفەت هەڵکەوت، نوسەر کاتی بۆ تەرخان کردو سەرلەنوێ خوێندیەوەو لەگەڵ دەقو ژێدەرەکان پێکی گرتنەوەو هەندێ هەڵەی راست کردەوەو فەرمودەکانی تەخریج کردو ژمارەی ئایەتەکانی دەستنیشان کردو چەند زیادەیەکیشی خستە سەر بێئەوەی بابەتەکان زیاد بکات بەڵام پەرتوکەکە بە پێزترو بە بڕشتتر دەکاتو ئەم بۆشاییانە پڕ دەکاتەوە کە نوسەر هەستی پێدەکرد.

بەجۆرە وا چاپی هەشتەمی لێ دەردەچێتەوە کە لە سەرجەم چاپەکانی پێشو پوختەترو بێ هەڵەترو دەوڵەمەندتر دەبێ. ولله الامر من قبل ومن بعد وله الحمد في الاولى والآخرة.

ئەبولحەسەن عەلی ئەلحەسەنی نەدوی
نەدوەی زانایان – لوکنهو
٢٨ -محرم- ١٣٨٩ ك
١٦ / ٤ / ١٩٦٩ ز
رۆژی چوارشەممە

# پێشەکی چاپی چوارەم

الحمدلله، وسـلام علـى عباده الذين اصـطفى.

کاتێك یەکەم چاپی پەرتوکی (بە داڕوخانی موسـڵمانان جیهـان چ زیـانێکی لێکـەوت؟!!) لـە سـاڵی (١٣٦٩ك - ١٩٥٠ز) کەوتـە بـەر دیـدی خوێنـەران پێشوازیەکی گەلـێ گەرمی لێکرا تەنانەت پێوانەو هومێدی دانەریشی تێپەڕاند، تەنها بابەتو ناوەڕۆكو چەمکەکانی نێو پەرتوکەکە بو کە ئاوا سەرنجی خـەڵکی راکێشا –کە لەوانەیە پێشوازیەکی سەیرو نـاوازە بوبـێ–، کەسـێتیو ناوبـانگی دانـەر لـە پـشت ئـەم پێـشوازیو دەنگدانەوەیـە نـەبوە چـونکە پێـشتر هـیچ پـەرتوکێکیتری لـە جیهـانی عەرەبیـدا بـڵاو نەبۆتـەوەو خـەڵکی ئـەم وڵاتانـە نەیانناسیوە.

هەڵبەت ئەم پێشوازیە گەرمەی کە لەم پەرتوکە کـراوە لـە فـەزڵی خواوەیـە، دوای فەزڵی خواش ئەوەبو کە لە کاتی گونجاوی خۆیدا بڵاوبوەوەو لەگەڵ خواستی ناڕونو ئاراستەی نادیاری نێو دڵانیش یەکی گرتەوەو دەگەڵ هەستی گـەلێك لـە بیرمەندو رۆشنبیرەکانی جیهانی عەرەبیش وەدەنگ دەهاتو لەگەڵ هزرو بۆچونو تۆژینەوەکانیان تێکی دەکردەوە .

پەرتوکەکە لە پایتەختە عەرەبیەکانو نێوەندە زانستیەکاندا بە فرەوانـی بـڵاو بۆوە، هەمو توێژەکان قبوڵیان کردو هەندێ لە رێبـەرە هزریـەکانیش تۆژینـەوەو دیراسـەیان لەسـەر کـردو مامۆسـتاو پـەروەردەکارەکان لاوەکانیـان هـان دەدا بیخوێننەوەو تێی بڕوانن، هەڵبەت سوپاس هەر بۆ خوایە کە خۆی کارە چاکەکان بە ئاکام دەگەیەنێ .

لیژنەی دانانو وەرگێڕانو بڵاوکردنەوە لە قاهیرە چاپی یەکـەمی لـێدەرکرد، بێگومان رۆڵێکی چاکیان گێڕا کە پەرتوکەکەیان بە بەرگێکی جوانو قەشەنگەوە خستە بەردەستانو لە نێوەندە زانستیو ئەدەبیەکانیـشدا نرخێکـی بـەرزیان پـێ

بەخشی. پاشان کۆمەڵەی ئەزهەر بۆ بڵاوکردنەوەو دانان-کە چەند برادەرێکی نوسەریشی تێدان- سور بون لەسەر ئەوەی کە دوبارە چاپێکیتری لێ دەرکەنەوە، منیش بە دڵخۆشیەوە رێگەم پێدان. ئوستادی گەورە دکتۆر ئەحمەد ئەمین (بەگ)-خوا لێی خۆش بێ- کە سەرۆکی لیژنەکە بو رەزامەندی فەرمو، ئەوەبو لە ساڵی (١٣٧٠ ك - ١٩٥١ ز) دوەم چاپی لێ دەرچووەوە، کە پێشەکی ئەم بەرێزانەی تێدابو: دکتۆر محمد یوسف موسی، نوسەری ئیسلامی ئوستاد سەید قوتب، برادەری نوسەر شێخ احمد الشرباصي، کە نرخی پەرتوکەکەیان بەرز کردەوە.

کاتێك چاپی دوەم دەرچو من لە گەشتێکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دابوم بۆیە نەمپەرژا زیادەی بخەمە سەر کە پێشتر بیرم لێدەکردەوەو بە پێویستم دەزانی، بەڵام خوا کردی بۆ چاپی سێیەم چەند سەرچاوەیەکیترم وەدەست کەوتو کۆمەڵێك راوبۆچونو لایەنی نوێم لەلادا گەڵاڵە بو و دەگەڵ ئەو چاپم دا، چاپی سێیەم لەبەر چەند هۆکارێك تا ساڵی (١٣٧٩ ك - ١٩٥٩ ز) نەهاتە چاپکردن بەڵام کە چاپ کرا ماوەیەکی کەمی بردو گشت دانەکانی فرۆشران. کە ئەمەشیان چاپی چوارەمەو زێدەی خراوەتە سەرو هەڵەکانی بژێردراوە.

لەخوا دەپاڕێمەوە ئەم چاپەو چاپەکانی دواتریش -إن شاء الله- وەکو چاپەکانی پێشو ببنە مایەی سود و بەهرەی موسڵمانان، ببنە هۆکارێك بۆ هۆشیاریو بڕوایەکی نوێ کە جیهانی ئیسلامی گەلێکی پێویستە. هەر خواش توانای بەسەر هەمو شتێکدایە.

**ئەبولحەسەن عەلی ئەلحەسەنی نەدوی**

**لوکنهو (هیندستان)**

# پێشەکیەك

## به پێنوسی ئوستادی هێژا دکتۆر محمد یوسف موسا

کاتێك ئاسمان پەیوەندی بە زەمین دەکاتو لە بەرزایی هەرە بەرزەوە لەلای خوای پەروەردگارەوە پەیامی خوا بە عەبدانی ناگزور[1] رادەگەیەنرێ، روداوێکە لە روداوە هەرە مەزنەکان کە یاساکانی سروشت دەسمێنو لە رێوشوێنی داڕێژراوی خۆیان دەخزێنو دەگۆڕێن کە -مەگەر لە حاڵەتی پێویستی زۆر گەورەدا یا بۆ مەبەستێك کە خوای بە تواناو باڵادەست تەقدیری کردبێ ئەگینا- ناگۆڕێن.

هەرشتێك لەم جیهانەدا رو بدا یان پەیدابێ، دەبێ هۆ و ئامانجێکی هەبێ.

دەرکەوتنی ئیسلامیش گەورەترین روداوە کە جیهان بەخۆیەوەی بینیبێ، کەواتە دەبێ مەبەستو هۆو رێخۆشەکی بۆ هەبوبن.

ئێمە ئێستاکە-ئەگەرچی زۆر بە کورتیش بێ- لە جوغزی ئەو بابەتەدا نین لەبارەی هۆو رێخۆشەکیەکانەوە بدوێین کە زەمینەیان بۆ دەرکەوتنی ئیسلام هەموار کردوە، کە ئاشکرایە ئەو کات جیهان کۆمەڵگەی چاكو راستی تێدا نەمابو، هەروەها لە بارەی ئەو مەبەستانەش نادوێین کە ئیسلامی لە پێناودا هاتوەو پێغەمبەرو یاوەرانی پێشین بۆی تێکۆشاون تا چەسپاندویانەو وەدییانهێناوەو جیهانیش تا رۆژگارێکی درێژ لەبەریدا هەساوەتەوە، هەمو کەس ئەمانەی لەلادا رونەو پێم وایە ئەگەر لێی بدوێم دوبارەیە، لە پێشەکیەکی واشدا کە بەدڵخۆشیەوە بۆ ئەم پەرتوکەی دەنوسم شوێنی ئەم جۆرە بابەتانە نیە، هەڵبەت لەسەر داوای برادەرو ئوستادی بەرێز سەید ئەبولحەسەن عەلی ئەلحەسەنی نەدوی پێشەکیەکە دەنوسم، کە یەکێکە لە بانگخوازە پێشەنگەکانی ئەم سەردەمەی تێیدا دەژین.

---

١ ناگزور: ئاتاج، محتاج.

پێم وایە ئەم پەرتوکە پێویستی بە پێشەکی هیچ پێشەکی نوسێك نیە چونکە دیارە خوێنەران بە چ پێشوازیەکی گەرمو ناوازەوە دەست لەملانی بون، تەنانەت هیچ پەرتوکێکی ئیسلامی کە لەم رۆژگارە دەرچوبێ پێشوازی وا گەرمی لێنەکراوە، بەڵام کە نوسەری بڕواداری بڕواڕاست ئەم داوایەی لێکردوم دیارە لە رێزو تەوازوعی خۆیەتی .

شاهێدی دەدەمو دەڵێم کاتێك چاپی یەکەمی ئەم پەرتوکە دەرچو رۆژێکی نەبرد سەر لەبەریم خوێندەوە، زۆر کەوتە بەردڵم، تەنانەت کە لێبومەوە لە دواهەمین لاپەڕەیدا نوسیم: (هەر موسڵمانێك لە پێناو هێنانەوەی شکۆی ئیسلامدا تێبکۆشێ لەسەری واجبە ئەم پەرتوکە بخوێنێتەوە). هەمو ئەمانە لەو کاتەدا بون کە هێشتا نوسەرم نەدەناسی، بەڵام کاتێك بە ناسینی بەختەوەر بومو چەند جارێکیش دەگەڵیدا دوام ئەوکات زانیم چۆنو بۆچی وا شەیدای پەرتوکەکەی بومە، ئەو کات بۆم دەرکەوت کە سەرچاوەی ئەم کاریگەربونە- وێڕای وەدەرخستنی هەقو تۆژینەوە بە پێزەکانی- بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە نوسەر شارەزاییەکی تەواوی بە ئیسلام هەیە و لە ژیانی خۆشیدا پەیڕەوی لێدەکاتو بە دڵسۆزی بانگەوازی بۆ دەکات .

ئەو ئەفسوسە قوڵو ژانە توندوتیژەی کە ئێمە هەستی پێدەکەین برادەری بەڕێزیشمان: ئەبولحەسەنی نەدوی ئەویش هەستی پێکردوە، خەمە گرانەکەش ئەوەیە کە وڵاتە ئیسلامیەکان لێی خۆش هاتونە لە پاشکۆی هەرە پشتەوەی وڵاتە رۆژئاواییەکاندا بنو وەك ئەوان ئارەزو بکەنو هەر مەسەلەیەکیش بێتە پێش حوکمی ئەوانی تێدا پیادە بکەنو دان بە بەهاو پێودانەکانی ئەواندا بنێن کە بە گوێرەی بنەماکانی خۆیان بڕیاری لەسەر دەدەن، لە ئەنجامی ئەمەدا موسڵمان بە شێوەیەکی گشتی متمانەی بە خۆیو رەگەزو دینو پێودان و بەها بەرزەکانی ون کردوە کە بابو باپیرانی مەردو رەندی زۆری لەسەر سور بون. دەردەکەی ئێمە ئەمەیە کە دەبێ دەرمانی بۆ وەدۆزین، گرفتەکەشمان بگرە سەرجەم گرفتەکانمان هەر لەمەدا خەست دەبنەوە کە لەسەرمان پێویستە لە ئامێزی دینو مێژوو کەلەپوری روحیو ئاوەزیی نەمرمان رێگەچارەی

سەرکەوتویان بۆ دیاربکەین. دانەری ئەم پەرتوکەش (بـە داڕوخـانی موسـڵمانان جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟!!) لە هەمو ئەمانەی روانیوەو خۆشی لـە پێنـاودا ماندو کردوەو هەرچی لە توانایدا هەبوە کەمتەرخەمی تێدا نەکردوە .

لەراسـتیدا گرفتـی ئـەمڕۆی جیهـانی ئیسـلامی لـەوەدا نیـە کـە لـەناو ناموسڵماناندا بانگەواز بەرەو ئیسـلام ناکرێو موسڵمانی نوێ زیاد نابن، بـەڵکو گرفتەکە لەوەدایە کە موسڵمانەکان خۆیان رویان لە ئیسـلام وەرگێڕاوەو پـشتیان لە ژیارو رەوشتو بەها و پێودانەکانی رۆژهەڵات کردوەو بە رۆژئاوا سەرسـامن، بۆیە وامان لێهاتوە تەنها بەناو و نەژادو ژینگەی جـوگرافی موسـڵمان بـێنو لـە ئیـسـلامی راسـتەقینەش کـەنارگیر بـێن، هـەتا وامـان لێهـاتوە لـە تەشـریعو نەریتەکاندا کە خۆمانی پێ بەڕێوە دەبەین ئیسـلام نەناسـینەوە، پێویـست بـەوە ناکا نمونە بێنینەوە چونکە لـە دەسـەڵاتدارو نوێنـەرەکانی وڵاتـانی ئیسـلامیو خاوەن پلەوپایە دینیەکاندا ئاشکرا دیارە، جا میسر دەڵێی یان وڵاتانیتر.

خوا ئیسـلامی کردۆتە دواهەمین پەیامی ئەم جیهانە، بۆیە نابێ چاوەڕێ بـێن پەیوەندیەکیتری ئاسمان بە زەویمان پێ بکرێتەوە تا زەوی لەو شـیرکو گـومڕایی و خراپەکاریانە پاك بکرێتەوە کە خەریکە سەرتاپای جیهان دادەگرنـەوە، نابـێ لـە دوای هاتنی پێغەمبەری ئیسـلام چاوەڕێی پێغەمبەرێکیتر بینو بڵـێین بـە هـۆی پەیامی تازەی ئەم پێغەمبەرەی دادێ خەڵك لە تاریکی نەفامێتی بەرەو رونـاکی ئیـسـلام دەربـاز دەکـرێ، نابـێ چـاوەڕێی قورئـانێکی نـوێ بـێن تـا بەهۆیـەوە مرۆڤایەتی سەرگەردان بەرەو راستەڕێی بەختەوەری رێنوێن بکرێ؛ چونکە خـوای بەخشندەی میهرەبان قورئانێکی وای بۆ هەناردوین کە هەرکەسێك وەدوای کەوێ سەرگەردان نابێ، شەریعەتێکی وای بۆ دابەزاندوین کـە هەرکەسـێك کـاری پـێ بکات بەدبەخت نابێ.

دەبێ کار بۆ ئەوە بکەین متمانەمان بەدین بگەڕێنینەوەو دین ببێتە بنچینەی ژیانمان، بەم جۆرە دەتوانین سەرتاپای جیهان لەم نەفامێتیەی گەمارۆی داوە رزگار بکەین. دەبێ یەکەمجار خۆمان بڕوا بەم دینە بێنین ئەمجا خەڵکی بۆ بانگ بکەین. خەڵکیش ئەوکاتە بڕوا دێنێ کە ئێمە ببین بە پێشەنگێکی چاك .

جیهان —کە خۆشم لە ئەوروپام وەدی کردوە- نوشستی سیاسیی و ئابوری موسڵمانان دەکەنە مەهانەیەکی زەقوزۆپ و دەڵێن ئیسلام شایستەی سەرکرداێەتی موسڵمانەکان نیە چجای جیهان!، کەچی هەرهەمان جیهانی مەسیحی بو کاتی خۆی کە موسڵمانەکان لە لایەنی بڕواو کردەوەدا موسڵمانی راستەقینە بون؛ لە مەسیحایەتی خۆی لەقولۆق ببو، کاتێکیش دەیاندی شمشێری موسڵمانان چتۆ داستانی بێوێنەو سەرکەوتنی گەورە تۆمار دەکات لە دڵەوە پێیان وابو ئەمە بەڵگەیە بۆ راستێتی ئیسلامو موسڵمانەکان چونکە دەیانگوت خوا سەرکەوتن تەنها بە بڕوادارانی هەڵبژاردە دەبەخشێ.(١)

ئەم قسەیەی کە لە سەرەوەدا گوتمان بێ بەڵگەو بێ شاهێدی مێژو نیە، تەنها لەو سۆنگەوە نیە بانگەواز بۆ ئیسلام بکەین، فەرمو ئەوەتانێ نوسەری (الدعوة الی الاسلام) وشە بە وشە دەڵێ :

((وا پێدەچێ رەوشتو ژیانی سەلاحەددین کە پڕ بو لە داستانو پاڵەوانێتی، کاریگەرێکی ئەفسوناوی خستبێتە مێشکی مەسیحیەکانی ئەوکات، تەنانەت کۆمەڵێك سوارچاکی مەسیحی ئەوەندەی پێ سەرسامو کەمەندکێش بون، نەتەوەو دینی مەسیحێتی خۆیان بەجێهێشتو چونە ریزی موسڵمانانەوە. نەسرانیەکان لە ساڵی ١١٨٥ ز سوارچاکێکی ئینگلیزیان دەرکرد کە سوارچاکێکی پەرستگا بو و ناویشی (رۆبەرت سانت ئەلبانس) بو، ئەویش بوە موسڵمانو کچێکی نەوەی سەلاحەددینیشی هێنا .

دوای دوساڵ لەم مێژوە سەلاحەددین غەزای فەلەستینی دەست پێکردو لە شەڕی حوتتیندا شکستێکی گەورەی بەمەسیحیەکان خوارد، گۆی (Guy)ی پادشای بەیتولمەقدیس بە دیل گیرا .

(١) تەماشای پەرتوکی (الدعوة الی الاسلام)ی سێر تۆماس ئارنۆڵدی ئینگلیزی ناودار بکە ل (٧) لە وەرگێڕدراوە عەرەبیەکەی دکتۆر (حسن ابراهیم)و ئەوانیتر .

پاشان بۆ ئێوارەی ڕۆژی شەڕەکە پاشا لەگەڵ شەش لە سوارەکانی بە ویستی ئازادانەی خۆیان ئەوێیان بەجێهێشتو بۆ نێو سەربازگەکەی سەلاحەددین هەڵاتن))[١].

ئەم نمونەیەی کە هێنامانەوە یەك بەڵگەیە لە هەزاران ئەو بەڵگانەی کە پەرتوکە کۆنو تازە مێژووییەکانیان ڕازاندۆتەوە، لەمەوە دەردەکەوێ کە پێشەنگی چاك کاریگەرێکی گەورە دەخاتە ناو دڵودەرونی خەڵکی ئەگەرچی خەڵکێکی ناموسڵمانو دوژمنیش بن، ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێ کە بونی پێشەنگی واچاكو سەرمەشق و فاکتەرێکی گرنگ بوە بۆ فتوحاتو سەرکەوتنی ئیسلامیەکانو ڕێگەی خۆشو هەموار کردوە.

ئیسلام دوێنێکە بە چ ئاڵایەك شەکاوەتەوە ئەمڕۆکەش هەر بە هەمان ئاڵا دەشەکێتەوە، هەڵبەت بە بڕوا بو، بڕوایەك دەگەڵ تەنکایی دڵ تێکەڵ ببێ، بە قوربانیدان بو، قوربانیدان بە خۆشەویستترین ماڵوگیانی لە پێناو ئیسلامدا، بە شانازیکردن بو، شانازی کردن بەو تەشریعو ڕێبیرو نەریتە چاکانەی ئیسلام کە جیهانی پێ ئاسوەدەبێو رادەپەڕێ، بە بانگەواز بو، بانگەواز بەهۆی کردەوەی چاكو وزەی پاك بە شێوەیەك لە هەمو لایەنەکانی ژیان پیادە بکرێو بە فەرمانی ئەو بانگەوازە نەبێ فەرمان نەدرێ.

ئەگەر بمانەوێ سەرلەنوێ سەرکردایەتی مرۆڤایەتی وەرگرینەوە پێویستە بیروباوەڕێکی ڕاستەقینەی ئەوتۆمان لە دڵدا بێ کە لە هەمو ڕەفتارو گوفتارێکدا ڕەنگ بداتەوە، دکتۆر محمد ئیقبال دەڵێ: موسڵمان بۆ ئەوە نەخوڵقاوە تا بە ئاراستەی (با) هەڵبکاتو لەگەڵ ڕەوتی مرۆڤایەتی ڕامالدرێ، بۆ ئەوە خوڵقاوە تا (ئەو) جیهانو کۆمەڵگەو ژیار ئاراستە بکاتو ئیرادەکەی وی مرۆڤایەتی بەڕێوە ببات. چونکە موسڵمان خاوەن پەیامو زانستو بڕوای ڕاستەقینەیە، چونکە موسڵمان بەرپرسی جیهانو ڕەوتو ئاراستەکەیەتی، شوێن پایەی موسڵمان لاساکردنەوەو ریزی دواوە نیە، بەڵکو بریتیە لە سەرکردایەتیو

---

(١) پەرتوکی ناوبراو ل (٨٢-٨٣).

پێشەوایەتیو رێبەرایەتیو رێنماییکردنو فەرمانو نەهیکردن. جا ئەگەر رۆژگار خۆی لێ گۆڕیو کۆمەڵگەش سەرپێچیلێکردو لە راستە شەقام لایدا؛ بۆی نیە چۆکی بشکێو دەستەو ئەژنۆ دابنیشێو رەوشی رۆژگار بلاوێنێتەوە، بەڵکو دەبێ شۆڕش بەرپا بکاتو رەوشەکە بگۆڕێ، لە ململانێو شەڕی خۆی بەردەوام بێ تا خوا یەکلای دەکاتەوە. دەستەوئەژنۆ دانیشتنو ملکەچبون بۆ رەوشی بێگارو بارودۆخی ستەمکارانەو مەهانە گرتن بە قەزاوقەدەر تەنها لە زەبونو گرگنان[1] دەوەشێتەوە، بەلاّم برواداری بەهێز ئەو کەسەیە کە خۆی دەبێتە قەزای زاڵو قەدەری رەتنەکراوەی خوای بالاّدەست[2].

بەراستی نازانم لەم وتەیەدا -کە وا دەزانم زۆر رۆیشتم- لە بارەی ئەم پەرتوکەوە چ بلێم کە هەروەکو لە سەرەتاشدا گوتم گەرەکی بە پێشەکی نیە .

من -خوا دەزانێ- وەبیرم نایێ چ لە پەرتوکە کۆنەکان چ لە تازەکان پەرتوکێکم خوێندبێتەوە وەك ئەم پەرتوکە هێندە شتی چاكو بەسودی لەخۆ گرتبێ، هیچ پەرتوکێك وەك ئەم پەرتوکە دەرمانو رێگەچارەی دانەناوە کە ساڵەهایە پێوەی دەناڵێنن، هیچ نوسەرێك وەك نوسەری ئەم پەرتوکە وا بە ناخی روحی ئیسلام شۆڕ نەبۆتەوە، بەجۆرەش دڵسۆزی نەنواندوە بۆ بانگەوازی دینی ئیسلامو کەسیش وەك ئەو هەمو توانایەکی لەم پێناوەدا تەرخان نەکردوە.

کەواتە پێویستە لەم پەرتوکە بەهرەمەندبین، سود لەو ئامرازو کەرستانە وەربگرین کە نوسەری بەرێز ئاماژەیان بۆ دەکات، تا بەڵکو هەڵسینەوەو ئاواتی دێرینو شکۆی ژینو رێزانەی ژیانەوە وەدەست بێنن. بێگۆمان ئەمەش بەوە دەکرێ کە رەوشو رێوشوێنو ئامانجەکانی خوێندنی لای خۆمان بگۆڕینو بیانکەینە پەروەردەیەکی ئەوتۆ کە بنچینەو بنەماکانی لەسەر ئیسلامێکی راستو دروست بێ، خوێندنەکەشمان ئەو ئامانجە بپێکێ تا لە جیهانی ئیسلامیدا راپەڕین بەرپا بکەینو لە جیهانیشدا بگەینەوە شوێنپایەی دیارو بەرچاوی

---

١ گرگن: قەزەم.

(٢) لە توێژینەوەی ئەبولحەسەنی نەدوی وەگیراوە بەناوی (شاعیری ئیسلام، محمد ئیقبال) ل(٦٦-٦٨).

خۆمان، بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکەش ئامرازو کەرستەی دروستو سەرکەوتو دروست بکەین .

ئەم راپەرینە ئیسلامیە -بەئیزنی خوا- کاتێک دێتە ئاراوە کە نەتەوەی ئیسلام لە خەوەکەی رابێو لە گلانەکەی هەڵسێتەوە، منداڵە خوێندکارەکانی ئەمڕۆ بکاتە پیاوی موسڵمانی دوارۆژ، پیاوی وایان لێدروست بکات بتوانن بە چاکی کاروباری نەتەوە راپەڕێنن، پیاوی ئەمینو ئازای وایان لێ پەروەردە بکات کە جگە لەخەمی هێنانەوەی شکۆی ئیسلامو جیهانی ئیسلامی هیچ خەمێکیتریان نەبێ.

بێگومان ئامرازی وا سەرکەوتو کە بتوانێ ئەم ئامانجە بەرزە لە خوێندنو فێرکردندا بێنێتە دی گەلێ زۆرو جۆراوجۆرن ئەگەر ئێمە مەبەستمان بێ، بەڵام لێرەدا پێم باشە وتەکەم بە بڕگەیەك[1] لە وتەکانی ئوستاد ئەبولحەسەنی نەدوی کۆتایی پێبێنم کە دەڵێ:

((قورئانی پیرۆزو رێژینی[2] محمد ﷺ دو هێزی مەزنو گەورەن، دەتوانن گڕی بڕواو حەماسەتی جیهادی ئیسلامی هەڵگیرسێنن، هەمیشە باسی شۆڕشی مەزن دەکەن کە بەسەر سەردەمی نەفامێتیدا بکرێ، نەتەوەی دەستەپاچەو خەمساردو ریسواو خەواڵو هان دەدەنو دەیکەن بە نەتەوەیەکی زندوو جوامێرو خوێنگەرمو ناڕازی لە نەفامیو دژ بە سیستەمی زۆرداری. دەردی ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامی ئەوەیە کە بە ژیانی دنیا خۆشنودو ئارخەیانن[3]، خۆیان دەگەڵ رەوشی گەندەڵ گونجاندوەو زیاد لە پێویست بێدەنگنو بەم شێوە ژینە کامەرانن، بە گەندەڵیو خراپەکاری نیگەران نابن، بە لاڕێبونو بێدینی هەراسان نابن، لەمەڕ بەدکاری موگرژ نابن، خولیای ورگی تێرو بەرگی جوانن، بەڵام قورئانو رێژینی پێغەمبەرﷺ ئەگەر رێگەیان هەبێ بچنە ناو دڵ بار بە جۆرێکیتر دەگۆڕێ، ململانێ پەیدا دەبێ، ململانێی نێوان بڕواو دوڕویی، ململانێی نێوان

---

(١) کۆبەندی پێنجەم -خۆسازدانی روحی . -وەرگێڕ-
٢ رسژین: رێوشوێنی ژینی رابردە، السیرة.
٣ ئارخەیان: دڵنیا، مطمئن.

ئاوەر[1] و دودڵی، ململانێی نێوان ژیانی دوارۆژی نەبڕاوەو ژینی دنیای بڕاوە، ململانێی نێوان ئاسودەیی دڵو هەسانەوەی جەستەی لە گڵ، ململانێی شەهیدبونو مەرگی سەرشۆڕی، ململانێیەك كە گشت پێغەمبەرەكان بەرپایان كردوە، بێگومان بەبێ بونی ئەم ململانێیە هەرگیز جیهان رزگار نابێ، تەنها ئەو كاتەش سەرتاپای جیهانی ئیسلامیو سەرجەم خێزانو ولاتە ئیسلامیەكان دەبوژێنەوە كە ئەم ململانێیە بەرپا بێ: ﴿ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى . وَرَبَطْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لَنْ نَدْعُوَ مِنْ دُونِهِ إِلَهًا لَقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا ﴾ الكهف ١٣-١٤.

ئیتر ئەوكات شنەبای بەهەشتو سروەكانی سەدەی یەكەم هەڵدەكەنەوە، ئەوكات جیهانێكی نوێ بۆ ئیسلام لە دایك دەبێتەوە كە بە هیچ جۆرێك بە جیهانە كۆنە داڕوخاوەكەی نەچێتەوە)).

لەم وشانەوە كە هەر لەم پەرتوكەوە خواستومانە بۆمان دەردەكەوێ كە روحی هومێدێكی گەورە باڵی بەسەر دانەر كێشاوە ! خوا خۆیو ئاسەوارەكانی بكاتە مایەی سودێكی زۆر، خوا پاداشتی چاكەكانی بداتەوە.

**محمد یوسف موسا**

---

١ ئاوەر: بڕوای بێشك، یقین

# پێشەکیەك

## به پێنوسی نوسەری ئیسلامی ئوستاد سەید قوتب

ئەمڕۆ موسڵمانان خۆ به ئیسلام هەڵدەدەنەوە کەچی لە حەقیقەتەکەشی نەگەیشتون، پتر به چاولێکەری دایكو باوکان وەریدەگرن تا بە ناسین، بۆیە گەلێك پێویستیان به کەسێکه سەرلەنوێ بڕوا بەخۆبونو لە رابردو ڕادیتن و هیوابون به دوارۆژیان بۆ بگەڕێنێتەوە.. گەلێك پێویستیان به کەسێکه بڕوابون بەم دینەیان بۆ بڕوێنێتەوە .

ئەم پەرتوکەی بەردەستم : ((بە داڕوخانی موسڵمانان جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟!!)) کە بەڕێز (سەید ئەبولحەسەن عەلی ئەلحەسەنی نەدوی) نوسیویەتی یەکێکە لە چاکترین ئەو پەرتوکە کۆنو تازانەی لەم بارەوە نوسرابنو من خوێندبمەوە.

ئیسلام بیروباوەڕی گەردەنبەرزییە، یەکێك لە تایبەتمەندە هەرە تایبەتیەکانی ئەوەیە کە هەستی گەردەنبەرزی لە روحی بڕواداران دەڕوێنێ بێئەوەی فیزبەرزیو خۆ بەزلزانینی لەگەڵدا بێ، روحی متمانە بەخۆکردنی پێدەبەخشێ بێئەوەی کەشوفشی لەگەڵدا بێ، هەستی هەدادانی[1] دەخاتە دڵ بێئەوەی خەمساردی لەگەڵدا بێ، وا لە موسڵمانان دەکات لە ئاست مرۆڤایەتی سەرجەم جیهاندا هەست بە بەرپرسێتیو سەرپەرشتایەتی بکەن، هەست بکەن ئەرکی ڕێنوێنیکردنیان پێسپێردراوە... ڕێنوێنکردنی گەلانی گومڕای سەرزەوی بەرەو ڕاستەڕێی ئاینی ڕاست، ڕێنوێنیکردنی مرۆڤایەتی لە تاریکستانەوە بەرەو روناکی ئیسلام: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ : ئێوە چاکترین نەتەوەی نێو خەڵکن چونکە فەرمان بە چاکە دەکەنو ڕێگە لە خراپە دەگرنو بڕوا بە خودا دێنن.﴾ العمران: ١١٠

---

١ هەدادان: ئاسودەبون.

وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾ئێوەمان کردۆتە نەتەوەیەکی نێوەڕاستی تا ببن بە شاهیدی سەرخەڵك‌و پێغەمبەریش ببێتە شاهیدی سەر ئێوە﴾ البقرة: ١٤٣.

ئەم پەرتوکەی وا لەبەر دەستم دایە گشت ئەم واتایانە لە دەرونی خوێنەر دەوروژێنێ‌و هەمو تایبەتمەندیەکان دەخاتە ناخی، لەمەشدا تەنها پەنا وەبەر وروژاندنی ویژدان‌و فیزو دەماری ئاینی نابات، بەڵکو هەقیقەتە بابەتیەکان دەکاتە کەرستەو دەیخاتە بەر دیدو هەست‌و ئاوەزو ویژدانەوە، روداوە مێژویی‌و ئێستاییەکان بەبێ زیادو کەم دەخاتە ڕوو ستەمیان لێناکات، لە هەمو ئەو دۆزو کێشانەی باسیشیان دەکات سەرلەبەریان دەباتەوە بەر دادگای هەق‌و واقیع‌و لۆژیك‌و ویژدانەوە، لە هیچ کێشەیەکدا ئەگەر بەلای ئەودا شکابێتەوە یان لە دژی ئەو، نە لە سەرەتاو نە لە ئەنجامدا، فڕوفێڵ‌و ستەمی نەکردوە.. ئەمەیان تازیاری[1] یەکەمی ئەم پەرتوکەیە.

ئەم پەرتوکە لەسەرەتادا وێنەیەکی بچوکی خێرا-بەڵام رون‌و ئاشکرا-بۆ جیهان دەکێشێ بەر لەوەی گزنگی ئیسلامی بەرکەوێ .. وێنەی گشت جیهان، لە رۆژهەڵات‌و رۆژئاواوە تا باکورو باشور، لە هیندستان‌و چینەوە تا فارس‌و رۆمستان.. وێنەی کۆمەڵگەو ویژدانی ئەو کۆمەڵانە دەکێشێ کە خاوەن پەیامێکی ئاسمانی بون وەکو جولەکەو دیانەکان یان بتپەرست بون وەك هیندۆکی‌و بوذایی‌و زەردەشتیەکان..

وێنەیەك دەکێشێ کە سەرجەم جیهان بگرێتە خۆی‌و هەرهەموی زۆر بەجوانی وەسف بکات، بێئەوەی ستەم بکات یان خۆسەپێنی بنوێنێ، بەڵکو گەلەکۆمەکی بە تۆژەرو مێژوناسانی کۆن‌و نوێی ناموسڵمانیش دەکات، هەڵبەت ئەوانیش کە باسی رۆڵی پێشانی ئیسلامیان کردوە مەبەستی خۆیان هەبوە.

رەوشی جیهان رادەنوێنێ.. کە روحی نەفامێتی بەسەردا زاڵ ببو و هەڵبزڕکابو، ویژدانی بۆگەن ببو، پێودانی بەهاداری‌و شیرازەی خوڕەوشتی شپرزە

---

١ تازیاری: إمتیاز.

ببو، ستەمو کۆیلایەتی بە هەڕمێن[١] بو، لافاوی خۆشگوزەرانی لـە رادەبـەدەرو کولەمەرگی ناگزورانە شەپۆلی هەڵدەکردو پـەردەی رەشـی بێبڕوایـیو گـومڕایی سەرتاپای جیهانی داپۆشـیبو، ئەگەرچـی ئاینـە ئاسمانیـەکانیش لـە ئـارادابون، ئەوانیش دەستیان تێوەردرابـو و تـین و تاویـان ون کردبـو، دەسـەڵاتیات بەسـەر دەرونان دانەدەشکا، وەك جەستەی بێگیانیان لێهاتبوو کە نـە روح و نـە ژینیـان تێدا نەبو، بەتایبەتی ئاینی مەسیحی.

دانەر پاش ئەوەی وێنەی نەفامێتی دەکێشـێ، رۆڵـی ئیسـلام رادەنوێنـێ و باسی ئەوە دەکات کە چۆن ئیسـلام توانیویەتی روحی مرۆڤایەتی لـە ئەفـسانەو ئەندێشەی پروپوچ، لە بەنـدەگیو کۆیلایـەتی، لـە خراپـەکاریو بۆگـەنبون، لـە چروکیو شپرزەبون رزگار بکات، چـۆن توانیویـەتی کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتی لـە ستەمو دەستدرێژی، لە داڕمانو لێکترازان، لە جیاوازی چینایەتی، لـە زۆرداری خونکاران[٢]، لە ریسواکاری کاهینان دەرباز بکات، چۆن توانیویتی جیهان لەسەر بناغـەی داوێنپـاکیو پاکـژی و ئیجابیـەتو بنیاتنـانو ئـازادیو تـازەخوازیو زانیـاریو دڵنیـاییو متمانـە بـە یـەککردنوبڕواداریو دادگـەریو ریـزداریو کردوکۆشی بێوچان لە پێنـاو پەرەپێـدانو بەرەوپێـشەوەبردنی ژیـانو بەخـشینی مافی مافداران دابمەزرێنێ.

ئیسـلام لە کاتێکدا توانیویەتی ئەو رۆڵە بگێـڕێ کـە لـە گـشت شـوێنێکدا سەرکردایەتی لە دەست خۆی بوە، ئیسـلام بیروباوەڕی گەردەنبەرزیە، رێوشـوێنی سەرکردەبونە، پێڕەوێکی سەرمەشقە نەك شوێنکەوتنە، بۆیە ئەگەر سەرکردایەتی لەدەست خۆی نەبێ ناتوانێ رۆڵ بگێڕێ.

پاشان باسی ئەو رۆژگارە دەکـات کـە موسـڵمانان رو لـە نـشێوی دەکـەنو دادەڕوخێنو واز لە سەرکردایەتیو سەرپەرشـتایەتیو بەرپرسـێتیە فرەوانەکـەیان دێننو جڵەو لە دەست ئیسـلام بەر دەبێ.

---

١ هەڕمێن: برەو.

٢ خونکار: قەڵەمڕەو، دەسەڵاتدار.

لێرەدا نوسەر باسی هۆیە روحیو ماددیەکانی ئەو داڕوخانە دەکات و ئەو ناخۆشیو کارەساتە دڵتەزێنانە دەخاتە رو کە موسڵمانان بەهۆی وازهێنانیان لە رێبازی دینەکەیان دوچاری بون. باسی مەرگەساتو رەوشی ناهەمواری جیهان دەکات کە بە هۆی ونکردنی ئەم سەرکردایەتیە سەرراستەو گەڕانەوەی بۆ نەفامێتی جارانی توشی هاتبو. ئەو هێڵە سامناکەش دەکێشێ کە مرۆڤایەتی پێیدا سەرەوخون دەبوەوەو هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا چەندین ئاسۆی گەشوگوشادی زانستی بۆ والاّ دەبو... بە وردبونەوەو تێوەڕامانەوە هێڵە سامناکەکە دەکێشێ نەك بە رستەی ئاگراویو دەربڕینی بە شاخو باڵ. چونکە هەقیقەتە واقیعیەکان وەك نوسەر راینواندوە پێویستیان بە باقوبریقو ئارایشدان نیە.

لە میانەی رانواندنی ئەو باس وخواسانەدا خوێنەر هەست بە ئەوپەڕی زەرورەتی گۆڕانی سەرکردەی مرۆڤایەتی دەکات.. گۆڕانی لەدەست نەزانیەوە بۆ دەست زانینو زانیاری . خوێنەر هەست بە زەرورەتی وجودی ئەم سەرکردایەتیەی ئیسلامو هەست بە هەمو ئەو مەرگەساتو کارەساتانەش دەکات کە بەسەر موسڵمانانو بەسەر رابردوو ئێستاو داهاتوی نزیكو دوری مرۆڤایەتی داهاتوەو دادی .

کاریگەرێکی تایبەتیش دەخاتە دەرونی موسڵمانو وای لێدەکات ئاخ بۆ رابردوی فەوتاو هەڵکێشێ و، شانازی بە داهێنانەکان بکات و، لە سەرکردایەتی لەدەستچوش رابمێنێ.

رەنگە جێی سەرنج بێ کە نوسەر بە وشەی (نەفامێتی) گوزارشتی لەو نسکۆیە کردوە کە بە هۆی نەمانی سەرکردایەتی ئیسلامیەوە توشی سەرجەم مرۆڤایەتی بوە.

بەڕاستی نوسەر زۆرچاك لەوە گەیشتوە کە جیاوازی بنەڕەتی لە نێوان روحی ئیسلامو روحی ئەو ماددەپەرستیەی بەر لە ئیسلامو دوای نەمانی سەرکردایەتی ئیسلامیش بریتیە لە (نەفامێتی).. چونکە نەفامێتی بریتی نیە رۆژگارێکی دیاریکراو، بەڵکو شەقڵێکی روحیو ئاوەزیی دیاریکراوە، کاتێکیش

ئەو شەقڵە دەردەکەوێ کە ئەگەر بەها بنچینەییەکانی ژیانی مرۆڤایەتی-ئەوانەی خوا مەبەستیەتی- لە ئارادا نەمێنێ و بەهای تری غەوارەی ئارەزوئامێز جێیان بگرنەوە. مرۆڤایەتی لە ئەمڕۆی ئەوپەڕی پێشکەوتنیدا بە هەمان دەردی دوێنێی ئەوپەڕی دڕندەیی دەناڵێنێ.

پەیامی ئیسلام بانگەوازە بۆ لای خواو پێغەمبەرو بڕوابون بە ڕۆژی دوایی، خەڵاتەکەشی رزگاربونە لە تاریکستانیەوە بۆ ڕوناکی، لە بەندەپەرستیەوە بۆ خواپەرستی، لە تەنگوناخۆشی دنیاوە بۆ گەشوگوشادی ژیان، لە ستەمو زەبروزەنگی دینانی ناڕەواوە بۆ نێو دادو رەوای ئیسلام .. ئەمڕۆ خەڵك تازیارێتیو چاکێتی ئیسلامیان بۆ رون بۆتەوەو لە هەمو سەردەمەکانیتر هاسانتر لێی تێدەگەن، نەفامێتی ریسواو زەبون بوە، خراپیەکانی وەدەرکەوتوە، خەڵك گەلێکی لێ بێزار و هەراسانن. رۆژ رۆژی گوازرانەوەی سەرکردایەتیە لە دەستی نەفامێتیەوە بۆ دەستی ئیسلام، بەو مەرجەی جیهانی ئیسلامی بێدار بێتەوەو بە دڵسۆزیو ورەبەرزیو خوێنگەرمیەوە پەیامەکەی دەئامێز بگرێ و بەو جۆرە دەستی پێوە بگرن کە نوسەری بەڕێز لە ئاخرونۆخری پەرتوکەکەیدا دەڵێ: ((وەك تاقە پەیامێك کە هەر ئەو دەتوانێ جیهان لە داڕمانو هەڵوەشانەوە رزگار بکات)).

لە کۆتاییدا دەڵێم ئاکارێکی هەرە دیاری ئەم پەرتوکە ئەوەیە کە فامێکی قوڵی هەیەو درکی بە هەمو لایەنێکی روحی ئیسلام کردوە، بۆیە دەڵێم ئەم پەرتوکە وەنەبێ تەنها وەك تۆژینەوەیەکی ئاینیو کۆمەڵایەتی سەرمەشق بێ بەڵکو بۆ نوسینەوەی مێژوێکی ئیسلامیانەش سەرمەشقە.

ئەوروپاییەکان لە گۆشەنیگای رۆژئاوایی و بە کاریگەری کلتورو فەلسەفەی ماددەپەرستی و بەفیزودەماری رۆژئاوایی و بە دەمارگیری ئاینییەوە مێژوی جیهانیان نوسیوەتەوە -جا هەستیان پێکردبێ یان نا-، سا لەبەر ئەوەی لە گەلێك هۆکارو پێودانیتری ئەم ژیانە بێئاگابونەو لەبەر فیزودەماریش هەر وایان

زانیوە ئەوروپا جەرگەو هەلێری[1] روداوانە، یان ئەگەر هۆکارێك سەرچاوەکەی لە ئەوروپاوە نەبوبێ فەرامۆشیان کردوە یان بە سوکیان گرتوە، بۆیە لە نوسینەوەی مێژودا گەلێ هەڵەیان کردوەو لە گەلێك شوێندا هەرزەلیون[2]، کە هەڵبەت بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو هۆکارو پێودانگانەی ئەوان ئاوڕیان لێ نەداوەتەوە نوسینەوەی مێژو راست دەرناچێ‌و شرۆڤەو دەرەنجامکاری نادروستی بۆ بڕیار دەدرێ.

ئێمەش وا راهاتوین وەك هەر شتێکیتر مێژوی پڕ هەڵەش زوبەزو و بێ یەكودو لەدەست ئەوروپاوە وەرگرین. هەڵەکان هەڵەی مەنهەجین چونکە گەلێك هۆکارو پێودان فەرامۆش کراون، هەڵەی تەسەوورین چونکە لە یەك گۆشەوە سەیری مرۆڤایەتی کراوە، هەڵەی دەرەنجامکارین کە ئەویش دوابەدوای هەڵە مەنهەجی‌و تەسەووریەکان پەیدا دەبن.

ئەم پەرتوکەی بەردەستم سەرمەشقێکە بۆ چۆنیەتی نوسینەوەی مێژو، چونکە بۆ هەمو کاروبارو هۆکارو پێودانەکان دەڕوانێ.. رەنگە خوێنەر چاوەڕێ نەبوبێ پیاوێکی موسڵمانی هیوادار بە هێزی روحی ئیسلامی‌و خوێنگەرم بۆ گێڕانەوەی سەرکردایەتی جیهانی بۆ ئیسلام باسی زەمینەی سەرکردایەتی و باسی (خۆسازدانی روحی)و (خۆسازدانی پیشەسازی‌و جەنگی)و (رێکخستنی تازەی زانستی)و (سەربەخۆبونی لایەنی بازرگانی‌و دارایی) بکات .

هەڵبەت ئەم جۆرە نوسینە لە هەستێکی تێکهەڵکێشەوە دەپشکوێ کە هەست بە سەرجەم بنەماکانی ژیانی مرۆڤایەتی بکات، نوسەر بەم هەستەوە بابەتە مێژوییەکانی رانواندوەو ئامۆژگاری پێشکەش بە نەتەوەی ئیسلام کردوە. لەبەر ئەوە ئەم پەرتوکە دەبێتە سەرمەشقێك بۆ نوسینەوەی مێژو، کە دەبێ موسڵمانانیش بەم نەشم‌و شێوازەوە بێنەوەی کاریگەری رێوشوێنی ئەوروپایانەیان لەسەربێ مێژو بنوسنەوە، چونکە رێوشوێنی ئەوروپایی ئەو جۆرە تێکهەڵکێشی‌و رەواکاری‌و لێکۆڵینەوەیەی تێدا نیە.

---

١ هەلێر: چەق.

٢ هەرزەلین: رەتبردن.

گەلێك بەوەش دڵخۆشم کە منیش وا بەهەمان جۆرە هەستەوە لەبارەی ئەم پەرتوکەوە دەدوێم‌و ئەم دیاردەیە تۆمار دەکەم . بەم دەرفەتەش خۆشبەختم کە بۆم رەخساوە ئەم پەرتوکە بە زمانی عەرەبی بخوێنمەوە... ئەوزمانەی نوسەر پەرتوکەکەی پێ نوسیوەو بۆ دوەم جار وا لە میسر چاپی دەکاتەوە: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَنْ كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴾ ق :٣٧

**سەید قوتب**

## وێنەیەکی وەسفی:

# ئەبولحەسەنی برام

**بەپێنوسی بەڕێز**
**دکتۆر ئەحمەد شەرباصی**

زستانی ساڵی (١٩٥١ز) لە (خانەی لاوانی موسڵمانان) لـە قـاهیرە لـە دوای موحازەرەیەك لە موحازەرە سێشـەممەیەکانمدا بـۆ یەکـەمجار بـرای خۆشەویـستم ئەبولحەسەنم دیت. بەوپەڕی ڕێزو بە تەوازوعێکی زۆرەوە هاتە لامو داوای لێکردم شەوێك لە شەوانی سێشەممەی بۆ بڕەخسێنم تا لەبارەی (جیهان لەبەردەم هـەردی فرەڕێبوندا[1]) موحازەرەیەك پێشکەش بە خەڵك بکات. پیـاوێکی لاوازو ئێـسك باریكو ردێن بۆڕ بو بەرگێکی سوكو هەرزانی دەبـەردا بـو، ڕوانینـەکانی قـوڵو تیژن، دەنگێکی باریکی دڵڕفێنی هەبو، بەڵام کەمێك گرێتـی تێـدا بـو، پاشـان زانیم کاتێ کە زۆر ماندو دەبێ دەنگەکەی ئاوەها گڕ دەبێ، دوای ئـەو یەکـەمین دیدارە خێرایەمان پتر بە یەکدی ئاشنا بوینو پەیوەندی برایەتیو خۆشەویستیمان لە نێواندا پتەوتر بو. ئەوەی وا لێرەشدا دەینوسم لە ڕێـی زانیاریـەکانی خۆیـەتی کـە پێـشتر پێـی ڕاگەیاندومـە، ئـەم بـەڕێزە زانایـەکی ئیمانـدارو بـانگخوازو خەمخۆرێکی ئیسـلامیە، نـاوی سـەید ئەبولحەسـەن عەلـی ئەلحەسـەنی هینـدی نەدویە. ڕەچەڵەکی دەگەڕێتـەوە سـەر حەسـەنی کـوڕی عەلـی -ڕەزای خوایـان لێبێ-. باوکی بەڕێزو فرەزانیشی نـاوی عەبدولحـەی کـوڕی فـەخرەددینی کـوڕی عەبدولعەلییە، نەژادەکەی دەگەڕێتەوە سەر (عبدالله الأشتر)ی کوڕی موحەممەدی (ذی النفس الزکیة)ی کوڕی (عبدالله المحض)ی کـوڕی (الحسن المثـنی)ی کـوڕی (الحسـن السـبط)ی کوڕی عەلـی کـوڕی ئـەباتالیب. باوکـە بەڕێزەکـەیخاوەنی چەندین کتێبانە کە هەنـدێکیان چـاپکراونو هەندێکیتریـشیان دەسنوسـن و بـە

---

١ هەردی فرەڕێ: مفترق الطریق.

پارێزراوی هەڵگیراون، (نزهة الخواطر) ناودارترین کتێبیەتی کە لە هەشت بەرگ پێکهاتوە[١]، لە ساڵی ١٣٤١ك مردوە.

سەید ئەبولحەسەن لە یەك لە بەڕێوەبەرایەتیەکانی هیندستان کە پێی دەڵێن (رائی بریلی) لەدایك بوە، کە نزیکەی حەفتا کیلۆمەتر لە (لوکنهو) دورە. لەدایکبونەکەی لە گوندی (تەکیە) لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی ١٣٣٢ی کۆچیدا بوە. خودا دەوام بە عومری بداو بیکاتە مایەی سودو بەهرە گەیاندن بە ئیسلامو موسڵمانان. ئەبولحەسەنی برام هەرچەندە بۆ چەند سەدەیەکە لە هیندستان دەژینو بە هیندی قسان دەکات بەڵام بنەماڵەکەی لە بنەڕەتەوە عارەبنو تا ئەمڕۆکەش رەچەڵەكو سەرجەلەی خۆیان پاراستوە. پەیڕەو لە تەوحیدێکی پاكو لە سوننەت دەکەنو خۆیان لە بیدعەکاری دەپارێزنو بانگبەرایەتی بۆ خودا دەکەنو جیهادیش لە پێناو خوادا بەرپا دەکەن. سەید ئەبولحەسەن برایەکی لەخۆ گەورەتری هەیە بەناوی دکتۆر سەید عەبدولعەلی عەبدولحەی[٢]؛ کە پزیشکەو لە نەدوەی زانایانو لە پەیمانگەی (دیوبند) هەروەها لە زانکۆی (لوکنهو)ش بە پلەی باڵا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. بەمجۆرە هەردو رۆشنبیری ئاینیو رۆشنبیریی سەردەمی لەخۆدا کۆکردۆتەوە. دەورێکی کاریگەریشی لە پەروەردەکردنی ئاینیو رۆشنبیرانەی ئەبولحەسەنی برای گێڕاوە، کە باوکی مرد ئەو جێی دەگرێتەوەو نەدوەی زانایان بەڕێوە دەبات. هەروەها وەك باوکێکی بەسۆز چاودێری ئەبولحەسەنی برا بچوکی کردوەو ئاگای لێبوە کە ئەوکات هێتیم بوەو تەمەنی نۆ ساڵ بوە.

سەید ئەبولحەسەن لەماڵەوە قورئان فێربوەو دایکی یارمەتیداوە کە دایکیشی لە ژنە خانەدانو بە حورمەتو چاکەکانەو قورئانی سەرلەبەر لەبەرکردوە، بابەتان

---

(١) ئەم کتێبە لە (دائرة المعارف)ی حەیدەر ئاباد حەفت بەرگی لێ‌هاتۆتە چاپ. بەرگی هەشتەمیشی لەژێر چاپدایە. ئەم پەرتوکە نزیکەی ژینامەی پێنج هەزار ناوداری هیندستانی تێدا نوسراوە. دانەریش پەرتوکی (الثقافة الاسلامية في الهند)ی بەچاپ گەیشتوە کە کۆڕی زانیاری عارەبی لە دیمەشق بە چاپی گەیاندوە.

(٢) لە (٢١/ ذی القعدة / ١٣٨٠ ك - ٧ / مایۆ / ١٩٦١ز) مردوە .

دەنوســـیو پــەرتوکان دادەنـــیو شــیعرانیش دەڵــێ[(١)]، ئەبولحەســەن هــەروەکو ڕۆڵەکانیتری هیندستان هــەردو زمــانی ئــوردیو فارســی فێربــوە، دوای ئــەوەی تەمەنی گەیشتۆتە دوازدە ســاڵ دەســتی بــە فێربــونی هــەردو زمــانی عــارەبیو ئینگلیزی کردوە، عارەبیەکەی لەسەر دەستی شێخ خــەلیلی کــوڕی موحەممــەدی یەمانی فێربوە[(٢)] و دو ساڵی ڕەبەقیشی بۆ خوێندنی ئــەدەبی عــەرەبی تــەرخان کردوە، زۆر پەرتوکی ئەدەبی خوێندۆتەوە. بە پێچەوانەی بارودۆخی ئــەو وەختــی هیندستان تەواو هۆگری ئەدەبی عەرەبی ببو و لەگەڵیــدا هەڵیــدەکرد. پــەرتوکی گەلێك لە نوسەرە قەڵەم ڕەنگینو هەڵکەوتوە کــۆنو نوێیەکانیــشی خوێندۆتــەوەو سەرچاوە کۆنەکانی ئەدەبی عەرەبیشی زۆر موتاڵا کردوە .

گرنگیەکی تایبەتیشی بەم چوار پەرتوکە داوەو تەواو خۆی بۆ تەرخان کــردوە: کەلیلەو دیمنــەی ئیبنولموقەففــەع، (نهــج البلاغــة)ی شـــریف الرضـــی، (دلائــل الاعجاز)ی جورجانی، (الحماسة)ی ئەبی تەمام. پاشان چوەتە زانکۆی لوکنهو کــە زانستە شارستانیەکانی تێدا بە زمانی ئینگلیزی دەخوێندریو بەشێکی تایبــەت بە زمانی عارەبیشی تێدایە. کــە ئەبولحەســەن چــوە زانکــۆ تەمــەنی لــە گــشت خوێندکارەکان بــچوکتر بــو. لەســەرەتادا وانــەکانی ڕێزمــانی عــارەبی تــەنگیان پێهەڵچنیو کەمێك وەپاش کەوت بەڵام پاشان هەر بە پلەی بــاڵا ســەردەکەوت.

---

(١) چەند پەرتوکێکی بەچاپ گەیشتوەو بڵاوکراونەتەوە، هەروەها کۆمــەڵێك شیعریــشی بــۆ بــڵاو کراوەتەوە کە هەموی موناجاتی خوداو نــزاو پاڕانــەوەو مــەدحی پێغەمبــەرە ﷺ، خــەڵکیش بەدڵیان بوە. لە (٦ / جەمادی ئاخیری ١٣٨٨ ك - ٣١ / ئۆگەستی / ١٩٦٨ ز) کۆچی دوایــی کردوە.

(٢) ئەوەی فەرمودە ناسی پایەدار شێخ حوسێنی کوڕی موحسینی ئەنساری یەمانی بوە کــە کــاتی خۆی بنەوبارگەی لە (بهوفالــی) هیندستان خــستبو. نەژادی ئەو بنەماڵەیــە لــە (الحدیــدة)یــە. بەهرەیەکی ڕەگاژۆی لە گوتنەوەی زمــانو ئەدەبــدا هــەبوەو چــێژێکی ڕەسەنیــشی لــە زمــانی عارەبیدا هەبوە. لە کەراتشی لە ( ٩ / جــەمادی یەکــەمی ١٣٨٦ی کۆچــیدا) کۆچــی دوایــی کردوە.

پاشان دیراسە ئەدەبیەکەی لەلای دکتۆر شێخ (تقي الدين الهلالي المراكشي)[1] تەواو کرد. کە ئەوکات لە نەدوەی زانایاندا سەرۆکی بەشی گوتنەوەی ئەدەبی عارەبی بو. نەدوەش مەکۆیەکە سەرپەرشتی (دارالعلوم)ی ئەوێندەر دەکات. پاشان بۆ ماوەی دو سالان لە نەدوەدا دەبێتە ئەندامو فەرمودەناسی تێدا دەلێتەوە. لەم بارەوە سودێکی فرەی لە شێخ حەیدەر حەسەن خان[2] وەرگرت.چەند مانگێکیش لە (دارالعلوم)ی (دیوبند) مایەوە، لەوێدا لە وانەکانی زانای گەورەی موجاهید شێخ حەسەن ئەحمەد لەدینیدا[3] ئامادە دەبو، کە لەبارەی فەرمودەوە دەدوا.

ئەبولحەسەن یەکەمین هەولی لە نوسینی ئەدەبیدا نوسراوێك بو لەبارەی سەربردەو ژینامەی سەیدی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی عیرفانی شەهید کە پێشەواو بانگخوازێکی ڕێگای یەکخواپەرستیو سوننەتپەروەریو جیهادی ڕێی خوا بو. لەسەر ئاماژەی براگەورەکەی (دکتۆر عەبدولعەلی) بابەتەکەی نوسیو دکتۆر (تقي الدين الهلالي)ش بۆ زانای فرەزانو سەید رەشید رەزای خاوەن گۆڤاری (المنار)ی روسپی هەناردو ئەویش لە گۆڤارەکەیدا بلاوی کردەوە. پاشان لە بەرگی کتێبێکی سەربەخۆدا بە ناونیشانی (( سەربردەی سەیدی پێشەوا ئەحمەد عیرفانی شەهید لە سالی ١٣٥٠ك)) نوسیوە. ئەم نوسراوە یەکەمین بەرهەمی ئەدەبی بو کە بە زمانی عارەبی نوسیویەتی کە ئەوسا تەمەنی لە نێوان حەڤدە تا هەژدە سال دەبو.

پاشان چوە (لاهور) لەوێدا لەسەر دەستی چاکسازی گەورەو بانگبەری مەزن شێخ ئەحمەد عەلی[4] کە تەفسیرناسێکی بەناوبانگ بو دەستی بە تەفسیر خوێندن کرد، (لاهور)یش ئەو کات شاری زانستو رۆشنبیریو ناوەندی

---

(١) ڕێبەری ڕاپەڕینی ئەدەبی عەرەبی بو لە هندستان، هەروەها چاکسازیخوازی پرۆگرامی خوێندنی ئەدەبی عارەبی بو، سێ‌سال لە نەدوەی زانایان بو، کۆمەلێك ئەدیبی بەناوبانگی لەسەر دەست پێگەیی وەکو، مەسعودی نەدوی‌و محمد ناظمی نەدوی .

(٢) لە ١٥ / جەمادی یەکەمی ١٣٦١ك مردوە .

(٣) لە ١٣ / جەمادی یەکەمی ١٣٧٧ك مردوە .

(٤) لە ١٣ / جەمادی یەکەمی / ١٣٧٧ ی کۆچی ئەمری خوای کردوە.

بلاوكراوەو رۆژنامەكانی هیندستانی دابەشنەكراو بو. ئەبولحەسەنیش ئەم دەرفەتەی هەڵقۆستەوەو دەگەڵ چەندین مامۆستاو ئوستادی گەورەو پایەدارو ئەدیبو شاعیرو هزرڤانان ئاشنا بو. ئەوەی شایانی باس بێ یەك لەوانە شاعیری ئیسلام دكتۆر موحەممەد ئیقبال بو. كە لە مەجلیسەكانی شاعیر بەشدار دەبو و شاعیریش دڵی پێخۆش دەبو[1]. هەرچەندە ئەبولحەسەن گەنجیش بو و ناوبانگیشی نەبو[2].

ئەبولحەسەن خوێندنەكەی لەزۆربەی قۆناغەكاندا بە بڕوانامە نەبوە، بەڵكو خوێندنێكی ئازادانەی روبەڕوی زانستو زانیاری بوە. جا كە دیراسەكەی لە لاهور تەواو كرد بۆ لوكنهو گەڕایەوەو لەوێدا لە (دارالعلوم)ی نەدوەی زانایان مایەوەو جۆرەها زانستی تێدا دەگوتەوە. لەم ماوەیە لەپاڵ ئەو كارەشیدا بە زمانی عارەبی مەقالاتی بۆ گۆڤاری (الضیاء) دەنوسی كە نەدوەی زانایان دەریدەكرد، سەرنوسەرەكەشی مەسعودی نەدوی[3] بو. هەروەها بە نوسینی چەندین پەرتوكی زمان ئوردوش خەریك بو. ژیاننامەكەی سەید ئەحمەدی شەهیدیشی بە چاپ گەیشت كە تەمەنی ئەو كاتی لە بیستو پێنج ساڵ پتر نەبو. هەرمێنێكی زۆری هەبو تەنانەت چوار چاپی لێدەرچو.

پاشان گواستیەوە (دلهی). لەوێدا بە دیداری موجەددیدی مەزن (شێخ موحەممەد ئیلیاس) شاد بو، ئەم دیدارە وەرچەرخانێكی لە ژیانی ئەبولحەسەن بەرپا كرد. چونكە شێخ موحەممەد ئیلیاس رێبەرێكی میللی بو، لە رێی بانگەوازەكەی بۆ خودا سەروساختێكی[4] قوڵو پتەوی دەگەڵ جەماوەردا هەبو، بەڵام ئەبولحەسەن تا ئەوكاتی لەگەڵ جەماوەردا هیچ پەیوەندێكی پەیدا نەكردبو، لەبەرئەوەی هەر بە خوێندنو كتێب نوسین خەریك بو، ئیتر ئەویش لەدوای ئەو

---

(١) لە كۆتایی ساڵی ١٣٨١ ی كۆچی مردوە .

(٢) سەید ئەبولحەسەن چیرۆكی ئەو سەردانەو سەربردەكەی لە پێشەكی پەرتوكەكەی بەناوی (روائع اقبال) باس كردوە

(٣) لە رەجەبی / ١٣٧٣ك — ١٦ / مارس م ١٩٥٤ز مردوە

٤ سەروساخت: ئاشنایەتی، سەروكار، پەیوەندی.

دیدارەدا دەستی کرد بە گەڕان و سوڕان و دەگەڵ خەڵکی گوندو دێهاتان تێکەڵ دەبو و گەشتی ئیسلامیانەی ئەنجام دەدا، گەشتی وای هەبوە رەنگە مانگێکی خایاندبێ، لەم گەشتانەدا بە گوندو شارەکانی هیندستان دەگەڕاو خەڵکی بۆ ئیسلام بانگ دەکرد .-ئێستاشی لەگەڵدا بێ- لە حیکمەتی وردو قوڵی ئاینی و لە هێزی بڕواییدا هەر شێخ ئیلیاس سەرمەشقی ئەبولحەسەنە. چونکە شێخ ئیلیاس -هەروەکو براکەمان وا دەڵێ-وێنەیەك بو لە پێشینە چاکەکان و دڵسۆزێکی بەغیرەت بو، جەرگی بۆ رەوشی نالەباری موسڵمانان دێشا، بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان تێدەکۆشاو لە خۆشی و ناخۆشی لەگەڵیان بو، لە پێناویاندا روحە بەهێزەکەی گڕی دەگرت و هەناوی بۆ دەسوتان[1].

پەروەردەی روحیشی لە خواناسی پایەدارو پەوەردیاری گەورە؛ شێخ عبدالقادری رائی فوری[2] وەرگرتوەو لە هاودەمیتی و مەجلیسەکانیدا بەهرەمەند بوە .

ئەبولحەسەن بۆتە سەرنوسەری گۆڤاری (الندوة)ی زانستیش کە بە زمانی ئوردی دەردەچوو زمانحاڵی نەدوە بو. زانکۆی ئیسلامیش لە (علیکرە) ئەرکی دانانی پرۆگرامێکیان بۆ قوتابیانی لیسانسی خوێندنی ئاینی پێ سپارد، ئەویش پەرتوکێکی بەناوی (ئیسلامییات) دانا و زانکۆش قبوڵی کرد و لە پای ئەوەشدا خەڵاتیان کرد. لە ساڵی (١٣٦١ك-١٩٤٢ز) دا زانکۆی میللی ئیسلامی لە دلهی بانگێشتی کرد تا موحازەرەیەك بدات. ئەویش موحازەرەیەکی لە بارەی

---

(١) لە ساڵی ١٣٦٣ کۆچیدا کۆچی دوایی کردوە. ئەبولحەسەن بە زمانی ئوردی ژیاننامەیەکی لەبارەوە نوسیوە. لە موحازەرەیەکیدا بەناوی (بانگەوازی ئیسلامی و بەرەو پێشەوە چونەکانی لە هیندستاندا وتەیەکیشی لەبارەوە هەیە . کۆمەڵەکەی کە زۆربەی کات بە کۆمەڵەی تەبلیغ دەناسرێن لە گورجوگۆڵ و چالاکتریان کۆمەڵەکانی هیندستانە، ژمارەشیان لە هەموان زۆرترە. چالاکی کاریگەریان هەیە، گەشتی بەردەوام ئەنجام دەدەن، بە ئاسیا و ئەفریقیا وئەورووپا و ئەمریکادا دەگەڕێن. ناوەندەکەی لە (دلهی) پایتەختی هیندستانە .

(٢) لە لاهور لە (١/ رەبیعی یەکەمی / ١٣٨٢- ئۆگەستی ١٩٦٢ ز) کۆچی دوایی کرد . ئەبولحەسەن ژیاننامەیەکی لە بارەوە نوسیەوە .

(ئاینو شارستانێتی) پێشکەش بە خوێندکاران کرد، هەمو زۆریان بەدڵ بو کە بە نوسـراویش بڵاوکرایەوە کاریگەرێکی بەرفرەوانی بەرپاکرد .

هـەر لـەو ماوەیەشـدا چـەند پـەرتوکێکی بـۆ خوێنـدکارانی خوێندنگـە عارەبیەکانی هیندسـتان دانـا. یـەك لەوانـە بریتـی بـو لـە (مختـارات في الادب العربـي).(دار العلـوم)ی هیندسـتانو چـەند زانکۆیـەکیش بڕیاریـان دا بیکەنـە پرۆگرامی خوێندنی خۆیان. پەرتوکێکیتری بریتی بو لە (قصص النبيين للأطفال) کـە لـە سـێ بەرگـدا بـو .. زۆر پەرتوکیتریـشی دانـا. هـەروەها گۆڤـاری (التعميـر)یشی دەرکرد کە مانگێ دوجار بە زمانی ئوردی دەردەچو.

مەکۆ(جمعية)یەکیشی دامەزراند تا موژدەی دینی ئیسـلام بەناو هیندۆسەکان بڵاوبکاتەوە. ئەم مەکۆیە موژدەگارە ئیسـلامیە یەك لە چـالاکیەکانی ئـەوە بـو کۆمەڵێك پەیامو تۆژینەوەی بەزمانی ئینگلیزی لـەبارەی نەتـەوەی ئیسـلامدا دەرکردو لەوێدا بڵاوی کردەوە. لە کۆتایی سـاڵی (١٣٧٨ك-١٩٥٩ز)یـشـدا لـە لوکنهو ( کۆڕی زانیـاری ئیسـلامی) دامەزرانـد. هـەروەها گـەلێك چـالاکیو بەرهـەمی تریـشی بـە زمـانی ئینگلیـزیو هینـدیو ئـوردیو عـارەبیو زۆر چاپکراوەی بەنرخی دیکەشی هەیە.

ئەم پەرتوکەش- بە داڕوخانی موسڵمانان جیهـان چ زیـانێکی لێکـەوت- لـە ساڵی (١٣٦٤ك -١٩٤٥) دا نوسیویەتی کە ئەوکات تەمەنی سیودو ساڵ بـو. بەڵام چاپکردنی وەدواکەوت. کە لەوماوەیەدا زیادەی دەخستە سەرو بە بابـەتیتر دەیڕازاندەوەو هەڵەبژێریو پوختەکاری لەگەڵدا دەکرد تائەوەی چاپی یەکەمی لـە میسردا لە ساڵی (١٣٦٩ك-١٩٥٠ز)دا بڵاوبۆوە.

ئەبولحەسەنی برای هێژام زۆر مەراقی لـە کۆکردنـەوەی پەرتوکانـە، شـەیدای باسوخواسی کتێبانەو شەونخونیان دەگەڵدا دەکێشـێ. لە کاڵاوپاڵای دنیایێ بەس خەمی کتێبەکانیەتی، بەهادارترین دیاری پێشکەشی بکرێ پەرتوکێکـە، کتێـب بۆ ئەوە کۆناکەتەوە ماڵەکـەی پـێ قـەرەباڵغ بکـات، بـەڵکو بـۆ ئەوەیـەتی تـا بیخوێنێتەوەو تاووتوێو رەخنەکاری تێدا بکات. نوسراوە جۆراوجۆرەکانیشی لـەم بارەوە بەڵگەیەکی ئاشکران. لە ئەنجامی ئـەو هـەمو خوێندنـەوەو شـەونخونیەی

دەگەڵ پەرتوکانی کێشاوە- لە تەك بەهرەو ئەزمونەکەیدا- دەتوانێ بە هاسانی بە زمانی عارەبی بدوێ. کە بە عارەبیش دەدوێ وەك لافاو هەڵقوڵی بێ زۆر بە ئابوتاب‌و بە پاراوی دەدوێ‌و قسەکانی پڕە لە هێنانەوەی وێنەی ڕەوانی‌و گوزارشتی جوان‌و سەرنجڕاکێش. بۆ زۆربەی موحازەرەکانیشی خۆی ئامادە دەکات‌و زۆرینەشیان دەنوسێتەوە. نەشم‌و شێوازی ئاخاوتنەکەی ڕەگەزی سۆزی بلێسەداری بەسەردا زاڵە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە لە دەرگەی تۆژینەوەیەك دەدا بە پوختەیی ئەنجامی دەدات‌و مافی خۆی دەداتێ‌و تاموچێژیشی لەگەڵ ئاوێتە دەکات وەکو لێم زانیوە‌و بە خۆشی پتر لە جارێك بۆی درکاندومە، کە لەبارەی بابەتێکی گرنگەوە دەدوێ حەز ناکا هێرش ببات، تەنها ئەو کاتە نەبێ کە زانیاریەکی زۆری لەبارەوە کۆکردبێتەوە‌و خۆی بۆ ئامادە کردبێ. ئەوەش نەك لەبەر مەعتەلی‌و بێ‌بابەتی بێ بەڵکو وەك وریا بونێکی زانایانەیە کە دەیەوێ بگاتە یەقین‌و مەسەلەکەی بۆ ساغ بوبێتەوە ئەوجا پەنا وەبەر هێرشان ببات!.. ئەبولحەسەن پەخشانی بەسەردا زاڵ بوە بۆیە ڕۆژێك لە ڕۆژان نەیکراوە هیچ شیعرێك بهۆنێتەوە...

مامۆستا ئەبولحەسەن بەردەوام ئەم جۆرە وەرزشانەی کردوە: تۆپانێ، مەلەوانی، ڕاووشکار، هۆکی‌و تێنس، بەڵام پاشان وازی لێهێناون. وێڕای ئەمەش چەند نەخۆشیەکیشی توش ببو، ماوەیەکی درێژی خایاند بە تایبەتی نەخۆشی سینگ، بەڵام پاشان خودا شیفای پێ‌بەخشی، تەنها کۆخەکەی نەبێ کە تاو نا تاو دەیگرێ.

حەز لە هیچ جۆرە وێنەیەك ناکات، بۆ خۆشی حەرام کردوە‌و لەسەریشی توندە. جارێکیان پێکەوە چوینە چاپخانەیەکی گەورە لە قاهیرەدا، وێنەگرەکەی ئەوێ زۆری حەز دەکردو زۆریشی داواکرد بۆ یادگاری وێنەیەکمان بگرێ، بەڵام ئەبولحەسەن ڕازی نەبو و گوتی موسڵمانانی هیندستان لەسەر حەڕامێتی وێنەگرتن هاودەنگن.

جارێك پرسیارێکم لێکردو گوتم لە پێشینانی چاك بە کامیان کارتێکراو بوی؟ لە وەڵامدا گوتی: بەم پیاوچاکانە: ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کە لە

کاتی فیتنەکەدا خاوەن هەڵوێستێکی ناسراوو بەناوبانگە. شێخلئیسلام ئیبنی تەیمیە. شێخ ئەحمەدی سەرهەندی کە خەڵکی سەرهەند بوەو سەرهەندیش شارێکە لە بنجاب، لە ساڵی (١٠٣٤)کۆچیشدا کۆچی دوایی کردوە، خاوەنی پەیامە نەمرەکانی شەریعەتو حەقیقەتو، دژایەتیکردنی بیدعەکاریە. شێخ (ولي الله الدهلوي) کە لە ساڵی (١١٧٦)ی کۆچیدا مردوە، توێژەرێکی مەزنی ئیسلامیش بوەو خاوەنی پەرتوکی (حجة الله البالغة)یە. هەروەها سەید ئەحمەدی شەهیدیش کە دامەزرێنەری یەکەمین دەوڵەتی شەرعی بوە لە هیندستان لە سەدەی سێزدەی کۆچی[1]، بۆ چەند مانگێك دەوڵەتەکەی حوکمی کردوە، بەڵام پاشان ئینگلیز بە نەخشەو پلانە گڵاوەکانیان روخاندیان.

گەورەترین هیواوهومێدی ئەبولحەسەن ئەوەیە کە ببینێ ئیسلام لەسەر روی زەویدا باڵادەست بێو دەوڵەتە سەرکێشو یاخیەکانیش بە ئەشکەنجەو لەبن دەست بن، تامەزرۆی ئەو دەمەیە کە بەچاوانی خۆی تۆڵەوەرگرتنەوەی خوا لەو کەسانە ببینێ کە دژایەتی ئیسلامیان کردەوەو موسڵمانانیان زەبونو نابوت کردوە، بەمەش فەرامۆشی دڵی دێتەوەو پرشنگی موژدەی بەسینەدا پەخش دەبێ. پێیوایەو وای دەبینێ کە ئەو کەمایەتیە موسڵمانەی لە هیندستان ماونەتەوە چاکەکانن و جێی هومێدن بۆ هیندستان، رەنگە ئایندەیەکی گەشیان لەوێدا بۆ ئیسلام پێبێ.

ئەبولحەسەن لە ساڵەکانی (١٣٦٧-١٣٦٩)ك بەرامبەر بە (١٩٤٧-١٩٥٠)ی زایینی گەشتێکی بۆ حیجاز کرد پاشان چەندین گەشتی بەرودواتری کردوە. لە ساڵی (١٣٧٠ك-١٩٥١ز) هاتە میسر. بە زۆربەی جیهانی ئیسلامیشدا گەڕاوە. لە (١٣٧٥ك-١٩٥٦ز) سەردانی تورکیای کردوە، سەردانی پایتەختەکانی وڵاتی ئەوروپاشو بەناوبانگترین شارەکانی ئەندەلوسیشی کردوە. سەردانی یەکەمی لە ساڵی ١٣٨٢ك بوە، هی دوەمیشی لە ساڵی ١٣٨٣ك

---

(١) ئەویش هەر لە بنەماڵەی ئەبولحەسەن بوە. یەکێك بو لە پیاوە هەرە بەناوبانگەکانی بنەماڵەو هیندستان، لە ساڵی ١٢٠١ك لە رائی بریلی لە دایك بوە. لە رێیخودا لە بالاکوت (پاکستانی ئێستا)دا لە ساڵی ١٣٤٦ك شەهید کراوە.

بەرامبەر بە (١٩٦٢-١٩٦٣)بوە. لەم گەشتانەدا زۆری دنیا دیوەو گەلێکی خوێندۆتەوەو جۆرەها بابەتی نوسیوە، ئامادەی موحازەران بوەو موحازەرەشی داوە، لە هەر جێیەك دابەزی بێ کردوکۆشی هەبوەو بەهرەی وەرگرتوە، زۆر پەیمانیشی بەستوە. لە ساڵی (١٣٨٠ك-١٩٦٢ز) کە براگەورەکەی دکتۆر سەید عەبدولعەلی ئەلحەسنی وەفاتیکرد لە جێی ئەودا بە ئەمینداری گشتی نەدوەی زانایان هەڵبژێردرا، لە ساڵی ١٩٥٧یشدا بەئەندامی پەیامنێری کۆڕی زانیاری عارەبی لە دیمەشق هەڵبژێردرا[١] .لە ساڵی (١٣٧٥-١٩٥٦ز) وەك مامۆستایەکی میوان لە زانکۆی دیمەشق بانگێشت کرا تاچەند موحازەرەیەك پێشکەش بکات [٢] لە ساڵی (١٣٨٠ك-١٩٦١ز) ئەنجومەنی دامەزراندنی (رابطة العالم الاسلامي)یش لە مەککەی پیرۆزدا هەروەها لە ئەنجومەنی راوێژکاری باڵای زانکۆی ئیسلامی لە مەدینەشدا بە ئەندام هەڵبژێردرا. لە ساڵی(١٩٥٩ز)شدا بە سەرۆکی دەزگای خوێندنی ئاینی لە ولایەتی باکوری هیندستان هەڵبژێردرا.

لە میسردا جارێکیان دانیشتبوین و ئەویشمان لەگەڵدا بو، لەبارەی چاکیەکانی میسرم لێپرسی، ئەویش بە کورتی وەڵامی دایەوەو گوتی: بڕوابون بەخودا، دینداری، خۆشویستنی موسڵمانان بەتایبەتی ئەگەر نامۆ بن، دڵ نەرمو ناسکی، سینەپاکی، بەرهەمی زۆر... پاشان لە خراپیەکانم لێپرسی، ئیحراج بو بەڵام پاشان گوتی: سفوراتی، خۆدانەپۆشین، وێنەی روتی ناو گۆڤارو رۆژنامەکان، بە سوك سەیرکردنی هەندێ حەرامەکان لە لایەن هەندێ زانا، نەکردنی نوێژی بەکۆمەڵ لەگەڵ ئەوەی مزگەوتیش زۆرن، هەڵپەکردنێکی کوێرانە بۆ لاساکردنەوەی ژیاری رۆژئاوا .

---

(١) یادەوەریەکی لە قاهیرەدا لەژێر سەرناوی ((مذكرات سائح في الشرق العربي)) لە ساڵی (١٣٧٣-١٩٥٤ز) چاپ کرا .

(٢) سەرجەم ئەو موحازەرانەی کە ئوستاد ئەبولحەسن لە مەدرەجی زانکۆی (الكبرى)ی دیمەشق پێشکەش کرد ژمارەیان دوازدە موحازەرە بو لە پەرتوکێکدا بەناوی ((رجال الفكر الدعوة في الاسلام)) لە چاپخانەی زانکۆی دیمەشق لە ساڵی (١٣٧٩ك-١٩٦٠ز)دا چاپ کرا .

هەروەها ئەبولحەسنی برام دوژمنــی رواڵــەتی درۆزنانەیــە، خــواردن‌و بــەرگ‌و جێخەوی بەهەند هەڵناگرێ، حەز لە قسەی زیــادو زۆرلــەخۆکردن ناکــات، هــیچ نرخێك بۆ پارەوپول دانانێ، متمانەکردنی بەخودا لەسەروی هەمو کارەکانیــەتی، لە پێناو ئەو مەبەستەی بڕوای پێ‌هەیە کۆڵنەدان‌و رەنجی بێوچانی بەجۆرێکە بۆیە بۆتە سەرمەشق، دڵسۆزیەکی زۆر قوڵی هەیە بۆیە لە کارەکانیدا سەردەکەوێ لــە کاتێکدا ئەوانی‌تر شــکســت دەخۆن.

زۆر پێدا رۆیشــتم، بەڵام هیچشــم لەبارەی ئەبولحەسەنی برام نە گوتوە.

**ئەحمەدی شەرباصی**

**مودەریسی ئەزهەر**

**قاهیرە**

**شەووال / ١٣٧٠ك**

**ئۆگەست / ١٩٥١ز**

# پێشەکیەك

## بە پێنوسی ئوستاد عبدالرحمن حبنکه المیدانی

سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خودایەی بەرزو بەخشندەیە، کە قورئان‌و سوننەت‌و وتەی پرواتای بە موحەمەدی کوڕی عەبدولا ﷺ بەخشیوە، کە پێغەمبەری کردۆتە چاکترین بانگخوازی ڕێی خودا، کە کردویەتی بە هۆشمەندترین پێشەنگ‌و سەرمەشقترین پەروەردەکار.

لە میهرەبانی خۆیەتی کە هەڵگرانی مەشخەڵی پەیامەکەی دانای ڕێڕاست‌و سەرڕاستن، بەوپەڕی تواناوە بە پێی ڕێوشوێنی پێغەمبەر ﷺ لە پێناو خوا تێدەکۆشن، لە هەر سەردەمێکدا ڕەوشی گەلان بە هەر چۆنێك بگۆڕێ و شەوی تاریکستان هەرچەندی درێژە بکێشی و تەمومژ هەرچەندی خەست و خۆڵ بێ، تا ڕۆژی دوایی رادەبێ قەت لە ڕێی هەق دانابەزن، بۆ ناهەقی رانـاخزن، لەمەڕ دوژمن نابەزن، چونکە خودا لەگەڵیانە.

ئەم پەرتوکە ((بە داڕوخانی موسڵمانان جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟!!)) کە بانگخوازی ئامۆژگارو ڕێبەری دانـاو زانـاو شێخی هێژاو پایەدار ((ئەبولحەسەن عەلی ئەلحەسەنی نەدوی)) نوسیویەتی، هەر لەگەڵ دەرچونی یەکەم چاپی لە ساڵی (١٣٦٩ك-١٩٥٠ز) زاناو بیرمەندان گەلێکیان کەوتە بەر دڵو شونێپایەکی بەرزی لەلادا پەیدا کردن. پەرتوکەکە مێژوی ڕەوشی گەلانی بەر لە ئیسلام بەسەر دەکاتەوە کە چۆن لە روی هزرو زانست داڕوخاون و لە ژیاردا تێکشکاون، چۆن لەناو بتپەرستیەکی پڕوپوچ‌و بێنمود و نەفامیتیەکی دزێو و ستەم‌و زۆرداریەکی لە رادەبەدەردا دەژیان، چۆن ملهوڕو خاوەن هێزو دەسەڵاتدارەکان خەڵکی ڕەش‌وڕوتیان دەچەوساندەوە، ستەمدیدەی بێ‌پشت‌و پەنا نەیدەتوانی روبەڕوی زەبروزەنگی ملهوڕان رابوەستێ‌و کۆت‌و زنجیری کۆیلایەتی‌و

سەرشۆڕی لە خۆی ڕاپسێنێ، تەنانەت ئەگەر مافیشی پێخوست دەکرا نەیدەوێرا دەنگ بکا.

باس دەکات مرۆڤایەتی کە ساڵەهای ساڵ بو، لەتاو بەدبەختبونو مەرگەساتی بەناڵەناڵ بو، لە حەژمەت ژیاری وێران دادوبێدادی بو، لە دەست دەستدرێژیو ستەمکاریو خوێنڕێژیو دوژمنکاری هاوار هاواری بو. ئیسلام هات فریای کەوتو گزنگی ئازادی بۆ پەخش کرد، بە بەڵگەی ڕۆشنو وتەی بەجێ، بە هێزی تۆسنو بازوی بە تین ڕێزومافی ڕەوای مرۆڤانی گەڕاندەوە و زوڵمو زۆرداری ملهوڕانی بڕاندەوە، مرۆڤی لە مرۆڤپەرستی ڕزگارکرد بۆ خواپەرستی، هەرچی سیستەمی هەوەستزادەی مرۆڤان بو کە بە ناوی ئاین لافی لێدەداو خەڵکی بەستەزمانی دەچەوساندەوە باوی نەهێشتو تەمومژی ڕەواندەوە. ئامێزی بە سۆزو بەزەیی و باوەشی دادگەریو چاکەکاری لە مرۆڤایەتی کردەوە و ڕێبیرو بیروباوەڕو شەریعەتو ئەحکامو ئامۆژی ئاسودەبەخشی پێشکەش کردن.

باس دەکات لەبەر ئەوە موسڵمانان داڕوخانو تێشکان چونکە لە ئامۆژو ڕێنماییەکانی ئیسلام دورکەوتنەوە، پشتیان لە زانست هەڵکردو نەزانی بڵاوبوەوە.. زانستێك کە ژیاری پێ بنیاد دەنرێ. کەچی گەلانی ڕۆژئاوا هاتن بەهرەیان لە بنچینەکانی ژیاری ئیسلامی وەرگرتو ژیارێکی مەزنی ماددییان بۆ خۆ پێکهێنا بەڵام بێنەوەی ئاوڕ بەلای بیروباوەڕو پەرستنکاریو خوڕەوشتو ڕەفتارو دادگەریو چاکەخوازیو هەقپەروەریەکەی بدەنەوە.

دوپات دەکاتەوە ژیارە ماددیەکەی ڕۆژئاوا مادەم خۆی بە ڕەگەزەکانیتری ژیاری ئیسلامی نەپاراستوە دەبێتە هۆکاری وێرانبونی جیهان و مرۆڤایەتیش بەرەو ڕەوشی تێکشکاوی پێشان دەگەڕێتەوە، وەکو جاران ملهوڕو ستەمکاران چڕنوك لە بەربینگی هەژارو ناگزوران ڕادەچەقێننو دیسان شەڕو پەشێوی بڵاو دەبێتەوە.

دوپات دەکاتەوە جیهان زیانێکی گەورەی بە هۆی داڕوخانی موسڵمانان بەرکەوتوە، ڕەنگە مرۆڤایەتیش توشی مەترسیەکی زەبەللاحی خاپوربون ببێت چونکە زلهێزانی سەر روی زەوی هێزی وێرانکردنی جیهانیان وەدەست هێناوەو

هیچ دینێکیشیان نیە دەستی خوانەناس‌و بێبڕواکان بگرێ‌و لێنەگەڕێ مرۆڤایەتی توشی ئەو رۆژە رەشە ببێ، وێڕای ئەمەش لە ناخی دڵەوە حەز دەکەن هەمو شتێکی سەر روی زەوی داگیر بکەن‌و دەست بەسەر گشت گەلان دابگرن .

گەلێك بە جوانی باسی کێشە کۆمەڵایەتیەکانی سەردەم دەکات، لەبارەی لاڕێبون‌و ترازانەکانی دەدوێ کە خەریکە مرۆڤایەتی لە کەندەلانی وێرانکاری هەڵدێرێ. گەلێك وتەو گەواهی گەورە بیرمەندانی رۆژئاوایی بە بەڵگە هێناوەتەوە کە دەگەڵ بابەتی نێو پەرتوکەکە تێکدەکەنەوەو روی راستەقینەی کێشەکان وەدەر دەخەن.

جەنابی شێخ ((ئەبولحەسەن عەلی ئەلحەسەنی نەدوی)) پیاوێکی ناسراوەو ناوبانگی بە سەرجەم جیهانی ئیسلامیدا بلاوبۆتەوە، بۆیە پێویستی بەوە نیە خۆی‌و بەرهەمە بەهادارەکانی پێناسە بکرێن.

وتەکانی منیش وەك یەکێکە چرایەکی کزۆڵەی بەدەستەوە بێ‌و خەڵکێکی چاوساغ بەرەو گلۆپێکی زلی کارەبایی رێنوێن بکات کە روبەرێکی بەرفرەوانی بەدەوری خۆدا روناك کردبێتەوە.

لە کۆتاییدا لە خوا دەپاڕێمەوە شێخ لەشی ساغ بێت‌و تەمەنی درێژ بێ، سودی بەرهەمەکانی نوسیویەتی‌و دەزگاکانی دایمەزراندەوە تا رۆژی دوایی هەر بمێنێ‌و بۆ دین‌و دونیا بەهرەیان بەردەوام بێ.

وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيّد الأولين والآخرين، وآله وصحبه ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين .

**عبدالرحمن حبَنّكة الميداني**

**مەککەی پیرۆز**

**١٨ / شەعبان/ ١٤١٨**

**١٨ / ١٢ / ١٩٩٧ ز**

# بە داڕوخانی موسڵمانان

# جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟!!

داڕوخانی موسڵمانان یەکەم داڕوخان نیە لە دنیادا. کە موسڵمانان دوای ماوەیەك سەرکردەیی هەرەسیان بردو لە مەیدانی ژیانو واقیعدا دەستیان کێشایەوەو کەنارگیر بون روداوێکە، بەڵام وەکو ئەو روداوانە نیە کە لە مێژوی تێکشکانی گەلو نەتەوەو داڕوخانی حکومەتو وڵاتان رودەدەن، وەکو شکانی پاشاو داگیرکەران نیە، وەکو ژێرکەوتنی داگیرکەرانی سەرکەوتو نیە، وەك بەرتەسکبونەوەی سێبەری ژیارەکان نیە، وەك داکشانی دوای هەڵکشانی سیاسی نیە، چونکە ئەو روداوانە لە مێژوی سەرجەم گەلانی سەر زەوی وێنەو هاو شێوەیان زۆرن، بەڵام روداوی داڕوخانی موسڵمانان روداوێکی ناوازەو بێوێنەیە ئەگەرچی گشت روداوێکی ناوازەش لە مێژودا وێنەی هەیە.

ئەم روداوە تەنها بە عەرەبانو بە گەلو نەتەوە ئیسلامیەکانیش تایبەت نەبوە چجای بنەماڵەو خانەوادەی حوکم بەدەست! بەڵکو مەرگەساتێکی مرۆڤایەتی سەرتاسەری بوەو مێژو قەت لەوەی رەشترو توشترو سەرتاسەریتری بەخۆ نەدیوە. جیهان ئەگەر تانەی فیزو دەماری سەرچاوی خۆی لابداو هەقیقەتی ئەم روداوەی بدیبایەو بیزانیبا بڕی ئەو دۆڕانەی پێی بڕاوە چەند گەورەیە، رۆژی رەشی روداوەکەیان دەکردە رۆژی شیوەنو تازیەداریو نەتەوەو گەلان پرسەیان لەگەڵ یەکتر دەگۆڕیەوە. بەڵام ئەم روداوە پڕ کارەساتە لە ماوەی رۆژێك و دو رۆژ روی نەداوە بەڵکو رۆژگارێکی دورودرێژی خایاندوە، جیهانیش تائێستا لێکدانەوەیەکی راستو تەواوی بۆ ئەم روداوە نەکردوەو قەبارەکەی نەناسیوە، تا ئێستاش تەرازوێکی وردو دروستی نیە کڵۆڵیو بەدبەختیەکەی خۆی پێ بکێشێ.

جیهان بە داڕوخانی وڵاتێك کە رۆژگارێك دەسەڵاتدار بوبێو گەلێك وڵاتی داگیر کردبێو گەلێك گەلی کردبێتە کۆیلەو لەسەر رەنجو شانی چەوساوەو

ژێردەستەكان رایبواردبێ، هیچ شتێكی لەكیس ناچێ. ئەگەر دەسەڵات لە دەست ناكەسێكەوە بچێتە دەست ناكەسێكیتر یان لە دەست كۆمەڵێكی زۆردارو ملهوڕو خۆپەرستەوە بچێتە دەست كۆمەڵێكی تری هاوشێوە، غەمگین نابێ و ژان نایگرێ. گەردون بە داڕوخانی نەتەوەیەكی پیر و پەككەوتەو لاواز یان بە دارمانی وڵاتێكی بناغە لەرزۆكو لەبەریەك هەڵوەشاوە توشی مەرگەساتو ناسۆرو ژان نابێ، بەڵكو بە پێچەوانەوە داڕوخانی نەتەوەو وڵاتێكی ئاوەها هەرخۆی نەریتێكە لەم گەردونەدا. فرمێسكی مرۆڤ گەلێك لەوە شكۆدارترە هەر رۆژەو بۆ پاشایەكی كۆچكردو یان بۆ دەسەڵاتێكی لەناوچو دابباریێ. كەسێك رۆژێك لە رۆژان لە پێناو بەختەوەریو بەرژەوەندی جیهان رەنجی نەدابێو تێنەكۆشابێ مرۆڤایەتی باكی پێ نیەو ئەفسوسی بۆ هەڵناكێشێ. ئەرزو ئاسمان لەمەڕ ئەو روداوانەی هەزاران جار رویان داوەو رو دەدەن سۆزیان نابزوێو بێبەزەیین : ﴿ كَمْ تَرَكُوا مِنْ جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ، وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ، وَنَعْمَةٍ كَانُوا فِيهَا فَاكِهِينَ، كَذَلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا قَوْمًا آخَرِينَ، فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنظَرِينَ: گەلێك باخاتو كانیاو و كشتوكاڵو پایەی شكۆدارو نازونوزیان لە دوای خۆدا بەجێهێشت، كە لە دوای ئەواندا گەلێكیتر هاتن جێگەیان گرتنەوە، كە لەناوچون ئەرزو ئاسمان شیوەنی بۆ نەگێڕانو سزاكەیان لەسەر دوا نەخرا﴾الدخان: ٢٥-٢٩ .

ئەم جۆرە نەتەوەو وڵاتانە مرۆڤایەتیان توشی ئەستەمو ئازارو كارەسات كردوەو نەتەوەی بچوكو ژێردەستەیان دوچاری ئەشكەنجەو نەهامەتی كردوە، وەك كرم جەستەی كۆمەڵگەی مرۆڤایەتیان گەندەڵ كردوە، ژەهرو ژەقنەموتیان هەڵڕشتۆتە ناو دەمارو خوێنی مرۆڤایەتی بۆیە هەر دەبو نەشتەرگەری ئەنجام بدرێو ئەو بەشە نەخۆشو توشە بقرتێنرێ، لەناوچونی ئەو بەشە نەخۆشەی جەستەی مرۆڤایەتی لە چاكەو بەزەیی پەروەردگارەوەیەو پێویستە گشت ئەندامو خێزانێكی مرۆڤایەتی بەڵكو هەمو تاكەكانی گەردون سوپاسی خوای لەسەر بكەن: ﴿فقطع دابر القوم الَّذِينَ ظَلَمُوا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِين: گەلی

ستەمکاری بێبڕوا ئاسەواری بڕایەوە، سوپاس بۆ پەروەردگاری بونەوەر﴾الانعام:٤٥

بەڵام موسڵمانان کە هەڵگری پەیامی پەیامبەرانن، مایەی شیفاو خۆشی جیهانن، کاتێك داڕوخانو وڵاتیان نەماو سروەیان نیشتەوە، وەك داڕوخانو نەمانو نیشتنەوەی هیچ گەلو رەگەزو نەتەوەیەکیتر نەبو.. ئەگەر وا بوایە هیچی ئەوتۆی نەدەنایەوەو شوێنکارێکی سوکی بەجێ دەهێشت.

داڕوخان داڕوخانی بانگەوازێك بو بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کە روحی پێ دەهاتەوە بەرو دەبوژایەوە، داڕوخانی بناغەیەك بو کە سیستەمی سەرجەم جیهانو ئاینی لەسەر دادەمەزرا.

جا ئایا داڕوخانێك ئەوەندە سەدەیەی بەسەردا تێپەڕی بێ شایەنی ئەوەیە مرۆڤایەتی لە رۆژئاواو لە رۆژهەڵاتدا ئاخو ئەفسوسی بۆ هەڵکێشن؟

ئایا راستە جیهان -کە سەدان گەلو نەتەوەی تێدایە- بە داڕوخانی ئەم نەتەوەیە دۆڕاندویێتی؟ ئەگەر وایە دۆڕانەکەی لە چ دایە؟

ئایا دوای ئەوەی موسڵمانان داڕوخانو سەرکردایەتی جیهان کەوتە بەردەستی نەتەوەکانی ئەوروپاو پاشان کە دەوڵەتێکی پانوپۆڕیان لەسەر داروپەردوی دەوڵەتی ئیسلامی بنیات نا، رەوشی جیهان بە چ گەیشت؟ ئایا نەتەوەکان چیان بەسەر هات؟

ئایا ئەو گۆڕانە گەورەیەی کە لە سەرکردایەتیو رێبەرایەتی جیهان رویدا چ کاریگەرێکی لەسەر ئاینو خورەوشتو رامیاریو ژیانی گشتیو چارەنوسی مرۆڤایەتی هەبو؟

ئەدی ئەگەر جیهانی ئیسلامی لەو لەپەڕوکەوتنەی تێی کەوتوە هەڵسێتەوەو لەو سوکە خەوەی دایگرتوە بێدار بێتەوەو جڵەوی سەرکردایەتی وەرگرێتەوە چ رو دەدات؟

لەو روپەڕانەی دادێ هەوڵ دەدەین وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە...

**ئەبولحەسەن عەلی ئەلحەسەنی نەدوی**



**بەندی یەکەم**

## مرۆڤایەتی لە ئاوزینگی سەرەمەرگدا

مێژونوسان لەمەدا هاودەنگن کە سەدەی شەشەمو حەفتەمی زاینی لە سەدە هەرە داڕوخاوەکانی رۆژگاری مێژون. بێسۆ مرۆڤایەتی بەر لەم دو سەدەیە چەند سەدەیەك بو گلۆڵەی کەوتبوە لێژیی‌و لەگەڵ رەوتی رۆژگاریشدا لێژبونەوەکەی خێراتر ببو، لەسەر زەویشدا هێزێك نەبو بەهانای بێ‌و بیگرێتەوە. مرۆڤ خوای وەدیهێنەری لەبیر کردبو، بۆیە خۆی‌و چارەنوسەکەشی لەبیر نەمابو، راستاڵیی ون کردبو، هێزی جیاکردنەوەی نێوان چاکەو خراپەو جوانو دزێویتی نەمابو. بانگەوازی پێغەمبەران رۆژگارێك بو کش‌ومات بو، ئەو چرایانەی کە پێغەمبەران هەڵیانکردبو بەهۆی رەشەباکانی دوای مردنیان کوژابونەوە، هەندێ چرای کزۆڵە مابون بەڵام هەر تەنها چەند دڵێکیان پێ‌رۆشن دەبوەوەو کۆمەڵگەو وڵاتیان روناك نەدەکردەوە. پیاوە ئاینیەکانیش نەبادا دینەکەیان دوچاری ئاژاوە بێ‌و تا هەر خۆیان خێوی دین بن، یان تا ئەرك‌و زەحمەتی ژین نەکێشن و تفت‌و تاڵی نەچێژن‌و پەڕۆ لەسەر نەئاڵێنن‌و خۆشی‌و هێمنی وەدەست بێنن، یان لەبەرئەوەی نەیاندەتوانی خەباتی ئاینی و رامیاری‌و روحی‌و ماددی راپەڕێنن؛ پشتیان لەژین هەڵکردبو و خۆیان وەدور گرتبو، پەنایان وەبەر دێرو کڵیساو خەڵوەتگای دور دور بردبو، ئەوانەی کە لە نێو رەوتی ژینیشدا مابونەوە لەگەڵ پاشاو دنیاداران رێك کەوتبون و لە گوناح‌و دەستدرێژیدا و لە خواردنی ماف‌و ماڵی خەڵکیدا هاریکارو کاسەلێسی زۆر دڵسۆز بون...

## چاوخشاندنێك بە ئاین‌و نەتەوەکاندا:

. دینە مەزنەکان وەك نێچیران کەوتبونە بەر دەستی تەوسکارو گاڵتەجاڕان، وەك یاری بون لەبەر دەستی دوڕوان‌و گزیکاران. روح‌و ئەدگاری رەسەنیان ون

کردبــو، تەنانــەت ئەگــەر خاوەنــانی پێــشینیش زندوبانــەوەو بیاندیبانــەوە نەیاندەناسـینەوە. لانـەکانی ژیـارو کلتـورو حـوکمو رامیـاری ببونـە شـانۆی بێسەروبەری‌و هەڵوەشانەوەو بێشـیرازەیی‌و سیستەمی پڕ سـتەمو زوڵـمو زۆریـی فەرمانڕەوایان، بۆیە هـەر خۆیـەخۆ خـەریك بـون‌و لـە دەردی خـۆ دەیانناڵانـد. پەیامیان نەبو بۆ جیهانی رابنوێنن، بانگەوازیان نەبو بە گـەلانی راگەیـەنن، لـە لایەنی روحی پوکابونەوە و کانیاوی ژینیان وشکی کردبو، نە خاوەن بەرنامەیەکی پـاك و بێگـەردی ئـاینیی ئاسمـانی بـون نـە خـاوەن سیـستەمێکی حـوکمڕانی مرۆڤکردەش.

## دینی مەسیحی لە سەدەی شەشەمی زاینیدا :

دینی مەسیحی هیچ رۆژێك لە رۆژان ئەو دینە نەبوە هێندە راڤەو رونکـاری‌و چارەسەری کێشەکانی مرۆڤایەتی تێدا بوبێ تا بتوانێ ژیارێك هەڵنێ یان وڵاتێك هەڵسوڕێنێ، بەڵکو دینێك بوە تەنها چەند ئامۆژێکی مەسیحی لە ئامێزدا بوەو خـاوەنی چـەند رێوشـوێنێکی سـادەی یەکخواناسـیش بـوە. (پـۆلس) هـات پڕشەنگەکەی کوژاندەوەو گەلێك ئەفسانەی نـەفامێتی و رێوشـوێنی بتپەرسـتی لەگەڵدا ئاوێتە کرد. پاشان (قوستەنتین) هات ئەوەندەی مابو ئەویشی وێران کرد. لە ئەنجامدا دینـی مەسـیحی بـو بـە ئاوێتەیـەك لـە ئەفـسانەگەلـی یۆنـانی‌و بتپەرســتی رۆمـانی‌و رەبەنایـەتی کلێـساو ئـەفلاتوناتی میـسری. لـەنێو ئـەم جروجەنجاڵیەدا ئامۆژە[1] سادەکانی مەسیح وەك توانەوەی دلۆپە ئاوێـك لـە نێـو دەریادا توانەوە. تا ئەوەی دینی مەسیحی بو بـە کۆمـەڵێك بیروبـاوەڕو نـەریتی وشـك‌و رەقـی وا کـە روحـی نەدەبوژانـدەوە و ئـاوەزی نەدەگەشـاندوە و سـۆزی نەدەبزواند و تەنگژەی ژینی پێ‌چارەسەر نەدەبو و رێگاشـی رۆشـن نـەدەکردەوە. پاشان ناپاکان زێدەی تریان تێخزاندو نەفامان لێکدانـەوەی نابـەجێیان تێئاڵانـدو وای لێهات کە مرۆڤ پتر لە زانـستو هـزر دابـبڕێ‌و دورکەوێتـەوە، ئـیتر سـەدە

---

١ ئامۆژ: تعالیم.

لــەدوای ســەدە دینێکــی بتپەرســتانەتری لێدەکەوتــەوە. ( Sale )-وەرگێــڕی قورئانی پیرۆز بۆ ئینگلیزی- لەبارەی نەسرانیەکانی سەدەی شەشــەمی زاینیــەوە دەڵێ: ((نەسرانیەکان لە رادەبەدەر قــددیس‌و وێنــەکانی حــەزرەتی مەســیحیان دەپەرست تەنانەت لە کاتۆلیکەکانی ئەمڕۆشیان تێپەڕاندبو))[1].

## شــەڕە ئاینیەکانی نێوەخۆی وڵاتانی رۆم :

پاشان شەڕەقــسەیەکی نــەزۆك‌و بێهــودە و مــشتومڕێکی توندوتیــژ لــەبارەی دینەوە پەیدا بو، ئــەم هەراوهەنگامەیــە هــزری خــەڵکی خــەریك کــردو زەیــن‌و زیرەکی گۆت کردن‌و وزەی کاری کرداری لێ خامۆش کردن، تەنانەت گەلــێ جــار شــەڕی بێئامانیــشی لێدەکەوتــەوە و کوشــت‌و بــڕو ئەشــکەنجەو وێرانکاریــشی دەنایەوەو تاڵان‌و بڕۆو شەبەیخون‌و رەشەکوژیــشی دێناکایــەوە، فێرگــەو کڵێــسەو خانوبەرەکانیش ببونە ســەنگەری دژبەیــەکی ئــاینی، ســەرەنجام شــەڕی نێوەخــۆ سەرتاسەری وڵاتی داگرتەوە.توندوتیژترین دیارەدەی ئەم دژبەیەکبونــە لــە نێــوان نەسرانیەکانی شام‌و وڵاتانی رۆم بو دژ بە نەسرانیەکانی میسر، یان راستتر بڵــێین لە نێوان (مولکانیەکان)و(مۆنۆفیسیەکان) بو. مولکانیەکان پێیان وابو (مەسیح) دو سروشتی تێکەڵ بەیەکی هەیە، بەڵام مۆنۆفیسیەکان پێیان وابو یەك سروشتی خواوەنــدێتی هەیــەو سروشــتە مرۆڤانیەکــەی وەك چــۆن دڵۆپــە ســرکەیەك لــە دەریایەکی پڕ شەپۆڵ‌و پانوپۆڕدا شیدەبێتەوە، شی بۆتەوە. دژایەتیەکە لە سەدەی شەشەم‌و حەفتەمی زاینیدا هێند لەوپەڕی گەرمی دابو دەتگوت دژایــەتی نێــوان جولەکەو نەسرانیەکانە، هەریەك ئەوەی تــری پــێ ناڕاســت‌و ناهــەق بــو. دکتــۆر ئالفەرد.ج. باتلەر دەڵێ:

((لــەم دو ســەدەیەدا ســەردەم ســەردەمی شــەڕو خــەباتی نێــوان میــسرو رۆمانیەکان بــو. نــاکۆکی رەگــەزی‌و نــاکۆکی ئــاینی هــەردوکیان پــشکۆی ئــەم

---

(١) (Sale’s Translation,P.٦٢(١٨٩٦

خەباتەیان وەجۆش هێنابو، بەڵام کاریگەری ناکۆکی ئاینی زیاتر بو، هۆی ناکۆیەکەش دژایەتیەکەی نێوان مولکانیو مۆنۆفیسیەکان بو.

چینی یەکەم — وەك لەناوەکەیرا دیارە- لایەنگری وڵاتی ئیمپراتۆر و دەسەڵاتو نیشتمان بون و بیروباوەڕی پێشینانیان هەڵگرتبۆوەو پێیان وابو (مەسیح) دو سروشتی تێکەڵ بەیەکی هەیە. بەڵام چینەکەی تر —خەڵکی میسر بونو- لایەنگری قیبتە مۆنۆفیسیەکان بون و بیروباوەڕی چینەکەیتریان بە تاوان دادەناو رکوکینەیان لێ هەڵدەڕشتو دژایەتیەکی توندوتیژیان دەکردو بە گوڕو تینێکی وا روبەڕوی دەبونەوە زەحمەت بتوانین بیخەینە بەرچاوو بڕوا ناکەین ئەگەر گەلێك هۆشمەند بێو بڕوای بە ئینجیل هەبێ شتی وا بکات))[1].

هیرقلی ئیمپراتۆر (٦١٠-٦٤١ز) دوای ئەوەی لە ساڵی (٦٢٨ز) بەسەر فارسەکاندا زاڵ بو، گەلێکی هەوڵدا ڕاڕەوی وڵاتە دژبەیەکەکان بەیەکەوە کۆکاتەوەو لەگەڵ یەکیان رێك خاتەوە، بڕیاری دا خەڵك چیتر قسە لەبارەی حەقیقەتی سروشتەکەی (مەسیح) نەکەن و نەڵێن سروشتێکی هەیە یان دو سروشت، بەڵام دەبێ پێیان وابێ خوا یەك ئیرادەو یەك بڕیاری هەیە.

لە سەرەتای ساڵی (٦٣١ز) پێشنیارەکە پەسند کراو ڕاڕەوی مۆنۆثیلی بوە ڕاڕەوی رەسمی وڵاتو شوێنکەوتوانی کەنیسەی مەسیحی . هیرەقل لە پێناو بەرقەرارکردنی ڕاڕەوی نوێو وەلانانی ڕاڕەوەکانیتر رێگا نەما نەیگرێتە بەر، بەڵام قیبتیەکان دژی ڕاڕەوی تازە و ترازاو وەستانو لە بیروباوەڕی کۆنی خۆیان دانەبەزین، پێیان باشتر بو بکوژرێن نەك لە ڕاڕەوی خۆیان بگۆڕێن.

ئیمپراتۆر بۆ جارێکیتریش هەوڵیدا ڕاڕەوەکان یەکبخاتو ناکۆکیەکان بنبڕ بکات، دوای تاووتوێ گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە خەڵك تەنها ئەوەندە بسەلمێنن خوا یەك ئیرادەی هەیەو مەسەلەکەی تریش کە ئایا ئیرادەکە لە کردەوە بەشدارە یان نا، لەنێو باسانی هەڵبوێرنو بەهیچ جۆرێك مشتومڕی تێدا نەکەن. قەناعەتەکەی کردە پەیامێکو بە هەمو جیهانی رۆژهەڵاتیدا بڵاوکردەوە. بەڵام

---

(١) فتح العرب لمصر . تعريب محمد فريد أبو حديد . ل (٣٧-٣٨)

گەردەلولەکەی میسر بەم پەیامەش نەنیشتەوە، (قیرس) لە میسر بۆ ماوەی دە ساڵی سەرومڕ خەڵکەکەی چەوساندەوەو ئازارو ئەشکەنجەی وای پێ دەچەشتن پیاو موی دەگەڵ گرژ دەبو. خەڵکیان دەگرت دوای ئەوەی گەلێکیان ئەشکەنجە دەدان لە ناو ئاویان دەخنکاندن. ئەگەر سەربزێوێکیان[1] بگرتایە دەیانبەستەوەو کۆمەڵێك مەشخەڵی بە بڵێسەیان ئاراستە دەکرد، لەشە هەڵقرچاوەکەی چۆڕ چۆڕ لوزەوی زوخاوی هەڵدەبەست. زیندانیکراویان دێنا دەیانخستە ناو گونیەیەکی پڕ لمو پاشان سەریان توند دەبەستو توڕیان دەدایە ناو دەریا، ئەمانەو گەلێك مەرگەساتیتر.

## هەڵوەشانەوەی کۆمەڵایەتیو تەنگەبەربونی ئابوری:

لە وڵاتی رۆمی رۆژهەڵاتدا هەڵوەشانەوەی کۆمەڵایەتی گەیشتبوە ئەوپەڕی، وێڕای چەرمەسەریەکانی ژیان باجو بەرتیلێکی زۆریش لە خەڵك ئەستێنرا. خەڵك لە حکومەتەکان بێزارو هەراسان ببون و تا سەر ئێسقان رکوکینەیان لێهەڵگرتبون و خۆزگەیان بە حکومەتێکیتری بێگانە دەخواست، سەرباری ئەمانە ماڵو موڵکیش زەوت دەکران، خەڵك لەبەر ژیوارە دژوارەکەی گەلێك جاران راپەڕینو شۆڕشیان بەرپا دەکرد. لە ساڵی (٥٣٢ز) لە راپەڕینێکدا سێ هەزار کەس لە پایتەخت کوژران[2] . لەگەڵ ئەو نەهامەتیو ناگزوریەشدا خەڵکەکە پشتاوپشت سواری دنیا ببونو لە رادەبەدەر دەستبڵاوبون و بەهەر چۆنێك بوایە هەوڵیان دەدا پارەوپولێك پەیدا بکەن و بیکەنە شاباشی رابواردنو ئارەزوبازی.

بناغەی پیاوەتیو مەردایەتی داڕما بو، کۆڵەگەی خورەوشت داڕوخا بو، خەڵك زگورتایەتییان پێ لە ژینی ژن و مێردایەتی خۆشتر بو تا بەڵکو بە ئازادی

---

١ سەربزێو: یاخی.

(٢) Encyclopeadia Britanica. See Justin

ئارەزوی تێر بکردایە[١]. (سەیل) لە بارەی دادگەریەوە دەڵێ: (( وەك کەلوپەل دەکڕدراو دەفرۆشرا، بەرتیلخۆریو گزیکاریش ئافەرینی بۆ هەڵدەدرا))[٢]. (جیبۆن) دەڵێ: ((ولاتی رۆم لە کۆتایی سەدەی شەشەمدا گەیشتبوە نزمترین پنتی هەڵدێرانو نشێوی[٣]، وەك ئەو درەختە زەبەلاحەی لێهاتبو کە رۆژێك لە رۆژان گەلانی دنیای لەبەر سێبەرە فرەوانەکەی هەسابێتەوەو پاشان لكو گەڵاکانی هەڵوەریبێو تەنها قەدە روتەڵەکەی مابێتەوەو ئەویش رۆژ لە رۆژ ژاکاوتر بێت))[٤]. نوسەرانی (مێژوی جیهان بۆ مێژونوسان) دەڵێن : (( ئەو شارە مەزنانەی خێرا خاپور بونو جارێکیتر شکۆداریو بوژانەوەیان نەبینیەوە شاهیدی ئەوەن کە دەوڵەتی بێزەنتینی لەو سەردەمەدا لە چ داڕوخانێکی زەبەللاحدا بوە، داڕوخانەکەش لەبەر ئەوە بوە کە گومرگو باجێکی لە توانا بەدەریان لەسەر خەڵك داناوە و بازرگانی بێهەرمێن بوە و کشتوکاڵ بایەخی پێنەدراوەو ئاوەدانکردنەوەش روی لە کەمی بوە))[٥].

## میسری سەردەمی وڵاتی رۆم لە روی ئاینو ئابوریەوە:

میسری بە خێروبێر و خێوی نیلی بە بەرەکەت لە نێو هەردو بەرداشی نەسرانیەتو ولاتی رۆمدا ببوە بەدبەختترین ولاتی سەرروی زەوی، یەکەم توشی شەرەقسەی چۆنیەتی سروشتی مەسیحو فەلسەفەی خواناسیو میتافیزیکای دەکرد، کە لەسەردەمی حەفتەمدا خراپترین کارەساتو پەشێوی لێکەوتەوەو هزرو هێزی خەڵکی کەشەنگو بەنگ کرد، دوەمیش بە درێژایی (دە) ساڵان بە مەهانەی دین دەیچەوساندەوەو بە ناوی رامیاریش زولمی لێدەکردو

(١) Edward Gibbon: The History of Decline and fall of the Roman Empire, V.٣.P.٣٢٧

(٢) (Sale's Translation P.٧٢(١٨٩٦

(٣) The History of Decline and fall of the Roman Empire, V.V P.٣١.

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشو.

(٥) Historian's History of the Warld V.VII p.١٧٥

ئەشکەنجەو ئازاری وای پێدەچەشت تەنانەت ئەوروپای سەردەمی تەفتیشی دینیش شتی وای بەخۆوە نەدیوە.

ئەم رەوشە وای بەسەر هێنابو، ئاگای لە رەوتی ژین نەمێنێ و، لە گشت کارێکی پیرۆزی ئاینی و روحی لاکەلا بێ، لە لایەك داگیرکراوەیەکی وڵاتی رۆم بو کەچی لە دەسەڵاتی رامیاری بێبەش بو، لەلایەکی دیکەشەوە نەسرانی بەو بەڵام ئازادی ئاینیو ئازادی بیروڕای پێ ڕەوا نەدەبینرا و ئەگەر باسی ئازادیشی کردبا روڕەش بوا.

دکتۆر (گۆستاف لۆبۆن) لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (ژیاری عەرەب) دەڵێ:

((میسریان بە زۆری زۆردارەکی کردە نەسرانی، کە ئەمەش بوبوە هۆی داڕوخانی و تا عەرەب فەتحیان نەکرد خۆی نەگرتەوەو رزگاری نەبوە میوانی. ئەوکات میسر ببوە شانۆی گەلێك ناکۆکی ئاینیو توشی گەلێك کلۆڵیو بەدبەختی ببو. خەڵك بەهۆی ناکۆکیەکانەوە سەنگەریان لە یەکتر دەگرتو شەڕو کوشتاریان بەرپا دەکرد. میسر –کە دابڕدابڕبونی ئاینی هەڵیلوشی بو و ستەمو زۆرداری فەرمانڕەوایان هێزو بڕستی بڕیبو- رکوکینەیەکی توندوتیژیان لەمەڕ کاربەدەستانی رۆم هەبو و هەمو دەمێك بە هەویای ئەو رۆژە بون کە لە چنگوڕکی قەیسەرە ستەمکارەکانی قوستەنتین رزگاریان ببێ))[1].

دکتۆر ئالفەرد .ج. باتلەر لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (فەتحی میسر لە لایەن عەرەبەکانەوە) دەڵێ :

(( ئەوەی راستی بێ میسر لە سەدەی حەفتەمدا کێشە ئاینیەکەی لە کێشە رامیاریەکەی گەورەتر بو، چونکە دەسەڵات نەببوە هۆی کۆمەڵ کۆمەڵ بونو دوبەرەکی، بەڵکو سەرجەم دوبەرەکیەکان بەهۆی بیروباوەڕو ئاینەوە سەریان هەڵدەدا. لە دیدی خەڵك دین وەك کانیاوێك نەبو کردەوەی چاکی لێ سەرچاوە بگرێ، پێیان وابو تەنها بیروباوەڕێکە لەنێو چەند بنەڕەتێکی دیاریکراودا و هیچیتر.

---

(١) حضارة العرب، تعريب: عادل زعيتر، الفصل الرابع (العرب في مصر) ل ٣٣٦ .

گشت دوبەرەکیو مشتومڕە توندوتیژەکانی خەڵك بەهۆی چەند وردە جیاوازیەکی بیروباوەڕیەوە پەیدا ببون. لە پێناو چەند بابەتێکی بێنرخ و لە پێناو چەند جیاوازیەکی ورد لە بارەی بنەڕەتی دینو فەلسەفەی میتافیزیکاوە[1] ژیانی خۆیان دەخستە بەر مەترسیەوە کە زۆر زەحمەتە پیاو تێیان بگاتو درکیان پێبکات))[2].

ولاتی رۆم وەك نێچیرێك میسری خستبوە بەر چنگی خۆی و بە ئارەزوی خۆی بەروبومی لێ دەدۆشیو خوێنی گەلی هەڵدەنۆشی، ئالفەرد دەڵێ:

(( رۆمەکان سەرانەیان لە هەمو کەسێك وەردەگرتوجۆرەها باجیشیان لە خەڵك دەسەند... هەڵبەت گشت باجەکان لە سەروی توانای خەڵکەکە بونو رەمەکیانە بڕەکەیان دیاری دەکرد))[3].

نوسەرانی (مێژوی جیهان بۆ مێژونوسان) دەڵێن:

((بڕێکی زۆر گەورەی دەرامەتو بەروبومەکانی میسر دەچوە ناو خەزێنەی ولاتی بیزەنتین. چینی رەنجدەرانی میسری-وێڕای ئەوەی لە هەمو دەسەلاتێکی رامیاری بێبەش بون- ناچاریش بون جگە لەو باجانەی لێیان ئەستێنرا سەر زەویانەش بدەن، سەروەت و سامانی میسریش لەو سەردەمەدا لە کەمبون و نزمی دابوو))[4].

بەمجۆرە میسر لەبەر هەردو بەلای چەوساندنەوەی ئایینیو ستەمو دەسبەسەرداگرتنی رامیاریو ئابوری ژیانی لێ تاڵو لێڵ ببو و لەناو ژانو ناسۆری خۆی دەتلایەوەو ئاگای لە هەمو شت بڕا بو.

---

١ میتافیزیکا: ئەودیو سروشت.
(٢) فتح العرب لمصر . ل (٤٧)
(٣) هەمان سەرچاوەی پێشو.
(٤) Historian's History of the Warld V.VII p.١٧٣

## حەبەشە :

حەبەشەی دراوسێی میسریش لەسەر ڕاڕەوی (مۆنۆفیسی) بو، گەلێك جۆرە بتیان دەپەرست کە هەندێکیان لە هەمەجیەکان خواستبۆوە. یەکتاپەرستیەکەیان جۆرێکی پێشکەوتو بو لە بتپەرستیو بەرگێکی زانستانەیان لەبەر کردبو و بە گەلێك زاراوەی نەسرانی ڕازاندویانەوە.
دینەکەیان بێ‌گیان بو، دنیاکەیان بێ‌ڤیان بو، کۆڕی (نیقیە)ش بڕیاری لەسەر ئەوە دابو کە لە کاروبارەکانی ئایندا سەربەخۆ نیەو شوێنکەوتوی تەختی ئەسکەندەرە .

## نەتەوە ئەوروپیەکانی باکورو ڕۆژئاوا :

ئەو نەتەوە ئەوروپیانەی کە بە باکورو ڕۆژئاوادا بڵاو ببونەوە لە نێو شەوەزەنگی نەفامێتیو نەخوێندەواریو شەڕی خوێناویدا پەلیان دەکوتا. هێشتا سپێدەی ژیارو زانست گزنگی بۆ پەخش نەکردبون، هێشتا ئەندەلوسی ئیسلامی نەهاتبوە سەر شانۆکەیان تا پەیامی زانستو ژیارەکەیان پێشکەش بکات و ئەزمونو ڕوداویش قاڵی نەکردبون. کەمێك نەبێ دەنا هیچیان لەبارەی جیهانو جیهانی شارستانیش هیچی لەبارەوە نەدەزانین، لەمەڕ ئەو ڕوداوانەی کە لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا رویان دەداو ڕێڕەوی مێژویان دەگۆڕی لە گوێی گادا نوستبونو بە ئاستەمیش پێی نەدەبزوان، لە نێوان نەسرانیەتیەکی نەوکام و بتپەرستیەکی پڕ ژەنگو ژاردا بون، خاوەنی هیچ پەیامێکی ئاینیو ئاڵایەکی ڕامیاری نەبون.
ھ . ج . ویلز دەڵێ:
(( ئەوروپای ڕۆژئاوای ئەو سەردەم هیچ نیشانەیەکی یەکبونو ڕژێمداری تێدا نەبو ))[1].

---

H.G.Wells : A Short History of Warld P.١٧٠ (١)

روبەرت بریفۆلت (Robert Briffault) دەڵێ :
(( ئەوروپا لە سەدەی پێنجەمەوە تا سەدەی دەیەم شەوێکی ئەنگوستەچاوی بەسەردا راشکاو تا دەهات شەوەکەی رەش‌و تاریکتر دەبو، هەمەجیەتی ئەو سەردەم لە هەمەجیەتی سەردەمی کۆن وێرانترو کارەساتتر بو، چونکە پتر لە تەرمی ژیارێکی زەبەلاح دەچو کە بۆگەن بۆبێ‌و مەشخەڵکەی خامۆش بوبێ‌و کاری لەکار تەواو بوبێ. نیشتمانە گەورەکانی وەکو ئیتالیاو فەرەنسا کە لە رابردودا ژیارێکی هەرە پێشکەوتویان تێدا گەشابۆوە ئەوانیش ببونە نێچیری بەر وێرانی‌و کاولکاری‌و بێسەروبەری ))[١].

## جولەکە :

لە ئەوروپاو ئاسیاو ئەفریقیادا نەتەوەیەك هەبو لە بواری ئایندا لە گشت نەتەوەکانی‌تر دەوڵەمەنتر بو، لە هەموان پتر لە زاراوەو واتاکانی دین دەگەیشتن‌و شارەزاتر بون کە ئەویش جولەکە بون، بەلاّم لە روی ژیارو رامیاری‌و هەتا ئاینیش هۆکاری کاریگەر نەبون. لە دێر زەمانەوە هەر نەتەوەی تر قەڵەمڕەویتی بەسەردا کردون‌و هەمیشە توشی دەربەدەری‌و ئازارو ئەشکەنجە کراون و بە زەبرو زەنگی زۆرداران چەوسێنراون.
بەهۆی ئەو مێژوە تایبەتیەی پێیدا تێپەڕیون و بەهۆی ئەو سیفەتانەش کە لە نەتەوەکانی تریان جویێ دەکاتەوە وەکو ژێردەستەیی هەمیشەیی، چەوسانەوەی لە رادەبەردەر، فیزو دەماری نەتەوەپەرستی، کەشوفشی نەژادی، چاوچنۆکی‌و چروکی، پارەپەرستی‌و ریباکاری؛ نەفسیەتێکی نامۆو گەلێك خوڕەوشتی تایبەتیان بۆ دروست ببو وەکو سەرشۆڕی لە کاتی زەبونیدا، بەدڕەفتاری لە کاتی دەسەلاّتدا، دوڕویی و گزیکاری، دلڕەقی و خۆپەرستی، خواردنی ماڵی خەڵکی بە ناڕەوا، کۆسپ خستنە بەردەم رێی خوا، کە لە هەمو سەردەم‌و شوێنێکدا وەك دروشم بەم سیفەتانەوە دەناسرانەوە.

---

Robert Briffault : The making of Humanity P. ١٦٤ (١)

قورئانی پیرۆز وەسفێکی وردو قوڵی سەدەی شەشەمو حەفتەمیان دەکات، باسی رەوشتی داتەپیوو دەرونی روخاوو کۆمەڵایەتی هەڵبزڕکاویان دەکات، کە بە هۆی ئەم سیفەتانەوە لە پێشەوایەتی نەتەوانو لە سەرکردایەتی جیهان دابڕان و داڕوخان.

## نێوانی جولەکەو مەسیحیەکان :

لە سەرەتاکانی سەدەی حەفتەمدا گەلێك روداو لە نێوان جولەکەو مەسیحیەکان سەری هەڵدایەوە، سینە پڕ بون لە کینەو دوبارە دوژمنکاری هاتەکایەوە. لە دواهەمین سالی حوکمی فۆکاسدا (٦١٠ز) جولەکەکان لە مەسیحیەکانی ئەنطاکیە هەڵسانەوەو گەمارۆیان دان، ئیمپراتۆریش بۆ ئەوەی شۆڕشەکەیان لەناو ببات (ئەبنۆسۆس)ی سەرکردەی رەوان کرد. ئەویش دەستی نەپاراستو هەرچی پێیکرا کردی، ئەوەی بەر شمشێری کەوت، ئەوەی لە سێدارەی هەڵواسی، ئەوەی لە ئاوێ خنکاندی، ئەوەی بە ئەشکەنجە کوشتی، ئەوەی کردیە خۆراکی دڕندان، کەسی قوتار نەکرد.

جولەکەو مەسیحیەکان هەمیشە لەگەڵ یەك ناکۆك بونو ناوەناوە یەکێکیان زەبری خۆی دەوەشاند. مەقرێزی لە پەرتوکی (ئەلخوطەط)دا دەڵێ: (( لە رۆژگاری (فۆکا)ی پاشای رۆمەکاندا، کیسرای پاشای فارسەکان بە لەشکرێکی گەورەوە هێرشی بردە سەر وڵاتانی شامو میسر، کەنیسەکانی قودسو فەلەستینو سەرجەم وڵاتەکانی شامیان وێران کردو هەرچی مەسیحی بو کوشتیان، پاشان هێرشیان بردە سەر میسر، لەوێش خەڵکێکی زۆریان کوشتو بڕ کردو ژنو منداڵێکی بێ ئەژماریشیان بە تاڵان برد. جولەکەکان لە شەڕو وێرانکردنی کەنیسەکاندا یارمەتی فارسەکانیان دەدا، لە طەبەریەو جەبەللجەلیلو گوندی صورو ناصریەو ئاوایی قودسەوە ڕا پێشوازیان لە فارسەکان کردو دەست لەناو دەست زەبرێکی کوشندەیان لێ‌وەشاندنو دو کەنیسەی قودسیان روخاند و

خانوبەرەی خەڵکیان سوتاند و پارچە خاچێکیان رفاند و بەطرەکی قودس‌و چەند یاوەرێکیشیان بە دیل گرت))[١].

پاشان دوای باسکردنی داگیرکردنی میسر دەڵێ:

(( لەو هەراو هۆریایەدا جولەکەکانی شاری صور راپەرین، بەدوای جولەکەی شارەکانی‌تریشیان دانارد، پەیمانیان بەیەکتر دا لەگەڵ مەسیحیەکان بەشەڕ بێن‌و تەخت‌و بەختیان وەرگەڕێنن، لە شەڕێکدا بیست هەزار جولەکە کۆبونەوە، شالاویان بردو هەمو کەنیسەکانی دەرەوەی شاری صوریان روخاند. بەلام مەسیحیەکان خۆیان راگرت‌و پاشان کە زۆر بون بەسەریاندا زاڵ بون و شکستێکی کوشندەیان پێ‌خواردن‌و گەلێکیشیان لێ‌کوشتن. هیرەقلیش هاوکات لەگەڵ ئەم هەرایەدا بو بە پاشای رۆمەکان‌و لە قوستەنتین تاجی پاشایەتی لەسەرنا، پلانێکی سەرکەوتوانەشی بۆ کیسرا دانایەوە و کیسرا کەوتە ناچاری و لەشکرەکەی کێشایەوە.

هیرەقل لە قوستەنتینەوە بەڕێ کەوت تا پاشانشینەکانی شام‌و میسر بەسەرکاتەوەو ئەو شوێنانەش کە فارسەکان وێرانیان کردبو بنیاتی نێتەوە. جولەکەکان کە بەم هەواڵەیان زانی لە طەبەریەو شارەکانی‌ترەوە بە کلکەسوتێوە چونە پێشوازی و گەلێك دیاری بەهاداریان پێشکەش کرد و داوایان لێکرد ئەمانیان بداتێ‌و سوێندیان بۆ بخوات تخونیان نەکەون، ئەویش ئەمانی دانێ و سوێندی بۆ خواردن. پاشان چوە قودس و نەصرانیەکان بە مەراسیمی خوێندنەوەی ئینجیل‌و هەڵگرتنی خاچ‌و بخورگێڕان‌و مۆم هەڵکردنەوە پێشوازییان لێکرد. هیرەقل کە شاری وێران‌و کەنیسەی روخاوی دیت خەفەت دایگرت‌و ئازاری کێشا. نەصرانیەکان روداویان سەرلەبەر بۆ گێڕایەوە کە چۆن جولەکەکان دەست لەناو دەستی فارسەکان شەڕیان لەگەڵدا کردون‌و کەنیسەکانیان روخاندون و تەنانەت لە فارسەکان گەلێك دڕندانەتر کوشت‌و بڕیان کردون. دنەیان دەدا تۆڵەیان بۆ بکاتەوە، ئەویش دەیگوت ئاخر سوێندم بۆ خواردون‌و ئەمانم پێداون.

(١) پەرتوکی ئەلخوطەطی مەقریزی . ٤ / ٣٩٢ .

بەڵام ڕەبەن‌و بەطرەك‌و قەشەكان فتوایان بۆدا مادەم بە فڕوفێڵ ئەمانیان وەرگرتوەو هیرەقل بە روداوەكان ئاگادار نەبوە بۆیە گوناح نیە ئەگەر كوشت‌و بڕیان بكاتەوە. لە بری سوێندەكەش خۆیان‌و نەسرانیەكان بە درێژایی ڕۆژگار لەهەمو ساڵێكدا جومعەیەك بەرۆژو دەبن، ئەویش راكەی پەسند كردو بڕیاری‌دا تۆڵەیان لێ بكەنەوە، ئەوانیش لەشكریان مۆڵ داو جولەكەكانیان تەفرو توانا كرد، مەگەر یەكێك خۆی شاردبێتەوە یان رای كردبێ‌و قوتار بوبێ ئەگینا لەسەرجەم پاشانشینەكانی میسرو شامدا هیچ كەسێكیان لێ‌نەهێشتن ...تاد)).

لەم سەربردانەوە بۆمان دەردەكەوێ كە جولەكەو مەسیحیەكان بە چ جۆرێك دوژمنایەتی یەكتریان كردوەو چۆن بە خوێنی سەری مرۆڤ تێنو بون، چۆن ئەگەر دەرفەتیان بۆ هەڵكەوتبێ تۆڵەیان لە دوژمن وەرگرتۆتەوەو هەمو سنورێكیان بەزاندوە. جا هەیاران! چۆن‌و نەتەوەیەك رەوشتەكەی بەجۆرە داتەپی بێ‌و بەجۆرە سوكایەتی بە ژیانی مرۆڤ كردبێ چۆن دەتوانێ پەیامی راستی‌و رەواو ئاشتی پێشكەش بكات؟! مرۆڤایەتی چۆن دەتوانێ لەبەر سێبەرو دەسەڵاتیدا بسێتەوە؟!

## ئێران‌و بزاڤە وێرانكارەكانی :

فارسەكان كە وەكو رۆم حوكمی نیوەی جیهانی شارستانیان دەكرد، مۆڵگەیەكی دێرین بون بۆ جموجۆڵی وێرانكارە هەرەگەورەكان كە جیهان بەخۆیەوەی دیبێ. بناغەی خوڕەوشتیان لەمێژ بو توشی لەرزین‌و شپرزەیی ببو. مشتومڕیان لەوەدا دەكرد ئاخۆ ژنی مەحرەم مارە بكەن یان نا، كە هەمو گەل‌و نەتەوەیەك پێیان ناڕەواو ناپەسند بوە. تەنانەت (یەزدیگوردی دوەم) كە لە ناوەڕاستەكانی سەدەی پێنجەمی زاینیدا حوكمی وڵاتی گرتە دەست كچەكەی

خۆی مارەکردو گواستیەوەو پاشانیش کوشتی.[١] ( بارامی چۆبین) کە لە سەردەمی شەشەمدا تاجی پاشایەتی لەسەر کرد خۆشکی خۆی گواستەوە.[٢]

پرۆفیسۆر (ئارتهەر کریستین سین) -مامۆستای زمانەکانی رۆژهەلات لە زانکۆی (کۆبنهاگن)ی دەنیمارك‌و پسپۆر لە مێژوی ئێران، لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (ئێران لە سەردەمی ساسانیەکاندا) دەڵێ:

(( گەلێك مێژونوسی هاوچەرخی وەکو (گاتهیاس) کە پسپۆرن لە مێژوی ئێرانی سەردەمی ساسانیەکان، پێیان وایە مارەکردنی ژنی مەحرەم لەناو ئێرانیەکاندا باوی هەبوە، لە سەردەمی دەسەڵاتی ساسانیەکانیشدا چەندین نمونە بۆ ئەم جۆرە مارەکردنە هەیە، بارامی چۆبین‌و گوشتاسب-پێش ئەوەی ببێتە مەسیحی- مەحرەمی خۆیان گواستۆتەوە[٣]. ئێرانیەکان ئەم جۆرە ژن هێنانەیان بە گوناح نەدەزانی بەڵکو پێیان وابو کردەوەیەکی چاك ئەنجام دەدەن‌و لەخوا نزیك دەبنەوە. لەوانەیە (هۆێن سۆئنگ)ی گەڕیدەی چینی ئاماژە بۆ ئەم جۆرە ژن هێنانە بکات کە دەڵێ : (( ئێرانیەکان بێ جوێکردنەوە هەمو جۆرە ژنێکیان دەخواست))[٤].

(مانی) لە سەدەی سێهەمی زاینیدا وەك کاردانەوەیەکی توندوتیژی دژ بە ئارەزوبازی بەربڵاوو هەروەها لە ئەنجامی مونافەسە وەهمیەکەی نێوان روناکی‌و تاریکیەوە رێبازەکەی بڵاوکردەوە کە بانگەشەی بۆ ژیانی زگورتایەتی دەکرد بەو مەبەستەی تۆوی شەڕو خراپەکاری لە جیهاندا نەمێنێ، دەیگوت تێکەڵبونی روناکی لەگەڵ تاریکی خراپەیەکە دەبێ لێی رزگار بین، بۆیە سەرجێیی بە حەرام دادەنا تابەڵکو مرۆڤایەتی خێراتر بڕێتەوە و روناکی بەسەر تاریکیدا زاڵ ببێ. بارام لە ساڵی (٢٦٧ز) کوشتی‌و گوتی: ((ئەو نەگریسە دەیەوێ جیهان وێران

---

(١)Historians History of the Warld,V.٨ P.٨٤

(٢) تاریخ الطبري: ١٣٨/٣

(٣)ئێران لەسەردەمی ساسانیەکاندا. دکتۆر محمد اقبال لە فەرەنسیەوە وەریگێڕاوەتە سەر ئۆردی. ل ٤٢٩

(٤)هەمان سەرچاوە . ل ٤٣٠

بکـا، وا باشـترە بەرلـەوەی ئاواتەکـەی بێتـەدی یەکـەجار لەخۆیـەوە دەسـت پێبکرێ)). مانی مرد بەڵام ڕێبازەکـەی تـا دوای فـەتحی ئیـسلامیش هـەر بـە زندوێتی مایەوە.

پاشان روحیەتی سروشـتی فارسـەکان شۆڕشـی لـە دژی ڕێبازەکـەی (مـانی) بەرپاکردو بەرگی بانگەوازی (مەزدەك)ی لەبەرکرد کە لە ساڵی (٤٨٧ز) لـەدایك بوە. مەزدەك دەیگوت: هەمو خەڵك بە یەکسانی لەدایك بونو جیاوازی نیـە لـە نێوانیاندا و دەبێ بە یەکسانیش بژین، جا لەبەر ئەوەی ماڵو ئافرەت دو شتی وان کە نەفسی مرۆڤ پتر ئەو دوە دەخوازێ بۆیە مەزدەك پێی وابـو دەبـێ مـرۆڤ لـەم دوانەدا پتـر یەکسانو هاوبەش بن. شەهرسـتانی[1] دەڵـێ: (( ئـافرەتو پـارەی حەڵاڵ کرد، خەڵکی وا لێکرد لەم دوانەدا هاوبەش بن وەك چۆن لە ئـاو و ئـاگرو لەوەڕ هاوبەش بون)). بانگەشەکە بە هەوەستو دڵی گەنجو دەوڵەمەنـدان بـو و ئاستانەش پەسندی کرد، شاقوباد پشتی گرتو یارمەتی بڵاوبونەوەی دەدا، تا لە ئەنجامدا ئێران لە گەرداوی بەدڕەوشتیو ئارەزوبازی لە رادەبەدەر نقوم بو)).

طبەری دەڵێ: هەرزەو هیچوپوچەکان بانگەشەکەیان بـە دەرفـەت زانـیو لـە پێنـاو رابـواردنو ئارەزوبازیـدا هەڵیانقۆزتـەوە بۆیـە شانبەشـانی مـەزدەكو مەزدەکیەکان راوەستانو پشتگیریان بۆ دەربڕی. خەڵك لەدەستیان بە هاوار بـون، دەچونە ماڵی خەڵك ژنو ماڵو خانویان لـێ زەوت دەکردن بێئەوەی خـاوەن مـاڵ بتوانێ دەستیان بگرێ. هەڕەشەیان لە شا قوباد کردبو کە ئەگەر ڕێبازەکەیان بـۆ خەڵك نەڕازێنێتەوە لە تەختی دادەبـەزێنن. بـەجۆرە دوای تێپـەڕبونی ماوەیـەك باوكو کوڕ یەکتریان نەدەناسی[2] و خەڵك هیچی لەدەست نەما پێـی دەوڵەمەنـد بێ))[3]. بەردەوام دەبێو پاشان دەڵێ: (( شا قوباد تا توشی گەرداوی مـەزدەکی نەبو باشترین پاشای فارسەکان بو، بەڵام لـەو کاتیـەوە سـنور بـەزین و پـەرژین هەڵوەشانەوە)) .

(١) الملل والنحل للشـهرستانی : (٨٦/١) .
(٢) واتە منداڵی زۆڵ پەیدا بون. -وەرگێڕ-
(٣) تاریخ الطبری : (٢ /٨٨).

## به پیرۆز زانینی کیسراکان:

کیسراکان پێیان وابو خوێنێکی خواییان لە جەستە دایە، فارسەکانیش وەك خوا تەماشایان دەکردنو پێیان وابو زاتی پیرۆزو بەرزن، ئەگەر بیاندیبان دەستی رێزیان بۆ لەسەر سینگ دادەنانو سەریان دادەنواند، سرودیان بە خواوەندێتیان هەڵدەگوت، پێیان وابو لە سەروی یاساو لە سەروی رەخنەو لەسەروی مرۆڤن، ناویان نەدەهێنان، لە مەجلیسیان دانەدەنیشتن، پێیان وابو مافیان بەسەر هەمو کەسێکەوەیە بەلاّم کەس مافی بەسەریانەوە نیە، ئەگەر پارەوپولێك یان مەڵوموشێکیان بە یەکێك بەخشیبوایە پێیان وابو چاکەو پیاوەتی دەگەڵدا کراوە نەك مافی رەوای خۆی، خەڵك نەدەبو بە هیچ جۆرێك لە قسەو فەرمانیان دەرچن.

بنەماڵەیەکی تایبەتیان دیارکردبو-کە ئەویش بنەماڵەی کەیانیەکان بو- پێیان وابو تەنها ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە دەبێ تاجی پاشایەتیان لەسەر بێو خەراج دەبێ بەس بەوان بدرێ، پاشایەتی دەبێ لە پشتاوپشتی ئەو بنەماڵەیە بێو باوك لە باپیرو کوڕ لە باوکی هەڵگرێتەوە، نابێ کەس داوای پاشایەتی بکات مەگەر زاڵمو گەمژەو کەودەنێك، لە خانەوادەی پاشا نەبوایە پاشایەتریان قبوڵ نەبو، ئەگەر گەورەیەك نەبوایە منداڵێکیان دەکردە پاشا ئەگەر کوڕیش نەبوایە ئەوا ئافرەتێك . لە دوای (شیروێ)دا ئەردەشێری کوڕیان کردە پاشا کە تەمەنی حەفت ساڵ بو، فەروخزاد خەسرۆ- کوڕی کیسرا ئەپروێز منداڵ بو بوە پاشا، بۆرانی کچی کیسرا بۆتە پاشا، هەروەها کچی دوەمی کیسراش بۆتە پاشا کە ناوی (ئەزرەمی دوخت) بو[1]. بە خەیاڵیان دانەدەهات فەرمانەدەیەکی گەورە یان یەکێك لە سەرکردەکانیان وەك رۆستەمو گابان بکەن بە پاشا لەبەر ئەوەی لە بنەماڵەی پاشایەتیدا نەبون.

(١) بگەڕێوە تاریخ الطبری : (٢ /٨٨)" تأریخ ایران لمکاریوس.

## جیاوازی نێوان توێژەکانی کۆمەڵ:

هەروەها پێیان وا بو پیاوانی بنەماڵە روحیەکانو نەجیبزادەکان لە روی جەستەو هزرو دەرونەوە لە ئاستی سەروی خەڵك دان، دەسەڵاتی رەهایان پێ رەوا دەبینن، بێ لاموجیم ملکەچیان دەبون، پرۆفیسۆر (ئارتهەر سین) نوسەری مێژوی (ئێران لەسەردەمی ساسانیەکاندا) دەڵێ:

((کۆمەڵگەی ئێرانی لەسەر بناغەی نەژادو پیشەگەری دامەزرا بو، چینەکانی کۆمەڵ جیاوازیەکی فرەوانیان لە نێواندا هەبو، هیچ پردو پەیوەندیەك بە یەکی نەدەبەستنەوە[1]، حکومەت لە خەڵکی قەدەغە کردبو خانوبەرەی میرو مەزنان بکڕن[2]، یەك لە یاسا سیاسیەکانی ساسانیەکان دەیگوت هەمو کەس دەبێ بەو پلەوپایە رازی بێ کە نەژادەکەی پێی دەبەخشێ و نابێ بۆ پلەو پایەی بالاتر هەڵڕوانێ[3]، تەنها دەبێ ئەو پیشەیە هەڵبژێرێ کە خوا لە پێناویدا خەڵقی کردوە[4]، نابێ هیچ پیشەیەکیتر هەڵبژێرێ[5]، پاشاکانی ئێران کاریان بە مەندەبۆران[6] نەدەسپارد[7]، خەڵك لە گەلێك چینی جیاواز پێك هاتبون، هەر چینێك پلەوپایەی دیاریکراوی خۆی هەبو))[8].

جیاوازی چینایەتی بۆ مرۆڤایەتی ریسوا بون بو، جیاوازیەکە لە کۆڕی میرو مەزنان ئاشکراتر وەدیار دەکەوت، کە میر دادەنیشت خەڵك وەك کۆلکەداری رەق رەپ رادەوستان، کە داشدەنیشتن وەك سەگی بەستەزمان قڕوقەپ وەردەکەوتن. شاندی موسڵمانان کە ئەم رەوشەی بینی گەلێکی پێ تاوان بو و نارەزایی

(١) ئێران لەسەردەمی ساسانیەکاندا، ل ٥٩٠
(٢) هەمان سەرچاوە، ل ٤٢٠
(٣) هەمان سەرچاوە، ل ٤١٨
(٤) هەمان سەرچاوە ل ٤١٨
(٥) هەمان سەرچاوە، ل ٤٢٢
(٦) مەندەبۆر: بۆرەپیاو، دني.
(٧) هەمان سەرچاوە ٤٢٢
(٨) هەمان سەرچاوە، ل ٤٢١

لێدەربڕی. (طەبەری) لەم روداوەی دەیگێڕێتەوە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە فارسەکان لە مەڕ میرومەزناندا لە چ سەرشۆڕیەکی لە رادەبەدەردا ژیاون، دەڵێ:

((لە ئەبا عوسمانی نەهدییەوە دەگێڕنەوە کە گوتویەتی: کاتێ موغیرە لە پردەکە پەڕیەوەو گەیشتە لای فارسەکان، ئەوانیش پێشوازیان لێکردو دایاننا، دوای روخسەتی رۆستەم رێگەیان دا بچێتە ژورەوە، فارسەکان خۆیان پۆشتە کردبو، تاجی زێڕیان لەسەر نا بو، کەوای زێڕینیان بەشان دادابو، فەرش‌و مافوری جوان‌و رازاوەیان راخستبو، تا یەکێك دەگەیشتە هەورازێ دەبوایە چەندین پایە ببڕێ، موغەیرە چوار کەزی تا سەرشانی شۆڕ ببۆوە، بەرەو ژورێ هەڵکشا و چوە لای رۆستەم‌و لەسەر تەختەکەی دانیشت، دامودەستەی رۆستەم دەورەیان لێداو کردیانە هەراو هۆریا و یەخەیان رادەکێشاو سەروسەکوتیان دەکوتا، پێیان نارێك بو لەگەڵ رۆستەم دانیشتوە! موغیرە کە ئەمانەی دیت گوتی: وا تێدەگەیشتین گەلێکی هۆشمەندن بەڵام بۆم دەرکەوت لە هەمو نەتەوان گەمژەترو چروکترن، ئێمەی عەرەب هەمو وەکو یەکین، کەس هیچ کەس ناکاتە بەندە مەگەر لە شەڕ، وامدەزانی ئێوەش وەك ئێمە دەگەڵ گەل یەکسانن، باشتر بو پێم بڵێن کە کەسانێکتان کردۆتە خواو ناخوازن کەس دەگەڵ خواکانتان دانیشێ!، منیش لە خۆمەوە نەهاتوم بەڵکو بە دواتاندا ناردوم، بەڵام ئەمڕۆ دڵنیا بوم دەدۆڕێن‌و تەخت‌و بەختی شاهانەتان وەردەگەڕێ، هیچ پاشایەتیەك بەم نەشم‌و رێوشوێنە تاسەر نیەو بە هۆشی وا خۆی راناگرێ ))[1].

## شکۆدارکردنی نەتەوەی فارس :

فارس گەلێکیان بەشان‌وشکۆی نەتەوەکەیان هەڵدەگوت و پێیان وابو لە گشت نەتەوەو رەگەزەکانی‌تر بالاترن‌و ئەو بەهرەیەی خوا بەوانی بەخشیوە بە گەلانی‌تری نەبەخشیوە، بەچاوێکی سوکەوە سەیری نەتەوەکانی دەوروبەریان دەکردو ناوو ناتۆرەی بێنرخ‌و سوکیان لێدەنان.

(١) الطبري ٤ / ١٠٨.

## ئاگر پەرستیو کاریگەریەکەی لەسەر ژیان :

فارسەکان لە رۆژگاری دێریندا خوایان دەپەرستو سوژدەیان بۆ دەبرد، پاشان وەك هاوبەشپەرستەکانیتر خۆرو ئەستێرەو هەسارەکانی ئاسمانیان لەلادا پیرۆز بو. زەردەشت-خاوەنی دینی فارس پەیدا بو، وەکو دەڵێن بانگەوازی بۆ یەکخواپەرستی کردوە و بتپەرستی نەهێشتوە، دەیگوت: نوری خوا لە گشت شتێکی رۆشنو بلێسەداری گەردون دەدرەوشێتەوە، پێی وابو روناکی نیشانەی خوایە بۆیە فەرمانی دا لە کاتی نوێژدا رو لە خۆر بکەن، دەیگوت: ئەم چوار رەگەزە؛ ئاگر، هەوا، خۆڵ، ئاو پیس مەکەن. دوای مەرگی زەردەشت زانا زەردەشتیەکان چەند شەرعێکیتری جیاوازیان داڕشت و هەرشتێك ئاگری گەرەك بوایە حەرامیان کردبو، تەنها بەکاروباری کشتوکاڵو بازرگانی خەریك بون، پاشان بەرەبەرە لە ئاگر پیرۆزیو روتێکردنەوە نزیکتر بونەوە تا پەرستیانو پەیکەرو ئاتەشگەیان[1] دروستکرد. دینو بیروباوەڕەکانیتر نەمانو ئاسەواریان بڕایەوە، تەنها ئاگرپەرستی مایەوە))[2].

جا لەبەر ئەوەی ئاگر پەیامو پەیامبەری نەدەنارد و رێوشوێنی بۆ ژیان دانەدەڕشتو تاوانبارو سەربزێوانی سزا نەدەدا بۆیە دینی ئاگرپەرستان تەنها وەك چەند رێورەسمێکی لێهاتبو کە لە ساتوشوێنی تایبەتدا بەڕێوە دەبران. لە دەرەوەی ئاتەشگە و لە ماڵو شوێنی کار و لە مەسەلەی رامیاریو کۆمەڵایەتیدا وەکو سەرجەم هاوبەشپەرستان ئازاد بون و هەوەستو ئارەزوی دڵو بیرکردنەوەو بەرژەوەندی دەیبزواندن.

بەمجۆرە نەتەوەی فارس دینێکی فرەلایەنو قوڵیان نەبو دڵو دەرون پەروەردە بکات و خوڕەوشت مشتوماڵ بکات و ئارەزوبازی جلەوگیر بکات و مەردوم بەرەو چاکە هان بدات و ببێتە سیستەمی خێزانو کاری نێو ماڵ رێك بخات، یان ببێتە سیاسەتی وڵات و دەستوری گەل، یان زوڵمی پاشاو زەبروزەنگی کاربەدەستان لە

(١) ئاتەشگە: پەرستگەی ئاگرپەرستان.

(٢) سەرنج بدە پەرتوکی (مێژوی ئێران) نوسینی: شاهین ماکاریوس. ل ٢٢١-٢٢٤

کۆڵ خەڵکی بکاتەوە و دەستی ستەمی ستەمکاران بشکێنیو مافی مەزلومان بستێنێ. ئاگرپەرستەکان لە روی خورەوشتو کردەوەدا لەگەڵ لائیک[1] و بەرەڵلاخوازەکانی ئەمرۆ جیاوازیان نەبو.

## چین: دینو سیستەمەکەی:

چینی ئەو سەردەم سێ دینی تێدا باوبو : لاوتسۆ، کۆنفۆشیۆس، بوذایەتی. یەکەمیان هێندەی نەبرد بوە بتپەرستی، کە پتر گرنگی بە لایەنی تیۆری دەدا، شوێنکەوتوانی پەرپوتو تەریکە دنیا بون، ژنیان نەدەهێنا، تەماشای ئافرەتیان نەدەکرد و سەروکاریان دەگەڵدا نەبون، ئەم دینە لەباریدا نەبو بنەمای ژیانێکی راستەرێ دابرێژێ یان حکومەتێکی سەرراست دامەزرێنێ، بۆیە ئەو شوێنکەوتوانەی لە دوای مردنی دامەزرێنەران هاتن لە رێبازیان لاداو پاڵیان وەپاڵ ئاینیتر دا.

بەڵام کۆنفۆشیۆس پتر بایەخی بە لایەنی پراکتیکی دەدا، ئامۆژەکانی لە جوغزی کاروباری دنیاو ماددەپەرستیو سیاسەتو کارگێری دەخولایەوە. شوێنکەوتوەکانی -لە هەندێ رۆژگاردا- پێیان وا نەبو خوایەکی دیاریکراو بپەرستن، بۆیە بە ئارەزوی خۆیان دارو بەردو روباریان دەپەرست. روناکی دڵنیاییو ئەنگێزەی[2] بروایی‌و شەرعی ئاسمانی تێدا نەبو، بەڵکو لە کۆمەڵێك پەندو ئەزمونی داناو دنیادیتان پێکهاتبو، مرۆڤ تێیدا ئازاد بو، ئەگەر مەیلی بوایە سودی لێوەردەگرت ئەگەرنا رەتی دەکردەوە.

---

(١) لائیك: بێدین.
(٢) ئەنگێزە: باعث.

## بوذایەتی : پەرسەندن و داڕوخانەکەی :

بوذایەتی تێنوتاوی سادەییەکەی نەمابو، بەرەهمێتی[1] سینەپڕ کینەو داخ لەدڵ قوتی دابو، ببو بە بتپەرستی، بۆ هەرکوێ دەچو بتی دەگەڵ خۆ دەبرد و لەهەر کوێ هەواری هەڵدابوایە جۆرەها پەیکەرو کۆتەڵی بوذای دادەتاشی. لە رۆژگاری هەرەتی بوذایەتیدا ژیانی ئاینیو شارستانی لەناو بتو پەیکەردا نغرۆ ببو[2]. ئوستاد(ئیشوراتوبا)-ئوستادی مێژوی ژیاری هیندستان لە یەك لە زانکۆکانی هیندستان دەڵێ: ((لە سایەی بوذایەتیدا ولاتێك پەیدا بو گەلێك بایەخی بە دیاردەی خواوەندایەتیو بتپەرستی دەدا، پەیوەندی برایانەی بوذایەتی گۆڕانی بەسەردا هات، تازەباویش سەریهەڵدا))[3].

نوسەرێکی هاوچەرخو گەورە سیاسەتمەدارێکیتری هیندیش ئەمەی تێبینی کردوەو دەڵێ:

(( بەرەهمێتی بوذایان کردبوە نیشانەی خوایەتی، بوذییەکانیش لەمەدا لاسایان دەکردنەوە، پەیوەندی برایەتی بوذایی ببو بە خێوی سامانێکی زۆرو زەوەند، ببو بە مەڵبەندێك بۆ بەرژەوەندی چەند کۆمەڵێکی تایبەتی، رژێمی ون کردبو، ئەفسونو ئەفسانە تێکەڵ بە رێوشوێنی پەرستنکاری ببون، بوذایەتی دوای ئەوەی بۆ هەزار ساڵ لە هیندستان لە هەرمێنو گەشە دابو سەرومڕ دادەڕوخاو دەکشایەوە. خاتو (**Rhys Davids**) باسی ئەو لاوازیو نەخۆشیانە دەکات کە توشی بوذایەتی ئەو سەردەم ببو، سەیدا (رادها کرشتن) لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (فەلسەفەکەی هیندستان) وتەکەی خاتون رادەگوازێتەوەو دەڵێ:

---

(١) بەرەهمێتی: البرهمیة.

(٢) پیاو ئەگەر سەردانی مۆزەخانەی (تکسلا)ی رۆژئاوای بەنجابی پاکستان بکات، لەبەردەم ئەو هەمو بتانەی بوذادا سەری سوڕ دەمێنێ و ئەو کات بۆی دەردەکەوێ دینو شارستانێتی بوذایی لە چ بتپەرستیەکدا بون. بتەکان لە شارە رۆچوەکانی ژێر زەوی دەرهێنراون .

(٣) (هیندستانی کۆن) بە زمانی ئوردی، نوسینی ئوستاد ئیشوراتوبا.

((هزرە نەخۆشەکان سێبەریان بەسەر ئامۆژە خورەوشتیەکانی بوذا هەڵکشاند تا لە نێو خەیالاتی نەخۆشدا گوم بو، دینەکە رارەوێکی نوێی لێ پەیدا بو، پەرەی ستاندو دڵو دەرونی خەڵکی داگرت، پاشان پوکایەوەو رارەوێکیتری لێکەوتەوە، ئەویش پوکایەوەو یەکێکیتر جێی گرتەوە، بەمجۆرە چوە دوێ، تا وەهمەکان کەڵەکە بونو بەری ئاسۆ گیراو تاریکستان چرنوکی لە زەوی گیر کرد. پەندو ئامۆژە بەنرخو سادەکانی بوذا بە هۆی مشتومری کەلامناسیەوە چروسایەوەو تێچو ))[1].

((بەرەهمێتیو بوذایەتی توشی داروخان بون، نەریتو باوی داتەپیویان تێکەوت، گەلێك زەحمەت بو لە یەکتری جوێ بکرێنەوە، بوذایەتی ئاخنرابوە نێو بەرەهمێتیو لەناویدا توا بۆوە ))[2].

مێژونوسان کە لەم دینەیان کۆڵیوەتەوە و تۆژەرەوان کە سەربردەی بوذایان نوسیوەتەوە، هێشتا بۆیان ساغ نەبۆتەوە ئاخۆ بوذاییەکان خوایان هەبوەو بروایان بە خوا هێناوە یان نا؟ هەندێکیان سەیرماونو دەڵێن: ئەم دینە مەزنە ئەگەر بروابون بە خوای تێدا نەبوبێ چۆنی توانیوە لەسەر بناغەی ئەو دابو رەوشتە ناسکانە دابمەزرێ[3]. بوذایەتی هەر بریتی بو لە چەند رێگایەك بۆ ئەوەی مرۆڤ دەرونی خۆی پێ پەروەدە بکات و ئارەزوەکانی پێ سەرکوت کا و بەرگی خورەوشتی جوان بپۆشێ، لە ئێشو ژان رزگار ببێو زانست وەدەست بێنێ.

کەواتە چینیەکان پەیامێکیان بۆ جیهان پێنەبو گرفتەکانی چارەسەر بکەن، جگە لەمە لە پەرگەی ئەوسەری رۆژهەڵاتی جیهانی شارستانیش بونو کەلەپوری ئاینو زانستەکەشیان توند لەمستی خۆ گرتبو، نە سامانی خۆیان پتر دەکرد نەهی خەڵکی.

---

(١) Jawaher Lal Nahru: The Discovery of India, p. ٢٠١,٢٠٢ .

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشو .

(٣) مەقالەی (بوذا) بخوێنەوە لە ئینسکلۆپیدیای (دائرة المعارف) بەریتانی .

## نەتەوەکانی ئاسیای ناوەڕاست:

نەتەوەکانیتری ئاسیای ناوەڕاستو رۆژهەلات وەکو مەغۆلو تورکو یابانیەکان لە نێوان بوذایەتی گەندەڵ و بتپەرستایەتی هەمەجی دابون و خاوەنی هیچ سامانێکی زانستی و هیچ سیستەمێکی سیاسی پێشکەوتو نەبون، بەڵکو لە قۆناغێکی ئینتیقالی دابون لە سەردەمی هەمەجیەوە بەرەو سەردەمی شارستانی، چەندین گەلیتریش هەبون کە تاکو ئێستاش هەر لە قۆناغی ئاوەزێکی رەشماڵنشینیو مندالیدا دەژین.

## هیندستان: لە روی دینو کۆمەڵایەتیو خوڕەوشتەوە:

ئەو مێژونوسانەی لە بارەی هیندستانیان نوسیوە لەوەدا یەکدەنگن کە داڕوخاوترین سەردەمی هیندستان لە هەر سێ لایەنی ئاینو خوڕەوشتو کۆمەلایەتیدا لە سەرەتای سەدەی شەشەمی زاینیەوە دەست پێدەکات، هیندستانیش سای دراوسێکانی لە هەمان خوڕەوشتی داتەپیوو کۆمەلایەتی شپرزەدا دەژیا کە گشت زەمینی تەنیبوەوە، ئەو شەوەزەنگەی باڵی بەسەر جیهان راهێلا بو هیندستانیشی گرتبوەوەو لە گەلێك دیاردەو ئەدگاریشدا تازیارێتی وەرگرتبو، کە دەتوانین لە سێ خالّدا کۆیان بکەینەوە: (١) بونی ژمارەیەکی لە رادەبەدەر بتوخواوەند. (٢) زایەندێکی[١] هاروهاجی بێسنور (٣) جیاوازیەکی فرەوانی چینایەتی.

## بتپەرستی سنوربەزێن :

هیندستانی سەدەی شەشەم لە بتپەرستیدا گەیشتبوە ئەوپەڕی. ژمارەی ئەو خواوەندانەی لە (ویدا)دا هەبون سیوسێ دانە بون، کەچی لەو سەردەمدا خۆی لە ٣٣٠ ملیۆن دەدا . هەمو شتێکی جوانو سەرنجڕاکێشو بەهرەبەخش ببونە

---

(١) زایەند: سێکس.

خواوەندو دەپەرستران، بتو پەیکەرو خواوەندەکان لە ژمارە نەدەهاتن، هەندێکیان پاڵەوانی مێژویی بون کە پێیان وابو خوا لە چەندین روداوو رۆژگاردا خۆی لەناو ئەواندا رانواندوە، هەندێکیان شاخ بون کە پێیان وابو چەند خواوەندێك لەسەریان وەدەرکەوتون، هەندێکیان کانزای وەکو زێڕو زیو بون کە پێیان وابو خواوەندیان تێدا بریسکاوەتەوە، خواوەندێکیتر روباری (کنج) بو کە پێیان وابو لەسەری (مەهادیۆ)ی خواوەندەوە سەرچاوەی هەڵبەستوە، هەندێکیتریان کەرستەی شەڕو کەلوپەلی نوسینو ئامرازی زاوزێو هەسارەی ئاسمانو ئاژەڵ بون کە مەزنترینیان چێڵ بو، گەلێ شتیتریش. دینەکەیان تەنراوێك بو لە گەلێ جۆرە ئەفسانەو داستانو سرودو بیروباوەڕو پەرستنکاری پێکهاتبو، کە نە خوا پەیامی پێ ناردوە نە لە هیچ رۆژگارێکیشدا ئاوەزی ساغ شتی ئاوای دارشتوە .

پیشەسازی داتاشینی بتو پەیکەر لەو سەردەمدا گەلێك پێشکەوت، لە سەدەی شەشەمو حەفتەمدا گەیشتە هەرەتو لە سەردەمە رابردوەکانیشی تێپەڕاند. گشت چینو توێژو خەڵکی وڵات لە پاشاوە هەتا گەدا بتیان دەپەرست، تەنانەت بوذایەتیو گەینایەتیش[1] نەیانتوانی خۆیان لێ هەڵوێزنن. ناچار وەك ئامرازێك بۆ بەرژەوەندی خۆیان هەڵیانقۆستەوە تا بتوانن بمێننو پتر بە وڵاتدا بڵاوببنەوە.

وتەکەی (هۆئن سۆئنگ)-گەریدەی بەناوبانگی چینی کە گەشتەکەی لە نێوان ساڵانی (٦٣٠-٦٤٤ز) ئەنجام داوە ئاماژە بۆ بتپەرستی لە رادەبەدەری ئەو سەردەم دەکات، وتەکەی بە بۆنەی ئەو ئاهەنگە مەزنەوە گوتوە کە (هیرش) پاشا

(١) گەین :GAIN : تایفەیەکی هیندۆسین، مەهاویرە لە شەشەم سەدەی بەر لە زاین دایمەزراندوە، بە ملوێنەها هیندۆسی پەیڕەوی لێدەکەن، بە پێچەوانەی هیندۆسەکانیتر بۆ دەسەڵاتی ڤیدا ملکەچ نابنو بڕوایان بە رەگەزپەرستی نیە، بڕوایان بە خوداش نیەو دەڵێن: خودا تەنها گوزارشت کردنێکە لەو هێزو برستە روحیەی کە لە مرۆڤدا هەیە. گوزەرانی ناگزورانەیان هەڵبژاردوەو بە ئاسوپەلاسی ژین بەسەر دەبەن، رێبازەکەیان ناوی (ئاهینسا)یە واتە نەرمونیانیو دور لە توندوتیژی.

ڤیدا: Vedas : ناوی پەرتوکێکی سەنسکریتی پیرۆزی هیندۆسەکانە نوێژوسرودو فەرزە ئاینیەکانی تێدایە. مونجید - وەرگێر

گێڕاویەتی، هیرش پاشا لە ساڵی (٦٠٦-٦٤٧ز) حوکمی هیندستانی کردوە، دەڵێ: ((هیرش پاشا ئاهەنگێکی زۆر گەورەی لە (قنوج) گێڕا کە زانای سەرجەم ئاینەکانی هیندستانی بانگ کردبو.

پاشا پەیکەرێکی زێڕینی بوذای لەسەر منارەیەکی لە پەنجا باڵ بەرزتر دامەزراندبو، پەیکەرێکی تری بچوکتریشی بە کەژاوەی کاروانێکی قەرەباڵغەوە هێنایە دەرەوە، هیرش پاشا خۆی لە تەنیشتەوە دەڕۆیشتو چەتری بۆ راگرتبو، کامرۆب پاشای هاوپەیمانیش مێشی لێ‌پاس دەکرد))[1]. هەمان گەریدە لەبارەی پاشاو دامودەستەی ئاستانەکەیدا دەڵێ: ((هەندێکیان (شۆ)یان دەپەرست، هەندێکی‌تر بوذایی بون، هەندێکی‌تر خۆرپەرست بون، هەندێکی‌تر (وشنۆ)یان دەپەرست، هەمو کەس بۆی هەبو خوایەك تایبەت بە خۆی بکاو بیپەرستێ یان تێکڕا سەرجەم خواکان بپەرستێ))[2].

## زایەندی بەهاڕوژمی بێجلەو:

ئاین‌و کۆمەڵگەی هیندی هەر لە دێر زەمانەوە لە ڕوی ئارەزوی زایەندیەوە سەرتۆپ بوە، ئەو ماددە زایەند بزوێنانەی لە دینی وڵاتی هیندا هەبوە لە دینی هیچ وڵاتێکی‌تردا نەبوە . پەرتوکە هیندی‌و ناوەندە دینیەکان لە باسوخواسی گەردون‌و دەرکەوتنی سیفەتی خواوەندان‌و رودانی پێشهاتی گەورەوە گەلێك چیرۆك‌و داستانی وایان لەبارەی تێکەڵبونی زایەندی نێوان خواوەندان‌و پەلاماردانی بنەماڵە نەجیمزادەکان لە لایەن خواوەندانەوە گێڕاوەتەوە، کە پیاو لەبەریاندا بتاسێ و تنۆك تنۆك ئارەقەی شەرمی بسڕێتەوە، دیندارەکان کە باوەڕو تین‌و تاوێکی گەرمەوە وتاریان دەداو ئەو داستان‌و چیرۆکانەیان بۆ خەڵك دەگێڕایەوە هەڵبەت کاریگەری گەورەی تێکردون‌و سۆزی دڵی بزاندون. جگە لەمە خەڵك بەژن‌و منداڵ پیرو لاوانەوە هەمو لە بەرامبەر دەعباکەی

(١) گەشتەکەی هۆتن سۆتنگ (فۆکۆی کی) وڵاتەکەی رۆژئاوا .
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشو .

(مەهادیۆ)ی خواوەندی هەرە گەورەیان کە پەیکەرێکی ناقۆلایان بۆ داتاشی بو کۆ دەبونەوەو دەیانپەرست. مێژوناسان دەگێڕنەوەو دەڵێن: هەندێ لە تایفە دینیەکانی هیندستان پیاویان ژنی روتی دەپەرستو ژنیشیان پیاوی روتی دەپەرست))[1].

کاهینو بەدڕەوشتەکان دەلالییان بە ئابڕوی ژنە رەبەنەکان دەکرد و زۆربەی پەرستگاکان ببونە مۆڵگەی بەدڕەوشتانو شەرواڵ پیسەکان مەرامی خۆیان لەوێدا دەدۆزیەوە. جا ئەگەر ئەمە رەوشی پەرستگاکان بوبێ دەبێ رەوشی ئاستانەی پاشاو کۆشکی دەوڵەمەندان چۆن بوبێ؟ کە مونافەسەیان لە کاری ناڕەواو بەدڕەوشتیدا دەکرد، کۆڕیان هەبو ژنو پیاویان تێکەڵ دەبونو کە عەرەقیشیان دەخواردەوە پەردەی شەرمو شەرەفیان لە روی خۆ هەڵدەماڵیو ئابڕویان وەلا دەنا، ئەدەبو پەردەی شەرم وجودیان نەدەما... بەجۆرە سەرتاپای وڵات وەبەر شەپۆلێکی گەورە و زەبەللاحی روتپەرستیو ئارەزوبازی زایەندی کەوتبو و خوڕەوشتی ژنو پیاوان لەوپەڕی نزمیو داتەپیویدا بو.

## سیستەمی چینایەتی پڕستەم :

لە مێژوی هەمو نەتەوەکاندا سیستەمێکی چینایەتی نەبوە لە سیستەمە چینایەتیەکەی هیندستان توندوتیژو وشکتر بێ و چینو چینیش ئەوەندە لێکترازاو بن. هیچیان وەك ئەو سوکایەتیان بە شانو شکۆی مرۆڤایەتی نەکردوە، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا هیندستان وەك سیستەمێکی ئاینیو شارستانی وڵاتەکەی ئیعترافی پێکردوەو هەزاران ساڵە تا ئێستاش ملکەچیەتی. سەرەتای جیاوازی چینایەتی لە ئاخروئۆخری سەردەمی (ویدا) پەیدا بو، لەبەرئەوەی هەمو بنەماڵەکان و پیشەو پیشەسازی تایبەت بەخۆیان هەبو، هەروەها لەبەرئەوەی دەیانویست نەژادو نەجیمزادەیی رەگەزی ئاری بپارێزن.

---

(١) ستیارتە برکاش لدیانند سرسوتی الهندكي، ل ٣٤٤

سێ‌سەدە بەر لە زاین لە هیندستاندا ژیاری بەرەهمێتی سەری هەڵداو گەشەی سەند، دەستورێکی نوێی بۆ کۆمەڵگەی هیندی رەنگرێژ کرد، لە دەستورەکەدا یاسایەکی سیاسیو شارستانی دەرکردو تەواوی وڵات دەنگی بۆ دا، بو بە یاسایەکی رەسمیو ژێدەرێکی ئاینیو شارستانی. ئێستاکە بە (منوشاستەر) بەناوبانگە .

یاساکە خەڵکی وڵات بۆ چوار چینی لەیەکتر جوێ دابەش دەکات کە ئەمانەن:
(١) بەرەهمیەکان: چینی کاهین پیاوە دینیەکان . (٢) شتری : شەرکەرو جەنگاوەران. (٣) ویش : جوتیارو بازرگانەکان. (٤) شودەر : خزمەتکارەکان.
(منو) کە یاساکەی دارشتوە دەڵێ:
((خوای خاوەن توانای رەها لە پێناو بەرژەوەندیەکانی جیهاندا بەرەهمیەکانی لە دەمی،شتری لە بازوەکانی، ویش لە رانەکانی، شودەریشی لە پێیەکانی خۆی خولقاندوە. بۆ هەر چینێکیش فەرزو ئەرکی تایبەتی بۆ داناون، بەرەهمیەکان دەبێ (ویدا) فێر بن یان قوربانیو خێراتەکان پێشکەش بە خواوەندان بکەن، شتری دەبێ پاسەوانی خەڵكو خێراتو قوربانیەکان بن، ویداش بخوێننو لە ئارەزوەکانی دنیا دورەپەرێز بن، ویش دەبێ ولّسات[1] بلەوەرێننو خزمەتیان بکەن، ویداش بخوێننەوەو کشتوکاڵی بازرگانی بکەن. شودەریش دەبێ خزمەتی ئەم سێ چینە بکەن))[2] .

## تازیاریەکانی چینی بەرەهمیەکان :

یاساکە مافو تازیاری وای بە بەرەهمیەکان داوە وەك خوای لێکردون. دەڵێ: بەرەهمیەکان چینی هەڵبژاردەی خوان، پاشای خەڵکن، هەرچی لە بونەوەر دایە موڵکی ئەوانە، باشترینی خەڵك و سەروەری ئەرزن[3]، دەتوانن بەئارەزوی خۆیان

---

(١) ولّسات: مەڕومالاّت.
(٢) منوشاستەر : دەروازەی یەکەم .
(٣) منوشاستەر : دەروازەی یەکەم .

ماڵومولکی کۆیلەکان (شۆدەرەکان)-بێئەوەی گوناح بێ- ببەن، چونکە کۆیلە خاوەنی هیچ نیە ئەوەی هەیبێ هی ئاغاکەیەتی[١].

ئەگەر بەرەهمیەك ریگویدا (پەرتوکی پیرۆز) ئەزبەر بکات لە گوناحان پاك دەبێتەوە ئەگەرچی سێ چینەکەیتریشی لەناوبردبێ[٢] پاشا بە هیچ جۆرێك بۆی نیە باجو بەرتیل لە بەرەهمیەکان وەرگرێ ئەگەرچی ولات لە گرانیو تەنگانەشدا بێ، بەرەهمی نابێ لە ولاتی خۆیدا لە برسان بمرێ[٣]، ئەگەر بەرەهمیەك تۆڵەی کوشتنی کەوتە سەر دروست نیە حاکم بیکوژێ بەڵکو دەبێ سەری بتراشێ، بەلام ئەگەر بەرەهمی نەبێ دەکوژرێ[٤].

(شتری) ئەگەرچی لە سەروی هەردو چینی (ویش) و(شودەر) بون بەلام گەلێك لە خوارەوەی بەرەهمیەکانیش بون. (منو) دەلێ: هەر بەرەهمیەك ئەگەر تەمەنی (١٠) ساڵ بێت باوك چەند چاکەی بەسەر کورەکەیدا هەیە، ئەویش هێندەی بەسەر شترییەکی تەمەن سەد ساڵیدا هەیە[٥].

## کلۆڵ و کەساسەکان:

شۆدەر (کەساسەکان) لە کۆمەڵگەی هیندیدا-بە دەقی یاسا ئاینیو شارستانیەکە- لە ئاژەلان کەمترو لە سەگیش زەبونتر بون، یاساکە دەلێ: ((ئاسودەیی شۆدەر لەوە دایە خزمەتی بەرەهمیەکان بکەن، ئەگەرنا پاداشتیان نیە[٦]. نابێ پارەوپول پاشەکەوت بکەن یان گەنجینە تەقەت بکەن چونکە-بەرەهمیەکان ئەزیەت دەدا[٧]، هەر کەساسێك دەست لە بەرەهمیەك بەرزکاتەوە

(١) دەروازەی هەشتەم .
(٢) دەروازەی نۆیەم .
(٣) دەروازەی نۆیەم .
(٤) دەروازەی دوەم .
(٥) دەروازەی یازدەیەم .
(٦) منوشاستەر : دەروازەی یازدەم .
(٧) دەروازەی دەیەم .

یان داردەستێکی لێ‌هەڵبڕێ‌و مەبەستی بێ پیای بکێشێ دەستی دەبڕدرێ یان ئەگەر تورە بو و شاپێکی هاوێشت پێی دەبڕدرێ[1]. ئەگەر کەساسێك ویستی لەگەڵ بەرەهمیەك دابنیشێ دەبێ پاشا سزای بدات، سزاکەش ئەوەیە کە دەبێ کونی کۆمی داغ بکات‌و لە وڵاتی دورخاتەوە[2]. ئەگەر دەستی لێدا یان جوێنی پێدا زمانی لە بنرا هەڵدەکێشرێ، ئەگەر بڵێ شتم فێر کردوە رونی هەڵقرچاوی لە گەرو دەکرێ[3]. کەفارەتی کوشتنی کەساسێك لەگەڵ کەفارەتی کوشتنی سەگ‌و پشیلەو بۆق‌و قەلەڕەش‌و کوندەبۆ وەکو یەکن))[4].

## ئافرەت لە کۆمەڵگەی هیندیدا :

لەو کۆمەڵگەیەدا ئافرەت وەك کەنیزە سەیری دەکرا[5]، پیاو هەبو ژنەکەی لەسەر قوماری دەدۆڕاند، هەندێجار ژنێك چەند مێردێکی هەبوە[6]، ژن ئەگەر مێردی بمردایە وەك زیندەبەچاڵ کرابێ مێردی نەدەکردەوەو خەڵك گاڵتەیان پێدەکردو قسەی سوکیان پێ‌دەگوت، دەبوایە تا دەمرێ هەر لە ماڵەمێردەکەی بوایەو خزمەتی کەسوکارەکەی بکردایە، ژن هەبو دوای مردنی مێردەکەی لەبەر ئەشکەنجەو خەفەتی ژیان یەکسەر خۆی دەسوتاند[7].

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشو .
(٢) دەروازەی هەشتەم .
(٣) منوشاستەر .
(٤) R.C.Dutt ٣٤٢-٣٤٣
(٥) سەرەتای داستانی بەناوبانگی هیندی (مەهابەهارتا) بخوێنەوە.
(٦) R.C.Dutt ٣٣١
(٧) ئەم خۆسوتاندنە لەناو چینە نەجیمزادە و بنەماڵە ئورستوکراتیەکان ببوە نەریتێکی باو و پەسند و چاك و بە ناوی(ستا) دەناسرا. پێیان وابو ژن ئەگەر خۆی بسوتێنێ وەفاداری بۆ مێردەکەی دەنوێنێ. بەڵام ئەم نەریتە لەگەڵ دامەزرانی حکومەتە ئیسلامیەکان و بە هەوڵی حاکمە موسڵمانەکان کەمتر بۆوە، دکتۆر(بریتەر)ی گەڕیدەی فەرەنسی ئاماژەی بەم هەوڵە کردوە، هەروەها ئینگلیزیش لەم دواییەدا بەشێوەیەکی یەکجاری قەدەغەی کرد.

بەجۆرە ئەم ولاّتە کە خاوەنی خاکی بەخێروبێر و ئاوەزی بەهۆش بو، ئەم نەتەوەیە —کە هەندێ لە مێژونوسانی عەرەب بە کانگای دانایی‌و سەرچاوەی دادو سیاسەت‌و بە فرەزان‌و هۆشمەندو بلیمەتیان دەدەنە قەڵەم[1]- لەبەرئەوەی لە ئاینی راست دوربون و سەرچاوەی رونیان لێ وێڵ بو و پیاوانی دینیان لارێ بو و بێبەرنامەو پەیام بون و شوێنکەوتوی نەفس‌و ئارەزو بون... ولاّتەکەیان ببوە شانۆی نەفامێتی لە رادەبەدەر و بتپەرستی سنوربەزێن‌و هەمەجیەتی توندوتیژو زوڵم‌و زۆری کۆمەلاّیەتی، بەجۆرێك کە لە نێو نەتەوەو مێژودا هاوشێوەی نەبوبێ.

## عەرەب: تایبە تمەندێتی و بەهرەکانیان:

عەرەب لە سەردەمی نەفامێتدا بە گەلێك بەهرەو خورەوشت لە نەتەوەکانی‌تر جوێ دەبونەوە وەك: زمان پاراوی، رەوانبێژی، خۆشویستنی ئازادی، گەردەنبەرزی، سوارچاکی، ئازایەتی، خوێنگەرمی لە پێناو بیروباوەڕدا، قسە لە رویی، زەین رونی، لەبەرکردن‌و لە بیرنەچونەوە، یەکسانی خوازی، ئیرادە پتەوی، ئەمەکداری‌و دەستپاکی.

بەلاّم لە سەردەمی کۆتاییدا لە مێژ بو لە پەیام‌و پەیامبەران دابڕابون‌و لە جوغزی جەزیرە گرمۆڵە ببون و ببونە دیلی نەریت‌و باوی باوانیان، بۆیە دوچاری داڕوخانێکی دینی‌و بتپەرستیەکی لە رادەبەدەر ببون، کەم لە نەتەوەکانی ئەو سەردەم وەکو وان بتپەرست بون، دوچاری نەخۆشی خورەوشت‌و کۆمەلاّیەتی ببون، کۆمەڵگەکەیان لەرزۆك‌و گەندەڵ و رەوشت نزم ببو، ئەدگارەکانی ژیانی نەفامێتی‌و دور لە ئاکاری دینی وەرگرتبو.

(١) صاعد الاندلسی، م ٤٦٢، طبقات الامم، ص ١١ .

## بتپەرستیەکەی نەفامێتی :

دین‌و بیروباوەڕی بەربڵاوو باوی عەرەب هاوبەشپەرستی بو، بڕوایان بە خوا هەبو کە هەر خوا خواوەندی هەرەمەزن‌و خالقی بونەوەرو کارگێڕی ئەرزو ئاسمانەو گشت فرمانێك بە فەرمانی ئەوە، ئەگەر پرسیاریان لێ‌بکرایە کێ ئەرزو ئاسمانی ئەفراندوە؟ دەیانگوت خوا، خوای خاوەن هێزو زانا ﴿ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ: ئەگەر لەخۆیان بپرسی، کێ ئەوانی وەدی هێنا، ئێژن: خودا، دەی چۆن لە هەق کلا دەبن؟﴾الزخرف: ٨٧.

بەڵام هزرە نەفامیەکەیان تەنگەبەر بو و هێندەی بڕ نەدەکرد بڕوا بە تەوحیدی پاك‌و بێگەردی پەیامبەران بێنن، ئاوەزی دور لە پەیام‌و پەیامبەران‌و دور لە فامی ئاینی بە دوری دەزانێ نزای مەردوم بەبێ پێناوو تکاخواز ئاسمانە بەرزەکان ببڕێ‌و بگاتە لای خوا، لە روانگەی نەریت‌و باوی پاشایەتی‌و جیهانی پڕ کەموکوڕەوە لەم مەسەلەیان دەڕوانی بۆیە لە پێناوان[1] دەگەڕان تا دەنگ‌و داوایان بگەیەننە لای خوا، لەوانیش دەپاڕانەوەو هەندێ پەرستنکاریشیان بۆ ئەنجام دەدان. هەوەڵجار هزری تکاخوازییان دەمێشك چەسپی، پاشان ئەم هزرە بو بە بیروباوەڕو پێیان وابو پێناوەکانیش توانای زیان‌و سود بەخشینیان هەیە، پاشان لە هاوبەشپەرستیدا پتر رۆچۆن‌و گەلێك خواوەندیتریان کردە هاوبەشی خوا، پێیان وابو هاوبەشەکانیش وەکو خوا کاروباری بونەوەر بەڕێوە دەبەن‌و توانایەکی سەربەخۆیان لە گەیاندنی سودو زیان‌و خێرو شەڕو پێبەخشین‌و نەبەخشیندا هەیە. جا ئەگەر عەرەبەکانی پێشو بڕوایان بە خواوەندێتی‌و پەروەردگارێتی خوا هەبوبێ‌و تەنها پێناویان دانابێ، بەڵام نەوەکانی دواتر خواوەندەکانیان دەگەڵ خوا کردە هاوبەش‌و پێشیان وابو وەك خوا توانای سەربەخۆیان لە خێرو شەڕو زیان‌و قازانج‌و ژیاندن‌و مراندندا هەیە، وێڕای

---

(١) پێناو: وسیط.

ئەمەش بڕوایەکی لێڵو ناڕونیشیان لەبارەی خواوەندێتیو پەروەردگارێتی خوا پەیداکرد[١].

## بتەکانی عەرەب لە سەردەمی نەفامێتیدا:

نەوەی دوەم پتر ڕۆدەچوو قوڕەکەی خەستتر دەبووەوە، جا لەبەرئەوەی بتپەرستی لەبەرچاوان دیارە و دەگەڵ هزری سادەو لاوازیشیان پتر دەگونجا بۆیە بیروباوەڕی بتپەرستی باوی سەندو گشت خەڵکی داگرتەوە، ئەوانەی خواوەندو پێناوەکانیان لە یەکتر جویێ دەکردەوە بە پەنجەی دەست دەژمێردرانو بە پیاوی ڕۆشنبیر سەیر دەکران. بەم جۆرە نەتەوەی عەرەب لە نێو بتپەرستیەکی لە ڕاددەبەدەردا نغرۆ ببون، هەمو هۆزو گوندوشارێك بگرە هەمو ماڵێك بتی تایبەت بە خۆیان هەبو و دەیانپەرست.

ئەلکەلبی دەڵێ: لە مەککەدا هەمو ماڵێك بتی خۆیان هەبو و دەیانپەرست، ئەگەر یەکێك بیویستایە سەفەرێك بکات دواهەمین کاری ئەوەبو بەر لەوەی ماڵێ جێبهێڵێ -بۆ پیرۆزی- دەستی بە بتەکە دادەهێناو لە خۆی هەڵدەسوی، کە دەشگەڕایەوە یەکەمین ئیش دەستی پێدا دەهێناوەو لە خۆی هەڵدەسویەوە[٢].

عەرەب سنوریان بۆ بتپەرستی دانەدەنا، هەبو بتخانەی بنیات دەنا، هەبو بتی دادەتاشی، ئەگەر ئەوانەشی لە توانا نەبوایە لەبەردەم کەعبەدا یان هەر شوێنێکیتری پێ چاك بوایە بەردێکی لێ قیت دەکردەوەو وەکو کەعبە بە دەوریدا دەسوڕایەوە، بەم بەردانەیان دەگوت (ئەلئەنصاب)[٣]. کەعبە — کە تەنها بۆ خواپەرستی بنیات نراوە- لەناوەوەو دەوروبەریدا (٣٦٠) بتی لی قیت کرابۆوە[٤]. پاشان دوای ڕۆژگارێك وای لێهات خودی بەردەکەیان دەپەرست.

---

(١) بگەڕێوە بۆ پەرتوکی ( بینة النبي ﷺ من القرآن) نوسینی ئوستاد محمد عزت دروزة.
(٢) کتاب الاصنام، ل ٣٣ .
(٣) هەمان سەرچاوەی پێشو.
(٤) الجامع الصحيح للبخاري، كتاب المغازي : باب فتح مكة .

بوخاری لە ئەبا ڕەجائی عاطاریدی دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی : لە نەفامێتیدا بەردمان دەپەرست، ئەگەر بەردێکی باشتریشمان بدۆزیبایەوە بەردی یەکەمان فڕێدەداو ئەومان دەپەرست. ئەگەر بەردیشمان وەچنگ نەکەوتبا چنگە خۆڵێکمان کۆدەکردەوەو مەڕێکمان بەسەردا دەدۆشی، پاشان دەمانپەرستو بەدەوریدا دەسوڕاینەوە[١].

ئەلکەلبی دەڵێ: ئەگەر یەکێك سەفەرێکی بکردایە، لە هەر قۆناغێك دابەزیبا چوار بەردی هەڵدەگرتەوە، جوانترینیانی دەکردە خواو دەیپەرست، سێ بەردەکەی تریشی دەکردە سێکوچکە، کە دەڕۆیشت بەجێی دەهێشتن[٢].

## خواکانی عەرەب:

عەرەبیش-وەکو سەرجەم هاوبەشپەرستەکان- گەلێك خواوەندیان لە فریشتەو جنۆکەو ئەستێرەکانی ئاسمان بڕیار دابو، پێیان وابو فریشتەکان کچی خوان و پێناوو تکاخوازیان دەپەرست تا لەلای خوا بۆیان بپاڕێنەوە، جنۆکەشیان دەپەرستو پێیان وابو وەك خوا تواناو کاریگەریان هەیە[٣].

ئەلکەلبی دەڵێ: بەنومولەیحی خوزاعە جنۆکەیان دەپەرست[٤]

صاعید دەڵێ: حیمیەر خۆریان دەپەرست، کەنانەش مانگ، لوخنو جوذامیش موشتەری، (طەی)ش سوهەیل[٥]، قەیسیش شیعرای[٦] عەبور، ئەسوەدیش عەتارد[٧].

---

(١) الجامع الصحیح للبخاری، کتاب المغازي : باب وفد بني حنیفة .

(٢) کتاب الاصنام .

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٤٤ .

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٣٤ .

(٥) قۆناخێکی مانگە، پێنج هەسارەی کەلوی (گا)ش دەگرێتەوە.

(٦) ئەستێرەکی ورشەدارە، لە عەرەبستانێدا لە کۆتایی چللەی هاوین وەدەردەکەوێ.

(٧) هەسارەیەکی کەلوی جەوزایە لە چللەی هاوین وەدیار دەکەوێ.　(٣،٤،٥)

مونجید- وەرگێڕ

## جولەکەو نەسرانیەکان لە ولاتانی عەرەبدا :

ئاینی جولەکەو نەسرانیەکان لە ولاتانی عەرەبدا بلاویبونەوە بەلام عەرەبەکان زۆر سودیان لەواتا دینیەکان وەرنەگرتبو، هەردو ئاین کتومت وەکو ئاینی جولەکایەتی شامو ئاینی نەسرانیەتی ولاتی رۆمو شام بون، هەمان گۆڕانو لارێبونو زەبونێتی کە -پێشتر باسمان کردون- لەوانیشدا هەبون .

## پە یام و بڕوابون بە زندوبونەوە:

عەرەب تێڕوانینێکی خەیاڵییان لەبارەی پێغەمبەرایەتیەوە هەبو، پێیان وابو پێغەمبەر زاتێکی پیرۆزەو لە مرۆڤ نیە، ناخواو ناخواتەوە، ژنو منداڵی نیە، پێویستی بە بازاڕ نیە. ئاوەزیان بەرتەسك بو، دەمێشکیان نەدەچو لە دوای مردن زندوبونەوە هەبێ، لە زندوبونەوەشدا لێپرسینەوەو سزاو پاداشت هەبێ، دەیانگوت: ﴿ مَا هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلاَّ الدَّهْرُ: تەنها ژینی دنیا هەیە، هەندێکمان دەمرینو هەندێکیتر لەدایك دەبین، بەهۆی رۆژگاریشەوە دەمرین.﴾الجاثية:٢٤، دەیانگوت،﴿ أَئِذَا كُنَّا عِظَامًا وَرُفَاتًا أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا: ئەگەر بمرینو ببین بە ئێسکو پڕوسك ئایا ئێمە زندو دەبینەوە؟!﴾الاسراء:٤٩ .

صاعید دەڵێ: عەرەبەکان بە گشتی بڕوایان بە زندوبونەوەو لێپرسینەوەو سزاو پاداشت نەبو، پێیان وابو ئەگەرچی خوا جیهانی بەدیهێناوە بەلام تاهەتایەو بۆ هەمیشە هەر دەمێنێ، کەسانێکیش هەبون بڕوایان بە زندوبونەوە هەبو، پێیان وابو ئەگەر وشتری بۆ لەسەر گۆڕ بکوژنەوە، بە سواری زندو دەبێتەوە، ئەگەر نا بە پیادە زندو دەکرێتەوە[1] .

(١) كتاب الأصنام، ل ٤٤ .

## نەخۆشـیە خوڕەوشتی و کۆمەڵایەتیەکان :

لە لایەنی خوڕەوشتەوە گەلـێ نەخۆشی ڕەگو ریشاڵی داکوتابو و پەلوپۆی بە هـەمو لایەکـدا بلاوکردبـۆوە، عەرەبـەکان بـۆ مەیخواردنـەوە ئـالودە بـونو مەیخواردنەوە سەرلەبەری کۆمەڵگەی داگرتبۆوە، شاعیران شعریان پێهەڵدەگوتو کۆبونەوەیان لەسەر دەبەست، روبەرێکی بەرفرەوانی لە شیعرو مێژو و ئـەدەبیات تەی کردبو، لە زماندا بە گەلـێ نـاوو سـیفەت هـەڵیان دەنـا، هێنـد بـە وردی وەسفیان دەکرد جێی سەرنجو سـەیرمان بـێ[1]، دەرگـای مەیخانـەکان بـەردەوام لەسەر پشت بو، بەیداخێکیان لەسەر دەشەکایەوە پێیان دەگوت (غایة).

لەبید دەڵـێ[2]:

**قد بت سأمرها وغاية تاجر        وافيت إذ رفعت وعزّ مدامها**

بازرگانیکردن بە مەی هێند بە هەڕمێن بو تەنانەت وشەی بازرگانییان لە بری مەیفرۆشی بەکار دێنا، وەك لـە دێـڕە شـیعرەکەی سـەرەوەرا دیـارە کـە لەبیـد گوتویەتی:- (وغاية تاجر)، عەمری کوڕی قومەیئەش دەڵـێ[3]:

**إذا سحب الريط والمروط الـى        ادنى تجاري وانقض اللمما**

قومارکردنیش یەك لـەو ئاکارانـە بـو کـە شـانازییان پـێدەکرد، ئـەلجاهیلی دەڵێ[4]:

**اعيـرتنا ألبـانها ولحومها        وذلك عار يا بن ريطة ظاهر**

**نحابي بها أكفاءها ونهينها        ونشـرب فـي اثمـانها و نقـامـر**

ئەگەر یەکێك لە کۆڕی قومارکردنێ دورەپەرێز بوایـە بـە نـەنگو خەوشـیان دەزانی، شاعیر دەڵـێ[5]:

---

(١) پەرتوکی (المخصص)-إبن سەیدە بخوێنەوە: ١١/٨٢-١٠١

(٢) السـبع المعلقات، معلقة لبيد .

(٣) ديوان الحماسـة .

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشو.

(٥) هەمان سەرچاوەی پێشـو .

**وإذا هلكت فلا تريدى عاجزاً غساً ولا برماً ولا معزالاً**

قەتادە دەڵێ: پیاو لە سەردەمی نەفامیدا ژنو ماڵو منداڵی لە قوماری دەدۆڕاند، پاشان کە دەیدیت وا لەلای خەڵکانیترن خەموخەفەت دایدەگرت و ئاخو ئۆفی هەڵدەکێشا، لە ئاکامدا کینەو دوژمنایەتیش پەیدا دەبو[1].

خەڵکی حیجاز بە عەرەبو جولەکەوە مامەڵەیان بە ریبا دەکردو باوێکی بەربڵاوبو لە ناویاندا، رێژەی ریباکاریەکە لە سنور دەرچوبو، طەبەری دەڵێ: لەسەردەمی نەفامیدا ریبا بە گوێرەی ساڵو دوچەندانەوە زیاد دەکرا، قەرزدەر بە قەرزاری دەگوت: دەمدەیەوە یا زیادی دەکەی؟ ئەگەر هەیبوایە دەیدایەوە ئەگەرنا بۆ ساڵیتر بە زیادەوە دەیدایەوە. ئەگەر قەرزەکە وشترێکی مێنگینەی یەکساڵە بوایە بۆ ساڵیتر دەبوە مێنگینەیەکی دوساڵە بۆ ساڵیتر دەبوە مێنگینەیەکی سێساڵە ... ئیتر بەم جۆرە. ئەگەر قەرزەکە پارە بوایە بۆ نمونە پەنجا درهەم بوایە بۆ ساڵیتر دەبوە سەد درهەم بۆ ساڵیتر دوسەد درهەم، بۆ ساڵی تر چوارسەد درهەم بەمجۆرە ساڵ بۆ ساڵی دوچەندانە دەبوەوە[2].

ریبا رەگی داکوتا بو، وەك نەریتێکی ئاسایی لێهاتبو، لەگەڵ بازرگانیدا فەرقیان پێنەدەکردو دەیانگوت، ﴿ إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا : کڕینو فرۆشتنیش وەك ریبا وایە ﴾ البقرة :٢٧٥، طەبەری دەڵێ: لە سەردەمی نەفامیدا ئەوانەی بە ریبا قەرزیان دەدایە خەڵك، کە کاتی وەرگرتنەوە دادەهات داوایان لە قەرزار دەکرد بیانداتەوە ئەویش دەیگوت: ((هێشتان مۆڵەتم بدێ بۆت زیاد دەکەم)) ئەگەر یەکێك پێی گوتبان ئەم کارە ریبایەو رەوا نیە، دەیانگوت، جیاوازی نیە، چ لە سەرەتای فرۆشتن بۆی زیاد بکەم چ لە کاتی قەرز دانەوەدا[3].

زیناکاری کەم نەبو، کەس نارەزایی توندوتیژی لێنەبو، پێیان ئاسایی بو ئەگەر پیاوێك چەند یارێكو ژنێکیش چەند دۆستێکی هەبێو بەبێ مارەکردن

---

(١) تەفسیری الطبری:﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمْ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ ﴾

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشو: ٥٩/٤ .

(٣) تفسیر الطبری، ل ٦٩ .

راببوێرن، هەندێ کەس ئافرەتیان ناچار دەکرد زینا بکات، ئیبن عەبباس دەڵێ: لە سەردەمی نەفامیدا کەنیزەکانیان ناچار دەکرد زینا بکەن تا پارەی پێ وەرگرن[١].

خاتو عائیشە -رەزای خوای لێبێ- دەڵێ: (( لەسەردەمی نەفامیدا چوار جۆرە سەرجێیی هەبو، یەکەمیان وەکو مارەکردنی ئێستای موسڵمانان وابو، هەندێ پیاو دەچونە لای باوكو کەسوکاری کچو داوای خوازبێنی کچەیان لێ دەکرد، دوای رێککەوتن، مارەیی کچەیان دەداو مارەیان دەکرد. دوەمیان: کاتێك ژنەکەی لە خوێنی پیساری[٢] پاك دەبۆوە پێی دەگوت برۆ لای فلانە پیاو با سەرجێییت لەگەڵدا بکات، مێردەکە تا بۆی رون دەبوەوە کە خێزانەکەی زگی پڕ بوە ئەوجا دەچۆوە لای، بەو مەبەستە ئەم کارەیان دەکرد تا منداڵی نەجیبو جوامێریان ببێ بەم جۆرەیان دەگوت( نکاح الاستبضاع). سێیەمیان کۆمەڵێکی لە (دە) کەس کەمتر دەچونە لای ژنێكو سەرجێیان لەگەڵدا دەکرد، کە ژنەکە زگی پڕ دەبو و منداڵەکەی دادەنا دوای چەند رۆژێك بە دوای هەمو پیاوەکانی دادەنارد ئەوانیش هەمو دەهاتن-دەبوایە بێن- ئافرەتەکە بە ئارەزوی خۆی منداڵەکەی بە ناوی یەکێکیان هەڵدەداو زگەکەی بەسەر ئەو دادەبڕی، پیاوەکەش نەدەبوایە رەتی بکاتەوە و قبوڵی دەکرد. چوارەمیان ژنی داوێن پیس بونو بەیداخیان لەسەر دەرگا هەڵواسی بو، پیاوان بە ئارەزوی خۆیان دەچونە لایان و لەگەڵیان جوت دەبون، پاشان کە یەك لە ژنەکان منداڵی دەبو بانگی سەرناسیان دەکرد ئەویش منداڵەکەی لەگەڵ پیاوەکان بەراورد دەکردو لە ئاکامدا بە ئەستۆی یەکێکیانی دادەبڕی، ئەویش بە منداڵی خۆی قبوڵی دەکرد))[٣].

(١) هەمان سەرچاوی پێشو، ١٨/ ٤٠١ .
(٢) پیساری: حەیز.
(٣) الجامع الصحیح – للبخاری . کتاب النکاح، باب من قال: لا نکاح الاّ بولی.

## ئافرەت لە کۆمەڵگەی نەفامێتیدا:

ئافرەت لە کۆمەڵگەی نەفامێتیدا ستەمی لێدەکرا و مافی دەخورا و ماڵو موڵکی بەزۆری زۆردارەکی لێ ئەستێنرا و لە میراتی بێبەش دەکرا، کە تەڵاق دەدرا یان مێردەکەی دەمرد ڕێگەی نەدەدرا مێردێکیتر بکاتەوە[1]، وەك شرەو برەو مەڕومالاّت بە میرات هەڵدەگیرایەوە، ئیبن عەبباس-خوای لێ رازی بێ- دەڵێ: (( ئەگەر پیاوێك باوك یان خزمێکی نزیکی بمردایە، خۆی دەبوە سەرپەرشتی ژنەکەیان، جا یان لەلای خۆی دەهێشتەوەو دوای مردنی ژنەکە؛ ماڵو سامانەکەی دەخوارد، یان مارەییەکەی وەردەگرتەوەو ئازادی دەکرد، عەطائی کوڕی ئەبی ڕەباح دەڵێ: ((لە سەردەمی نەفامێتیدا ئەگەر پیاوێك بمردایەو ژنو منداڵی لەدوای خۆیدا جێهێشتبا، خزمو کەسی مردوەکە ژنەکەیان لەلای خۆدا دەهێشتەوە تا منداڵەکان بەخێو بکات))، سوددی دەڵێ: ((پیاو لە سەردەمی نەفامێتیدا ئەگەر باوکی یان کوڕی یان براکەی بمردباو ژنی لێ بەجێمابا، ئەوا کامیان زوتر جلێکی هەڵدابایە سەر ژنەکە ئەو دەبو بە خاوەنیو دەیتوانی بە مارەییەکەی پێشو مارەی بکاتەوە، یان بە مێردی دابایەوەو مارەییەکەی بۆ خۆ وەرگرتبا، بەڵام ئەگەر ژنەکە گورجوگۆڵتر بوایە و زوتر بگەڕابایەوە نێو خزمو کەسانی خۆی ئەوا رزگار دەبو و دەبۆوە خاوەنی خۆی))[2]. لەسەردەمی نەفامێتیدا پیاو لە هیچ مافێکی خۆی بێبەش نەدەکرا بەڵام ئافرەت وانەبو، مافی پێشێل دەکرا، مارەییەکەی لرف دەکرا، بەمەبەستی ئازاردانی رایان دەگرت و ناحەقیان بەرامبەر دەکرد بێئەوەی تەڵاق بدرێ[3]. مێرد بێزاری لێ دەردەبڕیو روی لێ وەردەگێڕا، هەندێجار وەك هەڵپەساردەیان

---

(١) ﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ مِنْكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢٣٢

(٢) تفسير الطبري، ٣٠٨/٤

(٣) ﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِتَعْتَدُوا وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ ..﴾ البقرة:٢٣١

لێدەکرد(واتە نە ژنی مێردارەو نـە تەڵاقـدراوە)[1]، هەنـدێ خـواردن هـەبو لـە ئافرەتانیان حەرام کردبو[2]، پیاو بۆی هەبو بێسنور ژن بهێنێ[3].

بە کچان گەلێك دڵپەستو شەرمەزار بون، تەنانەت زندەبەچاڵیشیان دەکـردن، هەیثــەمی کوڕی عـەدی-کە ئەلمەیدانی لێی دەگێڕێتەوە- دەڵێ: زندەبەچاڵکردنی کچ لەناو سەرجەم هۆزو تیرەکانی عەرەبدا نەریتو باوێکی بەربڵاو بـو. نزیکـەی لە(دە) کەسان یەکێك زندەبەچاڵی دەکردو ئەوانیتر وازیان لێدەهێنا، تا ئیـسـلام نـەهات ئـەم نەریتـە لەناونەچـو. عەرەبـەکان لەبـەر چـەندین هـۆی جۆراوجـۆر کچەکانیان ژێر خۆڵ دەکرد، پیاو هەبو شەرمی بەخۆ بـو و لـەوە دەترسـا سـبەی ڕۆژێ ئابڕوی بچێ! پیاو هەبو ئەگەر کچەکەی ڕەش یان بەڵەك یان سەقەتو گۆج بوایە لێی بێهومێد دەبو و دەبن خولێی دەنا، هـەژارانی هەنـدێ هـۆزی عـەرەب لەبەر هەژاریو نـەبونی خـەرجی بـەخێوکردن منداڵـەکانیان دەکوشـت، گەلـێ جارانیش عەرەبە دەوڵەمەندو پایەدارەکان لێیان دەکڕینەوە[4]. صەعصـەی کوڕی ناجیە دەڵێ: کە ئیـسـلام هـات سـێـسەد کـچی زیندەبەچـاڵم بـە پـارە ڕزگـار کردبو[5]. پیاوی وا هەبو لەسەر خۆی دەکردە نەزر کە ئەگەر خوا (دە) کوڕی پـێ ببەخشـێ یەکێکیان دەکاتە قوربانیو سەری دەبـڕێ، عەبدولموتـەللیب نـەزرێکی وای لەخۆ گرت. پیاو هەبو پێی وابو فریشتەکان کچی خودان-پاکو بێخەوشی بۆ خوا- بۆیە کچەکانیان دەکوشت تا بگەڕێنەو لای خواو پێیان وا بـو لای خوایـان بۆ شـایەنترە [6].

---

(١) ﴿وَلَنْ تَسْتَطِيعُوا أَنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلاَ تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ وَإِنْ تُصْلِحُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا﴾ النسـاء: ١٢٩

(٢) ﴿قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ قَتَلُوا أَوْلاَدَهُمْ سَفَهًا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا مَا رَزَقَهُمُ اللَّهُ افْتِرَاءً عَلَى اللَّهِ قَدْ ضَلُّوا وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ.﴾ الانعام: ١٤٠

(٣) ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُوا﴾ النساء: ١

(٤) (بلوغ الارب في أحوال العرب)ی ئالوسی بخوێنەوە .

(٥) كتاب الاغاني.

(٦) بلوغ الأرب.

گەلێ جار وا رێك دەكەوت باوكەكە سەفەرێكی دەهاتە پێش‌و نەیدەپەرژا كچەكەی زندەبەچاڵ بكات، كە دەگەڕایەوە كچۆڵەكەی گەورە ببو و فامی پەیدا كردبو كەچی هەر دەیبردو دەیخستە ژێر خۆڵەوە، ئەو جۆرە كەسانە خۆیان شتی وایان گێڕاوەتەوە پیاو دێنێتە گریان، پیاوێتر هەبو لەسەر شاخێكی بەرزڕا كچۆڵەكەی هەڵداوێشت و دەیكوشت[1].

## فیزو دەماری هۆزپەرستی‌و خوێناوی لەناو عەرەبدا:

عەرەب فیزودەمارێكی هۆزپەرستی گەلێك توندوتیژو خوێناوییان هەبو كە بناغەكەی لەسەر نەفامێتی بو، لەم وتە بەربڵاوەدا خۆی نیشان دەدا كە دەڵێ: (( براكەت زاڵم بێ یان ستەمدیدە، لە پشتی بەو یارمەتی دە))[2] بە گوێرەی ئەم وتەیە رەفتاریان دەنواند.

كۆمەڵگەی عەرەبی گەلێك چین‌و بنەماڵەی تێدابو كە خۆیان پێ لە خەڵكی بەرزترو بەرێزتر بو، بۆیە لە گەلێك نەریت‌و باوو بۆنەدا خۆیان لە خەڵكی هەڵدەبوارد و تەنانەت لە هەندێ رێورەسمی حەجكردنیشدا لەگەڵ خەڵك بەشدار نەدەبون و لە عەرەفات رانەدەوستان‌و لە ئیفاضەو ئیجازەشدا وەپێشیان دەكەوتن[3]. بە ئارەزوی خۆیان مانگە حەرامەكانیان پاش‌وپێش دەكرد، دەسەڵات و پلەوپایەی باڵاو مافی پاش و پێش خستنی مانگە حەرامەكان وەك كەلەپور كوڕ لەباوكی هەڵدەگرتەوە، توێژی تر هەبو دەخرایە بەر بێگاری، توێژیتر هەبو جۆرەها كاری پێدەكرا، گەلێك توێژی تریش كە لە خەڵكی رەمەكی پێكهاتبون .. جیاوازی چینایەتی لە دیاردە هەرە زەق‌و زۆپەكانی كۆمەڵگەی عەرەبی بو.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشو .

(٢) ئیبن حەجەر لە (فتح الباری)دا لە (المفضل الضبي) دەیهێنێتەوە كە یەكەمین كەس لەسەردەمی نەفامێتیدا ئەم قسەیەی كرد (جندوبي كوڕي عەنبەر) بو.

(٣) ﴿ ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ البقرة:١٩٩

عەرەب بە هۆی رەوشی رەشماڵنشینیەوە شەقڵیان بە شەڕوشۆڕەوە گرتبو، شەڕ وەك یاری سەیری دەکراو دڵی خۆیان پێخۆش دەکرد، شاعیرێکیان دەڵێ[1]:

**واحياناً على بكر اخينا إذا ما لم نجد إلاّ أخانا**[2]

پێیان وابو شەڕو خوێنڕێژی شتێکی ئاسایی‌و ئاسانە، بە روداوێکی بچوکی دور لە مەترسی تەپوتۆزی شەڕ هەڵدەستا، هۆزی بەکرو تەغلەب کە هەردوکیان لە بنەماڵەی وائیل بون شەڕێکی بێئامانی چل ساڵەیان لە نێودا بەرپا بو و خوێنێکی زۆری تێدا رژا، موهەلهەلی برای کولەیب دەڵێ: هەردو بنەماڵە برانەوە و دایکان جەرگیان سوتا و منداڵان هەتیو بون و فرمێسکی چاوان وشك نەدەبونەوە و لاشەو تەرم نەدەنێژرانو بۆگەن دەبون، هۆی شەڕەکەش ئەوەبو کە کولەیبی سەرکردەی مەعد تیرێکی ئەنگاوتە گوانی وشتری (بەسوسی کچی مونقیذ)و خوێن‌و شیرەکەی تێکەڵاو بو، (جەساسی کوڕی موڕڕە)ش لە تۆڵەی ئەمەدا کولەیبی کوشت، ئیتر شەڕ هەڵایساو نەکوژایەوە[3].

شەڕەکەی نێوان هۆزی داحیس‌و غەبرائیش لەسەر ئەوەبو کە لە تەڕاتێنێکدا (قەیسی کوڕی زوهێر) کە لە هۆزی داحیس بو لەگەڵ (حوذەیفەی کوڕی بەدر) کەوتنە پێشبڕکێ، قەیس وەپێش حوذەیفەی دابوەوە، بەڵام (ئەسدا) بە فیتی حوذەیفە چوە پاڵ قەیس‌و زللەیەکی راوەشاندێ، زللەکە مەشغولی کردو دۆڕاندی، لەسەر ئەوە کوشتن رویداو تۆڵەی بۆ کرایەوە، ئیش گەورە بو، هۆزەکان وەدەنگ هاتن، شەڕو کوشتار و راوەدونان‌و رێگری پەرەی ستاندو هەزاران کەس خوێنی رژا[4].

ژیان یەکپارچە ببوە شەڕو شۆڕو رەشەکوژی، وەك تەونۆکە هەمو هۆزەکانی پێوەببو. رەوشی رەشماڵ نشینی، نەبونی پێداویستی گوزەران، چاوچنۆکی‌و چروکی، رکوکینە، گرنگی نەدان بە ژیانی دنیا، ئەمانە وایان کردبو تاڵان‌و

---

(١) ديوان الحماسة

(٢) واتە: چەندجار شەڕمان لەگەڵ برا کردوە ئەگەر کەسێکمان شك نەبردوە

(٣) تەماشای (أيام العرب) بکە.

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشو.

پەلاماردانو رەشەکوژی بلاّوبیێتەوەو کەس لە هیچ بستێکی خاکی جەزیرەدا لـە خۆی ئەمین نەبێ، هەمو دەم بۆی هەبو تالاّنو تیرۆر بکرێ، خەڵك لە ناو کـاروان و لـەنێو هۆزەکەیـدا دەرفێنـران، تەنانـەت ولاّتـە زلهێزەکـانیش پێویـستیان بـە پاسەوانی چالاكو نۆبەتداری بەهێز هەبو.

کیسرا لـە مەدائنـەوە دەگـەڵ پاسـەوانێکی زۆرو بـەهێزدا کـاروانی بـۆ لای نوعمانی کوڕی مونذیر دەنارد نوعمانیش دەگـەڵ پاسـەوانانی بـەنی رەبیعـە بـۆ هوذەی کوڕی عەلـی ئەلحەنەفی دەنارد، ئەویش دەگـەڵ پاسـەوانێکی زۆرەوە لـە خاکی بەنی حەنیفەی دەرباز دەکرد، لەوێوەش تا یەمەن چـەندین پاسـەوانیان بـۆ بەکرێ دەگرت تا دەیانگەیاندە لای کرێکارەکانی میسر[1].

## تاوانو خراپەکاری بەژ[2] و دەریای لە داگرتبو:

لە سەرپاکی زەویدا نەتەوەیەك نەبو خێری پێوە مابێ، کۆمەڵگەیەك نەبو بـە پێی خورەوشتو بنەمای چاکەکاری بە پێوە بێ، رژێمێك نـەبو لەسـەر بنـچینەی دادو بەزەیی دامەزرا بێ، سەرکردایەتیەك نەبو داناو زانا بێ، دینێـك نـەبو وەك پێغەمبەران هێناویانە بە راستو سەلامەتی مابێتەوە.

## چریسکی نێو شـەوەزەنگ :

لەو تاریکستانەدا تروسـکەی وەك پەنگەسـتێران لـە هەنـدێ دێـرو کلێـسادا وەبەرچاوان دەکەوتن بەڵام تاریکیان نەدەتارانـدو رێگـەیان رونـاك نـەدەکردەوە. کەسـێك بیویـستبایە زانـستی راسـت وەدەسـت بێنـێو دینـی رەوا بدۆزێتـەوە نەیدەزانی رو لە کوێ بکات. چاری ناچار سەری خۆی هەڵدەگرتو بـەنێو گەلـێ گەلو شاراندا دەگەڕا تا پیاوێکی شـارەزا ببینێتـەوە شـتێکی لێ حـاڵی بـێ[3]؛

(١) تأريخ الطبري،ب٢ ل ١٢٣.
(٢) بەژ: وشکان.
(٣) حالّیبون: تێگەیشتن.

حاڵی وەك حاڵی کابرای خەریکە خنکاو بو کە دەست بـۆ دارِوپـەردوی کەشـتیە تێکشکاوەکەی دەبات تا رزگار بێ، ئـەوەتانێ گـەڕانو سـورِانەکەی گـەورەترین گەریدەی ئاینخوازی سەدەی شەشەم بەڵگەیە بـۆ نـەبونی ئـەو جـۆرە زانایانـەی خەڵك فێری دین دەکەن، سەلمانی فـارس بـە خۆرهـەڵاتو خۆرئـاوادا گـەڕا، لـە شامەوە چوە موسل، لە موسڵەوە چوە نصـێبین، لە نصێبینەوە بۆ عەموریە، لـە هەر شوێنێك بۆ شوێنەکەیتر رەوان دەکرا تا سەرەنجام گەیشتە باوەشی ئیـسلامو لە تاریکستانی نەفامێتی رزگاری بو، سەلمان خۆی بۆمان دەگێرِێتەوەو دەڵێ:

((کە گەیشتمە شام پرسیم: کێ چاکترین کەسی دینەکەتانە؟ گوتیان ئوسقوفی کلێسا. منیش چومە لایو پێم گوت: ئەو دینەم بە دڵـە و ئەگـەر رێگـەم بـدەی حەز دەکەم لـەو کلێـسایەدا لەگـەڵت بم، لێـت فێـربمو نوێـژت لەگەڵـدا بکـەم، خزمەتیشت دەکەمو تەخـسیری ناکـەم. گـوتی: فـەرمو منـیش لەگـەڵی چـومە ژورەوە. بەڵام پیاوێکی بەدکارو ناراست بـو، خـەڵکی هـان دەدا مـاڵ ببەخـشن کەچـی ماڵەکـەی بـۆ خـۆی پاشـەکەوت دەکـردو بەسـەر هـەژارو نـاگزورانی نەدەبەشیەوە، بەو ساختەیە حەفت بارە زێرِو زیوی کۆکردبۆوە، لەبـەر ئـەوە زۆرم رك لـێدەبۆوە. کە مرد گاورەکان هاتن ئەسپەردەی خاکـی بکـەن منـیش تـێم گەیاندن کە پیاوێکی بەدو ناراست بـوەو هـەمو زێـرِو زیوەکـانم پێنیـشان دان، ئەوانیش گوتیان وەڵڵاهی مادەم وابێ دفنی ناکـەین، ئـەوانیش تەرمەکـەیان لـە خاچ هەڵواسیو بەردبارانیان کرد.

پاشان پیاوێکیتر جێی گرتەوە، ئەویان راستو بێساختە بو، پێنج نوێـژەکانی زۆر بەرِێکی ئەنجام دەدا، ئاورِی لە دنیا نەدەدایەوەو قـەت گرینگـی پێنـەدەدا، چاوی لە ئاخیرەت بو، تەنها بە تـەمای پاداشـتی دوارِۆژ بـو، شـەوو رۆژ خـوای دەپەرست، قەت کەسم وەکو وی بە دین نەدیبو، زۆرم خۆش دەویست، هیچ کەسم وەها خۆشنەویستبو، رۆژگارێکی درێژم لەگەڵی گوزەراند. پاشان لەسـەرەمەرگدا بەر لەوەی بمرێ پێم گوت: بەرِێزم! ئەوا دەمێکـە پێکـەوەینو کەسیـشم وەك تـۆ خۆشنەویستوە، ئێستاکەش دوا هەناسە ساردەکانی ژیانت هەڵدەکێشیو چاوەرِێی فەرمانی خوای، پێم بڵێ چ ئامۆژگاریو فەرمانێکم پێ دەکەی؟ گوتی: رۆڵەگیان

بەخودام سوێندە بڕوا ناکەم کەس مابێ ئەو ڕێوشوێنەی منی لەسەرە پەیڕەوی لێبکات، خەڵك هەموی فەوتاون و دینیان گۆڕیوە، بەڵام پیاوێك لە موسڵەو ناوی فڵانە بە تەنها ئەو ڕاست ماوە بڕۆ بیگەیێ.

کە گیانی سپاردو ئەسپەردە کرا ڕێی موسڵم گرتەبەر و کابرام دۆزیەوە و پێم گوت: فڵانەکەس بەر لەوەی بمرێ ئامۆژگاری کردم بێمە لاتو گوتی تەنها تۆ ڕاست ماوی. گوتی: لێرە بمێنەوە، منیش مامەوە، ئەویش پیاوێکی ڕاستو ساغ بو، لەسەر هەمان ڕێوشوێن بو، بەڵام هێندەی پێنەچو کۆچی دوایی‌کرد، لەسەرەمەرگدا بو پێم گوت: بەڕێزم! فڵانەکەس منی بۆ لای تۆ ڕەوانە کردبو، وا تۆش بەجێم دێڵی، چ ئامۆژگاریەکم پێدەکەی؟ گوتی: ڕۆڵەگیان! سوێندم بە خودایە، بڕوا ناکەم کەسی وەکو ئێمە مابێ تەنها فڵان کەس نەبێ کە لە نصێبینەو بڕۆ بیگەیێ.

کە مردو ماوەیەکی کەمی پێچو ملی ڕێم گرتو چومە لای کابرای نصێبین و مەسەلەی خۆمم بۆ گێڕایەوەو گوتم فڵانەکەس ڕەوانەی کردوم . گوتی: بمێنەوە منیش مامەوە. بەڕاستی پیاوێکی چاك بو، لەسەر هەمان ڕێوشوێن بو، بەخوا هێندەی پێ نەچو ئەویش مرد، لەسەرەمەرگدا پێم گوت: ئەتۆ چم ئامۆژگاری دەکەی؟ گوتی: ڕۆڵەگیان! بەوخودایە بڕوا ناکەم کەس مابێ وەکو ئێمە بێ تەنها یەکێك نەبێ کە لە عەموریە دادەنیشێ گەر حەز دەکەی بڕۆ لای، ئەو لەسەر ڕێوشوێنی ئێمەیە .

پاش ئەوەی مرد، ئەوێم بەجێهێشتو چومە لای پیاوەکەی عەموریە و مەسەلەی خۆم بۆ باس کرد، گوتی، لەلای من بمێنێوە. خوا هەڵناگرێ پیاوێکی ڕاست بو و لەسەر هەمان ڕێوشوێن دەڕۆیشت. لەوێدا کەسابەتم کردو بومە خاوەنی چەند مەڕو چێلێك، ئەویش مەرگی لێ هاتە پێشو لەسەرەمەرگدا پێم گوت: من تا هاتومە لات ئەوەندە کەسە ڕەوانیان کردوم تۆ چم پێ دەفەرموی؟ گوتی: ڕۆڵە گیان ! بەوخودایە بڕوا ناکەم هیچ کەسێك لەسەر ڕێوشوێنی ئێمە مابێ، بەڵام خەریکە پێغەمبەرێك پەیدا ببێ لەسەر ئاینی ئیبراهیمەو لەخاکی عارەبان دەردەکەوێ، بۆ خاکی نێوان حەڕڕەتەین کۆچ دەکا کە دارخورمایان لە

نێوان دایـە، چـەندین نیـشانەی پێغەمبەرایـەتی تێدایـە ناشـاردرێنەوە، دیـاری وەردەگـرێ، خێـرو زەكـات وەرنـاگرێ، لـە نێـوانی هـەردو قۆڵنجیـدا مـۆری پێغەمبەرایەتی هەیە، ئەگەر دەگەیە ئەو وڵاتە بڕۆ ..)) تاد[1].



(١) رواه الامـام احمـد عـن ابـن عبـاس عـن سـلمان و رواه الحـاكم في مـستدركه . ئـەم ریوایەتـە لەبەرئەوەی سەندەكەی موتتەصـیلەو راویەكانی عادیلن بۆیە یەكێكە لـە راسـترین ئـەو بەڵگەنامانەی كە لەبارەی نەفامێتیو حاڵەتە ئاینیەكەیەوە دەدوێن .

بەندی دووەم

## سیستەمی سیاسیو دارایی
## لە سەردەمی نەفامێتیدا

### پاشایەتی رەها :

سەردەمی نەفامێتی شانۆ بو بۆ حوکمی ستەمئامێز و غەدرکاری، سیاسەتی ئەو سەردەم بریتی بو لە پاشایەتی رەها.پاشایەتی هەبو بە پێی بنەمای بە پیرۆز زانینی بنەماڵە تایبەتیەکان بو، وەك لەناو فارسەکاندا وابو، بنەماڵەی ساسانیەکان پێیان وابو مافی پاشایەتیان لە لایەن خواوە پێ سپێردراوە، هەرچی لە تواناشیاندا هەبو تێکۆشان تا توانیان خەڵك بۆ ئەم مافە پیرۆزەی پاشایەتی بە جۆرێك ملکەچ بکەن وەك دین پەیڕەوی لێبکەن. پاشایەتی هەبو بە پێی بنەمای بە پیرۆز زانینێکی رەهای پاشاکان دامەزرابو، وەك لەناو چینیەکاندا وابو، کە بە پاشاکەیان دەگوت: ئیمپراتۆر (کوڕی ئاسمان)، پێیان وابو ئاسمان نێرەو زەمینیش مێ، بونەوەریش لەم دوانەوە کەوتۆتەوە، ئیمپراتۆر: خەتامی یەکەمیش نۆبەرەی ئەم ژنومێردەیە[1]. پێیان وابو ئیمپراتۆر تاکە باوکی گەلە و هەر شتێکیش بکات ئازادە، پێیان دەگوت: ((تۆ باوكو دایکی گەلی)).

کاتێك ئمپراتۆر (لی یان)یان (تای سۆنگ) مرد، سەرجەم خەڵکی چین بەرگی تازیەیان پۆشیو گەلێك خەفەتبارو پەرێشان بون، هەبو دەرزی لە دەموچاوی ئاژنی بو، هەبو پرچی خۆی بڕیبو، هەبو لەتەك تەرمەکەدا شینی دەکردو سەروگوێلاکی خۆی دەکوتا.

پاشایەتی هەبو بە پێی بنەمای بە پیرۆز زانینی چەند گەلو نیشتمانێك بنیات نرابو، پاشایەتی رۆم وابو، کە بنەمای سەرەکی بریتی بو لە بە پیرۆز زانینی

---

(١) مێژوی چین، جیمس کارکرن .

پاشانشینی گەلو نیشتمانی رۆم. سەرجەم نەتەوەو نیشتمانەکانی دیکەش لە خزمەتیان دابونو وەك خوێنبەر خوێنیان بۆ دلّی دەبرد، ولاّت هەمو ماف و رێبیر[1] و شکۆ و رێزێکی پێشێل دەکرد و ستەمو ملهوڕی و کاری ناشیرینیان پێ رەوا بو، هەر ولاّتێکیش پاشایەتیەکەی وەك دین و بیروباوەڕ وەرنەگرتایە و وەفا و دلّسۆزی بۆ نەبوایە هەمو جۆرە ستەمێکی دەرهەق دەکرد، هیچ کاتێك پێی ڕەوا نەدەبینی لە خاکی خۆی خاوەنی مافی رەواو حوکمی سەربەخۆی خۆی بێ، وەك وشتری دابەستیو سواری هەر هێندە ئالیکەی دەرخوارد دەدا تا گوانەکەی پێ پڕ شیر بێ یان پشتی پێ قیتو قۆز بێ.

(رۆبەرت بریفۆلت) لەبارەی ولاّتی رۆمەوە دەلّێ:

((هۆی سەرەکی لەناوچونو روخانی ولاّتی رۆم زێدە خراپەی (وەکو بەرتیلو شتیتر) نەبو، بەلّکو بەهۆی ئەوە بو کە هەر لە رۆژی یەکەمی دروستبونی ولاّتەوە شەڕو خراپەکاری پەلوپۆی بەناودا هاویشتو سیستەمی ولاّت دەگەلّ واقیع نەدەگونجا.

هەر ئۆرگانێك لەسەر بنەمایەکی لەرزۆك دامەزرابێ و نەشتوانێ زیرەکانە خۆی رزگار بکات هەلّبەت رۆژێك دادێ دابڕمێو خاپور ببێ، ولاّتی رۆم ببوە ئامرازی دەست چینێکی گچکە و لەسەر حیسابی رەنج و خوێنی جەماوەری چەوساوە رایاندەبوارد و بە تێروتەسەلی دەگوزەران. راستە کاری بازرگانی لە رۆمدا بە داد و ئەمانەوە بەڕێوە دەچو، کە دەمێك بو ولاّت دەقی پێوەگرتبو، لە حوکمو دادوەریشدا بەهێز و کارامە و لێهاتو بو، بەلاّم ئەم چاکییانە ولاّتیان لەسەرەنجامی رەشی بنەمای لەرزۆك و پڕ هەلّە نەپاراست))[2].

---

(١) رێبیر: مبدأ.

(٢) Robert Briffault: The Making of Humanity, P.١٥٩

## حوكمی رۆم لە میسر و شامدا :

دكتۆر ئالفەرد. ج . باتلەر لە بارەی حوكمی رۆم لە میسردا دەڵێ:
((حكومەتی میسر(ی رۆمی) تەنها یەك مەبەستی هەبو، دەیویست بە زۆری زۆردارەكی پارەو ماڵ لە خەڵك بستێنێو بیخاتە ناو خەزێنەی كاربەدەستان، قەت بە خەیاڵی دانەهاتوە گوزەرانێكی خۆشو گوشاد و ژینێكی تێروتەسەل بۆ خەڵك بێنێتە دی یان دڵو دەرونیان مشتوماڵ[1] بكاتو باری بژێویان راست بكاتەوە. حوكم حوكمی بێگانە بو، پەنای تەنها وەبەر زەبروزەنگ دەبرد و سۆز و بەزەیی بۆ خەڵك نەدەبزوا))[2].

مێژوناسێكی عەرەبی خەڵكی شام لەبارەی حوكمی رۆم لە شامدا دەڵێ:
((رۆمەكان لەسەرەتادا بە رەفتاری چاكو دادگەرانەوە دەگەڵ خەڵك هەڵسوكەوتیان دەكرد، هەرچەندە پاشانشینەكەشیان لە ناوەوەدا دوچاری گەلێك كێشەو سەرێشە ببو، بەڵام كە وڵاتەكەیان بە ساڵدا چو و هێز و بازوی پەیدا كرد، بارودۆخی خەڵكیان بەرەو ئەوپەری نەهامەتی برد و كۆتی كۆیلایەتیان لە گەردنان كرد. وڵاتی رۆم راستەوخۆ شامی نەخستە سەر خۆ و دانیشتوانەكەی نەبونە هاوڵاتی رومانی و خاكەكەش نەبوە خاكێكی رۆمانی، بەڵكو هەر بە نامۆ و ژێردەستی مانەوە، تەنانەت خەڵكەكە گەلێ جاران لەبەر باری ناهەمواری بژێویان منداڵی خۆیان دەفرۆشت، ستەمكاری و كۆیلایەتی و بێگاری لە رادەبەدەر بو، بە دەستی خەڵكی شام پەیمانگە و كارخانەكانیان لە شامدا دروست كرد))[3].

((رۆمەكان بۆ ماوەی حەفت سەد ساڵ حوكمی شامیان گێڕا، لەگەڵ حوكمی رۆمدا شام دوچاری كێشە و دوبەرەكی و ملهوڕی و خۆپەرستی و كوشتار بو. یۆنانیش بۆ ماوەی ٣٦٩ ساڵ حوكمی شامی گێڕا، لەسەردەمی ئەوانیشدا توشی

---

(١) مشتوماڵ: تهذيب.
(٢) فتح العرب لمصر، د.ئالفەرد.ج باتلەر، تعريب : محمد فريد أبو حديد .
(٣) خطط الشام، للاستاذ كرد علي : ١٠١/١ .

چەندین شەڕی خوێناوی و ستەمکاریی پڕ مەرگەسات بو، چاویان لە خێرو بێری شام داگرتبو، بە هەمو جۆرێك دەیانچەوساندنەوە، ستەمکارترین حوكمو رەشترین رۆژیان لەسەر دەستی یۆنانەوە بینی))[1].

بە کورتی ولایەتە ژێردەستەکانی فارسو رۆم ئاسودە نەبون و لە حوکمی بێگانە هەراسان بون، رەوشی سیاسی و ئابوریشیان تەنانەت لە پایتەختەکانیشدا لە پەشێویو بێسەروبەری دابو.

## سیستەمی باجو خەراج لە ئێراندا:

سیستەم و سیاسەتی دارایی لە ئێراندا سەقامگیر و دادگەر نەبو، زۆربەی کات پەشێو و پڕستەم بو، بە پێی رەوشت و ئارەزوی باجەستێن[2] و رەوشی شەڕ و باری رامیاری هەڵبەز و دابەزی دەکرد.

نوسەری (ئێران لەسەردەمی ساسانیەکاندا) دەڵێ:

((باجەستێنەکان لە مەزندەکردنی باج و پارەوەرگرتندا دەستیان لە گزیکاری نەدەپاراست و بەرکی خۆیان بێبەش نەدەکرد، جا لەبەرئەوەی بڕی کۆباجەکانی[3] گشت ساڵێك وەکو یەك نەبون بۆیە دەرامەت و خەرجی ولاتیش جێگیر نەبو، گەلێ جار کە ولات دوچاری شەڕ دەبو و خەرجی شەڕێی پێ نەدەکێشرا، یەکسەر پەنای دەبردە بەر ئەستاندنی باجی نوێ، هەرێمە دەوڵەمەندەکانی رۆژئاوا -بەتایبەتی بابل- هەردەم جێ ئامانجی ئەوجۆرە باجانە بون))[4].

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشو : ١٠٣/١ .

(٢) باجەستێن: الجباة.

(٣) کۆباج: الضرائب.

(٤) ئێران لەسەردەمی ساسانیەکاندا، ل ١٦٠.

## گەنجینە و پاشـەکەوتی پاشایان:

ئێـران لەگەنجینـەی وڵاتـدا پارەیـەکی ئـەوتۆی بـۆ خـەڵك خـەرج نـەدەکرد، پاشاکانی ئێران لـە دێرینـەوەڕا وا راهـاتبون کـە پـارەپولێکی لـە رادەبـەدەر و کەلوپەلـی بەهادار و گرانبەها بۆ خۆیان پاشەکەوت بکەن[1]. شـاخوسرەوی دوەم کە پارە و پولەکەی لە شاری مەدائینەوە بەرەو باڵاخانەکەی کە لە ساڵی (٦٠٧-٦٠٨ز) دروسـتی کردبو راگواستەوە بریتی بو لە (٤٦٨) ملیۆن میسقال زێڕ کـە دەکاتە ٣٧٠ ملیۆن فرەنکی زێڕ. لە سـێزدەمین ساڵی پاشایەتیشیدا گەنجینەکەی گەیشـتە ٨٠٠ ملیۆن میسـقاڵ زێڕ[2].

## لێکدابڕانی لە رادەبەدەری نێوان چینەکانی کۆمەڵگە:

کۆمەڵگەی ئێرانی کەمێکیان دەوڵەمەند و زۆرینەشیان هەژار بـون، نوسـەری (ئێران لەسەردەمی ساسانیەکاندا) لەبارەی گەشـترین سەردەمو دادگەرترین شـای ئێران کە (ئەنوشـێروان) بو، دەدوێ و دەڵێ:

((ئەو چاکسـازیە ئابوریەی ئەنۆشـێروان ئەنجامیدا پتر لـە بەرژەوەنـدی وڵات بو نەك خەڵك، خەڵکی رەمەکی[3] هەر لە هەژاریو دەسـتکورتی جاران دەژیـان، فەیلەسوفە بێزەنتیەکان کاتێك جیاوازیو لێکدابڕانە فرەوانەکەی نێوان توێژەکانی کۆمەڵگای ئێرانیـان بـەدی کـرد کـە توێـژی هـەرەخوارەوە گـوزەرانێکی تـاڵو ناخۆشیان دەبردەسەر، نیگەران بونو رەخنـەیان لـە کۆمەڵگـەی فارسـی گـرتو گوتیان: لەم کۆمەڵگەیەدا بەهێزەکان خۆیان بەسەر بێهێزەکـان سـەپاندوە و بـە زەبروزەنگ و دڵڕەقانەو زۆرداری رەفتاریان لەگەڵدا دەکەن))[4].

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشـو، ل ١٦٢

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشـو، ل ٦١١ .

(٣) خەڵکی رەمەکی: خەڵکی عەوام.

(٤) ئێران لەسەردەمی ساسانیەکاندا، ل (٥٨٩-٥٩٠).

ئەو بنەماڵە و نەژادانەی خاوەنی پارە و پشتی ئەستور بون و ڕێـز و شـکۆیان لەلای کاربەدەستان هەبو، دەستیان بەسەر پلەوپایەی وڵات داگرتبو.

ڕۆبەرت بریفۆلـت لەبارەی سیستەمی چینایەتی وڵاتی ڕۆمەوە دەڵـێ:

((ئەگـەر دامودەزگایـەکی کۆمەڵایـەتی توشـی نـەمانو داڕوخـان بوایـە سەرپەرشتان باویان وابو نەیاندەهێشـت وەجموجۆلی هەبێ و بەرەوپێشەوە هەنگاو بنێ، بۆیە کۆمەڵگەی ڕۆمی (لەسەردەمی داڕوخانـدا) ملکەچـی سیسـتەمێکی چینایەتی پڕ ستەم بو و ڕوی لە لاوازی بو، لەم کۆمەڵگەیـەدا کـەس بـۆی نـەبو پیشەکەی خۆی بگۆڕێت، کوڕ دەبوایە هەمان پیشـەی باوکی هەڵگرێتەوە))[1].

## جوتیارانی ئێــران:

باجی نوێ و جۆراوجۆر کۆڵی خەڵکی هێند قورس کردبو، تەنانەت گەلێك لـە جوتیاران کارەکانیان بەجێدەهێشـت، خەڵك لەبەر باجی زۆر و لە ترسی خزمەتی سەربازی بەزۆر کە دەبو بۆ کەسانێکی کە خۆشیان ناوێن بکەن یان لە پێناوێکـدا بیکەن کە خوێنیان بۆ گـەرم نـەبو؛ ڕویـان دەکـردە دێرەکـان و لەوێـدا دەژیـان. بێکاری و تاوانکاری و پەیداکردنی بژێوی بە ڕێگای ناڕەوا پەرەی سـتاندبو.

نوسەری (ئێران لە سەردەمی ساسانیەکاندا) دەڵێ:

((جوتیارەکان لە بەدبـەختی و کلۆڵیـەکی گـەورەدا دەژیـان، نـەدەبو زەوی و زارەکەیان بەجێ بێڵن یان بگۆڕن، دەخرانە بەر بێگاری و هەمو جـۆرە کارێکیـان پێدەکرا، مێژونوس (ئیمیان مارسیلینۆس) دەڵێ: جوتیارەکان وەك بلێیـی مـۆری کۆیلایەتیان لە تەوێڵ درابێ، دەبوایە لە دواوەی لەشکردا بە پێ بڕۆن، یارمـەتی و هاندانی وەك کرێ و موچەیان پێ نەدەدان[2]، پەیوەندی جوتیار لەگـەڵ خـاوەن زەویدا وەك پەیوەندی نێوان کۆیلە و بەگ وابو))[3].

---

(١) The Making of Humanity, P.١٦٠

(٢) ئێران لەسەردەمی ساسانیەکاندا، ل (٣٢٤).

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشـو، لە ٤٢٤ .

## ستەم و چەوساندنەوە:

جولەکەکانی شامو عێراقو یەعقوبیەکانی میسر زۆر خراپ دەچەوسێنرانەوە، کاربەدەستەکان ستەمێکی زۆریان دەرهەق دەکردنو خوێنو ماڵ و ئابڕویان ئەتك دەکردن، ریش سپی و دەمڕاستەکان قڕوقەپ وەك قوڕیان بەدەمدا کرابێ متەقیان لەدەم نەدەهاتە دەرەوە، خەڵك پێی وابو ئەم رەوشە خراپ و ناهەموارو ستەمکارە قەدەرێکی حەتمیە و چارەی نیە، رۆژ هەبو مردنیان پێ خۆشتر بو لەم جۆرە ژیانە.

## ژیاری پوچەڵ و ژیانی خۆشگوزەرانی:

خەڵك لە هەردو وڵاتی فارسو رۆمدا ژیانی پڕ فیزو کەشوفش و رابورادنیان دە ملی ئاڵا بو، لە لافاوی ژیارێکی پوچەڵ و ژیانێکی قرپۆکدا تا گەردەن نغرۆ ببون، شا و کاردەبەستانی رۆم و فارسان لە گێژەنی بێئاگاییدا خولیان دەخواردەوە و خەمی هەرەگەورەیان تاموچێژ و رابواردن بو، بە عەیشونوشێکی لە رادەبەدەر دەگوزەران، وێڵی رواڵەتی رازاوە و خۆشی ژین بون، کیسرا ئەپروێز (١٢) هەزار ژن و پەنجا هەزار ئەسپی هەبو، بێ ئەژمار ئامرازی خۆشگوزەرانی و کۆشکی بەرز و ماڵ و سامان و پۆشاکی رەنگینی هەبو، کۆشکە تایبەتیەکەی خۆی نمونەی ئەوپەڕی قەشەنگیو پڕ لە خۆشی بو[(١)].

(مەکاریۆس) دەڵێ :

((قەت لە مێژودا کەس نەبوە وەك کیسراکان بە خۆشیو نازونوزەوە رایانبواردبێ، لەوپەڕی رۆژهەڵاتەوە تا ئەوپەڕی رۆژئاواوە لە گشت شار و وڵاتێکەوە دیاری و خەڵاتیان بۆ دەهات[(٢)]، لە فەتحی ئیسلامیدا کە لە عێراق

(١) مێژوی ئێران، شاهین مەکاریۆس، چاپی ١٨٩٨، ل ٩٠

(٢) مێژوی ئێران، ل ٢١١

هەڵاتن پۆشاكو كاڵا و قاپ و قاچاخ و خۆراك و رونی هێند زۆر و جۆراوجۆریان لە گەنجینەدا پاشەكەوت كردبو كە نرخیان نەدەهاتە ژماردن)).

((عەرەبەكان گومبەزێكی توركی پڕ لە كوپەی سەر بە قورقوشم داخراویان دۆزیەوە، عەرەبەكان دەڵێن: وامانزانی خواردنیان تێدایە كەچی قاپو پەرداخی زێڕ و زیو بون ))[1].

مێژونوسانی عەرەب لە وەسفی (بەهار)ەكەی كیسرادا كە موسڵمانان لە شەڕی مەدائیندا گرتیان، دەڵێن:

((روبەرەكەی شەست باڵ بە شەست باڵ بو، هەریەك لە رایەخەكانی بە قەد لاتێك[2] دەبو، تانوپۆی رایەخەكان لە زێڕ چنرابو، نقێم و مۆروی بەهاداریان تێدا هۆنرابوەوە، گوڵو گەڵای نەخشەكانی لە دوڕ و گەوهەر بو، بە ئاوریشم و زێر روكەش كرابون، رێگای چونە ژورەوەی وەك كەڕەنا بو، رێگاكان وەكو دوڕیانی روبار لەیەكتر جویێ دەبونەوە، هۆڵەكەشی وەك هۆڵی دێرێ وابو، لە دەوروبەری دیوەخانەكەدا تولە ئاسنی زێڕین هەڵچەقێنرا بون، كوتاڵی حەریریان لە شێوەی دارودرەخت پێدا شۆڕ كرابونەوە و زێڕ و زیو رێژیان كردبون، دەتگوت دارودرەختی راستەقینەن رواون. ئاوی زستانیان لە چەندین حەوزدا كۆدەكردەوە، ئەگەر تێنو بونایە ئاویان تێدا دەخواردەوە، دەتگوت لەنێو مێرگ و گوڵاواندا دەژین))[3]. ئەمەش بەڵگەیەك بو لەسەر ژیانی پڕ لە چێژو خۆشی كە ژیاری فارسی پێی گەیشتبو.

شامیش لە رەوشی وڵاتی رۆم و شارەكانی ژێر دەسەڵاتی رۆمدا باشتر نەبو، هەردو وڵاتی شارستانی رۆم و فارس لە خۆشیو رابواردن و تەنتەنەی شارستانیدا وەك دو هەسپ لە پێشبڕكێ دابون، ئیمپراتۆر و وەزیر و كاربەدەستەكان لە گۆبەندی رابواردنێكی وا دەگوزەران ئەوسەری دیار نەبێ، ئاستانە و كۆشك و مەجلیسی خواردنەوە و رابورادنیان جۆرەها هۆكاری رابواردن و ئامێری مۆسیقای

---

(١) مێژوی طەبەری .
(٢) لات: پارچەیەك لە زەوی كێڵانێ.
(٣) مێژوی طەبەری: ٤ /١٧٨ .

تێدا بو، نازونوز و عەیش و نۆشیان لە ئەندازە دەرچو بو، حەسانی کوڕی ثابتی دو سەردەم دیتە لەبارەی مەجلیسی جەبەلەی کوڕی ئەیهەمی غەسسانی[١] دەڵێ: بەخۆم مەجلیسی جەبەلەم بینی، (دە) سۆزانی[٢] لێبو، پێنجیان ڕۆم بون و گۆرانی ڕۆمییان دەگوت، پێنجەکەی تریش کە ئیاسی کوڕی قوبەیسە بە دیاری بۆی ناردبو، گۆرانی خەڵکی حیرەیان دەگوت، زۆر ژنە عەرەبی تریشی لە مەککە و لە هەرێمی‌تر بۆ دەهات. کە بۆ خواردنەوە دادەنیشت ئالاس و یاسەمین و گەلێك دەرختی بۆنخۆشی تریان لە ژێر رادەخست، بۆنو بەرامی میسكو عەنبەریان بە جامی زێڕ و زیو بەسەردا دەگێڕا و لە جامێکی زیوینیشدا موشکی[٣] ڕەسەنیان لەبەردەم دادەنا، زستانان کام فەروەی بەنرخ و فەنەکی چاك بو دەبەریان دەکرد و داری تەڕیان بۆ دادەگیرساند، لە هاوینیشدا ژورەکەیان بەفرپۆش دەکرد و جلوبەرگی هاوینەیان دەبەر خۆ دەکرد)).[٤]

سەرکردە و فەرماندە و دەوڵەمەند و پیاوە ناودارەکانی بنەماڵە پایەدارەکان و تەنانەت تاکەکانی چینی مامناوەندیش هەوڵیان دەدا جلوبەرگ و خواردن و خواردنەوە و مەجلیس و رابواردنیان وەکو وان بێ و ژیانی خۆیان بەهەمان نەریت و ڕێوشوێن بەڕێوە ببەن. ژیان گەلێ سەخت ببو و گوزەران لە گرانی دابو و ژیار ئاڵۆز ببو، ئەو مەسروفەی کەسێکی ناودار لەخۆی دەکرد گوندێکی پێ دەژیا و هۆزێکی پێ پۆشتە دەکرا، نەریتیش وای دەخواست کە ناودارەکان ئەم جۆرە جل و بەرگانە لەبەر بکەن، خۆ ئەگەر یەکێك ئەم جۆرە بەرگەی نەپۆشیبا یان جارێك لە بیری چوبا لەبەری بکا دەبوە پەندی زەمانە و هەرکەس بیدیبایە پەنجەی سەرسامی بۆ ئاراستە دەکردو چاوی لێ ئەبڵەق دەبو، نەریتەکە وەك ئەرکێکی ژیان و ڕێوشوێنێکی کۆمەڵگەی لێهاتبو و نەدەبو کەس لێی لابدات.

---

(١) سەرۆك هۆزێك بو لەسەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا بوە موسلمان بەڵام پاشان هەڵگەڕایەوە و هەڵاتە ناو ڕۆم و بو بە گاور . وەرگێڕ

(٢) سۆزانی: ئافرەتی سەماکەری بەرچاوان.

(٣) موشك: میسك.

(٤) الاغاني، لأبي الفرج الاصفهاني: ٢/١ .

شەعبی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: جۆری جلوبەرگی فارسەکان بە گوێرەی پلەوپایەی هۆز و بنەماڵەکانیان بو، ئەگەر شکۆی تەواوی هەبوایە دەبوایە نرخی کراسەکەی بەری ١٠٠ هەزار درهەم بێ، هورمز لەو کەسانە بو کە شکۆی تەواوی هەبو و نرخی کراسەکەی ١٠٠ هەزار درهەم بو و سەرتاپاشی بە گەوهەر نەخشێنرابو[١]. ئەو کەسەش شکۆی تەواوی پێ دەبڕا کە ئەگەر لە حەفت بنەماڵە بەرزەکانیان بوایە. ئەزادیەکان کە لە سەردەمی کیسرادا میرزەبانی حیرە بو نیو شکۆی هەبو، نرخی کراسەکەی بەری (٥٠) هەزار درهەم بو[٢]، کۆچکەکەی[٣] سەری رۆستەمیان بە (٧٠) هەزار درهەم فرۆشت و بەهای کراسەکەشی ١٠٠ هەزار درهەم بو[٤].

خەڵك دەگەڵ ئەو ژیارە بە کەشوفش و باو و نەریتە فشۆڵە رادەهاتن و فرچکیان پێوە دەگرتو فراژو دەبون و ببوە سروشتی دوەمینیان، تەنانەت لە حاڵەتی زۆر ناچاریو تەنگانەدا گەلێکیان پێ سەخت بو لەم نەشمە ژینە دابڕێن و بۆ گوزەرانی ئاسایی بگەڕێنەوە. دەگێڕنەوە یەزدیگوردی-دواهەمین پاشای فارسان کاتێك لە مەدائینەوە رایکرد و هەڵات، هەزار کابان و هەزار سۆزانی و هەزار پڵنگەوان و هەزار بەرگدرو و چەندین هەزاری تریشی لەگەڵ خۆی برد هێشتا ئەم هەمو هەزارەشی پێ کەم بو[٥]، شا هورمزانی ئەهوازیش کاتێك بەدیل گیرابو، لەلای عومەری کوڕی خەتتابدا داوای ئاوی کرد بیخواتەوە، ئەوانیش لە پەرداخێکی ئەستور ئاویان بۆ هێنا، کە پەرداخەکەی دیت گوتی ئەگەر لە تێنوێتیان بمرم ناتوانم ئاوی تێدا بخۆمەوە، پاشان پەرداخەکەیان بۆ گۆڕی[٦].

(١) مێژوی طەبەری ب ٤، ل ٦ .
(٢) مێژوی طەبەری ب ٤، ل ١١ .
(٣) کۆچك: قلنسوة.
(٤) مێژوی طەبەری ب ٤، ل ١٣٤ .
(٥) ئێران لەسەردەمی ساسانیەکاندا، ل ٦٨١ .
(٦) مێژوی طەبەری ب ٤، ل١٦١ .

## زێدە باجی لە ڕاددەبەدەر:

لە ئەنجامی رابواردنی خۆش و بەربەرەڵلایی بێجڵەو و کەشوفشی فشۆڵدا باجێکی لەرادەبەدەر دەخرایە سەر خەڵك و بۆ ئەوەی باجێکی پتر لە چینی رەنجدەر و جوتیار و بازرگان و پیشەسازان بستێنن یاسای نوێیان دەردەکرد. باری خەڵکیان هێند قورس دەکرد پشتیان لەگەڵ کوڕ دەبووەوە و شەنگ و هێزیان لەبەر دەبڕین.

نوسەری (ئێران لەسەردەمی ساسانیەکاندا) دەڵێ:

((باوی پاشاکان وابو جگە لە باجی رەسمی دیاریش لە خەڵك وەربگرن، کە پێیان دەگوت (ئاین). لە نەورۆز و رۆژی میهرەجانیشدا بە تۆبزی دیارییان لە خەڵکەکە دەستاند، کانە زێڕەکانی ئەرمینیا موڵکی تایبەتی پاشا بون و بۆ گوزەرانی خودی خۆی تەرخان کردبو[١].

مێژونوسێکی عەرەبی شامیش دەڵێ:

((گەلی شام دەبوایە سەرانە و دەیەکی بەروبوم و بەرتیل و رەسمێکی سالانەش بدەن، گەلی رۆمیش چەندین داهاتی گرنگیان لە گومرگ و کان و باج و شیناوەرد و لەوەڕگاکان هەبو، بەکرێ دەیاندایە کرێبەستەکان[٢]، بەو کرێبەستانەیان دەگوت عەششار کە تەنانەت جیبایەی باجەکەشیان لە حکومەت دەکرییەوە، هەر ولایەتێك کۆمەڵێك شەریکەی لەم جۆرەی تێدا بو، هەریەکەشیان چەندین نوسەر و باجەستێنی هەبو کە خۆیان بە بەگ نیشانی خەڵك دەدا و لەو بڕەی بۆیان دیار کرابو پتریان لە جوتیاران دەستاند و شتی چاك و نایابیشیان لێ دەبردن، تەنانەت گەلێ جار وەك کۆیلە دەشیانفرۆشتن))[٣].

((یەکێك لەبارەی سیاسەتی ئیمپراتۆردا جوانی گوتوە کە دەڵێ: شوانی شارەزا خوری مەڕەکانی هەڵدەپاچێ بەڵام لە بنڕای هەڵناکێشێ، بۆ ماوەی دو

---

(١) ئێران لەسەردەمی ساسانیەکاندا، ل ١٦١ .

(٢) کرێبەست: شركات المتعهدين.

(٣) خطط الشام للأستاذ كرد علي: ٥/٤٧ .

سەدە ئیمپراتۆری رۆمەکان خەڵکیان هەڵدەپاچی و پارەوپولێکی زۆریان لێ دەستاندن بەو ناوەی لەپای ئەوەدا لە دوژمنانی دەپارێزن))[1].

## بەدبەختی خەڵکی:

لە هەردو ئیمپراتۆردا خەڵك ببونە دو چین: چینی پاشاو ئاستانەو بنەماڵە و هۆز و دەوڵەمەندە کاسەلێسەکان کە بەوپەڕی خۆشی دەژیان و لەنێو گوڵ و گوڵزار و دارو درەخت و دەوەن و گوڵاوی دڵڕفێنندا بە تێروپڕی دەگوزەران و هەناسەی پڕ بۆنی خۆش و بەرامەی موشکیان هەڵدەکێشا و ئەسپەکانیان بە زێڕ ناڵ دەکرد و خانوەکانیان بە ئاوریشمو حەریر پۆشتە دەکرد.

چینەکەی تر: چینی رەنجدەر و بازرگانی بێسەرمایە و پیشەساز و کرێکاران بون کە لە ژیانێکی سەختو تەنگدا دەژیان و جگە لە تەنگژەی گوزەران باری باج و بەرتیلیش هێز و بڕستی بڕیبون و رۆژ بە رۆژ بێنەواتر دەبون و کۆت و زنجیری کۆیلایەتیان تێ دەئاڵاو وەکو ئاژەڵ دەخرانە بەر بێگاری، دەبوایە بۆ ئاسودەیی کەسانیتر رەنج بکێشن و بۆ خۆشی کەڵەگایان بەدبەخت بن و بەیانی تا شەو خەریکی پەیداکردنی بژێوی رۆژ دەبون، کە بێزار و پەستیش دەبون پەنایان دەبردە بەر بادەو سەرمەست دەبون، کە دەیانویست بسێنەوە و خەمی خەستیان بتارێنن رویان لە کاری نارەوا دەکرد و لە رابواردن گەوزیان دەدا. جگە لە دژواری ژیانەکەیان دیلی لاساکردنەوەش بون و دەیانویست هاونەشمی دەوڵەمەندان بژین، هەڵبەت لەو پێناوەدا ئازارێکی پتریان لە ئازاری دابینکردنی نانی زگ دەکێشا. بۆیە ژیان ببوە مەرگەموش و بە گەرویاندا نەدەچوە خوارەوە، زۆر کەساس و رەنگپەڕیو و سەرقاڵ و دەستکورت بون.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشو .

## لە نێوان دەوڵەمەندیەکی یاخی ئامێز و هەژاریەکی لەبیربەرەوەدا:

بەمجۆرە پەیامی پەیامبەران لە ئارادا ون ببو، خوڕەوشتی چاك و بنەمای بەرز لە جیهانی شارستان و ئاوەدانیدا لەنێو هەردو بەرداشی دەوڵەمەندبونی یاخیئامێز و هەژاربونی لەبیربەرەوەدا هاڕەهاڕی بو. دەوڵەمەندان لە دین بێئاگا ببون و بایەخیان بە ژینی دوارۆژ نەدەدا و بیریان بەلای مردنو ژیانی دوای مردن نەدەچو، جوتیار و رەنجدەرانیش لەبەر خەم و پەژارە و ئەرکی قورسی گوزەرانیان ئاگایان لە ئاین بڕابو، سەرجەم خەڵك بە هەژار و دەوڵەمەندیەوە هەمیشە خەریکی ژیان و رابواردن بون، بەرداشی ژین هێند بەهێز بە دەوری خەڵك سوڕی دەخوراد تەنانەت خەڵك نەتوانن بۆ جارێکیش بۆ ئاین و رۆژی دوایی سەر بەرز بکەنەوە، نەیاندەپەرژا بۆ ساتێکیش دەگەڵ روح و دڵ و واتا بەرزەکانی ژین تێکەڵ بن.

## وێناکردنی نەفامێتی:

یەکێك لە زانا بەرزەکانی ئیسلام زۆر بە جوانی رەوشی نەفامێتی خستۆتە بەرچاو و دەڵێ:

((عەجەمو رۆم بە درێژایی رۆژگاری درێژ و لە ماوەی چەندین سەدەدا کە حوکمیان گێڕاوە لەناو خۆشیو رابواردنی دنیادا سەر نگون ببون، ژینی دوارۆژیان لەبیر چوبو، شەیتان سواری سەر ملیان ببو، لە هەمو بوارەکانی ژیاندا لە رابواردنی بێجلەو رۆچوبون و شانازیان پێوە دەکرد، گەلێك داناو زانا تانوپۆی خۆشی دنیایان بۆ دەچنین، بە درێژایی رۆژگار ژیانیان بەم نەشمەوە دەبردە سەرو رۆژ لە رۆژ لە رابواردن و چێژی ژین نغرۆتر دەبون. بەجۆرێك نرخی تاج و کەمەربەندی خانەکانیان لە سەد هەزار درهەم کەمتر نەبو، ئەگەر کۆشکی بەرز و حەوزی ئاو و کەنیزەی شۆخو شەنگ و رەواڵی جوان و کەشخە و نانی پڕ خواردن و جلوبەرگی قەشەنگ و جۆراوجۆر و ئارایشگای رازاندنەوەیان نەبوایە پێیان شەرمەزاریو روزەردی بو، هەرچەندی باسی عەیش و نۆشیان بکەی تەواو

نابێ، بۆ ئەوەی لە رابواردنەکەیان بگەی سەیری رەوشی پڕنۆشی بە نازونوزی پاشای ولاتەکەت بکە ئەوجا بۆت رون دەبێتەوە ئەوان چۆن بون.

ئەم شتانە دەگەڵ بنەڕەتی ژینیان تێکەڵ ببو و نەدەکرا لە دڵیان ریشەکێش بکرێ مەگەر دڵیان پارچە پارچە ببوایە، ببونە هۆی پەیدابونی گەلێك نەخۆشی کوشندەو بێچارە، کە سەرجەم خەڵکی بازاڕ و ماڵ و دەوڵەمەند و هەژارانی داگرتبوەوە و بەلا کەسی هەڵنەبوارد، توشی پەژارە و دەستوەستاوی کردبون و هەسانەوەی لێ هەڵگرتبون، چونکە ژیان گەلێ سەخت ببو و بە پارەوپولێکی زۆر و زەوەند نەبوایە هەڵنەدەسوڕا، پارەو پولەکەشیان تەنها بەوە دابین دەکرد کە باجی پتر بخەنە سەر جوتیار و بازرگان و کاسبکاران، خۆ ئەگەر خەڵکەکە بەلەسە دەبون و باجیان نەدەدا توشی ئەشکەنجەی کوشندە دەکران و دەکوژران، ئەگەر ملکەچیش دەبون وەکو کەری گێرەکەر و تێڕ لەسەر پشت و وەکو گاجوت لێ دەخوران، تەنها کاتێك دڵیان رادەگیرا کە پێویستیان پێ هەبون، بەلام پاشان نەیاندەهێشت ساتێکیش بسێنەوە، خەڵکەکە باری گوزەرانیان هێند سەختو قورس ببو کە نەتوانن سەر بۆ ئاسودەیی ژیانی دوایی بەرز بکەنەوە، رەنگە لە شارێکی گەورەو بەرفرەواندا کەسێك نەبوبێ دینی پێ گرنگ بوبێ))[١].



(١) حجة الله البالغة، باب إقامة الاتفاقات واصلاح الرسوم .

**بەندی یەکەم**

## ڕێوشوێنی پێغەمبەران لە گۆڕین و چاکسازیدا

### ئەو جیهانەی کە محمد ﷺ بەرەنگاری بووەوە:

ئەو کاتەی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا ﷺ بوە پێغەمبەر، جیهان وەك باڵاخانەیەك بو کە وەبەر بومەلەرزەیەکی بەهێز کەوتبێ و زۆر بە توندی راهەژا بێ، لە گەلێك شوێندا بناغەو بانەکەی داڕوخاو و تێشکابێ، لە گەلێك شوێنیتر دانوچاو و داکەوتبێ، گەلێك شت لە شوێنی شیاوی خۆیان نەما بن و لە شوێنی تردا کەوتبن، شتیش هەبن بەسەریەکدا تێکڕوخاو و کەڵەکە بوبن .

محمد ﷺ بە دیدی پێغەمبەرێتیەوە لە جیهانی روانی، مرۆڤێکی بینی لە مرۆڤێتی داشۆرابو، سوژدەی بۆ دارو بەرد و روبار و شتی وا دەبرد کە هێندەی نوکی دەرزیش زیان و قازانجی نەبێ.

مرۆڤێکی بەراوەژوی بینی، کە عەقڵیەتیەکەی تێکچوبو و لە بەڵگەنەویستان و بابەتی رون و بێگرێ نەدەگەیشت. شیرازەی بیری شپرزە ببو و بابەتێك تێوەڕامانی بویستایە بە سادەیی سەیری دەکرد و بابەتێکیش سادە بوایە لێی وە چەندوچونان دەکەوت و قوڵ دەبوەوە، ئەو شوێنەی کە خوازیاری بڕیاری دڵ بو لێی دودڵ بو، وای دەخواست لێی دودڵ بێ بەبێ سێودو دڵنیا بو. مرۆڤێك کە چێژەکەی هەڵبروسکا بو[1]؛ تاڵی بە شیرن و شیرنی بە تفت تام دەکردو ژەمەنبوردەی ژەهری مار بو. مرۆڤێك کە هەستی ناجسن ببو؛ کینەی لە دوژمنی ستەمکار هەڵنەدەگرت و دۆستی دڵسۆزیشی خۆشنەدەویست.

کۆمەڵگەیەکی بینی کە وێنەیەکی بچوکی جیهانی نیشان دەدا و هەمو شتێکی تێدا سەرەوژێر و جێیی گۆڕابو، گورگ شوان و ناحەزی زۆرداریش

---

١ هەڵبروسکان: هەڵبزڕکان.

دادبەدەست[1] بو، پیاوی تاوانکار لە خۆخەنی‌و بەختەوەر و پیاوی چاکەکاریش لە بێبەش و بەدبەخت بو، چاکە بەستەزمان‌و ناپەسند بو، خراپەی ناپەسندیش چاکی هەرەچاك بو. گەلێك نەریت‌و باوی بینی کە مرۆڤایەتی وێران دەکردو بەرەو هەڵدێری فەوتانێی دەبردن.

بینی خەڵك لە مەیخۆری وروکاون و هێند مەستن بۆ سەرمەستی خەریکە نەتوانن بێ مەی بژین، داوێن پیسی‌و بەدڕەوشتی لەوپەڕی بێشەرمی دابو، ریباکاری گەیشتبوە رادەیەك ماڵ و موڵك زەوت بکرێ، پولپەرستی‌و تەماحکاری خەڵکی بەرەو دڕندەیی و تالانکاری هەڵنابو، ستەم‌و بێڕەحمی گەیشتبوە رادەیەك کە کچۆڵەی بێگوناح‌و لە گوڵ پاکتر زیندەبەچاڵ بکرێن و جگەرگۆشان لەبەر هەژاری بکوژرێن!.

بینی پاشاکان زەوی خوایان پاوان کردوەو سەرجەم خەڵکیان کردۆتە کۆیلە. مالم‌و کەشیشەکان خۆیان لە خەڵك کردۆتە خوا و بە نارەوا ماڵی خەڵك دەخۆن‌و کۆسپ دەخەنە سەر رێگەی خوا.

بینی بەهرەکانی[2] مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی راست‌و دروست ئاراستە ناکرێن و لە کاری بێکەڵك بە فیرۆ دەدرێن و لە جیاتی ئەوەی سودو قازانج ببەخشن دەردەسەری دەنێنەوە و وەك بەلا لە بالای مرۆڤایەتی ئالاون. ئازایەتی بریتی بو لە رەشەکوژی و تالان‌و برۆ کردن، پیاوەتی ببوە ماڵ بە فیرۆدان و پاکوپوك کردن، جوامێری ببوە فیزودەماری نەفامیانە، زیرەکایەتی بریتی بو لە ساختە و پاختەسازی، ئاوەزیش بریتی بو لە ئامرازی داهێنانی تاوانی تازە[3] و ئارەزوبازی.

بینی تاك‌و کۆمەڵ وەك کەرستەی خاون بەلام پیشەسازی دەستڕەنگین و زیرەکیان لێ هەڵنەکەوتوە تا بۆ بنیادنانی پەیکەری ژیار وەبەرکار بن، وەك

١ دادبەدەست: قازی.
٢ بەهرە: موهبة.
٣ تازە: نوێ.

تەختە دارن بەڵام دارتاشێکی کارامەیان لێ پەیدا نەبوە تا کەشتیەکیان لێ دروست بکاتو دەریای ژیانی پێ ببڕن .

بینی گەلانی سەر روی زەوی وەك مێگەلە مەڕی بێ شوانن، سیاسەت وەك وشتری هاری بێجڵەوی بەرهەڵدایە، دەسەڵات وەك شمشێرەو لە دەستی سەرخۆشان دایە، کوڕو براگەلی خۆیان پێ بریندار دەکەن.

## لایەنەکانی ژیانی پڕبەدی[1]:

پیاوی چاکساز دەبێ مشوری سەرجەم لایەنەکانی ژیانی گەندەڵ بخواتو هەمویان لەبەر چاو بگرێ، هەر چاکسازێك بۆ ئەوەی تەنها یەك لایەنی کۆمەڵگە راستەڕێ بکات دەبێ سەرلەبەری تەمەنو توانی خۆی بۆ تەرخان بکات.

دەرونی مرۆڤ پێکهاتەیەکی ئاڵۆزو رایەڵ و پۆی وردی هەیە و زۆر دەرگاو پەنجەرەی تێدایە، بۆیە ئەگەر ئەو دەرونە توشی لاڕێبونو چفتوچەوێلی[2] بێت ئەوا تا روکارەکەی[3] لە خراپەوە بەرەو چاکە و لە خەوشەوە بەرەو ساغی وەرنەسوڕێ، تا گژوگیای زەرەربەخشی لێهەڵنەکێشرێ کە رەنگە بەهۆی خراپەکاری کۆمەڵگەو شپرزەبونی پەروەردەوە بڕوێ وەك چۆن گژوگیای شەیتانی لە خاکێکی نادان[4] دەڕوێ، تا تۆوی خراپەکاری لەناو نەبرێ و لە شوێنیدا خۆشویستنی چاکەو تەقوای لێ نەچێنرێ؛ قەت ناکرێ نەریتە ناجسنەکانی بنبڕ بکرێ و خەوش و کەموکوڕیەکانی چارەسەر بکرێ.

چارەسەرکردنی هەر دەردێکی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و هەر خەوشێکی نەوەی ئەمڕۆ وا دەخوازی تەواوی ژیان چارەسەر بکرێ، تەواوی تەمەنی چاکسازەکەشی گەرەکە، بەڵکو رەنگە تەمەنی چەندین پیاوی چاکسازی چەندینیتریشی گەرەك[5]

---

١ پڕ بەدی: گەندەڵی، فاسد.
٢ چفوچەوێڵ: خواروخێچ.
٣ روکار: ئاراستە، اتجاه.
٤ نادان: بە پیت و بەرەکەت.
٥ گەرەك: ویستن.

بێ. ئەگەر یەکێك بیەوێت لە وڵاتێکی پڕ لە رابواردنو بەرهەڵداییو ئارەزوبازیدا عەرەق قەدەغە بکا، ئەوا لە ماندوبونو رەنجی بە فیڕۆ بترازێ چیتری پێنابڕێ، چونکە خواردنەوەی عەرەق لە دەرونێکەوە سەرهەڵدەدا کە شەیدای نۆشینی چێژ بێ ئەگەرچی لە ژەهریش بێ، ئالودەی نۆشی مەستبون بێ ئەگەرچی لە گوناحیش بێ.

ئەم جۆرە دەرونە بە پڕوپاگەندەو بڵاوکراوە و نوسین و پەرتوك و وتاردانان ناسەنگرێتەوە[1]، بە رونکردنەوەی زیانە دروستیو رەوشتیەکان و، بە یاسای توندوتیژ و سزای جەرگبڕ وازناهێنێ[2]. بەڵکو تەنها بە گۆڕانکاریەکی قوڵی دەرونیەوە دەگۆڕێ، خۆ ئەگەر بە هەر رێگەیەکی تریش ناچار بکرێ وازبهێنێ ئەوا پەنا وەبەر جۆرەها فڕوفێڵ و تاوانیتر دەباتو بە ناو و وێنەیتر مفتی[3] دەکات.

---

١ ناسەنگرێتەوە: ناسڵەمێتەوە.

(٢) کاتی خۆی حکومەتی ئەمەریکا بڕیاری قەدەغەکردنی عەرەقی دا و ویستی تەواوی وڵاتی لێ پاك بکاتەوە، هەرچی هۆکارو ئامرازی شارستانی ئەوسا هەبو وەکو گۆڤار، رۆژنامە، وتار، وێنە، سینەما، هەموی لە پێناو رونکردنەوەی زیانو ناسەواره خراپەکانی عەرەقدا خستەکار. ئەو پارەیەی لە پڕوپاگەندەکانی خەرج کرد بە پتر لە ٦٠ ملیۆن دۆلار مەزەندە دەکرێ، ژمارەی ئەو لاپەڕانەی لەدژی عەرەق رەشنوس کران نزیك بە دە هەزار ملیار لاپەڕ دەبون، بە درێژایی چوارده ساڵان لە پێناو جێبەجێکردنی یاساکە نزیکەی ٢٥٠ ملیۆن جونەیهی کرده قوربانی، ٣٠٠ کەس ئیعدام کران، (٥٣٢٣٣٥) کەس بەند کران، سەرجەمی سزا ماڵییەکان گەیشتە ١٦ ملیۆن جونەیهـ . ئەو موڵکانەی حکومەت دەستی بەسەردا گرت بایی ٤٠٤ ملیۆن جونەیهـ دەبون، بەڵام هەمو ئەمانە دادی نەدان، بەڵکو بە پێچەوانەوە گەلی ئەمریکی شەیداترو لاملتر بون، پاشان ئەمریکا لە ساڵی ١٩٣٣ بە ناچاری یاساکەی هەڵوەشاندەوە و عەرەقی رەوا کرد و عەرەقخۆرانی رەها کرد.

لە پەرتوکی ( تنقیحات)ی ئوستاد ەبولئەعلای مەودودی وەرگیراوە.

٣ مفتی: مباح.

## پـێغەمبەر پیاوێکی هەرێمپەرست و رێـبەرێکی نیشـتمانپەرسـت نەبو:

ئەگەر پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی هەرێم پەرست بوایە و وەك سەرکردە سیاسیو رێبـەرە نیـشتمان پەرسـتەکان رەفتـاری بکردایـە، لـە عەرەبـستاندا بـوارێکی بەرفرەوانی بۆ دەڕەخسا و بە ئاسـانی دەیتـوانی ئـاڵای نەتەوایـەتی هـەڵبکاتو قورەیشیـیەکان و سـەرجەم هـۆزو تـیرە عەرەبـەکانی لـە ژێـردا کـۆ بکاتـەوە و نیـشـتمانێکی بـەهێزو یـەکانگیری[1] عـەرەبی دابمـەزرێنێو خۆشـی ببێتـە سەرۆکیان. بێگومان ئەبوجەهلو عوتبەی کـوڕی رەبیعـەو ئـەوانیتریش پێـشی هەمو کەس خۆیان راپێش دەکـرد و لـەژێر ئاڵاکـەدا کۆدەبونـەوەو خۆشـیان لـە پێناودا بە کوشت دەدا و بە سەرۆکایەتی پێغەمبەریش رازی دەبون. ئـەدی هـەر ئەوان نەبون دەیانگوت راست و دەسـپاکە؟ هەر ئەوان نەبون لە روداوە گەورەکەی ژیانیان لە مەککەدا لە کێشـەی دانانەوەی بەردە رەشەکەی کەعبەدا بە ناوبژیوان هەڵیانبژارد و گەورەترین رێزو شـکۆیان پـێ بەخـشـی؟ هـەر ئـەوان نـەبون بـە نوێنەرایەتی خۆیـان عوتبـەیان ناردە لای تـا پێـی بڵـێ ((ئەگـەر مەبەسـتت سەرۆکایەتیە دە وەرە هەمومان ئاڵات بۆ هەڵدەکەین و هەتا ماوی تۆ سەرۆکمان بە))[2].

ئەگـەر وای بکردایـە دەیتـوانی سـەرجەم جـوامێر و سوارچـاکانی عـەرەب کۆبکاتەوە و لە وڵاتی فارسیان بەربداتو لـە پێنـاو عەرەبایـەتی هەرسـکراودا تێبکۆشـێو بەسەر عەجەمە ستەمکارەکان زاڵ ببێو ئاڵای داگیرکاریی عەرەبیو شکۆی نەتەوایەتی لەسەر یاڵ[3] و بەرزاییەکانی وڵاتی رۆمو فارس بشەکێتەوە. جا ئەگەر بەرژەوەندی سیاسی ئەوسا نەیدەخواست خۆی لە قەرەی ئەم دو ئیمپراتۆرە

---

١ یەکانگیر: یەکگرتو.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير الدمشقي : ل ٣/٤٣ .

٣ یاڵ: گرد.

بدات، خۆ دەیتوانی شالاَو و شەبەیخونان[1] بباتە سەر ولاَتانی یەمەنو حەبەشەو دراوسێکانی تر و بیانکاتە پارچەیەك لە نیشتمانە عەرەبیە تازەکەی.

ژیانی عەرەبەکانی ئەوسا لە گەلێك لایەنی کۆمەلاَیەتی و ئابوریدا نالەبارو کۆسکەوتو بو، گەلێکی پێویست بە هۆشی سیاسەتمەدار و دەستوبردی کارگێڕ و ورەبەرزی جوامێر و داهێنانی فرەزانێك[2] هەبو، عەرەبەکان ئەگەر پیاوێکی وایان بۆ هەلکەوتبا شانو شکۆیەکی مەزنو مێژوێکی پڕ سەروەری نەتەوەییان بۆ دەهاتە کایەوە .

## نەهاتوە ناهەق بە ناهەق بسڕێتەوە:

بەلاَم خۆ محمد ﷺ نەناردراوە تا ناڕەوا بە ناڕەوا بسڕێتەوە، دەستدرێژی بە دەستدرێژی ببڕێتەوە، شت لە شوێنێ حەڕام بکاو لە شوێنێتریش حەلاَل، شوێنەواری گەلێك بە گەلێکیتر رەشکاتەوە. وەك رێبەرێکی نیشتمان پەرست یان وەك سەرکردەیەکی سیاسی نەناردراوە تا بەرژەوەندی بۆ خۆی دابین بکات و خەلك لە حوکمی فارسو رۆمانی رزگار بکاو بیانخاتە ژێر حوکمی عارەبی عەدنانیو قەحطانی. بەلکو وەك پێغەمبەرێکی موژدەگار و هەڕەشەگار نێردراوە، تا وەك مانگی دەرخشان پەیامەکانی خوا بە سەرجەم خەلکی راگەیەنێ، تا خەلك لە مرۆڤپەرستیەوە بەرەو خواپەرستی و لە تەنگی دنیاوە بەرەو بەرهەراوێتی[3] دنیا و دوایی و لە ستەمی دینانی بێدادەوە بەرەو دادو رەوای ئیسلام رزگار بکات. تا فەرمان بە چاکە بکاو رێگە لە خراپە بگرێ، تا شتی پاکیان بۆ حەلاَل و شتی پیسیان لێ حەڕام بکات. تا کاری ئەستەم و بێگارییان[4] لە کۆل کاتەوە و کۆتی گەردەنیان هەلوەشێنێ.

---

١ شەبەیخون: هێرشی شەوێ.

٢ فرەزان: بلیمەت و زۆرزان.

٣ بەرهەراو: بەرفرەوان.

٤ بێگاری: کاری زەحمەتی بەزۆر.

وتارەکانی پێغەمبەر ﷺ هەرگیز بە گەل و نیشتمانێکی دیاریکراو تایبەت نەبوە، بەڵکو بۆ دەرونی سەرجەم مرۆڤایەتی و بۆ ویژدانی مرۆڤ بوە. بەڵام نەتەوەی عەرەب لەبەرئەوەی لە داڕوخان و کوێرەوەریدا دەژیان بۆیە شایەنتر بو یەکەمجار کاری چاکسازی و خەباتە مەزنەکەی لەوانەوە دەست پێبکات. شاری مەککە و دورگەی عەرەبیش لەبەرئەوەی زەمینێکی گرنگی جوگرافی و سەربەخۆییەکی سیاسیشی هەبو بۆیە باشترین شوێن بون بۆ تێدا بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی. نەتەوەی عەرەبیش لەبەرئەوەی گەلێك تایبەتمەندێتی دەرونی و بەهرەی ئەدەبییان هەبو بۆیە باشترین زەمینە بون بۆ بانگەوازو چاکترین بانگخواز بون بۆ پەیامەکەی .

## کلیل و کلۆمی سروشتی مرۆڤایەتی:

پێغەمبەر ﷺ لەو چاکسازانە نەبو کە لە دیوی پشتەوەی خانو وەژوری دەکەون یان لە پەنجەرەوە خۆیان شۆڕ دەکەنەوە و لە پێناو چارەسەرکردنی چەند دەردێکی کۆمەڵایەتی‌و چەند خەوشێکی خوڕەوشتیەوە تێدەکۆشن، کە هەندێکیان توانیویانە بۆ ماوەیەکی کاتی لە چەند لایەنێکەوە وڵاتەکەیان چارەسەر بکەن و هەندێکیشیان مردن یەخەی پێ‌گرتون‌و لە کارەکەیان سەرنەکەوتون [(١)] .

---

(١) غاندی گەورەسالاری هیندستان، لە سەرەتای ژیانە سیاسی‌و روحیەکەیدا دو رێبیر(مبدأ)ی بە ئامانج گرتبو، سالارییە سیاسی‌و کەسایەتیە بەهێزە روحیەکەی خۆشی هەر لەم دو رێبیرەوە سەرچاوەی هەڵبەستبو و لێیانی لانەدەدا، لەم چەرخەدا کەم رێبەری وەکو وی هەڵکەوتون. رێبیری یەکەمی دەیگوت: (( نا بۆ توندوتیژی، نا بۆ بەرگری)). وەك ئاین و فەلسەفە بانگەوازی بۆ ئەم رێبیرە دەکردو ساڵانێکی درێژی لە پێناودا بەخت کرد، لە رێی وتار و نوسین‌و گۆڤار و رۆژنامەکانەوە بانگەشەی بۆ دەکرد و هەرچی پێی کرا کردی، بەڵام بانگەوازەکەی لەبەرئەوەی لە بواری گۆڕینی دەرون‌و لەسەر بنچینەی بانگەوازێکی ئاینی نەبو بۆیە بە کامی خۆی نەگەیشت و کاریگەریەکی قوڵی لەسەر گەلەکەی بەجێ نەهێشت . بانگەوازەکەی بوە نەخشی سەر ئاو و ریسی لێ بو بە خوری!. لە ساڵی ١٩٤٧ لە بنجابی رۆژهەڵات‌و لە دلهی پایتەختی هیندستاندا شەڕ و شۆڕێکی گەورەی تایفەگەری رویداو

پێغەمبەر ﷺ لە دەرگاوە چوە ناو خانوی بانگەواز و چاکسازی و کلیلەکەی خستە سەر کلۆمی سروشتی مرۆڤایەتی، ئەو کلۆمە[1] ئالۆزەی کە چاکسازانی سەردەمی بێسروشی[2] نەیانتوانی بیکەنەوە، تەنانەت ئەوانی پاشتریش هەر نەیانتوانی بیکەنەوە. پێغەمبەر ﷺ بانگی خەڵکی دەکرد تا بڕوا بە خوای تاك و بە پەیامی ئیسلام و ڕۆژی دوایی بێنن و لە بتو بتپەرستی رو وەرگێڕن و دژ بە تاغوتان تێبکۆشن، لە ناو گەلەکەیدا دەنگی هەڵدەبڕیو دەیفەرمو: (( هۆ خەڵکینە بڵێن لا اله الاّ الله رزگار دەبن)).



پتر لە نیو ملیۆن موسڵمان کوژران، لەم قەسابخانە بێنامانەدا تاوانکاریو کاری توندوتیژو دڕندانەی وا کراو بە جۆرێك دەستدرێژی کرایە سەر منداڵو ئافرەتو ئابڕوی خەڵك خەریکبو مێژونوسان بڕوا نەکەن. شەڕوشۆڕ بەردەوام بو و درێژەی کێشا تا لە ئەنجامدا ئەم پیاوە مەزنەیان تیرۆر کرد کە خەڵك هێند بە گەورەو مەزنیان دەزانی گەیاندبویانە ڕادەی بە پیرۆز زانین و بە خواوەند دانان. ڕێبیری دوەمیشی بریتی بو لە: ((نسخ اللمس المنبوذ)) هەڵبەت لەم کارەشیدا سەرکەوتنێکی ئەوتۆی وەدەست نەهێنا.

لێرەدا بۆمان ڕون دەبێتەوە کە ڕێوشوێنی ڕاستو دروستی سروشتی لە کاری چاکسازیو گۆڕیندا بریتیە لە ڕێوشوێنی پێغەمبەران .

سالار: زەعیم          کام: ئاوات.

١ کلۆم: قوفل.

٢ بێسروشی: الفترة.

بەندی دووەم

# گەشتی موسڵمان
# لە نەفامێتیەوە بەرە و ئیسلام

## بەرگری لەخۆکردنی نەفامێتی:

کۆمەڵگەی نەفامی بە هەڵە لە بانگەوازی ئیسلام و ئامانجەکانی نەگەیشتبون و بەرچاویان لێڵ نەبو، بەڵکو هەر لەو ساتەی گوێیان بە دەنگی پێغەمبەر ﷺ زرینگایەوە-کە بانگەوازی بۆ بڕوابون بە خوا رادەگەیاند- تێگەیشتن تیرێکە و ئاڕاستەی جەرگی نەفامێتی کراوەو کفنی مەرگی بۆ نەفامێتی دوریوە، بۆیە ئۆقرەیان لێهەڵگیرا و تا دوا دڵۆپی خوێن شەڕیان کرد و هەرچی سوار و شمشێر بەدەست بو مۆڵیان دا و بەرانگژی پێغەمبەری بانگخوازیان کردەوە.﴿ وَانطَلَقَ الْمَلأُ مِنْهُمْ أَنْ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَى آلِهَتِكُمْ إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ : کۆمەڵێك ریش سپی قورەیشی کە چونە لای پێغەمبەر و گەڕانەوە گوتیان، نەکەن لە دینی خۆتان هەڵخزێن، هەر خواکانی خۆتان بپەرستن، دیارە موحەممەد لەپاڵ ئەمەدا دەیەوێ ببێتە گەورەی هۆز و دەسەڵات بگرێتە دەست.﴾ ص: ٦.

نەفامێتی هەستی کرد خەریکە وا ئەستونەکانی دادەڕمێن و سێکوچکەکەی رادەخزێ و هێندە نابا دەبێ بڕێ!، ئا لێرەوە ئەو هەمو ئەشکەنجە و چەوساندنەوەیە هاتەدی کە دەرهەق بە موسڵمانانیان ئەنجام دا و مێژو بۆمانی باس دەکا، هەڵبەت ئەمەش نیشانەیەکە بۆ سەرکەوتنی پێغەمبەر ﷺ چونکە ئامانجی پێکا و دەماری دڵی نەفامێتی گرت و تیرەکانی لە جەرگی دا. پێغەمبەر ﷺ لەسەر بانگەوازەوکەی لە شاخ خۆڕاگرتر بو، ئێش‌وئازار لاری نەکردەوە، نەخشە لە خشتەی نەبرد، رانواندنی خۆشی دنیا نەیخەڵەتاند، بە مامی گوت: (( بە خوای مامەگیان! ئەگەر رۆژیشم بخەنە دەستی راست و

مانگیشم بخەنە دەستی چەپ، هەر واز لە بانگەوازەکەم ناهێنم، جا یان خوا سەری دەخا یان لە پێناویدا سەردەنێمەوە))[1] صدق الله العظيم

## لە پێناو دینی نوێدا:

پێغەمبەر ﷺ ماوەی سێزدە ساڵان بەوپەڕی راشکاویەوە، بێئەوەی مەبەست بشارێتەوە یان پێچاوپێچ و کەموکورتی بخاتە قسەکانی، بێئەوەی شل‌وشەکەتی بنوێنێ یان خاترانەی ئەم‌و ئەو بگرێ، بانگەوازی بۆ بڕوابون بە یەکتایی خواو بە ئیسلام و بە رۆژی دوایی رادەگەیاند و چاکیش دەیزانی بەم جۆرە راشکاویەوە گشت دەردێك دەرمان دەبێ. قورەیش کە بانگەوازەکەیان گوێ لێبو لێکرا لە گشت لاوە لێی راسان و بە یەك سەنگەر دژی وەستان و هاواریان لێ هەڵسا، گڕی رکوکینەیان لێ هەڵدەکرد تا بەڵکو خزم و کەس و خەڵکانی لێ وەدور بن. بار هێند دژوار ببو ئەگەر یەکێك زۆر دڵسۆز و بەجەرگ و لە خۆبوردە نەبوایەو لە ئاگر وئەشکەنجە و لە درِك و داڵان بێباك نەبوایە نەیدەتوانی بڕوای پێ‌بێنێ‌و شوێنی بکەوێ.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کۆمەڵێك لاوی چاونەترسی قورەیشی سینگی مەردایەتیان وەپێش دا و بڕیاریان دا دەگەڵ بڕوا و پێغەمبەری خوا بن، خۆشی دنیا و هەوەستەکانی لاوێتی وای لێنەکردن جودابن، شەیدای پاداشتی رۆژی دوایی بون و تاکە مەبەستیان چونە بەهەشت بو، هەرکە گوێبیستی بانگی بڕوا بون، ژیانی نەفامێتیان لەبەرچاو رەش بو و لە جێخەودا ئۆقرەیان نەما و دەتگوت لەسەر درِك و پنچکان راکشاون.

تێگەیشتن ئیتر چاریان نەماوە دەبێ بڕوا بە خوا و پێغەمبەر بێنن، بڕوایان هێنا و بەگەڵ پێغەمبەر کەوتن. خۆ پێغەمبەر ﷺ هاوشاریان بو، دەیانتوانی زو بچنە لای‌و بیبینن، زو بیگەنێ و گوێ بیستی بن -بەڵام لەبەر کۆسپ و تەگەرەکانی قورەیشەکان وەك گەشتێکی دور و درێژ و پڕ نەهامەتی

(١) البداية والنهاية : ٣ /٣٣

لێهاتبو، دەشیانزانی ژیانیان دەکەوێتە مەترسیو توشی تفت و تاڵی و ناخۆشیش دەبن، بەڵام هەر دەستیان خستە ناو دەستی پیرۆزی و جان فیدای بون و گیانیان بۆ کردە قوربانی.

گوێیان لە قورئان ببو کە دەیفەرمو: ﴿ الم، أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لاَ يُفْتَنُونَ، وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ : ئایا خەڵك کە بڕوا دێنن پێیان وایە نا ئەزموێن؟ گەلانی پێشوشمان ئەزمواندوە، تا خوا بزانێ کێ راست دەکاو کێ درۆ دەکا﴾العنکبوت:١-٣

گوێیان لێ ببو کە دەیفەرمو: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُمْ مَثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِكُمْ مَسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللَّهِ أَلاَ إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ : بڕواداران ! پێتان وایە بێئەوەی وەك بڕوادارنی پێشو تاقی بکرێنەوە بچنە بەهەشتێ؟ ئەوانی پێش ئێوە توشی نەبونی و زیانی گەورە بون، دوژمنان پەلاماریان دانو دوچاری لەرز و شەکەتیەکی لە رادەبەدەر بون، تەنانەت پێغەمبەر و بڕوادارەکان هاواریان وەبەر خودا برد و گوتیان: خوایە کەنگێ سەرکەوتنمان بۆ دەنێری؟ دەچاك بزانن سەرکەوتنی خوا نزیکە))البقرة:٢١٤.

بڕوادارەکان ئەو هەڵوێستی لە قورەیشیان پێشبینی کردبو دوچاریان بو، قورەیشیەکان بە هەمو جۆرێك بەرەنگاریان بونەوە و هەرچی لە هەگبەیاندا هەبو بەتاڵیان کرد، بەڵام ئەوان ورەیان بەرزتر دەبوەوە و متمانەیان زیاتر دەبو، بە دوژمنانیان دەگوت: ﴿ هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلاَّ إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا﴾الاحزاب:٢٢، هەرچەندی پتر ئازار دەدرانو زێتر دەچەوسێنرانەوە بڕوایان بەهێزتر و خوێنیان گەرمتر و رکوکینەیان لە مەڕ بێبڕوایی و خەڵکی بێبڕوا ئەستورتر دەبو، مەشخەڵی سۆزیان بە جۆشتر و دڵو دەرونیان پتر پاك دەبوەوە، وەك زێڕی پاك و شمشێری مشتومالْ خاوێن دەبونەوە.

## پەروەردەی دینی:

پێغەمبەر ﷺ لێکدا لێکدا[1] روحی ئەو کۆمەڵە گەنجەی بە قورئان دەبوژاندەوە و دەرونی بەبڕوا گۆش دەکردن، رۆژێ پێنج جاران بە جەستەی خاوێن و گەردنی کەچ و دڵی پڕ لە ترس و بەبیرو هۆشی ئامادەوە لە بەرامبەر خوا رایدەگرتن، رۆژ بە رۆژ روحیان پاکتر و دڵیان بێگەردتر و رەوشتیان چاکتر و لە دەسەڵاتی مادده رەهاتر دەبون، پتر بەرگەی هەوەستیان دەگرت و لە پەروەردگاری ئەرزو ئاسمانان نزیکتر دەبونەوە، رایدەهێنان کە لەسەر ئازار و ئەشکەنجە ئارام بگرن و لێبوردە بن و بەسەر نەفسی خۆیان زاڵ بن، چونکە لەمێژ بو فرچکیان بە شەڕو شۆڕەوە گرتبو، دەتگوت دەگەڵ شمشێردا چاویان بە دونیادا هەڵێناوە، خەڵکی نێو نەتەوەیەك بون کە چەندان شەڕی خوێناوی وەکو بەسوس و داحیس و غەبرائی بینیبو، شەڕەکەی فوجاریش هێندەی بەسەر رانەبوری بو.

بەڵام پێغەمبەر ﷺ سروشتە شەڕانیەکەی لێ تارومار دەکردن[2] و فیزو دەماری عەرەبپەروەرێتی خامۆش دەکردن و پێی دەفەرمون: ﴿ كفّوا أيديكم وأقيموا الصلاة : دەستتان مەکەنەوە و نوێژ بکەن ﴾، ئەوانیش گوێڕایەڵی دەبون و دەستیان راست نەدەکردەوە، نەك لە ترسان و لەبەر بێدەسەڵاتی بەڵکو لە پێناو جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ بو کە شتی وایان لە قورەیش قبوڵ دەکرد کە جەرگ و هەناوی پیاوی دەتاواندەوە، بگرە مێژو یەك تاکە رواداویشی تۆمار نەکردوە کە موسڵمانێك لە مەککەدا بە شمشێر بەرگری لە خۆی کردبێ ئەگەرچی پاساو و هێزیشیان هەبو بتوانن بەرگری پێبکەن، بەڵام فەرمانی خۆشەویستیان نەدەشکاند، کە ئەمەش ئەوپەڕی گەردنکەچی و گوێڕایەڵی دەگەیەنێ، پاشان کە قورەیشەکان هەمو سنورێکیان بەزاندو ژان گەیشتە سەر

---

١ لێکدالێکدا: سەروەر، بەردەوام.
٢ تارومارکردن: هیچ بەسەر هیچەوە نەهێشتن.

ئێسکان، خوا ڕێی بە پێغەمبەر و یاوەرانی دا کۆچ بکەن، ئەوانیش بۆ شاری مەدینە کۆچیان کرد کە خەڵکەکەی ماوەیەك بو ببونە موسڵمان.

## لە شارەکەی پێغەمبەردا ﷺ:

خەڵکی مەککە بە دیداری خەڵکی مەدینە شاد بون و تەنها دینی نوێ کۆی کردنەوە، ئەم بەیەکتر شادبونە وێنەی جوانترین دیمەنی دەسەڵاتی دینی لە مێژودا کێشا، ئەوس و خەزرەج کە هێشتا تۆزی شەڕی بوعاثیان لە خۆ دانەوەشاندبو و شمشێرەکانیان هێشتا خوێنی لێ دەچۆڕایەوە، ئیسلام ئاشتی کردنەوە و دڵی کردن بە یەك دڵ، تەنانەت ئەگەر لەم پێناوەدا سەرجەم گەنجینەی زەویش تەرخان بکرابوایە هەر نەدەکرا ئاشت ببنەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ دەگەڵ کۆچەرانی کردن بەبرا، برایەتیەکی هێند پتەوبو تەنانەت لە برایەتی شیریش شیرنتر بو، بگرە هەرچی دۆستایەتی ناوازەی لە مێژودا هەیە تۆزی ڕێگاشی ناشکێنن.

ئەم کۆمەڵە تازەیە-کە لە خەڵکی کۆچەرانی مەککە و خەڵکی یاریدەدەرانی مەدینە پێکهاتبون-بونە ناوکی ئەم نەتەوە ئیسلامیە گەورەیەی کە لە نێو خەڵکدا پەیدا بون، بونە هەوێنی بانگەوازی ئیسلامی. ئەم کۆمەڵە لە ساتێکی ئەستەم و دژواردا سەری هەڵدا و جیهانیان لەو شپرزەبونە پاراست کە هەڕەشەی وێرانکردنی لێدەکرد، مرۆڤایەتیان لەو مەرگەسات و ئاشوبانە پاراست کە دەورەیان تەنیبوەوە، بۆیە خوا کە کۆچەر و یاریدەدەرانی لەسەر برایەتی هان دەدا دەیفەرمو: ﴿ إِلاَّ تَفْعَلُوهُ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ : ئەگەر نەبن بە برا ئاژاوە و بەدکاریەکی گەورە لەسەر روی زەوی پەیدا دەبێ﴾الانفال:٧٣.

## کردنەوەی گرێی هەرە گەورە:

پێغەمبەرﷺ پەیتاپەیتا پەروەردەیەکی ورد و قوڵی بەم کۆمەڵە بڕوادارە دەدا، قورئان بەرەبەرە دەرونی باڵادەکردن و پشکۆی دڵیانی جۆش دەدا، لە کۆڕی پێغەمبەر ﷺ دا دادەنیشتن و لە دین ڕەگاژۆتر و لە هەوەست و ئارەزو

دورەپەرێزتر دەبون، لە پێناوخوا لە خۆبوردەتر و بۆ گەیشتن بە بەهەشت تامەزرۆتر دەبون، لەسەر زانست سورتر و لە دین شارەزاتر دەبون و پتر لە خۆیان دەپرسیەوە. لە خۆشی و ناخۆشیدا ملکەچی پێغەمبەر بون، هەژار و دەوڵەمەندیان بۆ جیهادێ ئامادەبون، لە ماوەی دە ساڵدا بیستو حەفت جاران لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بۆ غەزا دەرچون، پتر لە سەد جاریش بە فەرمانی ئەو بەرەنگاری دوژمن بونەوە، دنیایان لەلادا بێبەها بو، ژن و منداڵیان پێ گرفتێك نەبو، گەلێك ئایەت دادەبەزین و فەرمانی وای پێدەکردن کە لەگەڵی رانەهاتبون و پێی ئاشنا نەبون، ئەگەرچی دەرهەق بە سەر و ماڵ و منداڵ و خزمانیش بوایە و لەسەر دەرون قورسیش بوایە بەوپەڕی گەردەنکەچیەوە جێبەجێیان دەکرد.

گرێی گەورە (کە هاوبەشپەرستی و بێبڕوایی بو) هەڵوەشایەوە، بۆیە سەرجەم گرێکانی تریش هەڵوەشانەوە، تێکۆشانی یەکەمی پێغەمبەرﷺ لە پێناو هەڵوەشاندنەوەی گرێی هەرە گەورە بو بۆیە بۆ یەکەیەکەی سەرجەم فەرمان و بەهەڵستیەکانیتر تێکۆشانێکی تایبەتی تەرخان نەکرد، ئیسلام لە یەکەمین شەڕی لەگەڵ نەفامێتیدا سەرکەوتنی هێنایەدی بۆیە لە سەرجەم شەڕەکانیتریش سەرکەوتو بو، هەمو بە دڵو بە گیان و بە جەستە بۆ هەمو ئیسلام گەردەنکەچ بون، کە دەبونە موسڵمان ئیتر هەرگیز دەگەڵ پێغەمبەردا ناکۆك نەبون، هەر بڕیارێکی رۆنا بوایە لە دڵیان ناخۆش نەبو، فەرمان فەرمانی پێغەمبەر بو و هیچ کەس قسەی تێدا نەبو.

تەنانەت ورتەورتی نابەدڵی ناو دڵیان بۆ پێغەمبەر رادەنواند، ئەگەر سنورێکیان دەبەزاند و لە راستەڕێ لاڕێ دەبون و شایستەی دارکاری[1] دەبون ئامادە بون ئازاری سەختی موستەهەق بچێژن. کاتێك عەرەق حەڕام کرا کاسەو بەرداغیان سەررێژی بو، بەلام دەسبەجێ وازیان هێناو لێوی تامەزرۆیان گەستەوە و جەرگی بەجۆشیان دامرکاندەوە و گۆزە و گۆسکەیان شکاندن، ئەو رۆژی جۆگەلەی شار هەر عەرەقی پێدا دەڕۆیی.

---

١ دارکاری: الحدّ.

گەیشتنە رادەیەك پشکی شەیتانیان لە دەرون دەرچو، بەڵکو بەشی دەرونیان لە دەرون دەرچو، چەند بۆ خۆیان دادخواز بون بۆ خەڵکانیش وەکو خۆیان، لە دنیا پیاوی دوایی بون، لە ئەمڕۆشدا پیاوی سبەی، بەڵا زەبونی نەدەکردن، بەخشش[1] لە خشتەی نەدەبردن، هەژاری سەرقاڵی نەدەکردن، دەوڵەمەندیش لە خوای یاخی نەدەکردن، بازرگانی بێئاگای نەدەکردن، لە زەبر و زەنگ و هێز و بازو نەدەتۆقین، بەلاف و گەزاف و خۆهەڵکێش و خولیای بەدکاری نەبون، بۆ خەڵك وەك تەرازوی راستو دروست بون، تەنانەت دەگەڵ خۆیان و دایك و باوك و خزمانیش بە دادگەری رەفتاریان دەکردو لە داد و هەق لاتەراز نەبون، خەڵکی سەر زەوی پێشوازیەکی گەرموگوڕیان لێکردن، بەمجۆرە بونە رزگارکەری مرۆڤایەتیو پەرژینی جیهان و بانگخوازی دینی خوا. پێغەمبەرﷺ کە گیانی پاکی سپارد و ئەوانی لە دوای خۆیدا بەجێهێشت لە نەتەوە و پەیامەکەی دڵنیا بو بۆیە بە دڵی ئارام و بە چاوی رونەوە بۆ لای خودا گەڕایەوە.

## سەمەرەترین وەرچەرخان لە مێژوی جیهاندا:

ئەو وەرچەرخانەی پێغەمبەرﷺ لە دەرونی موسڵمانانو لە رێی موسڵمانانیشەوە لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا بەرپای کرد لە مێژودا وەرچەرخانی وا سەمەرە[2] روی نەداوە، لە هەمو روێکەوە سەمەرە بو، لە خێراییەکەی سەمەرە بو، لە قوڵیەکەی سەمەرە بو، لە بەرفراوانیەکەی سەمەرە بو، لە سەرتاپاگیریەکەی سەمەرە بو، لە رونو رەوانی و فامی[3] ئاسانی سەمەرە بو، وەك زۆربەی روداوە لە ئاسابەدەرەکان[4] لێڵ نەبو، مەتەڵی رێ وێڵیش نەبو. دەی با ئێستاکە لە روی کرداریەوە لەم وەرچەرخانە وەتوژین و بزانین تا چەند کاریگەری لەسەر کۆمەڵگە و مێژوی مرۆڤایەتی جێهێشتوە؟.

---

١ بەخشش: نیعمەت.
٢ سەمەرە: غەریب.
٣ فام: تێگەیشتن.
٤ ئاسابەدەر: الخارق للعادة.

## کاریگەری بڕوای راستەقینە لەسەر خوڕەوشت و ئارەزوودا:

خەڵك-بە عەرەب و غەیری عەرەبەوە- لە ژیانێکی نەفامیدا دەژیان و بە ئارەزوی هەوەستی دڵ رێوشوێنیان بۆ کاروباران دادەنا، پیاوێك چاکەی بکردایە خەلات نەدەکرا و پیاوێکیش سەرپێچی بکردایە سزا نەدەدرا، فەرمان و بەهەڵستی نەبو. دین شتێکی لاوەکی بو، دەسەلاتی بەسەر روح و دەرون و دڵ نەبو، کاریگەری لەسەر خوڕەوشت و کۆمەڵگە جێنەدەهێشت. پێیان وابو خوا بونەوەری دروست کردوەو پاشان دەسبەرداری بوە و پەروەردگارێتی بە خەڵکانێك سپاردەوەو ئیتر ئەوان جڵەوی کاریان گرتۆتە دەست و مشوری وڵات دەگێڕن و بڕێوی بەسەر خەڵك دابەش دەکەن و بەرژەوەندی حکومەتیان بە دەستەوەیە. بڕوابونەکەیان بە خوا وەك زانینی زانیاریەکی مێژویی بو، کە دەیانگوت خوا ئەرز و ئاسمانەکانی بەدیهێناوە وەك وەڵامی خوێندکارێکی بەشی هونەری مێژو وابو کە لێیان دەپرسی کێ ئەم باڵاخانە کۆنەی دروست کردوە؟، ئەویش بێئەوەی ترسی لە دڵدا بێ یان ملکەچی بێ، ناوی یەکێك لە پاشا دێرینەکان دێنێ. دینەکەیان ترس و نزای تێدا نەبو، هیچیان لەبارەی خواوە نەدەزانی تاکو خۆشیان بوێ و لێی بترسن، زانیاریەکەیان لێڵو ناڕون و کەموکورت و تێکڕایی بو، سام و خۆشەویستی لە دەروندا بەرپا نەدەکردن.

فەلسەفەکەی یۆنان بەشێوەیەکی سەلوبیانەوە دانی بە بونی (واجب الوجود) نابو بێئەوەی سیفەتی توانستو پەروەردگارێتیو دان و ستان[1] و بەزەیی بۆ بسەلمێنێ، تەنها خەلقکردنی یەکەمی بۆ سەلماندبو و ویست و زانست و مەبەستی لێ دابڕیبو، چەند سیفەتێکی گشتییان بە پێوادانی بەدیهێنراوان بۆ بڕیار دابو کە لە شانو شکۆی ئافەریدگارێتیان کەم دەکردەوە. بێگومان بڕوایەکی سەلوبیانەش قەت سیفەتێکی ئیجابیانە بەدەستەوە نادا و قەت نەشمانزانیوە ژیار و کۆمەڵگەو رژێم و کردەوە و بنیاتنانێك هەبوبێ لەسەر بیروباوەڕێکی سەلوبیانە دامەزرا بێ، بۆیە لە فەلسەفەی ئیغریقیدا دین لە روحی خۆشویستن و ترسان و

---

١ دان و ستان: الإعطاء والمنع.

پەنا وەبەر خوا بردن دابڕا بو. بەمجۆرە دینی بەربڵاوی جیهان روحیەتی ون کردبو و ببوە چەند رێوڕەسمو نەریتێك و وەك تارمایی بڕوای لێهاتبو.

ئەوانەی کە بونە موسڵمان لەو زانیارە پڕ دەرد و نارون و مردوەڕا کۆچیان کرد بۆ نێو زانیاریەکی قوڵ و رون و روحی کە خێوی دەسەڵات بو بەسەر روح و دڵ و جەستەدا و کاری لە خوڕەوشت و کۆمەڵگە دەکرد و توانای هەبو ژیان بگرێتە خۆی و رێوشوێنی بۆ رەنگرێژ بکات. بڕوایان بە خوای خاوەن گەلێ ناوی پیرۆز هێنا، کە خاوەنی تەواوترین سیفەتی شایەن بە شکۆیە، پەروەردگاری بونەوەرە، بەخشندەی میهرەبانە، پاشای رۆژی پاداشتە، پاشاو پیرۆزگارە، ئاشتیگار و پەناگارە،[1] زاڵو بە دەسەڵاتە، باڵادەست و گەورە و مەزنە، ئەفرێنەر و ئافەریدگار و وێنە بەخشە، کاربەجێ و خۆشەویست و دلۆڤان و لێبوردنگارە،[2] فەرمان و فرمان و هەمو شتێك مولکی ئەون، پەنا دەدات و پەنا نادرێ.. تا هەمو سیفەتەکانیتری کە لە قورئاندا باس کراوە. پاداشتەکەی بە بەهەشتە، سزاکەشی بە دۆزەخە، بری بەخشینی بژێوی بە دەستە، نهێنی ئەرزو ئاسمانان دەزانێ و بە رازی[3] نێو دڵ و ئاماژەی چاوان ئاگادارە.. تا هەمو سیفەتەکانیتر کە لەبارەی توانستو زانستو کردارەکانیەوە لە قورئاندا هاتون.

بەهۆی ئەم بڕوایە فرەوان و قوڵ و رونەوە وەرچەرخانێکی سەمەرەیان لە دەروندا بەرپا بو، ئەگەر یەکێك بڕوای بە (لا الـه الا الله) بهێنایە دەسبەجێ ژینی ژێروژور دەبو، بڕوا پەلوپۆی بەهەناویدا دەهاوێشتو سەرجەم دەمارەکان و هەستی دادەگرتەوە، دەگەڵ روح و خوێنی تێکەڵ دەبو، رەگو ریشاڵی نەفامێتی هەڵدەکێشا و ئاوەزو دڵی لە پرشەنگ تەژی دەکرد، پیاوی دەکردە پیاوێکیتر، لە بڕواپتەوی و دڵنیابون و ئارامگرتن و ئازایەتی و ئەنجامدانی کاری لە ئاسابەدەردا داستانی وای تۆمار دەکرد کە ئاوەز و فەلسەفەو مێژوی رەوشت پێی سەرسام دەبون، تا ئێستاش و بۆ هەمیشەش هەر جێی دۆشدامان و سەرسامبونە،

---

١ پیرۆزگار: القدوس ئاشتیگار: السلام پەناگار: المؤمن.
٢ دلۆڤان: الودود لێبوردنگار: الغفار.
٣ راز: نهێنی ناو دڵ.

زانستیش مەگەر بە بڕوایەکەی قوڵ و تەواو شرۆڤەی بکات ئەگەرنا ناتوانێ بە هیچ شتێکیتر پاساوی بداتەوە.

## نقورچەی ویژدان:

ئەم بڕوایە فێرگەیەکی ڕەوشتی و پەروەردگەیەکی دەرونی بو، بڕواداران فێری ورەبەرزی و گەردەنکەشی و لەخۆپرسینەوە و هەقپەروەری دەکرد و لە مێژوی ڕەوشتو دەرونناسیدا بەهێزترین ڕەتکەرەوە بوە کە مرۆڤی لە ڕەوشتی چروكو نامەردومانە گەڕاندۆتەوە. تەنانەت لەو کاتانەشدا کە یەکێك هاڕوژمێکی[1] ئاژەڵانەی بەسەردا زاڵ دەبو و توشی تاوانێك دەبو، ئەگەر کەسیش نەیدیبایە و دەستی یاساشی لێ دور بوایە؛ تەنها (بڕوا) ئۆقرەی لێهەڵدەگرت و بە توندی سەرزەنشتی دەکرد و نقورچەی بە ئازاری لە ویژدان دەدا و خەیاڵی پڕ ترس دەکرد، تا لەبەردەم یاسادا پێی لە تاوانی خۆی نەنابوایە دڵی ئارامی نەدەگرت، بەخۆی بۆ سزای توندوتیژی خۆی دەهات و بە دڵی ئارام و دەرونی مورتاحەوە سزاکەی وەردەگرت تا بەڵکو لە توڕەیی خوا و سزای ڕۆژی دوایی ڕزگار ببێ.

مێژونوسە متمانەپێکراوەکان لەم بارەوە ڕوداوی گەلێك سەیرو ناوازەیان بۆ گێڕاوینەوە کە تەنها لە مێژوی ئاینیی ئیسلامیدا وێنەی هەیە. یەك لەو ڕوداوانە موسلیمی کوڕی حەجاجی قوشەیری خاوەنی (الصحیح) لە عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدەوە ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ماعیزی کوڕی مالیکی ئەسلەمی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی ئەی پێغەمبەری خوا ستەمم لە خۆم کردوەو زینام کردوە، دەمەوێ پاکم بکەیەوە)) پێغەمبەر ﷺ ڕەوانی کردەوە، بۆ سبەینێ هاتەوەو و گوتی: ((ئەی پێغەمبەری خوا زینام کردوە)) پێغەمبەر ﷺ ڕەوانی کردەوە، پاشان بانگی هەندێ لە خزمەکانی کردو لێی پرسین: پێتان وایە ماعیز تێکچویێ؟ گوتیان: پێمان وایە عەقڵی تێکنەچوە و عەیبی نیە. جاری سێیەمیش هاتەوە لای پێغەمبەر ﷺ، بەڵام خۆشەویست دوبارە بەدوای

---

١ هاڕوژم: هورروژم.

خزمانی داناردەوە و لێیانی پرسی تێکنەچوە؟، ئەوانیش دیسان گوتیان: نەخێر، تێکنەچوە. جا کە بۆ جاری چوارەم هاتەوە، فەرمانیدا قۆرتێکیان بۆ هەڵکەنی و بەردبارانیان کرد.

پاشان ئافرەتە غامدییەکەش هات و گوتی: (( ئەی پێغەمبەری خوا زینام کردوە پاکم بکەوە)) پێغەمبەر ﷺ رەوانی کردەوە، بۆ بەیانی هاتەوە و گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا بۆ رەوانم دەکەیەوە؟ رەنگە بتەوێ وەکو ماعیز بمنێریەوە، ئێ بەو خودایە زینام کردوە و زگ پڕیشم، فەرموی بڕۆوە تا منداڵەکەت دەبێ پاشان وەرەوە، کە منداڵەکەی بو بەخۆ بە منداڵەکەی هاتەوە لای پێغەمبەر ﷺ، پارچە پەڕۆیەکی لە منداڵەکەی هالاندبو، گوتی: ئەوەش منداڵەکەمە، فەرموی: بگەڕێوە شیری بدێ تا لە شیر دەبێتەوە و خواردن دەخوات ئەوسا وەرەوە. کە منداڵەکە لە شیر بوەوە هاتەوە لای پێغەمبەر ﷺ و منداڵەکەشی لەگەڵ خۆی هێنابو، منداڵەکە لەتە نانێکی بەدەستەوە بو دەیخوارد. گوتی: ئەوەتانێ ئەی پێغەمبەری خوا لە شیر بۆتەوە و نانیش دەخوات، پێغەمبەر ﷺ منداڵەکەی دا بە مسوڵمانێك و فەرمانیدا قۆرتێکی تا سینگی بۆ هەڵکۆڵن و پاشان بەردبارانی بکەن. خالیدی کوڕی وەلید کە ئەویش یەکێك بو لەو خەڵکەی بەردبارانیان دەکرد لێی چوە پێش و بەردێکی ئەنگاوتێ[1]، ژنەکە چەند پڕوشکە خوێنێکی لێ پڕژا و بە دەموچاوی خالیدی کەوت، ئەویش جوێنی پێدا، پێغەمبەر ﷺ گوێی لە جوێنەکە بو، فەرموی هێواش بە خالید! جوێن مەدە، سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە تۆبەیەکی وای کردوە ئەگەر باجەستێنیش[2] ئەو تۆبەیەی بکردایە خوا لێی خۆش دەبو)). پاشان نوێژی لەسەر کردو ئەسپەردەیان کرد[3].

---

١ ئەگاوتن: پێکان.

٢ بەجەستێن: ئەوکەسەی باج دەستێنێ.

(٣) صحيح مسلم، كتاب الحدود.

## چۆکدانەدان بۆ تەماحی دونیا و ئارەزو:

ئەم بڕوایە دەسپاکیو داوێنپاکی و ڕێزی مرۆڤی دەپاراست، مرۆڤ لەمەڕ هەوەست و ئارەزو و تەماحی دنیادا خۆی پێ رادەگرتو نەدەڕوخا، ئەگەر بە تەنیا بایە و هیچ کەسیش نەیدیبایە یان بە دەسەڵات بایە و لە هیچ کەسیش نەترسایە هەر راستەڕێ بو و خۆی نەدەدۆڕاند. لە مێژوی فتوحاتی ئیسلامیدا لە کاتی غەنیمەت گرتندا هەڵوێستی دەسپاکی و ئەمانەت پاراستن و دڵسۆزی وا تۆمارکراوە کە لە مێژوی مرۆڤایەتیدا وێنەی نەبوە، ئەمەش بە هۆی بڕوای بەهێز و هەستکردن بە چاودێری خواوە بو کە لە هەمو شوێن و کاتێکدا ئەم هەست و بڕوایەیان لەگەڵدا بو.

طبەری دەڵێ: کە موسڵمانان دابەزینە ناو مەدائینەوە و سەرجەم غەنیمە دابەشنەکراوەکانیان کۆکردەوە، یەکێك هات نێرە وشترێکی چوارساڵەی تەسلیمی خاوەنی غەنیمەکان کرد. خاوەن و ئەوانەی لەگەڵیدا بون گوتیان: هەرگیز هەڵوێستی وامان نەدیوە، هیچ شتێکت لێ وەرگرتوە؟ گوتی: سوێند بەخوا لەبەر خوا نەبوایە بۆم نەدەهێنان. زانییان پیاوێکی بەڕێزو لەخواترسە، گوتیان: ئەتۆ کێی؟ گوتی: سوێند بەخوا پێتان ناڵێم تا نە ئێوە و نە خەڵکان ئافەرینم نەکەن، من سوپاسی خوا دەکەم و پاداشتی ئەوم بەسە. پیاوێکیان بە دوادا نارد تا گەیشتەوە لای هاوڕێکانی، پیاوەکە لە هاوڕێکانی پرسی: ئەم کابرایە کێیە؟ ئەوانیش گوتیان: عامری کوڕی عەبدی قەیسە(١).

## گەردەنکەشیو دەرونبەرزی:

بڕوابون بەخوا سەری وا بەرز کردبونەوە که بۆ هیچ کەسێکی شۆڕ نەکەن، نە بۆ پاشای بە زەبرو زەنگ نە بۆ کەشیش و ماڵو نە بۆ هیچ سەرکردەیەکی دینی و دنیایی چەمانەوەیان نەبو، دڵ و چاویان پڕ لە ترسو سامی خوا بو، بۆیە سامیان

---

(١) تاريخ الطبري : ٤/ ١٦

لە بچمی ئافەریدان و نەخش و نیگاری دونیا و ڕواڵەتی بە سەنسەنە[1] و فشۆڵ نەبو، کە سەیری پاشاو دەستوپێوەندەکانیان دەکرد کە بەم جۆرە لە نێو بەرفرەیی و خۆشگوزەرانی و ئارایش و سلسلە و پلپلەی دنیادا دەژیان، وەك بڵێی سەیری پەیکەرو بوکە شوشە بکەن کە پۆشاکی مرۆڤیان دەبەردا بێت، سامیان لەلادا نەبو.

ئەبو موسا دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کە گەیشتینە لای نەجاشی، نەجاشی لە مەجلیسەکەیدا دانیشتبو، عەمری کوڕی عاص و عەممارەی کوڕی یەساریش لە لای ڕاست و چەپی دانیشتبون و قەشەکانیش کڕو بێدەنگ، عەمر و عەممارە بە نەجاشییان گوتبو ئەوانە کڕنوشت بۆ نابەن. جا کە چوینە بەردەم نەجاشی کەشیش و ڕەبەنەکان گوتیان: کڕنوش بۆ پاشا ببەن. جەعفەریش گوتی: تەنها بۆ خوا کڕنوش دەبەین[2].

## بە سوك سەیرکردنی ئارایش و ڕواڵەتی فشۆڵ :

سەعد بەر لە دەستپێکردنی شەڕی قادسیەدا ڕیبعی کوڕی عامری بە نوێنەر نارده لای ڕۆستەمی فەرماندەی لەشکری فارسەکان، ڕیبعی کە چوە لای ڕۆستەم بینی مەجلیسیان ڕازاندۆتەوە و بەرگی بالیفەکانیان لە زێڕ نەخشاندوە و فەرشی ئاوریشمیان ڕاخستوە و گەوهەر و مرواری بە هاداریان ڕانواندوە، ڕۆستەم تاجی لەسەر ناوە و کەوای بە نرخی بە شان داداوە و سلسلە و پلپلەی بەنرخی لەخۆ داوەو لەسەر تەختێکی لەزێڕ دانیشتوە. ڕیبعیش بە بەرگێکی پەڕپوت و تەنکەڵەوە، بە شمشێر و قەڵغان و ئەسپێکی کورتەڵەوە وەژورێ کەوت و کە گەیشتە قەراغی فەرشەکە دابەزیو ئەسپەکەی لە تەختەکان بەستەوە، شمشێری لە کەمەر بو، زرێی لە سینگ بەستبو، کڵاوە ئاسنەکەشی لەسەر بو، بەم شێوەیە بەرەو ڕاژور هەڵکشا، پاسەوان گوتیان چەکەکەت دانێ ئەوجا بڕۆ. گوتی:

---

١ سەنسەنە: فەخفەخە.

(٢) البدایة، ب ٣

نەهاتوم تا چەك دانێم، خۆتان بەدواتان ناردوم، ئەگەر ڕێگەم دەدەن باشە ئەگەرنا دەگەڕێمەوە، ڕۆستەم گوتی: ڕێگەی بدەن. ئەویش بەرەو لای ڕۆستەم چو، تاقەتی دەدایە سەر ڕمەکەی و فەرشەکەی کون کون دەکرد. ڕۆستەم گوتی: بۆ چ هاتون؟ گوتی : خوا ناردوینی تا مرۆڤ لە مرۆڤپەرستیەوە بۆ خواپەرستی و لە تەنگو تاری دنیاوە بەرەو گەش‌و گوشادی دنیاو دوایی و لە بێدادی[1] دینانی ناڕەواوە بەرەو دادی ئیسلام رزگار بکەین.

## ئازایەتی بێوێنە و بێباکی لە ژین:

بڕوابون بە ڕۆژی دوایی ئازایەتیەکی لە ئاسا بەدەرو سۆزێکی بە جۆشی بۆ بەهەشت خستبوە دڵ موسڵمانان و لە ژینیش تا بڵێی بێباکی[2] کردبون، ڕۆژی دوایی و بەهەشت و بەخششەکانی وەك چۆن بیبینن لەبەرچاویان بو، وەك کۆتری نامەبەر بێئەوەی لە ڕێ لابدەن بۆی هەڵدەفڕین.

لە شەڕی بەدردا کاتێك موسڵمانان شکستیان خواردبو و دڵسارد ببون، ئەنەسی کوڕی نەضر بەرەو مەیدانێ ڕاپەڕی و سینگی مەردایەتی وەپێش دا، لە ڕێدا سەعدی کوڕی موعاذی دیت و پێی‌گوت: هۆ سەعد! سوێند بە پەروەردگاری کەعبە بەهەشتە بەهەشت، بە خوای وا بۆنی بەهەشتێ دەکەم، ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: کە تەرمەکەمان دۆزیەوە پتر لە هەشتا شوێن برینی تیر و ڕم و شمشێری لە جەستەدا بو، هاوبەشپەرستەکان هەتکیشیان کردبو، بەجۆرێك بو کەس نەیناسیەوە، خوشکەکەی نەبێ کە بە هۆی سەرەپەنجەکانی ناسیەوە[3].

پێغەمبەر ﷺ لە شەڕی بەدردا فەرموی: ڕاپەڕن بۆ ئەو بەهەشتەی کە بە قەد ئەرز و ئاسمانان بەرینە. عومەری کوڕی حومام گوتی: بە قەد ئەرز و

---

١ بێدادی: جەور و ستەم.
٢ بێباکی: بێمنەتی.
(٣) متفق علیه .

ئاسمانان؟! فەرموی بەڵێ. گوتی: بەهـ بەهـ!. فـەرموی: قـسەکەت بـە دڵـە یـان مەبەستت شتێکی ترە؟ گـوتی: نابـەخوا ئـەی پێغەمبـەری خـوا لەبـەر خۆشـی وتەکەتەکە وا دەڵێم، حەزدەکەم منیش لە بەهەشتیەکان بم، فەرموی دە دڵنیابـە تۆ لەوانی.

کە ئەمەی بیست دەنکە خورماکانی ناو تیردانەکەی دەرهێنا و لە دڵخۆشییان دەسـتی کردە خواردنیان، پاشان گـوتی: بـەخوای تـا ئـەو هـەموە دەخـۆم زۆر دەخایەنێ‌و درەنگ دادێ! دەنکـە خورماکـانی فـڕێدا و خـۆی هەڵکوتایـە نێـو مەیدان و تا شەهید بو شەڕی کرد[1].

ئەبوبەکری کوڕی ئەبو موسای ئەشعەری دەڵێ: ڕوبەڕوی دوژمـن وەسـتابوین، لەوکاتەدا لە باوکم بیست دەیگوت: لە پێغەمبەر ﷺ گوێ لـێبو دەیفـەرمو: دڵنیابن بەهەشت لەبەر سـێبەری شمـشێران دایـە. پیـاوێکی ڕوتەڵـەی شـڕۆڵە هەڵسایەوەو گوتی: بە گوێی خۆت گوێت لـێبو! گوتی: بەڵێ. پیاوەکـە چـوە لای برادەرەکانی‌و گوتی: بۆ دواجار سـڵاوتان لێبـێ، مـن دەچـمە نـاو شـەڕێ تـا نەشـکوژرێم ناگەڕێمەوە، شمشێرەکەی گرت و لە کالانـەی دەرهێنـا، کالانەکـەی شـکاند و فڕێیدا، جارێکیتر بە تەمای نەما. بـە شمیـشێری ڕوتـەوە ڕوی کـردە دوژمن و تا شەهید بو شەڕی کرد[2].

عەمری کوڕی جەموح پیاوێکی شەل بـو، شـەلێکی زۆر شـەل، چـوار کـوری هەبو، لەگەڵ گشت غەزاکانی پێغەمبەر ﷺ بەشدار دەبون . کـە پێغەمبـەر ﷺ خۆی و موسڵمانانی ئامادە کرد تا بۆ غەزای ئوحد دەربـچن، عـەمریش ویـستی دەگـەڵ کوڕەکـانی دەربـچێت، بـەڵام کوڕەکـانی پێیـان گـوت: بابـەگیان، خـوا ڕوخسەتی تۆی داوە، توخوا لەماڵەوە بمێنەوە، ئێمە لە جیاتی تـۆش دەردەچین، چونکە خودا جیهادی لەسەر تۆ هەڵگرتوە. عەمریش چوە لای پێغەمبـەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کوڕەکانم لێناگەڕێن منیش بەشداربم، سوێند بـەخوا حەز دەکەم شەهید بم‌و بە لاقی شەلم لەناو بەهەشت پیاسە بکەم. پێغەمبەر ﷺ

---

(١) رواه مسلم .

(٢) رواه مسلم.

وەڵامی دایەوە و فەرموی: عەمر! خوا جیهادی لەسەر تۆ هەڵگرتوە، بە کوڕەکانیشی گوت: ئێوەش وازی لێ بێنن بەڵکو خوا شەهیدی پێ ببەخشێ، پاشان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچو و لە شەڕی ئوحد شەهید کرا[1].

شەددادی کوڕی هاد دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ بڕوای هێناو وەشوێنی کەوت، پاشان گوتی دەگەڵ تۆ کۆچ دەکەم، پێغەمبەر ﷺ چەند یاوەرێکی راسپارد ئاگایان لێبێتو یارمەتی بدەن. کە شەڕی خەیبەر روی دا پێغەمبەر ﷺ چەند شتێکی بە غەنیمەت گرت و دابەشی کرد. بەشی دەشتەکیەکەشی دایە برادەرەکانی و فەرموی کە هاتەوە بیدەنێ، ئەو لەو کاتی مەڕومالاتی برادەرەکانی بردبوە لەوەڕێ، کە گەڕایەوە بەشەکەیان پێدا. گوتی: ئەمە چیە؟ گوتیان بەشی خۆتە و پێغەمبەر ﷺ بۆی داناوی. بەشەکەی هەڵگرتو چوە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە چیە؟ فەرموی: بەشی خۆتە، گوتی: بۆ ئەمە وەدوات نەکەوتوم، بۆ ئەوە هاتوم تا تیرێکم بە گەرو بکەوێت و شەهید بم و بگەمە بەهەشت. فەرموی ئەگەر راست بکەی خوا بە راستت دەخاتەوە. پاشان چونەوە شەڕێ، تەرمەکەیان هێنایەوە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتیان کوژراوە. فەرموی: خۆیەتی؟ گوتیان: بەڵێ. فەرموی: لەبەرئەوەی راستی کرد بۆیە خواش شەهیدی پێبەخشی[2].

## لە خۆپەرستیەوە بەرە و خواپەرستی:

موسڵمانەکان پێشان بەرلەوەی بڕوابێنن لە روی کارو ئاکار و رەوشت و دانوستان و سیاسەت و کۆمەلایەتیدا لە بێسەروبەری‌و پاشاگەردانی دابون و بۆ هیچ دەسەلاتێك ملکەچ نەبون، بێ سیستەم بون، رێبازێکی دیاریان نەبو، بەگوێرەی هەوەست دەگوزەران و بە کوێری ملیان دەنا و رەمەکیانە پەلیان

(١) زاد المعاد : ٣ / ١٣٥ .
(٢) زاد المعاد : ٣ / ١٩٠ .

دەبزوت، بەڵام ئێستا کە بڕوایان هێناوە لەنێو پەرژینی بڕوا و خواناسی دان و لێی دەرناچن، بڕوایان بە پاشایەتی و دەسەڵات و فەرمانەکانی خوا هێناوە و خۆیان بە بەندە دەزانن و گەردەن کەچن، گوێڕایەڵی ڕەهایان بۆ خوا هەیە و لە حوکمی خوا لاڕێ نابن و بە مو لانادەن، لە کەلی شەیتان دابەزیون و هەوەست و خۆپەرستییان تورِ داوە[1]، بەندەی دڵسۆزی خوان و ماڵ و گیان و مامەڵەیان بە گوێرەی ڕەزامەندی خوایە، شەڕ و مەسرەتیان بە ئیزنی خوایە، لە پێناو خوا خۆشنود[2] و تورە دەبن و دەبەخشن و دەسەنن و پەیوەندی دەبەستن و دەبڕن.

چاك لە زمانی قورئان و پێغەمبەر ﷺ دەگەیشتن، لە نەفامێتی کە دەگەڵی پێگەیشتبون حاڵی ببون، ڕاست و ڕەوان لە واتای ئیسلامیان لەلا رون بو، زانییان ئیسلام واتە کۆچکردن لە ژیانێکەوە بۆ ژیانێکیتر، لە زێدێکەوە بۆ زێدێکیتر،[3] لە حوکمێکەوە بۆ حوکمێکی تر، لە بێسەروبەریەوە بەرەو دەسەڵات، لە شەڕو شۆڕەوە بەرەو ملکەچی، لەخۆپەرستیەوە بەرەو خواپەرستی، دەیانزانی کە ئەگەر هاتنە نێو ئیسلام رای زاڵ بۆ شەرعەو کەس نابێ کێشەی لەگەڵدا بکات یان بۆچونی خۆی وەپێش بخات و ئەزیەتی پێغەمبەر بدات، دەیانزانی دادگاکاری[4] تەنها بۆ لای خوا دەگەڕێندرێتەوە و راوبۆچونی کەس حوکم ناکات و باو و نەریت رۆڵی نامێنێ و نەفس ناکرێتە پێودان، بۆیە کە دەبونە موسڵمان لە ژیانی نەفامیو گشت تایبەتمەندی و باو و نەریتەکانیەوە بەرەو ئیسلام و گشت تایبەتمەندی و نەریتو رەوشەکانی کۆچیان دەکرد، هەر دوابەدوای ئەوەی کە ئیسلامیان قبوڵ دەکرد دەسبەجێ ئەم وەرچەرخانە مەزنە بەرپا دەبو.

بۆ وێنە جارێکیان پێغەمبەر ﷺ تەوافی بە دەوری کەعبەدا دەکرد، فوزاڵەی کوڕی عومەیری کوڕی مەلوحیش هێدی هێدی لێی نزیك دەبوەوە، دەیویست

---

١ توردان: فرێدان.

٢ خۆشنود: رازیبون.

٣ زێد: نیشتمان، شوێنی لەدایکبون.

٤ دادگاکاری: تحاکم.

بیکوژێ. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: فوزالە ئەتۆی: گوتی: بەڵێ فوزالەمە ئەی پێغەمبەری خوا. فەرموی: لە دڵی خۆتدا چت دەگوت؟ گوتی: هیچ، یادی خوام دەکرد. پێغەمبەر ﷺ پێکەنیو فەرموی: داوای لێخۆشبون لە خوا بکە، پاشان دەستی خستە سەر سینگی، فوزالە دڵی دامرکایەوە و دەیگوت: سوێند بە خوا هێشتا دەستی لەسەر سینگم هەڵنەگرتبو وام لێهات کەسم لە پێغەمبەر خۆشتر نەوێت. دەڵێ: پاشان بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە و لە ڕێگادا ئەو ژنەم دیتەوە کە پێشتر پێم گوتبو تەمای چم هەیە. بانگی کردم گوتی: وەرە بزانم چت کرد؟ گوتم: خوا و ئیسلام رازی نابن وەڵامت بدەمەوە[1].

## ڕێبیرە رون و نەگۆڕەکانی بانگە وازی پێغەمبەران لەبارەی خواوە:

پێغەمبەران-سلاوی خوایان لێبێ- زاتو سیفەتو کردەوەکانی خوایان بە خەڵك ناساندبو، لە سەرەتای پەیدابونی بونەوەر و سەرەنجامیان ئاگادار کردبونەوە، پێیان راگەیاندبون کە مرۆڤ لە دوای مردندا چارەنوسی بە کوێ دەگات. خەڵك هەمو ئەو زانستانەیان لە دەمی پێغەمبەرانەوە بیستبو بێئەوەی ماندو بوبن یان بەدوای لێکۆڵینەوە و سۆراخکردن وێڵ بوبن، چونکە خۆیان پێشەکی و سەرەداویان لەدەستدا نەبوە تا بە مەبەستی نادیار بگەن بێگومان ئەم زانستانەش لەو دیوی پەردەی سروشت و هەستەوەن، بۆیە چاوی مرۆڤ بۆی بڕ ناکا و هەستیش تێیدا کار ناکات و زانیاریە سەرەتاییەکانیشیان لەبارەوە نیە.

بەڵام خەڵکەکە سوپاسی ئەو بەخششەیان نەکرد و کاریان هەڵوەشاندەوە و سەرلەجێ[2] بە خەستو خوڵی پێیدا هەڵچونەوە، سەریان بە دوی نادیاری وا دەنا کە هیچ دەرەتانێکی نەبێ، بەڵەد و چاوساغیان نەدەدۆزیەوە تا ڕێنوێن بن بەڵکو پتر گومڕا دەبون، لەو ئاسمانگەڕەش ماندوتر و سەرقاڵتر دەبون کە لەبارەی جوگرافیاوە قەناعەت بەزانستی مرۆڤایەتی ناکات-کە ساڵەهای ساڵ

---

(١) زاد المعاد: ٢ / ٣٣٢ .

٢ سەرلەجێ: سەرلەنوێ.

پێوانەکاریو نەخشەسازی بۆ ئەنجام دراوە-و هەوڵ دەدا سەرلەنوێ بەرزایی شاخەکان و قوڵایی دەریاکان و فرەوانی بیابانەکان و مەودا و کەوشەنەکان[1] پێوانە بکاتەوە! کەچی تەمەنەکەشی کورتەو هێندە بڕ ناکات، وزەی بێ بڕستە و بەشی ناکات، ئامرازی کەموکوڕەو باری نابات، بۆیە هێندەی نەبرد شەنگی لەبەر بڕا و ورەی بەردا، لە ئەنجامدا کۆمەڵێك زانیاریو پێوانەی شێواوی هێنایەوە. جا ئەوانی بەبێ چاوساغو بێ ڕێنوێنی لەبارەی خواوە پێهەڵاچون بە هەمان شێوە کۆمەڵێك بۆچونی هەڵەقو بەلەق و زانیاری کەموکوڕ و ورتەورتی وێڵ و لێڵ و بیردۆزەی نابەکامیان هێنایەوەو، خۆیان و خەڵکیشیان بە گومڕا برد.

هەروەها پێغەمبەران-سڵاوی خوایان لێبێ- گەلێك ڕێبیری نەگۆڕ و جێگیری وایان فێری مرۆڤ کرد بو کە لە گشت شوێن و کاتێك بێن بە بنچینەی ژیارێکی پایەدار و ژیانێکی ئاسودە، بەڵام ئەوان سەردەم بۆ سەردەم خۆیان لێ بێبەشتر دەکردو، ژیاریان لەسەر لێواری کەندەڵانێکی داڕماو و بناغەیەکی داڕوخاو و بە پێودانی پێوان و ئەزمونان بنیاد نایەوە، بۆیە بناغەی ژیارەکەیان ڕاخزا و دیوارەکانی داڕوخا و بان و ساپیتەکەیان بەسەردا تەپی.

بەڵام یاوەران-ڕەزای خوایان لێبێ- کە گشت ئەو زانستانەیان لە دەمی پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگرت گەلێك بەختەوەر و سەرکەوتو بون، ماندو نەبون و لە بەروبوم بەهرەمەند بون، وزەو زیرەکیو کۆششیان بۆ کاریتر تەرخان کرد و کاتیان بۆ بەرفرە بو و لە کاری سودبەخشی دین و دنیادا بەسەریان برد، دەستیان بە پەتێکی پتەو گرت و بە هۆشی دڵ دینیان وەرگرت.



١ کەوشەن: سنور، تخوب.

بەندی سێیەم

# کۆمەڵگەی ئیسلامی

## چەپکێك گوڵ:

بڕوابون بە خواو بە پێغەمبەر و بە ڕۆژی دوایی و ملکەچبون بۆ خوا و بۆ دینەکەی چفتوچەوێڵیەکانی ژیانی تەخت کرد، هەمو تاکێکی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بردەوە شوێنی شایانی خۆی، نرخ و ڕێزی کەم نەکردەوەو لە پێی خۆشی نەبردە دەرەوە، هەمو مرۆڤەکانی دنیا بونە چەپکێك گوڵی بێ چقڵ، بونە یەك خێزان، باوکی هەموان ئادەم بو، ئادەمیش لە گڵ بو، عەرەب وعەجەم[1] جیاوزییان نەبو، جیاوازی ڕێزیش بە تەقوا بو. پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو: ((كُلُّكُمْ بَنُو آدَمَ وَآدَمُ خُلِقَ مِنْ تُرَاب، لَيَنْتَهِيَنَّ قَومٌ يَفخَرون بِآبَائِهِم أَوْ لَيَكُونُنَّ أَهْوَنَ عَلَى اللّٰهِ تعالى مِنَ الْجِعْلانِ[2]: هەموتان لە نەوەی ئادەمن، ئادەمیش لە خۆڵ خەڵق بوە، با ئەوانەی خۆ بە باووباپیران هەڵدەدەنەوە واز بێنن دەنا لە لای خوا لە قالۆچەش بێ ڕێزتر دەبن )).

خەڵك ئەوەشی دەبیست کە دەیفەرمو: (( يَا أَيُّهَا النَّاسُ إنَّ اللّٰهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَتَعَظُّمَهَا بِآبَائِهَا، فَالنَّاسُ رَجُلانِ، رجلٌ بَرٌّ تَقِيٌّ كَرِيمٌ عَلَى اللّٰهِ تعالى، وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ هَيِّنٌ عَلَى اللّٰهِ تَعالى[3]: هۆ خەڵکینە! خوا تانەوتەشەرگرتن و شانازیکردنی نەفامیانەی بە باب و باپیرانی لەسەر لابردون، بزانن ئێستا خەڵك دو جۆرن: یان پیاوێکی چاك و لەخواترسە و لەلای خوا زۆر بەڕێزە، یان پیاوێکی خراپ و لەخوا یاخیەو لەلای خوا زۆر بێنرخە)).

---

(١) بە کەسانی غەیری عەرەب دگوترێ عەجەم. وەرگێڕ

(٢) تفسير ابن كثير، سورة الحجرات.

(٣) رواه ابن أبي حاتم .

هەروەها دەیفەرمو: (( إِنَّ أَنْسَابَكُمْ هَذِهِ لَيْسَتْ لِمَنْسَبَةٍ عَلَى أَحَدٍ، كُلُّكُمْ بَنُو آدَمَ، طَفُّ الصَّاعِ لَمْ يَمْنَعُوهُ، لَيْسَ لأَحَدٍ عَلَى أَحَدٍ فَضْلٌ إلاّ بِدِينٍ وَ تَقْوَى[1]: کەس بە نەژادو رەچەڵەك لەسەر کەس گەورەتر نابیٚ‌و کەسیش کەمتر نابیٚ، هەموتان نەوەی ئادەمن‌و وەك زاری تەرازو بەرانبەرن، کەس هیچی بەسەر کەسیترەوە نیە، مەگەر بە دین وتەقوا)). ئەبوذەر-خوا لێی رازی بیٚ- لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ((أنظر فأنك لست بخير من أحمر ولا أسود، إلاّ أن تفضله بتقوى الله: بڕوانە، تۆ لە هیچ کەس‌و لە هیچ سور و رەش پێستێك چاکتر نیت تەنها بەتەقوا نەبیٚ)). هەروەها لە شەودا کە لەخوا دەپاڕایەوە خەڵك گوێبیستی دەبون کە دەیفەرمو: ((وأنا شهيد أن العباد كلّهم أخوة[2]: من شاهیدم کە هەمو بەندەکان برای یەکترن)).

## ئەو کەسەی بانگەواز بۆ دەمارگیری بکات لە ئێمە نیە:

پێغەمبەر ﷺ رەگ‌و ریشاڵی نەفامێتی هەڵکێشا و تۆوەکەی لەناوبرد و گشت پەنجەرەکانی داخست، فەرموی: (( ليس مِنّا مَنْ دَعا الى عَصَبيّةٍ، وليس مِنّا مَنْ قاتَلَ عَلى عَصَبيّةٍ وَلَيْسَ مِنّا مَنْ مَاتَ على عَصَبيّة[3]: ئەو کەسە هەرگیز لە ئێمە نیە کە بانگەواز بۆ دەمارگیری دەکات یان شەڕی لە پێناودا دەکات یان لەسەری دەمریٚ)). جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵیٚ: (( لە غەزادا بوین کۆچەرێك لەقەیەکی لە یاریدەدەرێك[4] دا. یاریدەدەرەکە هەڵیدایی‌و گوتی: یاریدەدەران! هەڵسن یارمەتیم بدەن، کۆچەریەکەش گوتی: کۆچەران! ئێوەش هەڵسن. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: واز لەو دەمارگیریە بێنن، بۆگەنە))[5].

---

(١) رواه امام أحمد .

(٢) رواه ابو داود.

(٣) رواه ابوداود .

(٤) کۆچەران: المهاجرين.    یاریدەدەران: الأنصار

(٥)رواه البخاري

پێغەمبەر ﷺ فیزو دەماری نەفامیێتی حەڕام کـرد. نـەفامیێتی عەرەبـەکان بەبێ سنور پشتی یەکتریان دەگرت بەڵام پێغەمبەر ﷺ سنوری بۆ کێشا، یەکێك لە نەریتە جێگیرو پەندە هەرە باوەکـانی نـەفامیێتی دەیگـوت: ((أنـصـر أخـاك ظالمـاً أو مظلوماً: براکەت زاڵم بێ یا ستەمدیدە، لە پشتی بـە و یارمەتی‌ـدە))، بەڵام پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمون : ((مَن نَصرَ قَوْمَهُ عَلَى غَيـرِ الحَـقِّ فَهُـوَ كَالْبَعيرِ الّذي ردي فَهُوَ ينْزَع بِذَنْبِـهِ[1]: ئەو کەسەی هۆزەکـەی لەسـەر ناهـەق سەربخات وەك ئەوە وایە وشترێك قاچـەکانی لـە زەوی ڕۆچـوبێ‌و عاسـێ بوبـێ ئەویش بە کلکیەوە دەری بێنێ)).

دەرون و ئاوەزی موسڵمانی عەرەب بەجۆرێك کە گۆڕا پەندە بـاو و بڵاوەکـەی پێ قبوڵ نەکرێ، بۆیە کە پێغەمبەر ﷺ جارێکیان فـەرموی : ((أُنْصُـرْ أَخاكَ ظَالِمَـاً أَوْ مَظْلُوماً)) خۆی پێ ڕانەگیراو پرسـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا قـەینا ئەگەر ستەمدیدە بێ بەڵام ئەگەر زاڵم بێ؟ فەرموی: کە دەستی زاڵمەکەت گـرت و نەتهێشـت ستەم بکات کەواتە پشـتیت گرتوە))[2].

## هەموتـان شـوان‌و بەرپرسـن:

لە کۆمەڵگەی ئیسـلامیدا چین و توێژو ڕەگەزە جیاوازەکـان هاوکـاری یـەکتر ودەست لەناو دەست بون، کەس مافی کەسی پێشـێل نـەدەکرد، پیـاو سـەرداری ئافرەت بون چونکە خوا پلەیەکی پتری پێ‌بەخشیون و دابینکردنـی بـژێوییان لـە ئەستۆ بو، ئافرەتانیش خواپەرست‌و داوێنپاك و چاکەکار بـون، هـەروەك ئـەرکی ژنانەیان لەسەر شان بو مافی ڕەوای خۆشیان هەبو، سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵگـە شوان بون‌و لە کار و خەڵکی ژێر دەستیان بەرپرس بون، پێشەوا لە خەڵك بەرپرس بو، پیاو لە خاوخێزانی بەرپرس بو، ئافرەت لە ماڵی‌مێرد و منـداڵانی بـەرپرس

---

(١) تفسـير ابن كثيـر .

(٢) حديث متفق عليـه .

بو، خزمەتكار لە ماڵی گەورەكەی بەرپرس بو[1]،بەمجۆرە كۆمەڵگەی ئیسلامی كۆمەڵگەیەكی ڕێڕاست و سەرڕاست بو، لە كاروبارەكانی خۆی بەرپرس بو.

## گوێڕایەڵی لە سەرپێچیدا نیە:

موسڵمانەكان تەنها لەسەر هەق هاریكار بون و كاریشیان بە پرس‌وڕا بو، ئەگەر خەلیفە لەسەر گوێڕایەڵی خوا بوایە گوێڕایەڵی دەبون و ئەگەر لە خواش یاخی بوایە گوێڕایەڵی نەدەبون، دروشمی حوكمیان بریتی بو لە: ((**لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق**[2]: هیچ كەسێك گوێڕایەڵی بۆ ناكرێ ئەگەر فەرمانەكەی سەرپێچی خوای تیدا بێ)). ماڵو گەنجینە كە پێشتر خۆراكی دەمی پاشایان بو و دەوڵەمەندەكان بە فێڵ و گزی دایاندەگرت؛ بوە ماڵی خوا و تەنها لە پێناو خواو بۆ كاری خێر خەرج دەكرا و موسڵمانانیش ئەمینداری بون.
خەلیفە وەك سەرپەرشتی هەتیو ئەگەر پێویست بوایە بە قەد پێویست خەرجی دەكرد و ئەگەر پێویستیشی پێ نەبوایە دەستی بۆ درێژ نەدەكرد. زەوی‌وزار كە پاشاو كاربەدەستان بە ئارەزوی خۆیان دەیانبەخشیو زەوتیان دەكرد یان وەك پارچە پەڕۆ دایاندەبڕی، بوە مولكی خوا و ئەگەر یەكێك بە قەد بستێك ستەمی بكردایە خوا لە حەفت تەبەقەی زەوی دەیبردە خوارەوە.

## پێغەمبەر ﷺ شوێنی روح و دەرونی كۆمەڵگەی گرتەوە:

كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە سەرلەبەری ژیان و لە هەر شتێكی وەریدەگرت یان جێیدەهێشت گوڕوتین و چالاكی نەمابو، ماندو و شەكەت و خنكا بو، لە پێناو مەرامی گەورەكەیدا بە نابەدڵیو بە ناچاریەوە پەلكێشی شەڕ دەكرا، هێشتا تۆڵەی نەسەندبوەوە و برینی سارێژ نەببو كەچی بە تۆزی ئاشتەوایی پێ مۆر دەكرا. لەم كۆمەڵگەیەدا پیاوەكان ناچار دەكران قوربانی بدەن و ماندوێتی ببینن

---

(١) متفق علیه .
(٢) متفق علیه .

و ئازاری کاری سەخت بچێژن بێتەوەی بۆ مەبەستێکی رەوا بێ‌و ویژدان‌و سۆزی لەگەڵدا بێ، سەرکردەکانیان خۆش نەدەویست‌و سەرکردەش ئەوانی خۆشنەدەویست کەچی ناچاربون گوێڕایەڵی کەسانێك بن خۆشیان نەوێت، دەبوایە سەروماڵ بۆ کەسانێك بکەنە قوربانی کە رقیان لێ دەبونەوە، پشکۆی دڵان خامۆش ببو، سۆزی دەرونان سارد و کز ببو، خەڵك دەگەڵ دوڕوویی‌و روالەتبازی[1] و ناپاکی گەورە ببون و دەرون دەگەڵ زەبونی‌و ژێردەستەیی و ملشۆڕی و ستەمباری راهاتبو .

ئەو سۆزە بەهێزەی-کە مایەی ئەنجامدانی زۆربەی سەمەرەکانی‌مرۆڤایەتی و داستانە نەمرەکانی مێژوە، کە خەڵك پێی دەڵێن (خۆشەویستی)- لە ئارادا نەمابو، ماوەی چەندین سەدە بو کەس پەیدا نەببو وەجۆشی بخاتەوە و بەروبومی لێ وەبەرهەم بێنێ، خۆشەویستی هەر هێندە بو کە شاعیرانی کۆن‌و نوێ چەند شعرێکی لە پێناو جوانی جۆراوجۆر و دیمەنی دڵڕفێنی فانیدا پێهەڵبڵێن و هیچی‌تر.

لەنێو ئەم کۆمەڵگە سەرگەردان و ستەمدیدەیەدا محمد ﷺ راپەڕی‌و کۆت‌و زنجیری هەڵوەشاند، پاشان شوێنی روح و دەرون و دڵ‌و چاوانی گرتەوە، موحەممەد ﷺ ئەو مرۆڤە بو کە خوا بەرزترین سیفەتەکانی جوانی و تەواوی و تەژیترین واتاکانی باشی‌و چاکەکاری تێدا کۆ کردبۆوە، یەکێك لە رێگا بیدیبایە سامی لێدەکرد، کە لەگەڵی تێکەڵ دەبو خۆشی دەویست. یەکێك لە وەسفیدا دەڵێ: بەر لە محمد و لە دواشیدا کەسم وەکو ئەو نەدیوە. پیاو کە دەیبینی پڕبەدڵ خۆشی دەویست وەك چۆن ئاو لە تاڤگەوە بەرەو گۆلاو هەڵدەرژێ، دڵ‌و دەرون بۆی کێش دەبو وەك چۆن ئاسن بە موگناتیس کێش دەبێ، دەتگوت روح‌و دڵ رۆژگارێکە بۆ دیداری چاوەڕێن، نەتەوەکەی بە جۆرێك خۆشیانویستوە و فەرمانیان جێبەجێ کردوە لە مێژوی شەیدا و خۆشەویستان شتی وا نەبوە. لە رادەبەدەر خۆشیان

---

(١) روالەتبازی: ریابازی.

ویستوه و سەرو ماڵو ژنو منداڵیان بۆ کردۆتەوە قوربانی، بە شێوەیەك نە لە پێشتر و نە لە پاشتر هاوشێوەی نەبوە.

## خۆشویستن و باڵاگەردبونی بێوێنە :

ڕۆژێکیان دوای ئەوەی ئەبوبەکری کوڕی ئەبو قوحافە ببوە موسڵمان، هاوبەشپەرستەکان لێی کۆبونەوە و خستیانە ژێر دەستو پێیان و خراپیان لێدا، عوتبەی کوڕی ڕەبیعە هەردو کەوشەکەی پێکەوە گرتبوە دەست و رایدەوەشاندە دەموچاوی، هەمو لەشیان کردە خوێن، دەمو لوت و چاوی جیا نەدەکرایەوە، خوێن لە زگی نەدەوەستا، بەرەی تەیمیەکان کە خزمی بون هاتن خەڵکەکەیان دورخستەوە و خستیانە ناو پۆشاکێك و بردیانەوە ماڵەوە، لە مردنی بێگومان بون، تا بەرەبەری ئێوارێ هەستو خوستی نەبو، بەڵام هەرکە بەهۆش خۆی هاتەوە گوتی: پێغەمبەر چی بەسەر هات؟ خزمەکانی قسەی ڕەقو ناخۆشیان ئاراستە کرد و سەرزەنشتیان کرد و پێیان گوت: تۆ لەسەر موحەممەد وات لێ بەسەرهاتوە هێشتا لەو دەپرسی؟! بەجێیان هێشتو بە دایکیان گوت: ئەگەر ئاو بێ نان بێ برێکی دەرخوارد بدە. پاشان دایکی چوە پشت سەریو زۆری قسە بۆ کرد واز بێنێ، بەڵام ئەو هەر دەیگوت: پێغەمبەر چی بەسەر هات؟ دایکی گوتی: بڕوا بکە ئاگام لێنیە. گوتی: بڕۆ بۆ لای دایکی جومەیلی کچی خەتتابی لەو بپرسە، ئەویش چوە لایو گوتی: ئەبوبەکر دەڵێ موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا چی بەسەر هاتوە؟ گوتی: نە ئەبوبەکر دەناسمو نە موحەممەد، ئەگەر حەزیش دەکەی دێمە لای کوڕەکەت. گوتی: باشە وەرە. جا کە ئەبوبەکری بەو پەشۆکاویەوە دیت ئاوا لەسەر جێ کەوتوە و ڕەنگی مردوی لێنیشتوە، قیژاندی و گوتی: بەو خودایە ئەو کەسانەی وایان لێکردوی خوانەناس و بێبڕوان، ئومێدم هەیە خوا تۆڵەیان لێ وەرگرێتەوە، ئەبوبەکر لێی پرسی: پێغەمبەر چی بەسەر هات ؟ گوتی: ئاخر دایکت لێرەیە، گوتی: قەیناکە، گوتی: ساغو سەلامەتە.

گوتی: لە کوێیە؟ گوتی: لە ماڵی کوڕی ئەرقەمە. گوتی: دەسوێند بە خوا تا نەگەمە لای پێغەمبەری خوا نانو ئاوم بە گەرو ناکەوێ. پاشان هەر لەوێ مانەوە

تا ئێوارە داهاتو خەڵك هاتوچۆی نەما، ئینجا هەریەکەو بن پیلێکیان گرت و بردیانە لای پێغەمبەر ﷺ))[١].

ژنێکی ئەنساری لەشەڕی ئوحددا باوكو برا و مێردەکەی شەهید کران، کە تەرمەکانیان هێنایەوە گوتی: ئەدی پێغەمبەری خوا چۆنە؟ گوتیان: سوپاس بۆ خوا سەلامەتە گوتی: کوانێ با بیبینم، کە بینی ئەوجا دڵنیا بو و گوتی: مادەم تۆ سەلامەت بی هیچ بەڵایەك سەخت نیە[٢].

کە خوبەیبیان بردە سەر تەختەداری تیرباران کردنێ، گوتیان: هۆ خوبەیب! حەز دەکەی موحەممەد لێرە لە جێی تۆ بوایە؟ گوتی:هەرگیز، نەك لە جێی من بێ، بەڵکو حەزدەکەم من بکوژرێم نەك ئەو دڕکێکی لە پێ راچێ. ئەوانیش گاڵتەیان پێکردو دایانە قاقای پێکەنین[٣].

زەیدی کوڕی ثابت دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ رایسپاردم سەعدی کوڕی روبەییع بدۆزمەوە، فەرموی: ئەگەر دۆزیتەوە سڵاوی منی پێ بگەیەنە و بڵێ: پێغەمبەری خوا دەڵێ حاڵی چۆنە؟ منیش لەنێو تەرمەکاندا دەگەڕام تا دۆزیمەوە، لە حەفتا شوێن بە تیر و رم و شمشێر بریندار ببو پێم گوت: سەعد! پێغەمبەر ﷺ سڵاوت لێدەکات و دەڵێ حاڵت چۆنە؟ گوتی سڵاو لە پێغەمبەر ﷺیش بێ و پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا وا بۆن و بەرامەی بەهەشت دەکەم. تۆش بە خزمە یاریدەدەرەکانم بڵێ: تا هانای چاویان دنیا ببینێ ئەگەر بێبڕواکان هەر زەبرێك لە پێغەمبەر ﷺ بوەشێنن لە لای خوا شەرمەزارن. پاشان گیانی دەرچو[٤].

---

(١) البداية والنهاية : ٣ / ٣٠ .
(٢) رواه ابن اسحاق امام المغازي، ورواه البيهقي مرسلاً .
(٣) البداية والنهاية : ٤ / ٦٣ .
(٤) زاد المعاد : ٢ / ١٣٤ .

ئەبو دوجانە لەشەڕی ئوحددا سینگی لە پێغەمبەر ﷺ کردبو، هەمو ئەو تیرانەی لە پێغەمبەریان دەگرت بە پشتی وی دەکەوت کەچی لە شوێنی خۆشی نەدەجولا و لانەدەکەوت(١).

مالیکی ئەلخدری هەمو برینەکانی لەشی پێغەمبەر ﷺی هەڵمشت تا پاك بونەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی گوت: لە دەمتی فڕێ دە، گوتی سوێند بەخوا فڕێی نادەم(٢).

ئەبو سوفیان کە چوە مەدینە، لەوێدا چوە ماڵی کچەکەی-دایکی حەبیبە، ویستی دانیشێ بەلام دایکی حەبیبە زو حەسیرەکەی هەڵگرت و نەیهێشت لەسەری دانیشێ، ئەبو سوفیان گوتی: کچم! نازانم لەبەر جێگاکەت بو یا لەبەر منت بو؟ گوتی: لەبەر ئەوە بو جێی پێغەمبەر ﷺ بو، تۆش هاوبەشپەرستی، پیسی(٣).

عوروەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی دوای ئەوەی لە پەیمانی حودەیبیە گەڕایەوە بە برادەرەکانی گوت: هەیاران! سوێند بەخوا بە وەفد بۆ لای گەلێك لە پاشایان چومە، چومە لای قەیسەر و کیسرا و نەجاشی، سوێند بەخوا هیچ پاشایەکم نەدیوە وەکو یاوەرانی موحەممەد ڕێزی موحەممەد دەگرنو بە گەورەی دەزانن؛ ڕێزی بگرنو بە گەورەی بزانن، سوێند بە خوا کە بەڵغیش فڕێ دەدا زو یەکێکیان دەیگرێتەوە و لە دەموچاوی و لەشی هەڵدەسوێ، کە فەرمانیان پێدەکا یەکسەر رادەپەڕن، کە دەستنوێژ هەڵدەگرێ خەریکە لەسەر پاشماوەی ئاوەکەی ببێتە شەڕ و هەریەکە دەیەوێ کەمێکی وەبەرکەوێ، کە قسەی لەلادا دەکەن دەنگیان زۆر نزم دەکەنەوە، لەبەر ڕێزو گەورەییەکەی زۆر تەماشای چاوی ناکەن(٤).

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشو.
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشو: ٢/١٣٦
(٣) سیرة ابن هشام: ذکر الاسباب الموجبة للمسیر الی مکة .
(٤) زاد المعاد : ٣ / ١٢٥ .

## ملکەچبونی ناوازە:

سەربازە خۆبەخشەکانی ((خۆشەویستی)) بێ سێودو لێکردن ملکەچی فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ بون، لەبەرئەوەی پڕ بە دڵ خۆشیان دەویست و پڕ بە تواناش ملکەچی دەبون، جوانترین وتە لەم بارەوە وتەکەی سەعدی کوڕی موعاذ بو کە بەر لە شەڕی بەدر لەباتی خۆیو یاریدەدەرەکان گوتی: (( من بە ناوی خۆم و یاریدەدەرەکانەوە دەدوێمو دەڵێم: بۆ کوێ بڕۆی، پەیوەندی لەگەڵ کێ ببەستی و ببڕی لەگەڵتین، چەند ماڵمان لێ وەرگری یا ببەخشی پێخۆشنودین، ئەوەشمان پێ خۆشترە کە وەریدەگری، فەرمان فەرمانی تۆیە و ئێمەش ئامادەین، سوێند بەخوا ئەگەر بچیە زرێبارەکەی غەمدانیش لەگەڵتین، ئەگەر خۆت لەم دەریایەش بدەی خۆ لێ دەدەین))[1].

بە موو لە فەرمانی پێغەمبەریان لانەدەدا، کاتێک پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکرد هیچ کەسێك لە خەڵکی مەدینە دەگەڵ ئەو سێکەسەی لە غەزای تەبوك بەشدار ببون نەدوێ؛ هەمو گوێڕایەڵی بونو کەس قسەی لەگەڵدا نەکردن. شاری مەدینەیان لێ ببوە شاری مردوان، کەس نەبو بانگیان بکات یان وەڵامیان بداتەوە. کەعب دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد هیچ کەسێك قسە لەگەڵ ئەو سێ کەسەمان نەکات، خەڵکیش خۆی لێ وەدور گرتین و بون بە خەڵکێکیتر، تەنانەت زەویشم لێ گۆڕا بو، ئەو زەویە نەبو کە پێشتر دەمناسی. پاشان دەڵێ: زۆری خایاند و موسڵمانانیش گەلێکم لەگەڵ وشك بون، جارێك لەبەر بێزاری چوم بەسەر دیواری شورەی ماڵی ئەبو قەتادە هەڵگەڕام-کە ئامۆزاو خۆشەویسترین کەس بو لە لام-و سڵاوم لێکرد، سوێند بەخوا وەڵامی نەدامەوە، گوتم : هۆ ئەبو قەتادە! تو و خوا دەزانی خوا و پێغەمبەرم خۆش دەوێ؟ بێدەنگ بو، دوبارە بانگم کردەوە هەر بێدەنگ بو، جاری سێیەم کە

(١) هەمان سەرچاوەی پێشو : ٣ / ١٣٠ .

بانگم کردەوە گوتی: خواو پێغەمبەر زاناترن. چاوم پڕ فرمێسك بو و دابەزیم و ڕۆیشتم[١].

کەعب ئەوپەڕی ملکەچی بۆ پێغەمبەر ﷺ هەبو، هەرچەندە زور سەرزەنشت و وشك ڕەفتاری لەگەڵدا کرابو بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ خەبەری بۆ نارد لە ژنەکەی دور کەوێتەوە گوێڕایەڵ بو و گوتی: هەر تەنها لێی وەدور کەوم یان چ شتێکی تریش بکەم؟ فەرموی: نا بەس لێی وەدور کەوە، ئەویش بە ژنەکەی گوت: بگەڕێوە ماڵی باوکت، تا خوا کارەکەم یەکلا دەکاتەوە لەوێ بە[٢].

پێغەمبەری لە هەمو کەس خۆشتر ویستوە و هیچ کەسێکی بەسەر پێغەمبەر هەڵنەبژاردوە، پاشای غەسسان کە زانیبوی کەعب لەو تەنگو چەڵەمەیە دایەو خەڵك سەرکۆنەی دەکەنو بە وشکی ڕەفتاری لەگەڵدا دەکەن، ویستی حاڵەتەکەی هەڵقۆزێتەوە و داوای لێکرد بچێتە لای، بەڵام ئەو ڕەتی کردەوە. کەعب خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ((لە بازاڕی مەدینەدا دەگەڕام، پیاوێکی نیبطی خەڵکی شام یەکێك بو لەوانەی خواردنیان هێنابو لە مەدینە بیفرۆشن، دەیگوت: کێ کەعبی کوڕی مالیکم پێ نیشان دەدا؟ خەڵکیش پەنجەیان بۆ من ڕادەکێشا، هاتە لامو نامەیەکی پاشای غەسسانی دایە دەستم- منیش خۆم نوسەر بوم- نامەکەم خوێندەوە تێیدا نوسرابو: زانیومانە هاوەڵەکەت ساردی لەگەڵدا نواندوی، خۆ خوا نەیکردوە هەر لە نیشتمانی کەساسو زەبونیدا بیت، وەرە لای من، من بەختەوەرت دەکەم. کە خوێندمەوە گوتم: ئەوەش تاقیکردنەوەیەکی ترە، نامەکەم خستە ناو تەندورێك و سوتاندم[٣].

یەکێکیتر لە هەڵوێستە سەیر و سەمەرەکانی گوێڕایەڵیو خێرایی ملکەچبون ئەوەبو کاتێك کە ئایەتی حەرامکردنی عەرەق دابەزی یاوەران لە کۆڕی عەرەق خواردنەوە دابون، ئەبو بورەیدە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: دانیشتبوین عەرەقمان دەخواردەوە پێمان وابو کارێکی جوانو پیاوانەیە، هەستام چومە لای

---

(١) متفق علیه .
(٢) متفق علیه .
(٣) متفق علیه .

پێغەمبەر ﷺ و سڵاوم لێکرد، ئەم ئایەتە دابەزیبو کە عەرەق حەرام دەکات: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ . إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمْ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنْ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنتَهُونَ ﴾المائدة: ٩٠-٩١ ، یەکسەر گەڕامەوە لای هاوەڵەکانم و ئایەتەکەم بۆ خوێندنەوە، هەندێکیان کاسەیان لە دەستی بو و کەمێکیان لێ خواردبۆوە و کەمێکیشی لەناودا مابو، کاسەکەیان لە بن لێوی سەرەوەی دەمیان داناو وەکو کەڵەشاخگر عەرەقەکەیان تف کردەوە، پاشان عەرەقەکانیان رشتەوە ناو دەفرەکان و گوتیان: وازمان هێنا پەروەردگار، وازمان هێنا پەروەردگار[1].

پڕ بەدڵ گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بون تەنانەت پێغەمبەریان لەسەروی سەر و خێزان و هۆزیش داناوە، هەڵوێستەکەی (عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی) بەڵگەو نمونەیەکە لە نمونە هەرە سەیر و سەمەرەکانی گوێڕایەڵی کە ئیبنو جەریر بە سەنەدی خۆیەوە لە ئیبنو زەید دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: پێغەمبەر ﷺ بانگی عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کرد و پێی گوت: ئاگات لێیە باوکت چ دەڵێ! گوتی: چ دەڵێ دایكو باوکم بە قوربانت بێ؟ فەرموی: دەڵێ ئەگەر بگەڕێینەوە دەبێ ئەوەی کەس بێ ناکەس لە شار وەدەرنێ. گوتی: راستە، ئەی پێغەمبەری خوا! سوێندم بە خوا ئەتۆ کەسی و ئەویش ناکەس. ئەی پێغەمبەری خوا ! خۆشت وا هاتوی بۆ مەدینەو خەڵکیش دەزانن کە کەس ئەوەندەی من بۆ باوکی باش نیە، بەڵام ئەگەر خواو پێغەمبەری خوا رەزامەندی بفەرمون هەر ئێستا دەچم لە گەردنی دەدەم، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: نا، وا مەکە. جا کە بۆ مەدینە گەڕانەوە (چونکە بۆ شەڕی خەندەق چوبونە دەرەوەی شاری . وەرگێڕ) عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی، بە شمشێری روتەوە لەبەر دەروازەی مەدینە وەستا بو و چاوەڕێی باوکی دەکرد، کە باوکی هاتەوە پێی گوت، تۆ گوتوتە ئەوەی کەس بێ ناکەس وەدەردەنێ؟ ئێستا

---

(١) رواه ابن جرير بسنده فى التفسير عند قوله تعالى: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ﴾المائدة: ٩٠، تفسير الطبرى، ج ٧.

وەدەردەکەوێ کێ کەس و کێ ناکەسە؟ ئەوە ناڵێم خواو پێغەمبەری خوا رێگەت بدەن ئەگینا سوێند بەخوا هەرگیز نابێ پێت وەشاری بکەوێتەوە، هەرگیز نابێ جارێکیتر لە سێبەری مەدینەدا بسێیتەوە. باوکیشی هاواریکرد: هۆ خەزرەجیەکان! کورەکەم ناهێڵێ بگەرێمەوە ماڵی خۆم! کورەکەم نایەڵێ بچمەوە ماڵی خۆم!. ئەویش گوتی: وەڵڵاهی قەت ناچێتەوە تا پێغەمبەر رێگەی دەدا. چەند پیاوێك کۆبونەوە و پێیان گوت رێگەی بدە با بڕواتە ژورەوە، گوتی، نا بەخوای ناڕوا مەگەر خواو پێغەمبەر رێگەی بدەن. چونە لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵیان پێ راگەیاند، ئەویش فەرموی: بڕۆن پێی بڵێن با وازی لێبێنێ و بچێتەوە ماڵی خۆی، ئەوانیش هاتنەوە فەرمانەکەی پێغەمبەریان پێراگەیاند، گوتی: مادەم فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بێ بەسەرچاو[1].



(١) تفسير الطبري، ب ٢٨ .

بەندی چوارەم

# چۆن پێغەمبەر ﷺ کەرستەی خاوی نەفامێتی کردە بەرهەمی ناوازەی[1] مرۆڤایەتی؟

پێغەمبەر ﷺ بە هۆی بڕوا فرەوانو قوڵەکەیەوە، بە ئـامۆژی[2] رێکـوپێکی پێغەمبەرانەیـەوە، بـە پەروەردەیـەکی ورد و کارامـەوە، بـە کەسـایەتیە بێوێنەکەیەوە، بە سـای پەرتوکـە ئاسمانیەکەیـەوە کـە پـەرجوێکی بێهاوتایـە و سەمەرەکانی لەبن نایە، ژیانێکی تازەی بە بەر مرۆڤایەتیدا کردەوە.

پێغەمبەر ﷺ روی کردە توانستە مرۆڤایەتیـەکان کـە وەك کەرسـتەی خـاو هەڵدرابونەوە سەریەكو کەس بە دەوڵەمەندیەکەی نەدەزانیو شوێنەکەی نەناسـرا بو و بێباوەڕی و نەفامێتی و دنیاپەرستی بـە فـیڕۆی دابـون، روی تێکـرد و بـە یاریدەی خواوە بڕوا و بیروباوەڕی تێدا بوژاندەوە، روحێکی تازەی بە بەردا کردەوە و وزە شـاراوەکانی تەقاندەوە و بەهرە پەژموردەکانی[3] گەشـاندەوە و هەریەکەی دەبردەوە شوێنی شیاوی خۆیو وەك خشـت شوێنی خۆیان دەگرتەوەو نەخشـیان دێنا، دەتگوت شوێنەکەی دەمێکـە کـەلێن بـوە و چـاوەڕێی ئـەم پڕبونەوەیـەی کردوە، پێشـتر دەتگوت پەیکەربون کەچـی ئێـستا بونەتـە جەسـتەی گەشـاوە و مرۆڤی بە جولەجول، پێشـتر دەتگوت مردوی بێ جولەبون کەچـی ئێـسـتا زنـدو بونەتەوە و ئیرادە بەسەر جیهاندا پیادە دەکەن، پێشـتر دەتگوت کوێر بون کەچی ئێـستا بونەتە سـەرکردەو سـەرکردایەتی نەتـەوەکان دەکـەن: ﴿ أَوَمَـنْ كَـانَ مَيْـتـاً فَأَحْيَـيْـنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُـهُ فِـي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا: ئەرێ ئەو کەسەی پێشـتر مردبو و پاشان زنـدومان

---

(١) ناوازە: عجیب.

(٢) ئامۆژ: تعالیم.

(٣) پەژمودە: سیس و کز.

کردۆتەوە و روناکیمان پێبەخشیوە تا خەڵك رێنوێن بکات لەگەڵ ئەو کەسدا وەکو یەکە کە لە تاریکی دایە و هەرگیز دەربازی نابێ؟!﴾الانعام:١٢٢

پێغەمبەر ﷺ روی کردە نەتەوەی عەرەبی سەرگەردان و نەتەوەکانی تریش، هێندەی نەبرد جیهان گەلێ پیاوی هەڵکەوتو و بێوێنەی لێ بەدی کردن. عومەر کە وشترەوانی باوکی بو و روشکێن دەکرا، کە لە نێو قورەیشیەکاندا بە تورە و تۆسن و رەق ناسرا بو و پایەکی بەرزی نەبو و ئاوزاکانی[1] زۆر بە گەورەیان نەدەزانی؛ بوە بلیمەتو شکۆدارێکی ئەوتۆ دنیا واقی لێ ورما، کۆشکی قەیسەر و کیسرای لەسەر دەست رما، وڵاتێکی ئیسلامی خاوەن موڵكو سامانێکی فرەو کارگێڕیەکی دەستڕەنگینو سیستەمێکی سەرکەوتو و پڕ لە دادگەری و لە خواترسی و چاکەخوازی دامەزراند، کە ئێستاش وەك نمونەیەکی بەرز دەخرێتە رو.

خالیدی کوڕی وەلید کە لاوێکی سوارچاکی قورەیشی بو، کە بەهرە جەنگاوەریەکەی لە جوغزێکی تەسکی ناوچەییدا خولی دەخواردەوەو لەسەر ئاستی جەزیرەدا ناوبانگێکی ئەوتۆی نەبو، کە سەرۆکەکانی قورەیش لە شەڕە هۆزپەرستیەکاندا کۆمەکیان لێدەخواستو هەر سوپاسو ئافەرینێکیان دەکرد، بو بە هێمای هێرشی لەشکری خواناسانو هەر کۆسپێکی دەهاتە پێش تەختی دەکرد و وەك هەورەتریشقە هێرشی دەبردە سەر رۆم و بۆ هەمیشە ناوی لە مێژودا مایەوە.

ئەبو عوبەیدە کە پیاوێکی چاکخوازو دەسپاكو نەرمونیان بو و لەسەرەتادا سەرتیپی موسڵمانان بو، بوبە سەرکردەی لەشکری موسڵمانانو هیرەقلی لە شامو رەزو باخەکانی ڕاوناو پەرگەندەی کرد، هیرەقل چاوی ماڵئاوایی یەکجارەکی بۆ شام هەڵبڕی و گوتی: خواحافیز سوریا خواحافیز، جارێکیتر ناتبینمەوە.

عەمری کوڕی عاص کە یەکێك بو لە هۆشمەندانی قورەیش و بۆ حەبەشە رەوان کرا تا موسڵمانە کۆچکردوەکان بگەڕێنێتەوە، بەڵام بە دڵی سارد و

---

(١) ئاوزا: هاوتەمەن، ئاوقەران.

دەسبەتاڵی گەڕیەوە؛ دەبێتە ئەو کەسەی کە میسر فەتح دەکا و گەلێ داستان تۆمار دەکا.

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص کە لە مێژوی عەرەبی بەر لە ئیسلامدا نەمانبیستوە سەرتیپ و سەرلەشکر بێ؛ کلیلەکانی مەدائن دەگرێتە دەست و عێراق و ئێران فەتح دەکات.

سەلمانی فارسی کوڕی موبذان کە لە گوندێکی ئێران لە دایك دەبێ و لە بەندایەتیەوە بەرەو بەندایەتی و لە بێگاریەوە بەرەو بێگاری رادەگوێزرێتەوە؛ لە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی فارسەکاندا کە تا دوێنی کەساس و زەبونێك؛ دەبێتە فەرمانڕەوا و لەمەش سەیرمێنتر؛ خۆی لێنەگۆڕاو هەر سەلمانی زاهید و دەستکورتی جاران بو، خەڵك دەیاندی لە کوخێك دەژی و بەشانی خۆی کۆڵ هەڵدەگرێ.

بیلالی حەبەشی، ڕێزو پلەیەکی وا پەیدا دەکا فەرمانڕەوای بڕواداران - عومەری کوڕی خەتتاب- نازناوی (گەورە)ی پێ ببەخشێ.

سالمی ئازادکراوی ئەبوحوذەیفە هێند شایان و لێهاتو دەبێ، تەنانەت عومەر لە بارەیەوە دەڵێ: ئەگەر زندو بوایە لە دوای خۆمدا دەمکردە جێنشین.

زەیدی کوڕی حاریثە لە جەنگی موئتەدا دەبێتە سەرلەشکری موسڵمانان کە جەعفەری کوڕی ئەبا طالب و خالیدی کوڕی وەلیدیشی تێدایە، ئوسامەی کوڕیشی سەرکردایەتی لەشکرێك دەکات کە ئەبوبەکر و عومەری تێدایە.

ئەبوذەر و میقدادو ئەبودەرداء و عەماری کوڕی یاسر و موعاذی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب؛ شنەبای ئیسلامیان لەسەر دەست هەڵدەکاو دەبن بە زاهیدی بێوێنە و زانای فرەزان.

عەلی کوڕی ئەباتالیب و خاتو عائیشەو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و زەیدی کوڕی ثابت و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس لە ئامێزی پێغەمبەری ﷺ نەخوێندەواردا دەبن بە زانای جیهانی و زانستیان لێ دەبارێ و پەند و ئامۆژگارییان لەسەر زاردا دەپشکوێ، دەبن بە خاوەنی چاکترین دڵ و قوڵترین

زانستو ئێسکسوکترین کەسێتیان لێ‌دەردەچێ، کە دەدوان رۆژگار بێدەنگ دەبو، کە وتاریان دەدا خامەی مێژو دەینوسیەوە.

## کۆمەڵە مرۆڤێکی هاوسەنگ:

ئەم کەرستە خاوە پەرش و بڵاوەی کە نەتەوە هاوچەرخەکان بە بێنرخیان دەزانیو وڵاتانی دراوسێ گاڵتەیان پێدەهات، هێندەی نەبرد جیهانی شارستان کۆمەڵە مرۆڤێکی وای لێ بەدی کردن کە لە مێژودا وێنەی نەبێ، کە وەك ئاڵقەیەکی داخراو بون و هیچ سەرێکی کراوە نەبو، وەك باران بون و دیارنەبو خێروبێر لە سەرەتاکەی دایە یان لە کۆتاکەی، کۆمەڵێك بون لە گشت لایەنەکانی مرۆڤایەتیدا متمانەی تەواویان لەسەر خۆ بو.

کۆمەڵێك بون کە لە جیهان بێنیاز بون بەڵام جیهان نەیدەتوانی لێیان بێنیاز بێ، توانیان ژیاری خۆیان بنیات نێن و حکومەتێك دامەزرێنن، هەرچەندە لەم بارەوە بێئەزمون بون بەڵام ناچار نەبون پیاو لە گەلانیتر بخوازن یان بۆ بەڕێوەبردنی حکومەتەکەیان پشت بە حکومەتیتر ببەستن، حکومەتێکیان دامەزراند باڵی بەسەر روبەرێکی بەرفرەوانی دو کیشوەری مەزندا درێژ دەبوەوە، کاریان بە پیاوی وا دەسپارد کە دیندار و کارامە و خاوەن تواناو دەستی پاك بن. ئەم حکومەتە بەرفرەوانو پەلوپۆ راکشاو و هەڵکشاوە لەسەر دەستی ئەم نەتەوە تازە پەیدابوەدا بە تێکۆشان و بەرگریو خەباتی چەند گرێ ساڵێك و بە شانو باڵی پیاوانی بەدەستوبرد و کارامەوە دامەزرا، کە فەرمانەدەی دادگەر و خەزێنەداری دەسپاكو دادوەری دادپەروەر و سەرکردەی خواپەرستو کاربەدەستی لەخواترس و سەربازی بە تەقوایان تێدابو.

ئەم حکومەتە بە سای پەروەردەی بەردەوامی ئاینییانە و بەسای بانگەوازی بێوچانی ئیسلامیەوە؛ بو بە کانیاوێك وشك نەکاتو ئاسەواری نەبڕێتەوە، چونکە پشتی بە پیاوگەلێکی وا دەبەست کە لایەنی رێنوێنیان بەسەر لایەنی باجەستێنی هەڵدەبژارد و خاوەنی کاری چاكو کارامەیی بون، ئالێرەدا ژیاری ئیسلامی بە رواڵەتی راستەقینەی خۆی وەدەرکەوت و ژینی ئاینی بە

تایبەتمەندیەكانیەوە هاتە ئارا كە سەردەمێك بو لە مێـژوی مرۆڤایەتیـەوە دابـڕا بو.

موحەممـەد ﷺ كلیلـی پێغەمبەرایـەتی خـسـتە سـەر قـوفڵی سـروشتی مرۆڤایەتی بۆیە گشـت گەنجینەو سەمەرە و هێزو بـەهرەكانی والآ بـو، جـەرگی نەفامێتی ئەنگاوتو لەناوی برد و، بە پشتیوانی خوا جیهانی سەركەش و لاملی ناچار كـرد روڕەوتێكـی نـوێ بگرێتـە بـەر و دەرگـای سـەردەمێكی بەختـەوەر بكاتەوە، كە ئەویش سەردەمی ئیسـلامی بو كە بەردەوام لە روخـساری مێـژودا دەدرەوشـێتەوە.



**بەندی یەکەم**

# ڕۆژگاری سەرکردایەتی ئیسلامی

## پێشەوا موسڵمانەکان و تایبەتمەندیەکانیان:

موسڵمانان وەدەرکەوتن و بونە سەرکردەی جیهان و نەتەوە نەخۆشەکانیان لە ڕابەرێتی جیهان دابڕاند که مرۆڤایەتیان دەچەوساندەوە و ستەمیان لێ دەکردن. تەکانیان بە مرۆڤایەتی دا و هەنگاوی هاوسەنگ و دادگەرانەیان پێ هەڵگرتن، ئەمەش چونکە هەمو ئەو سیفەتە سەرکردەییانەیان لێ وەدی هاتبو کە ئازادی و ئاسودەیی بۆ مرۆڤایەتی دابین دەکەن.

**یەکەم**: موسڵمانەکان خاوەن پەیامێکی ئاسمانی و شەریعەتێکی خوایی بون و لەخۆیانەوە یاساو ڕێوشوێنیان دانەدەڕشت، چونکە ئەمە کانگەی نەزانی و هەڵەو ستەمکاریە، لە ڕەوشت و ئاکار و بەڕێوەبردنی کار و ڕەفتارکردن لەگەڵ خەڵکدا بە ڕەمەکی[1] پەلیان نە دەکوتا ، خوا ڕوناکی بۆناردبون تا ڕێی ڕاستی پێ وەدی بکەن و شەریعەتی بۆ ڕەوانە کردبون تا حوکمی خەڵکانی پێ بکەن: ﴿أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا: ئایا کەسێك مردبێ و پاشان زندومان کردبێتەوە و روناکیمان پێ دابێ تا لە نێو خەڵکدا ڕێ ڕۆشن بێ، وەك کەسێکە لە تاریکی دابێت و دەربازی نەبێت.﴾ الانعام:١٢٢، هەروەها دەفەرموێ : ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ: بڕواداران ! لە پێناو خوادا دادگەرانە حوکم لە نێو خەڵکدا بکەن ، ڕکبونەوەتان لە کەسێك

(١) ڕەمەکی: عشوائي.

وا نەکا دادگەر نەبن دادگەر بن، داد لە تەقوا نزیکترە، لە خوا بترسن، خوا لە کردارتان ئاگادارە.﴾المائدة : ٨.

**دووەم:** موسڵمانەکان بە پێچەوانەی زۆربەی گەل و تاك و کاربەدەستانی ئەمڕۆ و پێشان بەبێ پەروەردەکردنی ڕەوشت و پاککردنەوەی دەرون حوکمیان نەگرتۆتە دەست، بەڵکو ماوەیەکی درێژ لە ژێر پەروەردە و سەرپەرشتیکردنێکی وردی موحەمەد ﷺدابون ، پاکی دەکردنەوە و داب و ڕەوشتی فێر دەکردن و، ڕێوشوێنی بۆ دەکێشان تا لە خوا بترسن و داوێنپاك و دەستپاك و لە خۆبوردە و خۆنەویست بن و هەڵپە بۆ پلە و پایە نەکەن و چاوی تێ نەبڕن ، دەیفەرمو: ((إنّا والله لا نُوَلّي هذا العملَ أحداً سألَهَ ، أو أحداً حَرَصَ عَليه[1]: سوێند بە خوا کاربەدەستێتی بەیەکێك ناسپێرین خۆی بیخوازی یان هەڵپەی بۆ بکات)). هەمیشە ئەم ئایەتەی گوێبیست دەکردن کە دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ الدَّارُ الآخِـرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لاَ يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الأَرْضِ وَلاَ فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ: ڕۆژی دوایی بۆ کەسانێکە کە لە سەر زەویدا لوتبەرزی و خراپەکاری ناخوازن، سەرەنجامیش بۆ لە خوا ترسانە﴾القصص:٨٣ ، موسڵمانەکان بۆ پلە و پایە و کاربەدەستێتی هەڵپەیان نەدەکرد و وەك ئەشقی پەروانە بۆ ڕوناکی ئەشقی نەبون. نەك بڵێی پارە و پولی لە پێناودا ببەخشن یان پڕو پاگەندە بۆ چاك و لێهاتویی خۆیان بکەن تا هەڵبژێردرێن بەڵکو بەهەمو جۆرێك هەوڵیان دەدا هەڵنەبژێردرێن و کاریان نەخرێتە ئەستۆ ، کە کارێکیان پێ دەسپێردرا بە دەسکەوت و قازانجی هەوڵدان و ئەنجامی ماڵبەخشینیان نەدەزانی بەڵکو پێیان وابو ئەمانەتێکە دەخرێتە ئەستۆیان و تاقیکردنەوەیەکە لە لایەن خواوە دێتە ڕێیان ، سوری دەیانزانی لەلای خواوە لە گەورە و بچوکان پرسیاریان لێ دەکرێتەوە ، هەردەم یادی وتەی خوایان دەکردەوە کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّـهَ يَـأْمُرُكُمْ أَنْ تُـؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ: خوا فەرمانتان پێ دەکا ئەمانەت بدەنەوە خاوەنی خۆی ، ئەگەر حوکمیشتان لە نێوان خەڵکدا

---

(١) متفق عليه

کرد دادگەرانە بێ﴾النساء:٥٨، ﴿ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلائِفَ الأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ : خوا ئێوەی لەسەر زەویدا کردۆتە جێنشین و هەندێکتانیشی بەچەند پلەیەك بەرزتر کردۆتەوە ، تا تاقیتان بکاتەوە﴾الأنعام:١٦٥.

**سێیەم:** موسڵمانەکان خزمەتکاری ڕەگەزێك و ئازادیخوازی گەلێك یان نیشتیمانێك نەبون و بۆ بەرژەوەندی و خۆشگوزەرانی گەل و نیشتیمانێکی دیاریکراویش تێنەدەکۆشان و بڕوایان بەوە نەبو گەل و نیشتیمانێك بەسەر نیشتمان و گەلانیتر زاڵ بکەن ، چونکە دەیانزانی بۆ ئەوە بەدیهێنراون تا فەرمانڕەوایی بەسەر گشت مرۆڤایەتیدا بکەن، نەك تا ئیمپراتۆریەتێکی عەرەبی دامەزرێنن، جا لەبەر سێبەریدا ڕاببوێرن و لە ژێر ڕکێفیدا ناز و فیزان رابنوێنن و خۆ لە خەڵکی بەبەرزتر هەڵببوێرن، دەیانزانی بۆ ئەوە هەڵنەبژێردراون خەڵك لە ژێر حوکمی فارس و ڕۆم دەرباز بکەن و بیانخەنە ژێر حوکمی عەرەبان و حوکمی ژێردەستەی خۆیانەوە. بەڵکو بۆ ئەوە هەڵبژێردراون تا خەڵك لە هەمو جۆرە مرۆڤپەرستیەکەوە بەرەو خوا پەرستی ڕزگار بکەن. وەك ریبعی کوڕی عامر -شاندی موسوڵمانەکان- لە دیوەخانی یەزدی گوردیدا گوتی : ((خوا ناردوینی تاخەڵك لە بەندە پەرستیەوە بەرەو یەکخواپەرستی، لە ناخۆشی دنیاوە بۆ خۆشیەکەی، لە ستەمی ئاینەکانەوە بۆ دادی ئیسلام ڕزگار بکەین))[1]، گشت گەل و خەڵکانی سەرزەویان لە لادا وەکو یەك بو، خەڵك گشتی لەئادەم بو، ئادەمیش لەگڵ بو، عەرەب ڕێزی پتری بەسەر عەجەمدا نەبو، عەجەمیش هەروا، مەگەر بەتەقوا: ﴿ يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ : هۆ خەڵکینە ! ئێوەمان لە ژن و پیاوێك بەدیهێناوە، پاشان چەندین گەل و هۆزمان لێ پەیدا کردون بۆ ئەوەی لەگەڵ یەکتر ئاشنا بن، ئەو کەسەتان لەلای خوادا ڕێزی زیاتری هەیە کەخاوەنی تەقوایەکی زیاترە﴾الحجرات:١٣[2].

---

(١) البداية والنهاية، لابن كثير .

(٢) بەشێکە لە وتارەکەی حەجی ماڵئاوایی پێغەمبەرﷺ .

عەمری کوڕی عاص کە لە میسر والی بو، جارێك کوڕێکی زللەیەك لە پیاوێکی خەڵکی میسر دەدات و دەڵێ ((دەبخۆ لە کوڕی هەردو بەڕێزانەوە بخۆ)) شانازی بە باوانی دەکات، عومەری کوڕی خەتتاب تۆڵە بۆ کابرای میسری وەردەگرێتەوە و بەعەمر دەڵێ: ((کەنگێ خەڵکتان کردۆتە کۆیلە لە کاتێکدا کە بە ئازادی هاتونەتە دنیاوە؟!)).[٣] موسڵمانەکان لە ڕوی ئاین و زانست و پەروەردەدا لەگەڵ هیچ کەسێك پیسکەییان[١] نەنواندوە و لە پلەوپایە و کاربەدەستیدا تەماشای ڕەنگ و ڕەچەڵەك و نیشتیمانیان نەکردوە، بەڵکو وەك هەوری بەبەرەکەت بارانیان لە سەرتاسەری وڵات و بە سەر گشت خەڵکی داباراندوە، جا خاك و خەڵکەکەش بە گوێرەی لە بار و نالەباری خۆیانەوە بەهرەیان وەرگرتوە[٤].

گەل و نەتەوەکانی سەر ڕوی زەوی-تەنانەت ئەوانەش کە هەر لە دێرینەوە چەوساوە بون-، لە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی ئەو موسوڵمانانەدا توانیان بەشی خۆیان لە ئاین و ڕەوشت و پەروەردە و دەسەڵات وەربگرن و لەگەڵ عەرەب دەست لە ناو دەست جیهانی نوێ بنیات بنێن، بەڵکو زۆر کەس لە گەلانی دنیا لە گەلێك بابەتدا لە عەرەبەکانیشیان تێپەڕاندبو، پێشەواو فەقیە و فەرمودەناسی وایان تێدا هەڵکەوت کە بۆ عەرەب و سەرجەم موسوڵمانانیش وەك تاجی سەر

---

(٣) تەواوی ئەم ڕوداوە لە (تأريخ عمر بن الخطاب) ی (ابن الجوزي)دا هەیە .

(١) پیسکەیی: ڕەزیلی، بخل.

(٤) ئەبو موسای ئەشعەری ـ خوا لێی ڕازی بێ لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی : ((ئەو ڕێنوێنی و زانستەی خوا بە منیدا هەناردوە وەك بارانێکی زۆر وایە بە سەر خاکێکدا بباری، خاکەکە بەشێکی پاك و بە پیز بێ و باراناوەکە بگرێتەوە خۆی و لەوەڕ و گیایەکی زۆری پێ سەوز بێ. بەشێکیتری ڕەقەن و ڕوتەن بێ و سەوزایی نەڕوێنێ، بەڵام ئاوەکە قوت نەداتەوە بەڵکو گلی بداتەوەو ببێ بە ئەستێڕ و گۆماو و خوا بیکاتە مایەی خێروخۆشی خەڵك، بە جۆرێك هەم خۆیان لێی بخۆنەوە هەم ئاژەڵ و مەڕو ماڵاتی پێ ئاو بدەن هەم کشتوکاڵیشی لە بەردا بکەن. بە شێکیتری شۆرەکات بێ نە ئاو گل بداتەوە نە لەوەڕیش بروێنێ، ئەم خاك و بارانە نمونەیەکە بۆ ئەو کەسانەی خوا لە دین شارەزای کردون و خۆیان و خەڵکی پێ بەهرەمەند دەکەن و، بۆ ئەوانەش وێنەیەکە کە بەم ئیسلامە سەربەرز نابن و ڕێنوێنی خوا وەرناگرن)) بوخاری گێڕاویەتیەوە .

بن، تەنانەت ئیبنو خەلدون گوتویەتی : ((سەیرە! لە نەتەوەی ئیسلامیدا ئەو کەسانەی ئالآی زانستیان هەڵگرتوە، جا چ لە بواری زانستی شەرعیدا بوبێ چ لە بواری زانستی ئاوەزیدا بوبێ، کەمێکیان نەبێ ئەگینا زۆربەیان عەجەمن، جا ئەگەر عەرەبیشیان تێدا بوبێ یان ئەوەتە زمانەکەی یان پەروەردەکار و مامۆستاکەی عەجەم بوە، لە کاتێکدا دینەکە بە زمانی عەرەبیە و پێغەمبەرەکەشی عەرەب بوە))[1]. لە نێو گەلانی سەردەمی ئیسلامیدا گەلێك سەرکردەو پاشاو وەزیر و خانەدانی وا هەڵکەوتون کە لە ڕوی چاکەکاری و مەردایەتی و بلیمەتی و ئاینداری و پیاوەتیدا سەرتۆپی مرۆڤایەتی و خان و میرکوڕی جیهانن و وەك ئەستێرە بە ئاسمانی زەویدا دەبریسکێنەوە.

**چوارەم:** مرۆڤ جەستەو گیانە، دڵ و ئاوەزە[1]، سۆز و کۆئەندامە[2]، تا هەمو ئەو هێزانە بە هەماهەنگی نەشونما نەکەن و تێشوی چاکیان دەرخوارد نەدرێ، مرۆڤ هەرگیز ڕزگار و بەختەوەر نابێ و بە هاوسەنگی پێش ناکەوێ. تا نێوەندێکی ئاینی و ڕەوشتی و ئاوەزی و جەستەیی نەیەتە ئارا مرۆڤ تێیدا بتوانێ بە کام و چڵەپۆپەی مرۆڤایەتی خۆی بگات؛ هەرگیز ژیارێکی چاکخواز و راستەڕێ نایەتەدی . ئەزمونیش سەلماندویەتی کاتێك ئەمانە دێنە دی کە سەرکردایەتی ژیان و بەڕێوەبردنی سەوڵی ژیار بەدەست کەسانێك بێ کە بڕوایان بە گیان و مادده هەبێ و لە ژیانی ئاینی و ڕەوشتیدا پێشەنگی تەواو بن و خاوەنی ئارەزوی ساغ و بە فام بن و لە زانستی ڕاست و سودبەخشدا بەهرەدار بن، چونکە ئەگەر لە بیروباوەڕ و پەروەردەدا کەموکوڕییان تێدا بێ لە ژیارەکەشدا ڕەنگ دەداتەوە و کەموکوڕیەکە تەشەنە دەکات و بە زۆر دیاردە و لە زۆر شێوەدا دەردەکەوێ.

---

(١) المقدمة، ل ٤٩٩ .

(١) ئاوەز: عەقڵ.

(٢) کۆئەندام: کۆمەڵە ئەندامەکانی لەش.

ئەگەر کۆمەڵێك زاڵ بن کە تەنها ماددە و چێژ و قازانجی بەرهەست[1] بپەرستن و تەنها بڕوایان بەم ژیانە هەبێ و بڕوایان بە سەروی هەست نەبێ، هەڵبەت شەقڵ و سروشت و ڕێبیر و ئارەزوەکانیان کار لە چۆنیەتی و شێوەی ژیارەکە دەکات و بە مۆرکی ئەوان کەسان مۆرك دەگرێ و بە شەقڵی وان نەخش دێنێ، لە هەندێ لایەنی مرۆڤایەتیدا دەگاتە لوتکە و لە لایەنی گرنگتریشدا تێکدەشێوێ، ئەم جۆرە ژیارە لە بواری گەچ و کەرپوچ و کاغەز و کوتاڵ و ئاسن و ڕەساسدا دەبوژێتەوە، لە بواری شەڕو شەڕگەدا پێش دەکەوێ، لە بواری دادگا و رابوردنگە و مەکۆی[2] بەدکاریدا بەرفرەوان دەبێ، بەلاّم لایەنی دڵ و گیانی دەمرێ و پەیوەندی نێوان ژن و مێرد و باوك و کوڕ و کوڕ و کوڕ و برا و برا و برادەر و برادەر لاواز و لەرزۆك دەبێ ، ژیارەکە وەك جەستەیەکی قەبە و هەلاّوساوی لێدێ ، چاو ئەگەر ببینێ سام و شەرمی لێدەکات کەچی هەناوەکەی پڕ لە ژان و ژوارە و تەندروستیەکەشی پەرێشان و پەشۆکاوە .

ئەگەر کۆمەڵێك زاڵ بن بڕوایان بە لایەنی ماددی نەبێ یان فەرامۆشی بکەن و تەنها گرنگی بە گیان و سەروی هەست و سروشتەوە بدەن و دژایەتی لەگەڵ ژیاندا بکەن، ئەوا گوڵی ژیار دەژاکێ[3] و هێزی مرۆڤایەتی لاواز دەبێ، خەڵکەکە -بە کاریگەری ئەم جۆرە سەرکردایەتیەوە- ژیانی بیابان و چۆڵەوانی بەسەر ژیانی نێو شاردا هەڵدەبژێرن، پێیان خۆشتر دەبێ تەنیا بن و لە ژیانی ژن و مێردایەتی وەدور بن، جەستەی خۆیان دەخەنە بەر ئازار و ئەشکەنجەوە تا بەڵکو دەسەلاّتی جەستە لاواز بێت و گیانیش پتر پاك بێتەوە ، مردنیان پێ لە ژین باشتر دەبێ تا لە جیهانی ماددەوە بەرەو جیهانی گیان بگوازنەوە و لەوێدا بە پلەی تەواوێتی بگەن!، چونکە پێیان وایە پلەی تەواوێتی لە جیهانی ماددەدا نایەتەدی؛ لە ئەنجامدا ژیارەکە دێتە سەرەمەگ و ئاوزینگ دەدا، شارستانێتی وێران دەبێ و شیرازەی ژیانیش شپرزە دەبێ.

---

(١) بەرهەست: محسوس.

(٢) مەکۆ: شوێنی کۆبونەوە.

(٣) ژاکان: سیس بون.

جا چونکە ئەم ڕێوشوێنە دژی ڕێختی مرۆڤایەتیە بۆیە هێندە نابات شۆڕشی لە دژدا بەرپا دەکرێ و بە ماددیەتێکی ئاژەڵانەی وا تۆڵەی لێ وەردەگیرێتەوە کە تروسکەی گیان و خورەوشتی تێدا نەبێ ، ئیتر مرۆڤایەتی دادەشکێ و ژیانێکی ئاژەڵانەی کێویانەی دوچار دەبێ و لە مرۆڤایەتیەکەی دادەشۆرێ. یان کۆمەڵێکی بە هێزی ماددەپەرست هێرش دەبەنە سەر ئەو کۆمەڵە ڕەبەنە و ئەوانیش لەبەر سروشتە نەرم و لاوازەکەیان ناتوانن بەرگری بکەن و ناچار ملکەچیان دەبن و خۆیان بەدەستەوە دەدەن یان ڕەنگە کۆمەڵەکە هەر خۆی -لەبەر ئەو ئاستەنگانەی[1] لە چارەسەرکردنی کاروباری دنیادا دێتە ڕێیان- دەستپێشخەری بکەن و کۆمەك لە ماددیەت و ماددەپەرستان بخوازن و کاروباری ڕامیارییان پێ بسپێرن و خۆشیان خەریکی پەرستنکاری[2] و باو و نەریتی ئاینی بن؛ بەمجۆرە دین لەسیاسەت جوێ دەبێتەوە و لایەنی گیان و ڕەوشت دەپوکێتەوە و سێبەری کورت دەبێتەوە و دەسەلاتی بەسەر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و ژیانی زانستیدا نامێنێ، تا ئەوەی دەبێتە سامۆتك[3] و خەیاڵێك یان وەك تیۆرێکی زانستی بێ کاریگەری لێدێت و ژیانیش دەبێتە ماددەپەرستیەکی پەتی.

لە مێژودا کەم جار بوە کۆمەڵێك سەرکردایەتی مرۆڤیان گرتبێتە دەست لەم کەموکورتیانە بێبەش بوبن؛ بۆیە مرۆڤایەتی هەمیشە لە نێوان ماددەپەرستیەکی ئاژەڵانە و گیان پەرستیەکی ڕەبەنانەدا سەنگ و سوك بوە و هەردەم باری شلەژاوە.

بەڵام یاوەرنی پێغەمبەرﷺ بەوە جوێ دەبنەوە کە لایەنی ئاین و ڕەوشت و لایەنی هێز و ڕامیارییان بەیەکەوە کۆ کردبوەوە، گشت لایەنێکی مرۆڤایەتیان لێ هاتبوە دی، سیفەتە چاك و جۆراوجۆرەکانی سەرکردایەتیان تێدابو. بەهۆی پەروەردە گیانی و ڕەوشتیە هاوسەنگەکەیانەوە کە مرۆڤ کەمجار توانیوێتی دابینی بکات ، هەروەها بە هۆی کۆکردنەوەی بەرژوەندیەکانی گیان و جەستە و،

---

(١) ئاستەنگ: صعوبات.

(٢) پەرستنکاری: عبادات.

(٣) سامۆتك: شبح.

خۆ ئامادەکردنی تەواوی ماددی و هەبونی ئاوەزێکی بەرفراوانەوە؛ توانییان مرۆڤایەتی بەرەو لوتکەی هەرە بەرزی گیان و ڕەوشت و ماددە ببەن.

## ڕۆژگاری خەلافەتی ڕاشید ژیارێکی چاکی نواند:

لە گشت لایەنەکانی مێژودا نەمانزانیوە ڕۆژگارێك هەبوبێ لە ڕۆژگاری خەلافەتی ڕاشید تەواوتر و جوانتر و گەشاوەتر بوبێ ، لەم ڕۆژگارەدا هێزی گیان و ڕەوشت ئاین و زانست و کەلوپەلە ماددیەکان هەموی بەیەکەوە مرۆڤی تەواویان بنیات دەنا و ژیاری چاکیان رادەنا.

حکومەتێك بو لە حکومەتە هەرە گەورەکانی جیهان و خاوەن گەورەترین هێز و سیاسەتی سەردەمی خۆی بو، ڕەوشتی بەرزی تێدا بەربلاو بو ، پێودانی[1] ڕەوشتی چاك ژینی خەڵك و سیستەمی حوکمی هەڵدەسوڕاند، ڕەوشت و چاکەکاری هاوشانی بازرگانی و پیشەسازی دەگەشایەوە ، لەگەڵ پەرەسەندنی ڕەوشت و حاڵەتی گیان ئامێزدا فتوحات و ژیاریش بەرفراوانتر دەبون ، ژمارەی کەتن[2] و تاوانکاری بە گوێرەی ڕوبەری وڵات و ژمارەی دانشتوان لە دابەزین دابو هەرچەندە هۆکاریش لە بەر دەست بون ببنە مایەی تاوانکاری، پەیوەندی نێوان تاك بۆ تاك و تاك بۆ کۆمەڵ و کۆمەڵ بۆ تاك لە چاکی دابو . ڕۆژگارێك بو لەوپەڕی تەواوێتی بو، مرۆڤ خەونی بە ڕۆژگارێکی پێشکەوتوتر نەبینیوە و خەیاڵی بۆ ڕۆژگارێکی گەشاوەتر نەڕۆییوە، هەڵبەت ئەم ڕۆژگارەش بە سایەی سەری ئەو پیاوە جوامێر و مەردانەوە هاتە دی کە بەهۆی بیروباوەڕی پاك و ڕەفتاری چاك و بە پەروەردەی جوان و بە تەگبیری سەرکەوتوانەوە دەبونە کاربەدەست و وڵاتیان بەڕێوە دەبرد و سەرپەرشتی خەڵکیان دەکرد و لە هەر کوێ بونایە خاوەنی دین و خوڕەوشتی بەرز بون ، ئەگەر فەرمانڕەوا بونایە یان بەرفەرمان ، ئەگەر چاودێر بونایە یان سەرباز هەر دەسپاك و لە خواترس و

(١) پێودان: معیار.
(٢) کەتن: جنایە.

بێدەعیە بون.

پیرێکی گەورەی ڕۆمەکان وەسفی جەنگاوەرە موسڵمانەکان دەکات و دەڵێ: ((بە شەو نوێژان دەکەن و بەڕۆژ بە ڕۆژو دەبن، پەیمان ناشکێنن، فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگە لە خراپە دەگرن، لە نێو خۆدا یەکسانن و کەس مافی کەس پێ شێل ناکات ))[1]، یەکێکی تر گوتویەتی : (( بە رۆژ سوار چاکی مەیدانن ، بە شەو خواپەرستی بێوچانن، بە بێنرخ هیچ شتێك لە خەڵکی پەیماندار ناخۆن ، بچنە ناو هەر شارێك کە فەتحی دەکەن ستەم ناکەن و سەلامەتن ، لە شەڕدا تا بەسەر دوژمندا زاڵ نەبن واز ناهێنن ))[2]. یەکێکی تر گوتویەتی : ((لە شەودا خواپەرستن، لە ڕۆژدا سوارچاکن، هەمیشە بۆ شەڕ ئامادەن ، تیر و کەوان دروست دەکەن ، رم مشتوماڵ دەکەن ، بە جۆرێك بە دەنگی بەرز قورئان دەخوێنن و یادی خوا دەکەن ئەگەر دەگەڵ تەنیشتەکەشت بدوێی لێت تێناگات))[3].

سەربازی وا هەبوە لە فەتحی مەدائیندا تاج و فەرشەکەی کیسرای وەچنگ کەوتوە، کە نرخیان سەدان هەزار دینار بوە، کەچی بەدڵ نەیخواستوە و دەستی گزی بۆ درێژ نەکردوە، بەڵکو وەك سای غەنیمەتەکان بۆ لای فەرماندەکەی بردوە، ئەویش یەکسەر بۆ خەلیفەی ناردوە، خەلیفە کە ئەمەی بیستوە، سەرسامی دایگرتوە و پڕ بە دڵ ئەم وتەیەی لە بارەوە دەربڕیوە: بەڕاستی ئەو کەسانی ئەمانەیان ناردوە مرۆی دەست پاك و دڵ پاکن[4].

## کاریگەری پێشەوایەتی ئیسلامی لەسەر ژیانی گشتیدا :

یاوەرانی محمد ﷺ شایەن بون کە مرۆڤایەتی لە بەر سێبەر و لە ژێر حوکمیاندا ئاسودە بن و هەنگاوی ڕاست هەڵگرن و لەسەر ڕێی ڕاست ڕێ ببڕن و مەبەستی دروست وەرگرن ، شایەن بون جیهان ئاوەدان و دڵنیا بکەنەوە و زەوی

---

(١) رواه احمد بن مروان المالكي في المجالسة.

(٢) البداية والنهاية : ٥٣/٧ .

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشو : ١٦/٧ .

(٤) سيرة عمر بن الخطاب، لابن الجوزي .

لە خێر و بەرەکەت تەژی بکەن ، چونکە باشترین کەس بون بیپارێزن و بەرژەوەندی بۆ دابین بکەن، وەك سندوقێکی ئاسن یان وەك کۆتی گەردن لە ژیانیان نەدەڕوانی تا دژایەتی بکەن و تێکی بشکێنن، وەك تاکە دەرفەتێکی ڕابواردن و خۆشگوزەرانی و کەیف و سەفا سەیریان نەدەکرد تا هەڵیقۆزنەوە و ئاوێزانی بن و کاتی لیَ بەفیڕۆ بدەن و دەست بۆ گشت خۆشیەك ببەن، ژیانیان بە ئەشکەنجە و سزای تاوان دانەدەنا تا خۆیان لیَ ڕزگار بکەن.

وەك خوانێکی تێر و تەسەل لە دنیایان نە دەڕوانی تا خۆیان لە سەر بەکوشت بدەن ، وەك تالاَن سەیری گەنجینە و خێر و بێری زەمینیان نەدەکرد تا شەڕ و کوشتاری لەسەر بەرپا بکەن ، نەتەوەی غەریب و لاوازیان پیَ نێچیری بیَ پێی بەستەزمان نەبو تا ڕاو و شکاری بکەن . بەڵکو پێیان وابو ژیان بەخششێکی خواییە و سەرچاوەی سەرجەم خێر و بێر و گشت چاکەیەکی ڕەوایە ، بۆ ئەوەیە تا لە خوا نزیك ببنەوە و بگەن بە چلەبەنانی[1] مرۆڤایەتی کە خوا وای بۆ داناون ، پێیان وابو تاکە دەرفەتێکی تێکۆشان و هەوڵدانە و دەرفەتیَتری بەدوا نایە: ﴿ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً: خوا ئەو خوایەیە کە مردن و ژیانی بەدیهێناوە تا تاقیتان بکاتەوە ئاخۆ کامتان کردەوەی چاکتر دەکەن. ﴾الملك:٢ و ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الأَرْضِ زِينَةً لَهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً: هەرچی لەسەر زەویدا هەیە وەك ئارایش و جوانی فەراهەممان هێناون، تا مرۆڤی پیَ تاقی بکەینەوە ئاخۆ کامیان کردەوەی چاکتر دەکات. ﴾الکهف:٧.

پێیان وابو ئەم جیهانە موڵکی خوایەو ئەوان تێیدا جێنشینن . یەکەم لەو ڕوەی کە لە بنەڕەتدا خوا مرۆڤی بەجێنشین بەدیهێناوە وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً: من لەسەر زەویدا جێنشینێك دادەنێم. ﴾البقرة :٣٠، ﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا: خوا هەرچی لە زەویدا هەیە گشتی بۆ ئێوە بەدیهێناوە﴾البقرة : ٢٩ ، ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنْ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً:

(١) چلەبەنان: هەرەت، لوتکە.

ڕێزمان لە ئادەمیزاد ناوە، توانامان پێداون تا بتوانن لە وشکانی و دەریادا بژین، لە شتی پاك بژێویمان پێداون ، بەسەر گەلێك خەلقیتر پایەدارمان کردون﴾الاسراء : ٧٠.. دوەم لەو ڕوەی کە مرۆڤن و بۆ فەرمان و حوکمی خوا ملکەچ بونە و خواش ئەوانی ڕاسپاردوە تا جڵەوی کاران بەدەست بگرن و سەرپەرشتی خەڵکی بکەن ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمْ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا: خوا بەڵێنی بە هەندێك لە ئێوەی بڕوادار داوە کە کاری چاك دەکەن؛ کاروباری زەمینیان پێ بسپێری وەك بە بڕوادارانی پێشوی سپاردوە و ئاینەکەشیان کە خوا پێی ڕازی بوە سەقامگیر دەکات و پاشان ڕەوشی پڕ ترسیشیان بۆ بەڕەوشێکی ئارام دەگۆڕێ و من دەپەرستن و هاوبەشم بۆ پەیدا ناکەن ﴾النور:٥٥. هەروەها خوا ڕێی پێداون لە خێروبێری زەوی بەهرەمەند بن بەلاَم بەبێ دەستبلاَوی و زێدەڕۆیی: ﴿ يَابَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلاَ تُسْرِفُوا إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ: ئادەمیزادان ! لە کاتی نوێژدا جا لەهەر مزگەوتێکدا بون خۆتان پۆشتە بکەن و بخۆن و بشخۆنەوە بەلاَم دەستبلاَو مەبن ، خوا دەستبلاَوانی خۆش ناوێت﴾ الأعراف :٣١ ، ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِن الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ: بلێ: بێژە کێیە، جلکی جوان و خشڵ و بژێوی پاکژێ-کە خوا بۆ عەبدەکانی خۆی ڕەوا دیوە-لای وایە کە ناڕەوایە؟ بێژە: ئەمانە شایانی ئەو کەسانەن کە لە ژیانی دنیادا بڕوایان بەخوا هێناوەو ڕۆژی قیامەتیش هەر تایبەتی خۆیانە﴾الأعراف :٣٢، هەروەها سەرپەرشتایەتی گەلانی سەرزەوی پێ سپاردون و ئەوانی لە ڕەوت و ڕەوش و ڕەوشت و خواستەکانی مرۆڤایەتی بەرپرسیار کردوە . ئەرکیان پێ ڕاسپێردراوە تا گومڕاوان بهێننەوە سەر ڕێی ڕاست و خراپەکاران لە کاری خراپ بگێڕنەوە و لارو وێران ڕێکخەنەوە و درز و کەلێنان پڕکەنەوە و تۆڵە بۆ بێدەسەلاَت و زەبونان وەرگرنەوە و مافی مافخوراوان بستێننەوە و تۆوی دادگەری بڕوێننەوە و ئارام و هێمنی لە

جیهاندا بژیێننەوە ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ: ئێوە بونە باشترین نەتەوەی نێو گەلان چونکە فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگە لە خراپە دەگرن و بڕوا بەخوا دێنن.﴾آل عمـران:١١٠، ﴿يا أيها الذين آمنو كونوا قوامين بالقسط شهداء لله : ئەی بڕواداران ! دادگەرانە شاهێدی لە سەر خەڵك بدەن ﴾ النساء:١٣٥.

زانایەکی موسڵمانی ئەڵمانی وەسفێکی وردی مرۆڤی موسڵمان دەکات و دەڵێ:

(( ئیسلام -وەکو نەسرانیەت- لە ڕوانگەیەکی تاریکەوە ناڕوانێتە جیهان، ئیسلام فێرمان دەکات ژیانی دونیا بە گەورەتر وەرنەگرین و وەکو ژیاری ئێستای ڕۆژئاوا نرخی زیاتری بۆ دانەنێین. دینی مەسیحی بێزاری لە ژیانی سەر زەوی دەردەبڕێ و خۆشی ناوێ، بەلاَم ڕۆژئاوای ئێستا-بە پێچەوانەی روحی نەسرانیەتەوە- گرنگیەکی لە ڕاددەبەدەر بە ژیان دەدات وەك گرنگیدانی ژەمەنبوردە بە خواردن و خواردنەوە ، هەرچەندە ڕێزیشی ناگرێ . کەچی ئیسلام بە ڕێز و بە هێمنیەوە دەڕوانێتە ژیان، ژیان نا پەرستێ بەڵکو بە قۆناغێك دەیناسێنێ کە وەك پردێك بێ بۆ ژیانێکی بالاَتر، جا مادەم قۆناغێکە و بۆ پەڕینەوەیە کەواتە مرۆڤ دەبێ بە ساکاری وەری بگرێ و لە نرخی خۆی نەیباتە دەرەوە.

لە گەشتی ژیاندا چار نیە دەبێ بەو جیهانە راببورین، خوا پێشتر ڕێوشوێنی وا کێشاوە، کەواتە ژیانی مرۆڤایەتی نرخە گەورەکەی خۆی هەیە، بەلاَم نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە ئەم ژیانە وەك ئامراز و پێناوێك[1] وایە و نرخەکەشی بارتەقای خۆیەتی . ئیسلام ڕێگە بەو بیردۆزە ماددیە نادات کە دەڵێ: ((نیشتمانی ژیانی من تەنها ئەم جیهانەیە و هیچی تر))، ڕێگە بە بیردۆزە نەسرانیەکەش نادات کە بە سوك سەیری ژیان دەکا و دەڵێ: ((ئەم جیهانە نیشتمانی ژیانی من نیە )) . ڕێگای ئیسلام ڕێگای ناوەنجی هەردولایە، قورئان

(١) پێناو: واسطة.

ئامۆژگاریمان دەکات بەم جۆرە بپاڕێنەوە:﴿ وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ: هەیانە دەڵێ: خوایە لە دنیا و دواییدا چاکمان پێ ببەخشە و لە سزای ئاگرمان بپارێزە ﴾البقرة:٢٠١.

ئیسلام، ئەم جیهانە نەك هەر بە کۆسپی سەر ڕێی تێکۆشانی بەفەڕی ڕوحی نازانێ، بەڵکو پێشکەوتنی ماددیانەش لە بەر دڵان شیرن دەکات بەڵام بە ئامانجی دانانێ . پێی وایە دەبێ ئامانج لە تێکۆشان ئەوەبێ کە ڕەوشتێکی تاکی و کۆمەڵی وابێتە دی یارمەتی پەرەسەندنی هێزی ڕەوشتیی مرۆڤ بدات و ئەگەر ڕەوشتێکی واش هاتەدی بپارێزرێت.

ئیسلام خەڵك بۆ ئەوە ڕێنوێن دەکات تا لە هەمو کردەوەیەکی گەورە و بچوکدا هەست بە لێپرسراوێتی خوڕەوشتانە بکەن . سیستەمی ئاینیی ئیسلام هەرگیز ڕێگە بە فەرمانێکی وەك ئینجیل نادات کە دەڵێ : ((ئەو شتی بۆ قەیسەرە بیدەن بە قەیسەر و ئەو شتی بۆ خواشە بیدەنە خوا))، چونکە ئیسلام ڕێگە بەوە نادات ژیان بۆ لایەنی ڕەوشتی و لایەنی کرداری دابەش بکرێت . یەك جۆر هەڵبژاردن هەیە یان ڕەوا یان ناڕەوا ، شتێك نیە لە نێوان هەردوکیان بێت . بۆیە ئەوەندە دوپات لەسەر ئەنجامدانی کردەوان دەکاتەوە چونکە بە بەشێکی هاوبەندی[1] ڕەوشتی دەزانێ. لەسەر هەمو موسڵمانێکیش پێویست دەکا خۆی بە بەرپرسی ژینگە و ڕوداوان بزانێ، جیهادیشی لەسەر داناوە تا لە هەمو شوێن و کاتێدا هەق بەرپا بکات و ناهەق لەناو ببات، قورئان دەفەرموێ: ﴿ كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾آلعمران: ١١٠.

ئەمە پاساوە[2] ڕەوشتیەکەی ئیسلامی و فەتحە سەرەتاییەکانی ئیسلامی و ئیستعماری ئیسلامییە، ئەگەر بە ناچاری وشەی ئیستعمار بەکار بێنین بەڵێ ئیسلام ئیستعماریە بەڵام ئیستعماریەکەی بە ئەنگیزەیەکی کەڵەگایی و داگیرکاری و لە پێناو ئابوری نەتەوەیی نیە ، مەبەستی پێشینانی موجاهید تێر

(١) هاوبەند: لازم
(٢) پاساو: مبرر.

و پڕی و گوزەرانی خۆش نەبوە لەسەر شان و باڵی خەڵكانی تر ، بەڵكو تەنها لەو پێناوەدا بوە كە زەمینەیەكی خۆش بۆ مرۆڤ بڕەخسێنن تا بتوانن پەرە بە لایەنی روحی بدەن، وەك ئەوە وایە كە لە ئیسلامدا ئەگەر یەكێك زانستی چاكەكاری بخوێنێ دەبێ كار بە چاكەكانیشی بكات.

ئیسلام هەرگیز لەگەڵ لێكجوێكردنەوەی ئەفلاتونی و تیۆریانەی نێوان چاكە و خراپەدا نیە ، تەنانەت ئەوەشی پێ ناپەسندێكی ناقولایە كە مرۆڤ لە روی تیۆریەوە هەق و ناهەق لێك جوێ بكاتەوە كەچی بۆ سەرخستنی هەق و لە ناوبردنی ناهەق تێنەكۆشێ، چونكە چاكە و هەق وەك ئیسلام وا دەڵێ ئەو كاتە دەژین كە مرۆڤ لە پێناو هێنانەدی دەسەلاتی هەق تێبكۆشێ، ئەو كاتەش دەمرن كە ئەگەر زەبونیان بكات و سەریان نەخات))[١].

## ژیاری ئیسلامی و كاریگەریەكەی لەسەر روڕەوتی مرۆڤایەتیدا:

دەركەوتنی ژیاری ئیسلامی بە روح و ڕواڵەتەكانیەوە و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی بە شێوە و سیستەمەكەیەوە ، كە لەسەدەی یەكەمی كۆچیدا هاتنە ئاراوە پاژێكی[١] نوێ بو لە مێژوی دین و ڕەوشت و دیاردەیەكی تازە بو لە جیهانی ڕامیاری و كۆمەڵایەتیدا، ڕەوتی ژیاری وەچەرخاند و ئاراستەیەكی نوێی بەدنیا گرتە بەر . بانگەوازی ئیسلامی هەر لە دێرینەوەڕا بەردەوام لە سەر دەستی پێغەمبەران ڕاگەیەنراوە و بانگخوازان بڵاویان كردۆتەوە و دڵسۆزانیش لە پێناویدا تێكۆشاون ، بەڵام بانگخوازان لە هیچ ڕۆژگارێكدا وەك ئەم جارە نەیانتوانیوە حكومەتێك لەسەر بنچینە و ڕێوشوێن و بنەڕەتەكانی ئیسلام دامەزرێنن ، نەیانتوانیوە بە شەقڵی ئیسلام و بە پێی بنەماكانی ژیارێك بنیات بنێن ، لە هیچ ڕۆژگارێكدا ئەم بانگەواز و كردوكۆشە وەك ئەم جارە سەركەوتنی وەدەست نەهێناوە كە لەسەر دەستی محمد ﷺ و جێنشینە سەرڕاستەكان

---

(١) Mohammad Asad(Leopold) Islam At the Cross Roads, Fifth Edition,P.٢٩

(١) پاژ: بەند.

هاتوەتە دی.

پشکوتنی ئەم جارەی ئیسلام تەنگ و چەڵەمەیەکی نوێ بو بۆ نەفامی کە پێشتر دەگەڵی ڕانەهاتبو، نەیدەزانی چۆن لێی ڕزگار بێ، پێشتر بانگەوازێکی ئاینیی ڕوحی بینیبو، کەچی ئەم جارە ڕزگاریە، بەختەوەریە، ڕوحە، ماددەیە، گیانە، هێزە، ژیارە، کۆمەڵە، حکومەتە، ڕامیاریە، ئاینێکی لەبەر دڵان شیرینە، ئاوەز بە ئاسانی وەریدەگرێ، سەرتاپای وتەی جوان و بەجێیە و دژ بە ئەفسانە و هزری پڕوپوچی نابەجێیە، پەیامێکی خوایی و سروشێکی ئاسمانیە دژ بە پێودان و ئەزمون و یاساگەری مرۆڤانە، ژیارێکی پایەدار و بونیات بە هێز و بناغە تۆکمەیە ، ڕوحی لە خواترسان و داوێنپاکی و دەستپاکی لەبەر دایە ، تێیدا خوڕەوشتی چاك لە سەروی پارە و پشتە ، گیان لە سەروی ڕواڵەتی پوچە ، خەڵك هەموی یەکسانن ، بە تەقوا لەیەکدی جوێدارن ، خەڵك گرنگی بە ڕۆژی دوایی دەدەن بۆیە دەرونیان ئارام دەبێ و دڵیان پڕ لە ترسی خوا دەبێ و ڕکەبەرایەتی دنیایی و ڕکوکینە و لێك توڕیی کەم دەبێتەوە.

هەمو ئەمانە دژ بە ژیارێکی تێکقژقژاوی شلەژاوی پڕ ڕکوکینە و بنیات لاواز و کۆڵەگە لەرزۆك وەستاون، کە تێیدا گەورە زوڵم لە بچوك دەکات و بەهێز مافی بێهێز دەخوات و لە ڕابواردن و بەدکاریدا پێشبرکێ دەکەن و لە پارە و پشت و خۆشگوزەرانیدا کێبەرکێ دەکەن و دنیاکەی یەك پارچە بۆتە شەڕو شۆڕ و ژیارەکەشی بۆتە دۆزەخی خەڵکی ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنْ الْعَذَابِ الأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُون: جگە لە سزای هەرە گەورە سزای بچوکیشیان پێ دەچێژین تا بەڵکو بۆ لای خوا بگەڕێنەوە ﴾السجدة:٢١.

بانگەوازی ئەم جارە حکومەتێکی دادگەرە و بە یەکسانی لە خەڵك دەڕوانێ، مافی بێهێز لە بەهێزان وەردەگرێتەوە، پاسەوانی خوڕەوشتی خەڵکە وەك چۆن پاسەوانی ماڵ و خانویانە، خوێن و ئابڕویان دەپارێزێ، باشترین کەس بۆتە فەرماندە، زاهیدترین کەس کاری پێ ڕاسپێردراوە و پایەی پێ بەخشراوە .. حکومەتێکە و دژ بە حکومەتێکی پڕبەدکاری و زۆرداری وەستاوە، کە کاربەدەستەکانی گزیکار و ستەمکارن، ماڵی خەڵك دەخۆن و ئابڕویان دەتکێنن

و خوێنیان بە ناهەق دەڕێژن و خوڕەوشتی خەڵك دەشێوێنن، كاربەدەستانی نمونەی خوڕەوشتی خراپن، خراپترینیان بۆتە فەرماندە، ئـاژەڵ و ولـسات و سـەگەكانیان تێرو پڕن بەڵام خەڵكەكەی ژێردەستیان قات و قڕن، خانوەكانیان پۆشتەو پەرداخن بەڵام خەڵكەكە ڕوت و ڕەجاڵن.

خەڵك كە ئەم جیاوازیەی بینی ئیتر كۆسپ و تەگەرەیان لە ئیسلام نەدەبینی و بە ئاسانی ئیسلامیان قـەبوڵ دەكـرد، لـە موسڵمانیـشدا روبـەڕوی ئاسـتەنگ و سەختی نەدەبونـەوە و سـودو بەرژەوەندیـشیان لـە نەفامیـەتی وەدی نـەدەكرد. پیاوێك كە دەهاتە نێو ئیسلام هـیچ شـتێكی نەدەدۆڕانـد و هیـچی لـە دەست نەدەدا، بەڵكو فێنكی ئاوەر و شیرنی بڕوای دەچەشـت و خـۆی لـە نێـو شـكۆی ئیسلام و وڵاتێكی بەهێز دەدۆزیەوە و شانازی پێوە دەكرد، هاوەڵی وای بۆ دەبـو كە بەسەر و ماڵ و گیان بۆی فیدا بن، دەرونێكـی ئـارامی دەرەخـسا و، بـڕوای بەژیانی دوای مەرگ پەیدا دەكرد، بۆیە خەڵك بە ویـستی ئازادانـەی خۆیـان لـە سەربازگەی نەفامێتیەوە بەرەو سەربازگەی ئیسلام دەپەڕینەوە و بەرەبەرە خـاكی نەفامێتی تەسكتر دەبوەوە، وشەی ئیسلامیش هەر بـەرز دەبـو و سێبەرەكەشـی درێژتر دەبوەوە، تا ئەو ڕۆژەی ئاژاوەی نـەفامێتی بڕایـەوە و تـەنها دینـی خـوا مایەوە.

كاریگەری ئەم وەرچەرخانە[1] گەلێك گەورەو مەزن بـو، پێـشتر لـە دەوڵـەتی نەفامێتی و نامۆیەتی ئیسلامدا ڕێی خوا پڕ لە مەترسی و سـەخت و هەڵـەموت بو، كەچی ئێستا ئاسان و ئارام و بێ مەترسیە، پێشتر لـە نێوەنـدی نەفامێتیـدا مرۆڤ زۆر بە زەحمەت دەیتوانی بەرفەرمانی خوا بێ، بـەڵام ئێـستا لـە نێوەنـدی ئیسلامیدا زۆر زەحمەتە بتوانێ نافەرمانی خوا بێ[2]، دوێنـێ بانگـەوازی بـەرەو دۆزەخ دیارو سەرخراو بو كەچی ئەمڕۆ خامۆش و زەبونە، پێشتر هۆكـاری لـەخوا یاخیبون بـە ئاشـكرا بـەربڵاو بـو كەچـی ئـەمڕۆ بەدەگمـەن و نهێنیـە، پێـشتر بانگەوازی بەرەو خوا لە خـاكی خـوا تـاوان بـو ، ڕەنگـە بـەدزیو لـە پـەنایان

(١) وەرچەرخان: انقلاب.

(٢) نافەرمانی: سەرپێچی.

ڕاگەیەنرابوایە ، بەلاَم ئەمڕۆ بەدەنگی بەرز و ئاشکرایە، ئازاد و ئارامە و دڕایەتیەکی ئەوتۆی ناکرێ، ئەمڕۆ بانگخوازان لە پێناو بیروباوەڕو دینی نوێدا وەکو جاران ناترسن دوچاری چەوسانەوە و ئەشکەنجە بن ﴿ تَخَافُونَ أَنْ يَتَخَطَّفَكُمْ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُمْ بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُمْ مِنْ الطَّيِّبَاتِ: لەوە دەترسان خەڵك ڕاتان ڕفێنێ کەچی پاشان خوا داڵدەی دان و سەری خستن و لە شتی پاك بژێوی پێ بەخشین ﴾الأنفال:٢٦، بانگخوازان ئەمڕۆ بەبێ هیچ تەگەرەیەك فەرمان بەچاکە دەکەن و ڕێگە لە خراپە دەگرن.

سروشت و ئاوەزی خەڵك بە هەستکردن و بێ هەستکردن دەگۆڕن و وەك چۆن وەرزی بەهار کار لە سروشتی مرۆڤ و ڕوەك دەکات بە ئیسلام کاریگەر دەبون، دڵە یاخی و وشکەکان بەرەبەرە نەرم دەبون و لە خوا دەترسان، بنەماو هەقیقەتەکانی ئیسلام بە قولاَیی دەروندا دەچونە خوارەوە و پەلوپۆیان بە هەناودا دەهاوێشت، بەهای شتان لە دیدی خەڵك دەگۆڕا، پێودانە کۆنەکانی دەگۆڕان و پێودانی نوێ جێیان دەگرتنەوە، نەفامێتی ببوە بزاڤێکی کۆنەپەرست و هەوڵدان بۆ پاراستنی بە وشکی و گەمژەیی حسێب بو، ئیسلامیش ببوە شتێکی پێشکەوتو و هاوچەرخ، موسڵمانبون و خۆ بە ئیسلام ڕانواندن خانەدانی و کەشخەیی بو، نەتەوەکان بڵێ سەرتاپای زەوی بەرەبەرە لە ئیسلام نزیك دەبوەوە، خەڵکەکە هەستیان نەدەکرد لە ئیسلام نزیك دەبنەوە وەك چۆن گۆی زەوی هەست ناکات بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە، نزیك کەوتنەوەکە لە فەلسەفە و دین و ئەدەب و ژیارەکەیان وەدەردەکەوت، ناخ و ویژدانی دەسمین و دەبوە مایەی سەرهەڵدانی بزاڤی چاکسازیخوازی تەنانەت لە دوای ڕوخانی موسڵمانەکانیش.

ئیسلام یەکخواناسێتی هێنا و بتپەرستی و هاوبەشپەرستێتی نیوەمر کرد، لەو ڕۆژیوەڕا هاوبەشپەرستی لە دیدی هاوبەشپەرستان بێبەها و سوك بو، خۆیان بە شەرمەزار دەزانی و لێی بێبەری دەبون و بە شان و باڵیان هەڵنەدەگوت ، کەچی پێشتر لە پێناو سەرخستنیدا تێدەکۆشان و خۆیان لەسەر بە کوشت دەدا، خەڵکی هەمو دینێك هەوڵیان دەدا هاوبەشپەرستی و دیاردە و باو و نەریتەکانی

خۆیان بە جۆرێك ڕاڤە بکەن و زمانی بۆ خوار بکەنەوە کە لە یەکخواناسیەکەی ئیسلام نزیك بێ و پێی بچێ.

ئوستاد ئەحمەد ئەمین دەڵێ: لە ناو نەسرانیەکاندا زۆر کێشە کە ئاسەواری ئیسلامیان بەسەرەوە دیار بو سەریان هەڵدا، یەکێك لەوانە بزاڤێك بو کە لە سەدەی هەشتەمی زاینیدا واتە لە سەدەی دوەم و سێیەمی کۆچیدا لە سێپتیمانیا[1] سەری هەڵدا و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە نابێ مرۆڤ لە بەردەم قەشەدا ئیعتیراف بە گوناهەکانی بکات و قەشە ئەو مافەی بۆ نیەو مرۆڤ بۆ ڕەشبونەوەی گوناحەکانی دەبێ تەنها لە خوا بپاڕێتەوە، جا چونکە ئیسلام قەشە و ڕەبەن و مالی تێدا نیە ، بۆیە ئیعترافیشی تێدا نابێ)).

بزاڤی تریش سەریان هەڵدا کە بانگەشەی تێکشکاندنی پەیکەر و کۆتەڵە ئاینیەکانیان دەکرد، لە سەدەی هەشتەم و نۆیەمی زاینیدا واتە لە سەدەی سێیەم یان چوارەمدا ڕاڕەوێکی[1] نەسرانی پەیدا بو کە بەپیرۆززانینی وێنە و پەیکەری ڕەت دەکردەوە، ئیمپراتۆری ڕۆمانی (لیو)ی سێیەم لە ساڵی (٧٢٦ز) بڕیاری قەدەغە کردنی بە پیرۆززانینی وێنە و پەیکەری دەرکرد، لە ساڵی (٧٣٠ز) بڕیارێکی تری دەرکرد و ئەم کارەی بە بتپەرستی لە قەڵەم دا، قوستەنتین و (لیو)ی چوارەمیش هەمان هەڵوێستیان هەبو، بەڵام پاپا گریگۆری دوەم و سێیەم و گرمانیۆسی بەتریکی قوستەنتنیە و خانم ئیریسنی ئیمپراتۆر بەرگریان لە پەرستنی وێنە دەکرد و پشتیوانیان بۆ دەردەبڕی، لە نێوان ئەم دو چینەدا کێشەیەکی توندوتیژ پەیدا بو کە لێرەدا ناکرێ باسی بکەین.

هەندێ لە مێژونوسان پێیان وایە بانگەوازەکانی نەهێشتن و تێکشکاندنی وێنە و پەیکەران بە ئیسلام کاریگەر بون ، دەڵێن : کلودیۆس (Cladius) کە لە ساڵی (٨٢٨ ز) کراوەتە ئۆسقوفی (تورین) و وێنە و خاچەکانی دەسوتاند و نەیدەهێشت بپەرسترێن؛ لە ئەندەلوسی ئیسلامیدا لە دایك بوە و گەورە بوەو

(١) موقاطەعەیەکی کۆنی فەرەنسایە دەکەوێتە باشوری ڕۆژئاوای فەرەنسا لە سەر دەریای سپی ناوەڕاست.

(١) ڕاڕەو: مذهب.

هەڵوێستی ئیسلامیش دیارە چۆن دژی وێنە و پەیکەر بوە، بوخاری و موسلیم لە خاتو عائیشەوە دەگێڕنەوە کە دەفەرموێ: ((جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێکدا گەڕایەوەو منیش پەردەیەکم بە پەنجەرەوە هەڵواسیبو وێنەی تێدا بو، کە پەردەکەی دیت پارچە پارچەی کرد و زۆر توڕە بو و ڕەنگی گۆڕا و فەرموی: عائیشە! بە ئێش و ئەشکەنجەترین کەس لە ڕۆژی دواییدا ئەو کەسانەن کە خەڵقی خوا دەشێوێنن. عائیشە دەڵێ: پەردەکەمان کردە چەند پارچەیەك و یەك دو بالیفمان لێ دروست کرد)) فەرمودەی تر لەم بارەوە گەلێ زۆرن.

مێژوناسی بەناوبانگی ئەوروپی بەشێوەیەکی رونتر لە بارەی وێنە و پەیکەری ئاینیەوە دەدوێ و دەڵێ:

((لە کڵێسادا وێنەپەرستی برەوێکی زۆری هەبو، کاتی خۆی مەسیحیە بڕوا لاوازەکان بەرەبەرە قبوڵیان کرد و پێیان وابو پیرۆز و بێگوناحن. لە سەرەتای سەدەی هەشتەمەوە کاتێك ئەم تازەباوە لە لوتکەی پەرەسەندن دابو لە پڕو نەکاوێکدا یۆنانیەکان وریا بونەوە و زانیان سەر لە نوێ لە بەرگی مەسیحیدا دینی بابو باپیرانیان ژیاندۆتەوە ، موسڵمانان بەسای قورئان و جولەکەکانیش بەسای تەورات توانجیان ئاراستە دەکردن و رکوکینەیەکی هەمیشەییان لە مەڕ دروستکردنی بت و هونەری بتپەرستیدا هەبو ، ئەم هەڵوێستە نیگەران و خەفەتباری دەکردن، بەڵام ئەگەر مەسەلەکە هەر جولەکە بونایە دەیانتوانی چاوی لێ بنوقێنن و ئاوڕی لێنەدەنەوە چونکە ژمارە کەم و زەبونیش بون، بەڵام توانج و سەرزەنشتی موسڵمانە ڕزگاریخوازەکان کە لە دیمەشقدا حوکمیان دەکرد و خەریکبو قوستەنتینیەش رزگار بکەن بایەخێکی گەورەی لەلادا پەیدا کردبون)).

(جیبۆن) دەڵێ:

((یەکەمین کەس لەدژی پەرستنی وێنە و بتدا تێکۆشابێ ئیمپراتۆر (لیو)ی بتشکێن (٧١٧-٧٤١ ز) و کانستائنی پێنجەمینی کوڕی (٧١٤-٧٧٥ ز) بونە، ل ٢٥٢ ئەنجومەنی (SYNOD) کە لەساڵی (٧٥٤ ز) لە قوستەنتینیەدا بەسترا، دوای توێژینەوەیەکی درێژدادڕی شەش مانگی بەوە گەیشتن کە پەرستنی وێنە و پەیکەرەکانی مەسیح شتێکی تازەباوە. ناوچەی ڕۆژهەڵات بەم بڕیارە

ڕازی نەبو بەڵام بە ناچاری قبوڵیان پێ کرا، ئیتاڵیەکانیش لەساڵی (٧٢٨ ز) شۆڕشێکیان لەدژدا بەرپا کرد))[(١)]

هەروەها تایفەیەکی تری نەسرانی[(٢)] بە جۆرێکی وا ڕاڤەی عەقیدە سێپەرستیەکەیان دەکرد کە لە یەکتاپەرستیەوە نزیك بێت و نکوڵیشیان لە خوایەتی مەسیح عليه السلام دەکرد[(٣)].

ئەو کەسەی مێژوی ئاینیی ئەوروپا و مێژوی کڵێسای نەسرانی بخوێنێتەوە هەست بەوە دەکات کە ئیسلام چ کاریگەرێکی ئاوەزانەی لەسەر کێشەگەلی چاکسازیخوازان و شۆڕشگێرانی دژ بە سیستەمی ئوسقوفی جێهێشتوە. بانگەوازە چاکسازیخوازە گەورەکەی (لۆثەر) وەکو مێژونوسان دانیان پێ ناوە- لەگەڵ هەمو خەوشەکانیشیدا[(٢)] دیارترین دیاردە بوە کە کاریگەری ئیسلام و هەندێ لە بیروباوەڕەکانی بەسەرەوە بوبێ.

هەروەها عەقلیەت و شەریعەتی ئیسلامی لە دوای فەتحی ئیسلامیدا کاریگەرێکی زەقی لەسەر ڕەوشت و کۆمەلایەتی یاساگەری نەتەوەکانی ئەوروپای نەسرانی و هیندستانی بتپەرستی بەجێهێشتوە[(٤)].لە مەسەلەکانی یەکخواناسی و کێشەکانی مافی مرۆڤ و یەکسانخوازی لە نێوان چینەکانی مرۆڤایەتیدا کە ئاینی ئیسلام لە زوەوە باسی کردوە و لە شەریعەت و ژیارەکەیدا دابینی کردوە، کاری تێکردون.

باسناسی[(٣)] بە ناوبانگی هیندی (K.M.Panikkar) باڵیۆز[(٤)]ی پێشوی هیندستان لە میسر لە بارەی کاریگەری بیروباوەڕی یەکخواناسی ئیسلامی لەسەر ئاوەزی گەل و ئاینی هیندیەوە دەڵێ:

---

(١) پەرتوکی (انحطاط روما وسقوطها) نوسینی جیۆن ل (٢٥٥ ـ٢٥٦)

(٢) Hainc's Christianity of Islam in Spain P.١١٦

(٢) ضحى الأسلام : ١/١٦٤ـ١٦٥

(٢) خەوش: عەیب.

(٤) Doctor Tara Chand: In fluence of Islam on Indian Culture.

(٣) باسناس: تۆژەرەوە، الباحث.

(٤) باڵیۆز: سفیر.

((بێگومان ئیسلام لە ڕۆژگاری خۆیدا کاریگەریەکی قوڵی لە ئاینی هیندۆکی کردوە، هیندۆکەکان لە هزری خواپەرستیدا قەرزباری ئیسلامن، ڕێبەرانی هزر و ئاینی هیندۆکی ئەو ڕۆژگار، ئەگەر چی خواکانیان بە ناوی جۆراوجۆرەوە ناوزەد کردبو، بەڵام بانگەوازیان بۆ خواپەرستی دەکرد و بە ڕاشکاوی دەیانگوت خوا تاك و تەنیایە و تەنها ئەو شایەنی پەرستنە و ڕزگاری و بەختەوەریش تەنها لەو داوا دەکرێ، ئیسلام لەو ڕۆژگارەدا شوێن پەنجەی لە گشت ئاین و بانگەوازەکانی هیندستان جێهێشتبو وەکو ئاینی (Bhagti) و بانگەوازی (کەبیرە)[5].

سەرەك وەزیرانی پێشوی هیندستان ـ جەواهیر لال نەهرۆ لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (Discovery of India) دەڵێ:

((ئەو داگیرکەرانەی کە لە باکوری ڕۆژئاوای هیندستانەوە هاتنە نێو هیندستان و هەروەها هاتنی ئیسلامیش بایەخێکی گەورەیان لە مێژوی هیندستاندا هەبو، ئیسلام هات دەمامکی ڕوی دزێوی خراپەکاریەکانی ناو کۆمەڵگەی هیندۆکی هەڵماڵی و خەڵکی لە ستەمی دابەشبونی چینایەتی و لە (لەمسی مەنبوذ) بێدار کردوە، ئارەزوی دورەپەرێزبون لە جیهان کە هیندستان تێیدا دەژیا لە دڵی خەڵکی دەرهێنا، بیردۆزەی برایەتی ئیسلامی و یەکسانی کە موسڵمانان بڕوایان پێ هەبو و تێیدا دەژیان کاریگەرێکی قوڵی خستە مێشکی هیندۆکەکانەوە، ئەوانەی کە زیاتر کەوتنە بەر کاریگەریەکەش ئەو کەساس و بەدبەختانە بون کە لەنێو کۆمەڵگەی هیندیدا لە یەکسانی و مافی مرۆڤایەتی بێبەش بون )).

نوسەرێکی هاوچەرخی پایەدار کە ناوی (N.C.Mehta) یە لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (ژیاری هیندستان و ئیسلام) دەڵێ:

((ئیسلام لە ڕۆژگارێکدا کە ژیارە کۆنەکان دادەڕوخان و ڕویان لە هەڵدێران بو؛ مەشخەڵی ڕوناکی بۆ هیندستان هێنا و تاریکستانی سەر ژیانی خەڵکی تاراند، ئامانجە پیرۆزەکان کرانە بیروباوەڕی هزری‌و کاری ڕزگاریخوازێتی ئیسلامی

(٥) Asurvey of Indian History P.١٣٢

لە جیهانی هزردا فراوانتر و مەزن تر بو وەك لە کێڵگەی ڕامیاری، هیندستانیش سای ولاّتانی تر لەمەدا بەشی خۆی وەرگرت، بەلاّم بۆ بەدبەختی! لەم ولاّتەدا (حکومەت) مێژوی ئیسلامی نوسیوەتەوە و کۆنترۆڵی کردوە بۆیە حەقیقەتی ئیسلام پەردەپۆش کراوە و بەخشش و دەستە جوان و ڕەنگینەکانی لە بەرچاواندا بزر بوە)).

هیچ دین و ژیارێك کە ئەمڕۆ لە جیهانی شارستان و ئاوەداندا دەژێت ناتوانێ بڵێ کەم و زۆر بە ئیسلام کاریگەر نەبوە.

ڕۆبەرت بریفۆلت لە پەرتوکەکەیدا بەناوی: ( The Making of Humanity) دەڵێ:

((هیچ لایەنێك لە لایەنەکانی پێشکەوتنی ئەوروپا نیە کە چاکەی گەورە و شوێنەواری کاریگەریتی ژیاری ئیسلامی بەسەرەوە نەبێ ))[١] لە شوێنێکی تردا دەڵێ:

((زانستە سروشتیەکان (کە فەزڵەکەی بۆ عەرەب دەگەڕێتەوە) ئەوروپای بۆ ژیان نەگەڕاندۆتەوە، بەلاّم ژیاری ئیسلامی هەر لەو ڕۆژەی کە گزنگی بەسەر ئەوروپا پەخش کردوە کاریگەری گەورەو جۆراوجۆری خستۆتە سەر ژیانی ئەوروپا)).

جا ئەگەر کار هەر بەم جۆرە ڕۆیشتبوایەو مرۆڤایەتی هەر لەژێر سەرکردایەتی ئەو کۆمەڵە موسوڵمانە مابونایەوە و تیر لە کەوانی خۆی دەرچویایە و ئاو لە ئاوەڕۆی خۆی ڕۆیی بوایە؛ جیهانی مرۆڤایەتی مێژویەکی تری دەبو... ئەو مێژوە تراژیدیەمان لە جیهان نەدەخوێندەوە کە پڕە لە نسکۆ و بەدبەختی و کوێرەوەری مرۆڤایەتی، مێژوێکی تری پڕ شکۆ و جوانی دەبو کە هەمو مرۆڤێك خۆزگەی پێ دەخوازێ و گشت چاوێکی پێ ڕون دەبێ، بەلاّم ڕەوتی قەدەر بەجۆرێکی تر ئاراستە بو و موسڵمانەکان خۆیان دوچاری داڕوخان بون.



(١) P.١٩٠

**بەندی دووەم**

# داڕوخان لە ژیانی ئیسلامیدا

## سنوری جیاکەرەوەی نێوان دو سەردەم:

ئەدیبێك گوتویەتی : (( دو شت هەن کاتی ڕودانیان بەوردی دەستنیشان ناکرێ: یەکەم:نوستنی مرۆڤ ، دووەم:داڕوخانی ژیانی نەتەوە، مرۆڤ ئەوکاتە هەستی پێ دەکا کە رویان داوە و کاریان لەکار تەواو بوە))؛ ئەم وتەیە لەسەر هەمو نەتەوەکان جێبەجێ دەبێ، بەڵام سەرەتای داڕوخانی ژیانی ئیسلامی لە هی نەتەوەکانی تر ڕونترە. ئەگەر بمانەوێ پەنجە بخەینە سەر سنوری جیاکەرەوەی نێوان هەرەت و هەڵدێرانی نەتەوەی ئیسلامی دەبێ بیخەینە سەر ئەو هێڵە مێژووییەی کە خەلافەتی ڕاشید لە پاشایەتی عەرەبی یان لە پاشایەتی موسڵمانان جوێ دەکاتەوە.

## ئاوڕدانەوەیەك لە هۆیەکانی ڕاپەڕینی ئیسلامی :

جڵەوی سەرکردایەتی ئیسلامی و جیهانیش بە هۆیەوە لەدەست پیاوانێك بو کە گشتیان لە ڕوی بڕوا و بیروباوەڕ و کردەوە و ڕەوشت و پەروەردە و پاکسازی دەرون و بەرز و پاکێتی ڕێژین و پێگەیشتویی و هاوسەنگیەوە پەرجوێکی[1] درەوشاوەی موحەممەد ﷺ بون . پێغەمبەر ﷺ هەموی تواندنەوە و لە قالبی ئیسلامی داڕشتنەوە، جەستەی لێ بترازێ ئەگەرنا لە حەز و ئارەزو و مەبەست و هەوەستدا پیاوی تریان لێ دەرچو و یەکێك ئەگەر زۆر بەوردیش سەیری ڕێژین و ڕەوشتیان بکات ڕەفتارێکی نەفامێتیان لێ وەدی ناکات کە دەگەڵ ڕوح و

---

(١) پەرجو: معجزة.

دەرونی ئیسلامیدا پێچەوانە بێ، ئەگەر ئیسلام مرۆڤ بوایە لەوان زیاتری لێ دەرنەدەچو.

وەکو گوتمان بۆ دین و دونیا بەیەکەوە پێشەنگی پێگەیشتو و پێودانی[1] بێخەوش بون و پێشەوا بون و پێش نوێژیان بۆ خەڵك دەکردو دادوەر بون و کێشەیان چارەسەر دەکردو بە داد و زانستەوە حوکمیان دەکردو دەستپاك بون و خەزێنەداری ماڵی موسڵمانانیان دەکردو سەرکردە بون و سەرکردایەتی لەشکریان دەکرد و سەرکەوتوانە نەخشەیان بۆ شەڕ دەکێشا، فەرماندە بون و کاروباری وڵاتیان بەڕێوە دەبرد و سزاکانی خوایان جێبەجێ دەکرد، لەیەك کاتدا لە خواترس و زاهید و قارەمان و موجاهید بون، دادوەری تێگەیشتو و فەقیهی موجتەهید بون، فەرماندەی بە دەستوبرد و سیاسەتمەداری هەڵکەوتوش بون.

خەلیفە ئایندار و سیاسەتمەدار بو، کۆمەڵەکی لە دەورە بو - ئەگەر دەستەواژەکەم بگونجێ - لە قوتابخانەکەی پێغەمبەر ﷺ (یان) لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺەوە دەرچوبون ، بەیەك قالب داڕێژرا بون ، هەڵگری یەك جۆرە روح بون ، هەمان پەروەردەیان وەرگرتبو ، خەلیفە ڕاوێژی پێدەکردن و پشتی پێدەبەستن ، تا ئەوانی ئاگادار نەکردبایەوە بڕیاری گرنگی دەرنەدەکرد. روحەکەیان ژیار و سیستەمی حوکم و ژیانی کۆمەڵایەتی و خوڕەوشتی خەڵکی تەنیبوەوە، ئاوات و مەبەستەکانیان لە ژیاردا ڕەنگی دابوەوە، دوژمنایەتی لە نێوان روح و ماددەدا نەبو، ململانێ لە نێوان دین و سیاسەتدا نەبو ، دابڕان لە نێوان دین و دنیادا نەبو ، زۆرانبازێ لەنێوان بەرژەوەندی و ڕێبیردا نەبو، پاڵەستۆدان لە نێوان هەوەست و ڕەوشتدا نەبو ، رکوکینە لە نێوان چینەکاندا نەبو، مونافەسە لە سەر ئارەزودا نەبو، هەمو لەگەڵ یەك کۆك و تەبا بون.

---

(١) پێودان: مقیاس.

## مەرجەکانی ڕابەرایەتی ئیسلامی:

ڕابەرایەتی ئیسلامی وا دەخوازێ چەند سیفەتێکی ورد و زۆر فرەوانی تێدابێ و کە دەتوانین لە دو وشەی (جیهاد) و (ئیجتیهاد)دا کۆیان بکەینەوەو دو وشەی سوک و ساکارن بەڵام سەرتاپاگیر[1] و فرە واتان.

## جیهاد:

جیهاد بریتیە لە بەکارهێنانی وزە و ئەوپەڕی کردوکۆشکردن لەپێناو وەدیهێنانی گەورەترین خواست. گەورەترین خواستی موسڵمانیش ئەوەیە کە بتوانێ گوێڕایەڵی خوا بێ و ڕەزامەندی خوا وەدەست بێنێ و ملکەچی حوکمەکانی بێ و فەرمانەکانی جێبەجێ بکات .کە ئەمەش تێکۆشانێکی درێژو دژواری دژ بە هەمو جۆرە بیروباوەڕ و پەروەردە و ڕەوشت و مەرام و هەوەستێکی تەگەرە ئامێزی گەرەکە و تێکۆشانێکی دژ بە خواوەندە دەرونی و زەمینیەکانی گەرەکە کە دژایەتی حوکم و پەرستنی خوا دەکەن، جا ئەگەر موسڵمان ئەمەی بۆ هاتە دی ئەوا لە سەری واجب دەبێ لە پێناوی حوکم و فەرمانەکانی خوا تێبکۆشێ تا لە جیهان بالادەست بێ و لە نێو مرۆڤایەتیدا پیادە بکرێن، ئەمەش وەك ڕاپەراندنی فەرزێکی خوایی کە خوا لە پێناو بەختەوەری مرۆڤایەتیدا فەرزی کردوە، چونکە گەلێ جار بەبێ بونی ئەم تێکۆشانە مرۆڤ ناتوانێ گوێڕایەڵی خوا بێ کە قورئان پێی دەڵێ (فیتنە).

ئاشکرایە سەرلەبەری جیهان بە هەمو ئەو شتانەی تێدایە وەك بێگیان و ڕوەك و ئاژەڵ و مرۆڤ ، بۆ ویستی خوا و ڕێوشوێنی گەردونی و یاسا سروشتیەکان کە خوا دایناون ملکەچە: ﴿ وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ: هەرچی لە ئەرز و ئاسماندا هەیە بەئازادی و نائازادی ملکەچی خوان ، سەرەنجام هەر بۆ لای خواش دەگەڕێنەوە﴾آلعمران:٨٣، ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ

---

(١) سەرتاپاگیر: شمولی.

يَسْجُدُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ: نەتبینیوە ئەوەی لە ئاسمان و لە زەویدا هەیە، خۆر و مانگ و ئەستێرە و شاخ و دار و جانەوەر و زۆرینەی خەڵك سوژدە بۆ خوا دەبەن، زۆر لە خەڵکیش سزای خوایان بەسەردا چەسپاوە!﴾ الحج:١٨. جا دیارە جیهادی مرۆڤی موسڵمان لە پێناو چەسپاندنی ئەو بەرنامەیە کە خوا بە پێغەمبەرانی ڕاناردوە، لە پێناو بەرزبونەوەی وشەی خوا و فەرمانەکانیەتی، لە پێناو ئەوەدایە کە حوکم و فەرمان تەنها بۆ خوا بێ. ئەم جیهادە تا ڕۆژی دوایی هەردەمێنی ، زۆر جۆر و شێوەشی هەیە کە لە ژمارە نایەن، جۆرێکیان جیهادی کوشتارییە کە ڕەنگە لە گشت جۆرەکانی تر بەرزتر و شکۆدار تر بێ، ئامانجەکەشی ئەوەیە لە سەر زەویدا هێزێکی یەکسانی دژ بە هێزی چاکە خوازی ئیسلامی نەمێنێ خەڵك لاڕێ بکات ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لله : تا ئاژاوە دەبڕێتەوە و دینی خوا زاڵ دەبێ بیانکوژن ﴾البقرة:١٩٣. یەکێك لە داخوازیەکانی جیهاد ئەوەیە کە موسڵمان دەبێ زۆر چاك ئیسلام بناسێ کە جیهادەکەی لە پێناودا دەکات ، زۆر چاك نەفامێتی بناسێ کە جیهادەکەی لە دژدا دەکا و بەڕەنگ و ڕواڵەت نەخەڵەتێ، عومەری کوڕی خەتتاب- ڕەزای خوای لێبێ - گوتویەتی: ((ئەگەر کەسانێك لە ناو ئیسلامدا پەیدا بن و شارەزای نەفامێتی نەبن؛ ئیسلام قوڵف قوڵفی لێ هەڵدەوەشێتەوە ))، جا مەرج نیە هەمو موسڵمانێك بێباوەڕی و نەفامێتی و ڕواڵەت و ڕەنگ و شێوەکانیان بناسێت، بەڵام ڕێبەر و سەرکردەکانی لەشکری ئیسلامی کە دژ بە بێباوەڕی و نەفامێتی دەجەنگن، دەبێ شارەزاییان لە موسڵمانان زۆرتر بێت و وردەکارانەتر نەفامێتی بناسن.

هەروەها دەبێ تەواو ئامادە و ساز بن و هێزی کامڵیان هەبێ، ئاسن بە ئاسن بەڵکو بەپۆڵا بکوتن و گەردەلول لە ڕوی (با) هەڵکەن، بە هەمو توانا و دەسەڵاتێکەوە ڕوبەڕوی بێباوەڕی و بێباوەڕان ببنەوە، هەمو دۆزراوە زانستیەکانی سەردەم وەك چەك و ئامێر و مەشقی جەنگی بەکار بێنن، بۆ دابینکردنی ئەم هێزانە کەمتەرخەم و دەستەوەستان نەبن ﴿ وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ

وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ : تا بۆو دەکرێ چەك و جبەخانەی شەڕ و ئەسپی سواری پەیدا بکەن و دوژمنی پێ بترسێنن؛ کە دوژمنی خوداشن.﴾ [1]الانفال : ٦٠.

## ئیجتیهاد :

مەبەستمان لە ئیجتیهاد ئەوەیە کە سەرکردە ئیسلامیەکان بتوانن بۆ ئەو کارەسات و ڕوداوانەی ڕوبەڕوی ژیانی موسڵمانان و جیهان و نەتەوەکانی ژێر دەسەلاتیان دەبنەوە یان بۆ هەربابەتێك کە لە ناکاو دێتە پێشێ یان نوێ دەبێتەوە بڕیاری ڕاست دەربکەن، کە فیقهی نوسراو و ڕاڕەوی پەیڕەولێکراو و فتوای نێو پەرتوکەکان لە بارەیانەوە نەدواون، هەروەها شارەزاییان بەڕوحی ئیسلام هەبێ ، لە راز و نهێنیەکانی شەریعەت بگەن ، بە بنەڕەتەکانی تەشریعی ئیسلامی ئاشنا بن ،-وەك تاك و کۆمەڵ- هێزی هەڵێنجانی حوکمی شەرعیان هەبێ و بتوانن گرفتەکان چارەسەر بکەن و نەتەوە لە تەنگانە ڕزگار بکەن .

زیرەکی و دەستوبردی و کارامەیی و زانستێکی وایان هەبێ بتوانن لەو هێزە سروشتیانەی خوا خەلقی کردوە بەهرەمەند بن و لەو خێروبێر و کانە بەبرِشتانەی خوا لە زەویدا فەراهەمی هێناون سود وەرگرن و بۆ بەرژەوەندی ئیسلامی بەکار بێنن، نەك ئەهلی ناهەق و شوێنکەوتوانی شەیتان بۆ مەرام و هەوەستی خراپەکارانەی خۆیان و بۆ دەست بە سەرداگرتنی زەوی و بڵاوکردنەوەی بەدکاری بەکاری بێنن .

---

(١) هەڵبەت چەند مانگێکە وەرگێڕانەکەی (قورئانی پیرۆز)ی مام هەژار کەوتۆتە بازاڕەوە، جا لەسەر پێداچونەوەکەی کاك (نەوا) لە چەند شوێنێکدا تەرجەمەی ئایەتەکان لەوەرگێڕانەکەی مام هەژار وەرگیراون.

تارامی گەلاڵی. ٢٠٠١/٨/١٥

## گوازرانەوەی پێشەوایەتی لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی تر:

بەڵام بەداخەوە پاشان ئەم پایە ترسناکە کەوتە دەستی کەسانێك کە وەکو نەوەکانی پێشوتر خۆیان ئامادە نەکردبو و پەروەردەیەکی ئاینی و ڕەوشتیی قوڵ و پتەویان وەرنەگرتبو، ڕوحی جیهاد و هێزی ئیجتیهادیان لە مەسەلە دینی و دنیابییەکانیان نەبو، بۆیە نەیانتوانی ئەرکی جێنشینایەتی ئیسلامی ڕاپەڕێنن، ئەمە حوکمێکی گشتیە و ژمارەیەکی زۆر لە خەلیفەکانی بەنی ئومەییە و بەنی عەبباسیش دەگرێتەوە.

## لارێیونەکانی ژیانی ئیسلامی:

لە ئەنجامی ئەمەدا کێوی ئیسلام گەلێك شەقار[1] و درزی تێکەوت و ژیانی ئیسلامی لە گەلێك لاوە کەوتە ڕێی چەوتی.

## دابڕانی دین لە ڕامیاری:

دین و ڕامیاری بە کردەوە لە یەکتر دابڕان ، جێنشینەکان لە ئاستێکی زانستی و ئاینی وادا نەبون تا پێویستیان بە زانا و ئەهلی دین نەبێ، بۆیە جڵەوی حوکم و سیاسەتیان لە دەست خۆ گرت و ـ ئەگەر حەزیشیان بکردایە و بەرژەوەندی بیخواستایە ـ وەك ڕاوێژکاری پسپۆر پرس و ڕایان بە فەقیە و زانایان دەکرد و بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان دێنان و بە ئارەزوی خۆیان کاتێکیش بیانویستایە دەستبەرداریان دەبون و بە گوێیان نەدەکردن، بەم جۆرە ڕامیاری لە چاودێری ئاین ڕەها بو، وەك قەیسەر و کیسرایەتی زۆرداری لێهاتبو و گەلێ جارانیش دەبوە پاشایەتیەکی پەتی، بگرە وەك وشترێکی هاری بەرەڵڵای لێهاتبو.

زاناکان و ئەهلی دینیش ببونە سێ بەش: هەبو دژ بە خەلیفە ڕاپەڕی بو، هەشبو کەنارگیر[1] بو، تەنها بەخۆ خەریك بو، چاوی لە ڕوداوان نوقاندبو، لە

---

(١) شەقار: درزی گەورە.

چاکسازی بێهومێد بو، کەکاری ناهەقی دەبیست و دەبینی بەزار ڕەخنەی دەردەبڕی و ئاخ و داخی هەڵدەکێشا بەلام هیچ دەسەلاتێکی نەبو، جۆری سێیەمیشیان لەبەر بەرژەوەندی دینی یان لەبەر بەرژەوەندی خۆی دەگەڵ حکومەت بو، هەریەکەو بە گوێرەی نیازی خۆی .. ئیتر لەو کاتەوەڕا دین و ڕامیاری[٢] لە یەك دابڕان.

دین وەك باڵندەیەکی باڵ بڕاو و پێ بەستراوی لێهات و ڕامیاریش دەست و دەسەلاتی ڕەها بو، لە هەڵسوکەوتیدا ئازاد بو، قسەی جێبەجێ دەبو، خۆی خاوەنی فەرمان و بەرهەڵستی بو، زاناکان و ئەهلی دینیش ببونە توێژێکی جوێ و دنیادارانیش توێژێکی تر، مەودای نێوانیشیان گەلێ فرەوان بو، بەڵکو گەلێ دوژمنایەتی و رکوکینەشیان لەنێواندا بەرپا دەبو.

## مەیلی نەفامێتی لە کاربەدەستاندا :

زۆربەی کاربەدەستان و تەنانەت خەلیفەش لە ڕوی دین و خوڕەوشتدا سەرمەشقی کامل نەبون، ڕەگ و مەیلی نەفامێتی لە گەلێکیاندا هەبو، ئەم روح و دەرونە لە ژیانی گشتی و کۆمەلایەتیشدا ڕەنگی دایەوە، خەڵك لاسای ڕەوشت نەریت و خواستەکانی ئەوانیان دەکردەوە، چاودێری دین و ڕەوشت و لێپرسینەوە نەما، بزاڤی فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگەگرتن لە خراپە دەسەلاتی ون کرد، چونکە هێزی نەبو و حکومەتیش نەیدەپاراست، ئەوانەی بەم کارە هەڵدەستان چەند کەسێکی خۆبەخشی بێهێز و بێدەسەلات بون، هۆکاری سەرپێچیکردنیش زۆر بەهێز بو . بەم جۆرە نەفامێتی لە ناو ولاتی ئیسلامدا هەناسەی هاتەوە بەر و سەری قیت کردەوە، خەڵکێکی گەلێ زۆر روی لە ڕابواردن و ژینی بە نازونوز و گاڵتەو یاری کرد و لە نێو ئارەزوبازی و چێژ و تێروتەسەلیدا نغرۆ بون.

---

(١) کەنارگیر: دورەپەرێز، منعزل.
(٢) رامیاری: سیاسەت.

ئەگەر چاوێك بە پەرتوكی (الأغاني) و (الحيوان)ی (جاحیظ)دا بخشێنی بۆت رون دەبێتەوە كە خەڵك چۆن بە هەمو توێژەكانیەوە بۆ ڕابواردن هەڵپەیان كردوە و بۆ چێژ و خۆشی گڵپەیان سەندوە و بۆ ژینی دونیا شێت و شەیدا بون. بێگومان بەم جۆرە ڕێژین و ڕەوشتە دابەزیوە، بەم جۆرە شەكەتبونەی نێو خۆشی و ڕابواردن هیچ نەتەوەیەك ناتوانێ پەیامی ئیسلام ڕاپەڕێنێ و شوێنی پەیامبەران بگرێتەوەو خوا و ئاخیرەت وەبیر خەڵك بێنێتەوە و هانیان بدات دین و تەقوایان بەرزبێتەوە، ناتوانێ لە خوڕەوشتدا ببێتە سەرمەشقی خەڵكی، تەنانەت ڕۆژگاری ژینی كامەران و ئازادیشی درێژ ناخایەنێ[1]: ﴿سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً: شێوەی كاری خوا لەناو پێشینەكانی رابردوشا هەر وابوەو شێوەی كاروباری خودا گۆڕانی بەسەردا نایە﴾الأحزاب:٦٢.

## نوێنەرایەتیكردنی ئیسلام بە شێوەیەكی نەشیاو :

جێنشینەكان لەو شتانەی كردویانە و نەیانكردوە تەنها نوێنەرایەتی زات و سیاسەتی خۆیان كردوە .. هەرگیز نە لە ڕوی سیاسەتی شەرعیەوە، نە لەڕوی یاساكانی جەنگیەوە، نە لە ڕوی سیستەمی شارستانیەوە ، نە لە ڕوی ڕێوشوێنەكانی خوڕەوشتەوە نوێنەرایەتی ئیسلامیان نەكردوە، مەگەر چۆن .

---

(١) زێدەڕۆیی و هەڵەیە ئەگەر پێمان وابێ كۆمەڵگەی ئیسلامی گشت ئاكارێكی ڕوحیو ڕەوشتی و شەرعدارێژی ون كردبێ و لە سەرجەم ڕوخسارە ئیسلامی و ئەدگارە مێژوئامێزەكانی دابڕابێ و، وەك كۆمەڵگە هاوچەرخەكانی مرۆڤایەتی ئەمڕۆی لێهاتبێ. لە ڕاستیدا كۆمەڵگەی ئیسلامی هەمیشە زۆرینەی ئەدگارو تایبەتمەندێتی و تازیارێتی خۆی پاراستوە كە ئیسلام هێناویەتی و جێنشینە سەرڕاستەكان ڕەگیان داكوتاوە و زانا خواناسەكان پاراستویانە، زاناكان لە هەمو سات و كاتێكدا وجودیان هەبوە و فەرمانیان بەچاكە كردوە و ڕێگەیان لە خراپە گرتوە ، ئەوە موسڵمانەكانی پاشتریش وەك میرات هەڵیان گرتۆتەوە ، تەنانەت كۆمەڵگە ئیسلامیەكەی ئەوسا لە سەرجەم كۆمەڵگە هاوچەرخ و دراوسێكانی ئەمڕۆ باشتر بوە، زۆربەی حدود و حوكمە ئیسلامیەكان و شەرعە ئاسمانیەكان جێبەجێ كراون، كۆمەڵگەكەی ئەوسا توشی لاڕێبون ببو نەك لاڕێ بوبێ، بە پێچەوانەی واقیعی كۆمەڵگەكانی تر (وەك و مەسیحیەت و ئاگرپەرستی و بتپەرستی) كە بونەتە نێچیری لاڕێبون و گۆڕان و ڕەشبونەوە.

پەیامی ئیسلام هێز و کاریگەریەکەی لە دڵی ناموسڵمانان ون کردبو، متمانەیان پێ لاواز ببو، مێژونوسێکی ئەوروپی گوتەنی: ((ئیسلام دەستی بە داڕوخان کرد، چونکە مرۆڤایەتی گومانی لە ڕاستێتی ئەو کەسانەوە پەیدا کرد کە نوێنەرایەتی ئەم ئاینە تازەیان دەکرد)).

## گرنگی نەدان بە زانستە کردەییە بەسودەکان:

زانا هەرە مەزنەکان هێندەی بایەخیان بە زانستەکانی میتافیزیکا[١] و فەلسەفەی خواوەندیەتی دا، بایەخیان بە زانستە سروشتیە ئەزمونیەکان و زانستە کرەییە سودبەخشەکان نەدا، میتافیزیکا و فەلسەفەکەشیان لە یۆنانیەکانەوە وەرگرتبو، یۆنانیش هەر نەتەوەپەرستیەکەی خۆیان بو کە وەریانگێڕابوە سەر زمانە فەلسەفیەکان و بەرگێکی هونەرییان لەبەر کردبو، فەلسەفەکەش بریتی بو لە کۆمەڵێك گومان و بۆچون و تەلیسمی واژەیی بێ هەقیقەت و پڕوپوچ و بێواتا. هەڵبەت خوا بە هۆی قورئان و ڕێنوێنی و ڕێڕۆنیەکانەوە موسڵمانانی لەم جۆرە فەلسەفەکاریە پاراست و ڕێگای وای بۆ ڕوناك کردنەوە پێویستیان بە سۆراخکردن و لێوەتۆژین و بەشبەشکاری و شیتەڵکاری[٢] نەبێ لە بابەتەکانی زات و سیفەتەکانی خواوە کە پتر بە شیتەڵکاری کیمیاوی دەچێت .

بەلام موسڵمانان سوپاسی ئەو بەخششە گەورەیان نەکرد، دور لە جیهاد چەندین سەدەی دوورودرێژیان لە پێناو ئەو جۆرە زانست و توێژینەوانە بە فیڕۆ دا، زیرەکایەتی خۆیان لە توێژینەوەی فەلسەفی و کەلامناسیدا بەهەدەر دا، کە هیچ سودێکی نەدەبەخشی و هیچ ئەنجامێکی بەدەستەوە نەدەدا و پەیڤێکی[٣] بۆ دنیا و ئاخیرەت فەراهەم نەدەهێنا ، لەبەر خەریکبونیان بەو زانستە فەلسەفیانەوە ئاگایان لە زانستە کردەیی و ئەزمونیەکان نەما کە هێزەکانی سروشتیان بۆ

---

(١) میتافیزیکا: ئەودیو سروشت.

(٢) شیتەڵکاری: تحلیل.

(٣) پەیف: پەیام.

بەیدەست دەکات، نەیانتوانی لە پێناو بەرژەوەندی ئیسلامدا سود لەم هێزانەوە وەربگرن و دەسەلاتی ماددی و روحی ئسلامی پێ بەسەر جیهاندا رابهێلن.

هەروەها بە لێکۆڵینەوە لە روح و لە فەلسەفەی ئیشراق و مەسەلەکانی وەحدەتولوجودیش خەریك بون و بەشێکی گەورەی کات و کۆشش و زیرەکایەتی خۆیان بە فیڕۆدا.

هەرچەندە ئەو ئاستەی کە موسڵمانەکان لە زانستە سروشتی و ئەزمونیەکان پێی گەیشتن بە بەراورد لەگەڵ چەرخەکانی پێشتر پێشکەوتوتر و لە زانست و ئەزمونیشدا دەوڵەمەندتر بو، بەڵام لەگەڵ پێشکەوتنی بەرفرەوانی زانستەکانیتر و لەگەڵ ئەو رۆژگارە درێژەی کە لە مێژودا دەسەلاتدار بون هاوڕێژە و گونجاو نەبو، بۆیە ئەو بلیمەت و هەڵکەوتوانەی لە زانستەکانی فەلسەفەدا هەڵکەوتن لە زانستە ئەزمونیەکان هەڵنەکەوتن.

ئەو پەرتوکانەی کە لە بارەی زانستەکانی سروشت و گەردونناسی و ئەزمونکاریەوە بەجێیان هێشتون، ئەگەرچی ئەوروپا لەسەرەتای راپەرینەکەیدا سودی لێ وەرگرتن و دانی بە بەهای بەرزی ناون ، بەلام لە بەرامبەر ئەو پەرتوکخانە گەورە و فرەپەرتوکانەی ئەوروپا کە لە هەردو سەدەی حەڤدەم و هەژدەمدا وەبەرهەمی هێناون ، گەلێ بچوك و پوکەڵەن، هەرچەند شانازی بە بەرهەمی زاناکانی ئەندەلوس و داناکانی رۆژهەلات بکەین بەلام لە بەرامبەر بەرهەمە زەبەلاحەکەی رۆژئاوا لە زانست و حیکمەت و ئەزمون و تاقیکردنەوەدا؛ شتێکی ئەوتۆ نیە و بەهیچ ناچێ، جا لەڕوی چەندێتی و چۆنیەتی بێ یا لەڕوی داهێنان و تازەکاری بێو یا لە روی وردەکاری زانستی و پوختەکاری هونەری بێ.

ئەگەر مەبەستتە بزانی رێژەی نێوان بایەخدانی رۆژهەلاتی ئیسلامی بە هەردو لایەنی روحی و لایەنی زانستی ئەزمونیەوە بە چ ئەندازەیەك بوە؛ بەراوردێك لە نێوان پەرتوکی (الفتوحات المكية)ی شێخ (ابن عربي ) بکە دەگەڵ گەورەترین

پەرتوك كە دەبارەی سروشت و دانایی[١] نوسراوە، ئەوكات بۆت دەردەكەوێ لە ڕوی بابەت و بایەخ و هەوڵدانەوە چ جیاوازیەكی لە ڕاددەبەدەریان لە نێواندا هەیە، دەشزانی كە تا چ ڕاددەیەك لایەنی روحی بە سەر چێژی ڕۆژهەڵاتدا زاڵ بوە.

## بیدعەكاری و گومڕاكاری:

یەكخواناسیە پاك و بێگەردەكەی ئیسلام لەزگبو[٢] بە پەردەی هاوبەشپەرستی و نەزانی و گومڕاكاری دادەپۆشرا، سیستەمی ئاینی گەلێ جۆرە بیدعەكاری تێكەوتبو و بیدعە ڕوبەرێكی بەرفراوانی لە ژیانی موسڵماناندا گرتبوەوە و لە دینی راست و دنیای خەریك كردبون، پایە و تازیارێتی[٣] موسڵمانان بەسەر نەتەوەكانی تری سەرزەویدا لەو دینەوەیە كە موحەمەد ﷺ هێناویەتی و تازیارێتی و پەرجوی ئەم دینەش لە ڕاست و دروستی و پارێزراویەكەیەتی و چونكە ئەم دینە بەوە جوێ دەبێتەوە كە سروش[٤] و بەرنامەی خوای كاربەجێ و دانایە: ﴿تَنزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾فصلت:٤٢. بەڵام ئەگەر ئاوەز و هەوا و ئارەزوی خەڵكی تێكەوت و دەستكاری كرا و لە سروش و زانستە پاك و پارێزراوەكان بترازێ و هیچی زیاتری بەسەر دینەكانی تر و هیچ تازیاریەكی بەسەر سیستەمە مرۆڤانیەكانەوە نامێنێ و بەختەوەری دنیا و دوایی دابین ناكات و شایەن نابێ خەڵك ئاوەزی بۆ كەچ بكەن یان شەیدای بن.

---

(١) دانایی: حکمە.
(٢) لەزگبو: خەریكبو.
(٣) تازیاری: میزة.
(٤) سروێت: نیگا، الوحي.

## سام و هەیبەتی دین :

ئەوەت لە بیر نەچێ کە دین بە درێژایی ئەو ڕۆژگارەوە هەمیشە زندو بوە، لە دەستێوەردان و لاڕێبون و گۆڕانکاری پارێزراو بوە، سامی بەسەر موسڵماناندا هەبوە و لاڕێبونی بۆ دەستنیشان کردون و مەشخەڵی هەرەبەرز و روناکی پڕشنگدار بوە: ﴿ يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنْ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ وَيُخْرِجُهُمْ مِنْ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ: ئەوانەی شوێن ڕەزامەندی خوا کەوتبن؛ خوا بەهۆی ئەو قورئانەوە بۆ ڕێگا سەلامەتەکانی بەهەشت ڕێنوێنی دەکات، بە ئیزنی خوا لە تاریکی دەریاندێنێ بۆ ڕوناکی، بۆ ڕێگای ڕاست ڕێنمایان دەکات﴾المائدة:١٦. هەروەها قورئان و سوننەت هەمیشە دژ بە هاویەشپەرستی و بیدعەکاری و نەزانی و گومڕاکاریی شۆڕشیان لە دڵی خوێندەواران بەرپا کردوە، هەمیشە شۆڕشیان لە دژی ڕەوشت و نەریتی نەفامی و لە دژی چەوساندنەوەی چەوسێنەران و ستەمی پاشایان هەڵگیرساندوە.

لە هەمو ڕۆژگارەکانی مێژوی ئیسلامی و لە گشت ناوچەکانی ئیسلامیدا هەمیشە قورئان و سوننەت کاریان لە کەسانێك کردوە و ئەوانیش لەسەر ڕێوشوێنی پێغەمبەران ڕاپەڕیون و ئاینیان تازە کردۆتەوە و ڕوحی جیهادیان بوژاندۆتەوە و دەرگای ئیجتیهادیان بۆ ئوممەت کردۆتەوە و لە پێناو دامەزرراندنی حکومەتێکی ئیسلامی لە سەر ڕێوشوێنی خەلافەتی ڕاشید تێکۆشاون، جا هەندێکیان لەو ڕێگایەدا شەهید کراون و هەندێکی تریش توانیویانە بۆ ڕۆژگارێکی کورتخایەن حکومەتێکی ئیسلامی دابمەزرێنن و سەردەمێکی وەك سەردەمی خەلافەتی ڕاشید بنوێنن: ﴿ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً: گەلێك پیاو لە بڕواداران پەیمانەکەی لەگەڵ خوا بەستبویان جێبەجێیان کرد، هەندێکیان شەهید بون و هەندێکی تریش چاوەڕێن و لەسەر پەیمانەکەیان ماون و خۆیان لێ نەگۆڕا﴾الأحزاب:٢٣، ئەم کۆمەڵە فەرمودەکەی پێغەمبەریان لێ هاتۆتە دی کە دەفەرموێ : ((لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ

خَذَلَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ كَذَلِكَ[١]: له نەتەوەکەمدا هەمیشه کۆمەڵێك لەسەر حەق دەمێننەوە و به دوژمنان زەبون نابن و هەتا رۆژی دوایی دادێ هەروا دەبن))، مێژوی جیهاد و تازەخوازی ئیسلامی بەیەکترەوە بەستراون و هیچ ماوەیەك لەیەکتر دانەبڕاون، مەشخەڵی چاکسازیخوازەکانیش وەك ئەڵقەکانی زنجیر به دوای یەکدا هاتون و به ڕەشەبایان دانەمرکاون[٢].

## خۆشبەختبونی جیهانی ئیسلامی له سەدەی شەشەمی کۆچیدا:

له سەدەی شەشەمی کۆچیدا خوای گەورە خۆشبەختیەکی گەورەی به جیهانی ئیسلامی بەخشی که ئەو کات جیهانی ئیسلامی له دوای سەلجوقیەکانەوە نیشانەکانی لاوازی و بەساڵداچونی لێ وەدەر کەوتبو و پاشا و فەرماندەکانش دابڕ دابڕیان کردبو، پاشان خوا کردی چەند سەرکردەیەکی گەورە پەیدا بون و شان و شکۆی ئیسلامیان پاراست و ژیانیان گەڕاندەوە نێو جیهانە داڕماوەکەی ئیسلامی. هێرشە داگیرکەریەکانی خاچپەرستەکان، که یەکەمجار مەبەستی دەستبەسەرداگرتن بو بەسەر ئەو شوێنانەی که له لای مەسیحیەکانەوە پیرۆزن، دژ به ئیسلام و سەرجەم موسڵمانان دەستی پێکرد و هەڕەشەیان له جەزیرەی عەرەبی و لانەی ئیسلام و ولاتە دراوسێکانی شامیش کرد و پاشان خاچپەرستە ئەوروپیەکان توانیان قودس و سەرجەم شار و قەلاکانی شام داگیر بکەن و وێڕای ئەمە چاویان بڕیە شارەکەی پێغەمبەریش ﷺ. خاچپەرستەکان له دوای ئاژاوەی هەڵگەڕاوەکان گەورەترین مەترسی بون بۆ سەر ئیسلام و موسڵمانان. خوا کردی عیمادەددین ئەتا بەگی زەنگی (له ٥٤١ ك مردوە) بۆ ئیسلام ڕابێ، که گەلێك جار لەشکری روبەڕوی خاچپەرستان کردۆتەوە و له زۆر شەڕ وگەڕدا شکستی پێ خواردون و تەنانەت شاری (ڕەها)شی فەتح کردو دواتر که عیمادەددین زەنگی ماڵئاوایی له دنیا کرد کوڕە مەزن و دادگەرەکەی؛ شا نورەددین مەحمود زەنگی

---

(١) رواه مسلم (كتاب الجهاد).
(٢) لەمبارەوە پەرتوکی دانەر بەناوی (رجال الفكر والدعوة الى الاسلام) بخوێنەوە.

(لە ٥٦٩ك مردوە) جێی گرتەوە و نەخشەی کێشا شام لە خاچپەرستان پاك کاتەوە و قودسی پیرۆزیان لە دەست ڕزگاربکات و بیخاتەوە ژێر دەستی موسڵمانەکانەوە، بەڵام بەر لەوەی کارەکەی بەئەنجام بگات کۆچی دوایی کرد. پاشان یەکێك لە قارەمان و هەڵبژاردەکانی جێی گرتەوە کە ئەویش مەلیکی سەرکەوتو سوڵتان سەلاحەددین یوسفی کوڕی ئەیوبی پاشای میسر بو. خوا کالآی ئەم کارەی بە بالآی ئەم پیاوە بڕی، سەلاحەددین پیاوێکی بەدەستوبرد و کارامە و گەردەنکەش و ورەبەرز و وریا بو ، بۆ جیهادی ڕێی خوا خۆبەخش و لە خۆبوردە و بۆ سەرخستنی ئیسلام کۆڵنەدەر بو، لە شەڕی دژ بە بێباوەڕ و سەربزێوان سەرگەرم بو، سەرکردەیەکی هەڵکەوتو بو، لە ڕێکخستن و کارگێڕیدا زیرەك و چاپوك بو، چاکەخواز و دینپەروەر بو، مەرد و نەبەرد و جوامێر بو، مرۆڤدۆست و بە ڕەوشت بو، خاوەن گشت ئەو ئاکارانە بو کە لە شان و شکۆی پیاوە هەرە ناودار و هەڵکەوتوەکانی جیهان هاتبوە دی. بەم جۆرە سەلاحەددین بو بە پەرجوێکی ئیسلام و سەلماندی کە هێشتا ئیسلام ڕۆژگاری بەسەر نەچوە و بوژانەوەی دانەمرکاوە و بەرهەمی لێ نەبڕاوە، توانی بۆ یەکەمجار دوای ڕۆژگارێکی درێژخایەن لە دابڕدابڕ بون جیهانی ئیسلامی لە یەك سەنگەر بخات و روبەڕوی هێرشەکانی ئەوروپایان بکاتەوە کە ئەوروپا سەرجەم پاشا و فەرماندە و سەرکردە ناودار و گشت لەشکرەکانی کۆ کردبوەوەو لەجیهانی ئیسلامی بەردابو.

لە ژێر ئاڵاکەی سەلاحەددیندا گەلێك گەل و نەتەوەی جۆراوجۆری موسڵمان بۆ جیهاد کۆبونەوە کە قەت پێشتر وا کۆ نەببونەوە، دوای ڕۆژگارێکی دورو درێژ لە خامۆشبونی مەشخەڵی جیهاد و غیرەتی ئیسلامی گڕی گرت و کڵپەی سەند، سەلاحەددین هەرچی پێشکەوتنی زانست و داهێنان و پیشەسازی ئەوکاتی جیهانی ئیسلامی و هەرچی زیرەکی و ئارامی و فام و تێگەیشتنی خۆی هەبو، هەموی لەم جیهادەدا بەکارهێنا، لە شەڕی (حطین)دا لە ساڵی (٥٨٣ ك) بە سەر خاچپەرستەکان زاڵ بو و شکستی کوشندەی پێ خواردن و بڕبڕەی پشتی شکاندن . لە هەمان ساڵدا قودسی فەتح کرد و سەرجەم فەلەستینی رزگار کرد و خاچپەرستانی لە (صور) گەمارۆدا، پاشان ئەوروپا بە هەرچی چەك و تفاقیەوە بو

لەشکرێکی گەورەی لە ژێر ئالآی سەرکردەی ناودار: ریچارد (Richard) پاشای ئینگلتەرا کۆکردەوە و بەرەنگاری موسڵمانان بونەوە، شەڕو شۆڕ لە نێوان موسڵمان و خاچپەرستان بەردەوام بو، هەر ڕۆژەی لایەك سەردەکەوت تا لە ساڵی (٥٨٨ك-١١٩٢/٩/٢ز) ئاگربەستیان ڕاگەیاند و شەڕ کۆتایی هات و لە ئەنجامدا فەلەستین لە زۆرینەی خاچپەرستە داگیرکەرەکان پاك کرایەوە و ریچارد بەرەو پاشانشینەکەی خۆی (ئینگلتەرا) گەڕایەوەو سەلاحەددینیش دوای ساڵێك کۆچی دوایی کرد.

لێرەدا پێمان باشە لێدوانەکەی مێژوناسی ئینگلیزی ( Stanley Lane Poole) بێنینەوە کە لەو پەرتوکەی لە بارەی سەلاحەددینەوە دایناوە لە بارەی ئەم ئاگربەستەوە چەند شتێکی نوسیوە، لە لێدوانەکەیدا بۆمان دەردەکەوێ کە لە ژێر سەرکردایەتی سەلاحەددیندا جیهانی ئیسلامی خاوەن چ جۆرە هێز و یەکێتیەك بوە، دەڵێ:

((شەڕی پیرۆز کە پێنج ساڵی خایاند کۆتایی هات، موسڵمانەکان بەر لە سەرکەوتنیان لە شەڕی حوطین لە ڕێککەوتی یۆلیۆی ساڵی (١١٨٧ ز)دا خاوەنی یەك بست خاکی ڕۆژئاوای روباری ئەردەن نەبون، بەلآم لە سێپتەمبەری ساڵی (١١٩٢ ز)دا کە مەسرەتیەکەی[1] (ڕەملە)یان بەست خاوەنی سەرتاپای وڵات بون، تەنها ئەو زنجیرەیە نەبێ کەلە صورەوە تا یافا درێژ دەبێتەوە کە هەر لە ژێر دەستی مەسیحیەکاندا مایەوە. ئاگربەستەکە لەو جۆرە نەبو سەلاحەددین لێی شەرمەزار و پەشیمان بێ، ڕاستە زۆربەی ئەو شوێنانەی خاچپەرستەکان داگیریان کردبو لە ژێر دەستی ئەوروپیەکاندا مایەوە، بەلآم ئەنجامەکە لە چاو ئەو هەمو زەرەرە گیانی و ماڵیەی ئەوروپا لێی کەوت بەهیچ نەدەچو. ئەوروپا لەم شەڕەدا هەموی هوروژا بون و رویان لە خاکی پیرۆز کردبو، پاپا ڕاپەڕینی خاچپەرستانەی ڕاگەیاندبو، قەیسەر فرێدریك و پاشاکانی ئینگلتەرا و فەرەنسا و صەقەڵیە و لیۆبۆڵدی نەمساوی و دۆقی برجەندی و کۆنتی فلاندەری و سەدان

---

(١) مەسرەتی: صلح.

نەجیمزادەی بەناوبانگ و چەندین سەرکردەی گەلە نەسرانیەکان و پاشای حکومەتی قودسی مەسیحی و پاشاکانی حکومەتە نەسرانیەکانی فەلەستین و سوارچاك و پاڵەوانانی تایەفەی (داویە) و (ئەسپتار)، هەمو کۆبونەوە و هەرچی لە توانایاندا هەبو تەرخانیان کرد بۆ ئەوەی دەست بەسەر قودس دابگرن و حکومەتە مەسیحیەکەیان ببوژێننەوە کە مەڵبەندەکەی لە قودس بو، کە خەریکبو بڕوخێ و بڕێتەوە.

بەلاّم ئەنجامی ئەم کردوکۆشە بەرفراوان و زەبەللاحە چ بو؟، قەیسەر فریدریك لەم ماوەیەدا مردو پاشاکانی ئینگلتەڕا و فەرەنساش گەڕانەوە وڵاتی خۆیان، گەلێك فەرماندە و نەجیمزادەیان لە ئیلیا ئەسپەردەی خاك کردو قودسیش وەکو جاران لەژێر ڕکێفی سەلاحەددیندا مایەوە، مەسیحیەکانیش تەنها میرنشینی بچوکی (عەککا)ی سەرکەناریان بۆ وەچەنگ کەوتەوە .

تەواوی جیهانی مەسیحی یەکجێ وەك یەك پیاو ڕوبەڕوی موسڵمانەکان بونەوە، بەلاّم نەیانتوانی سەلاحەددین لە شوێنی خۆی دورخەنەوە، لەشکرەکەی سەلاحەددین بەهۆی جیهادی درێژخایەن و ماندوبونی گەورەوە شەکەت ببون، چونکە چەندین ساڵی دورو درێژی سەرومڕ لە سەنگەری خەبات و تێکۆشانی دژ بە دوژمنێکی زۆر بەهێز دابون، کەچی سەربازێك نەبو بۆڵەبۆڵ بکات و ناڕەزایی و بێزاری خۆی دەربڕێ،هەر ڕۆژێکیش سەلاحەددین بۆ جیهاد بانگی کردبن کەس خۆی نەدزیوەتەوە و لە ئامادەبون وەدوا نەکەوتون و سەر و گیان و ماڵی بەهاداریان فیدا کردوە، ڕەنگە سەرکردەیەك لە هەندێ لە دۆڵە دورەکانی زێی دیجلەدا سکالاّی لەو کۆمەکخوازیە هەبوبێ کە درێژی خایاندو خەریکبو کۆتایی نەیەت، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا کە پێویست بوە و داوایان لێکراوە دەسبەجێ لەشکریان سازداوە و بۆ سەرخستنی سەلاحەددینیان ناردوە.

لەشکری موسڵێ بەوپەڕی مەردایەتی و خوێنگەرمیەوە لە شەڕی کۆتایی (ئەرسوف)دا شەڕیان کرد، سوڵتان دڵنیابو کە لە میسرو عێراق و لە شامی باکور و ناوەندیدا لەشکری بۆ دێت یارمەتی بدەن. تورکمان و عەرەبە میسریەکان ملکەچی فەرمانەکانی سوڵتان و خزمەتکاری بەوەفا بون، هەرکاتێ

کۆمــەکی لێ خواســتبان وەك بەنــدە لەبەردەســتیدا ئامــادە بــون، ســولتان بــە شێوەیەکی زۆر سەیر ئەو هــەمو رەگــەزە جۆراوجــۆرەی لەگــەڵ یەکـدا ئاوێتــە و تێکەڵ کردبو هەرچەندە ڕەگەزو نەتەوەشیان جیاواز بو، زۆر سەیر تاکــەکانی ئــەو خەڵکە جۆراوجۆرەی لەگــەڵ یەکـدا کۆکردبــوەوە هەرچــەندە نــاکۆکی نــاوەکی و دوبەرەکی هۆزایەتیشیان هەبو، هەموی وەك یەك جەستە داڕشتبون.

سولتان لە یــەك پێکرتنــی ئــەم ڕەگــەزە جۆراوجۆرانــەدا هەنــدێ ئاســتەنگی هاتوەتە ڕێ و لە هەندێ بۆنەدا ناکۆکیش سەری هەڵداوە، بــۆ نمونــە جارێــك لــە (یافا)دا لەشکر یاخی بوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گشت نەتەوە ڕەگەز جیاوازەکــان تا ساڵی ١١٩٢ز هەر ملکەچی فەرمانەکانی سەلاحەددین بون و لە ژێر ڕکێفیــدا مانەوە، هەر لەو کاتەی سولتان سەلاحەددین لە ساڵی (١١٨٧) زاینیــەوە گەلــە کۆمەکی لێخواستن بەردەوام بە یەك سەنگەر لەگەڵیدا بــون و جیهادیــان کــردوە، لەم ماوە درێژخایەنەشدا مێژو هیچ ڕوداوێکــی یــاخیبونی تۆمــار نــەکردوە کــە هــەرێمێك یــان وڵاتێــك یــان ســەرکردەیەك هەڵگەڕابێتــەوە و ئــەو دڵــسۆزی و پشتیوانیەی ئەوان دەریانبڕیوە وەفادار و هەرە بــە هێزەکــانی سەرسـام کـردوە. ئەوەی زانیومانە یەکێك لە خزمەکانی لە عێراق شۆڕشــی لــە دژدا بــەرپا کــرد، بەڵام سولتان پیاوەتی لە گەڵدا کرد و لێی بوریەو ئەویش کەفوکوڵی دامرکایــەوە و چیتر هەڵنەگەڕایەوە. لەمەوە دەردەکەوێ کە سولتان چ ڕێز و سامێکی بەســەر وڵات و هاوڵاتیەکاندا هەبوە.

شەڕ کە پێنج ساڵی خایاند کۆتایی هات، مەینەت و دەردەسەریەکان بڕانەوە، سولتان خۆی تاکە پاشا بو هەر لە شاخەکانی کوردانەوە تا بیابانی (نۆبە)، خــۆی پاشای وڵاتی کوردان و ئەرمەنستان بو، سولتانی قۆنیە و قەیسەری قوستەنتینیە لەو دیوی ئەم سنورەوە حەزیان دەکرد دۆستایەتی لەگەڵ سەلاحەددیندا ببەســتن و یارمــەتی بگۆڕنــەوە، بــەڵام ســەلاحەددین خــۆی بەرمنــەت نــەکردو یارمــەتی هــەردوکیانی ڕەت کــردەوە، بۆیــە لــە شــەڕەکاندا هــەرگیز لــە یارمەتیــدانی سەلاحەددیندا ئامادە نەبوینە ، تەنها بۆ پیرۆزبایی ئامادە دەبون.

سەلاحەددین خۆی پاڵەوانی ئەم شەڕوشۆڕە بو، خۆی چەقی بازنەکە بو ، مەلیك عادلی براشی دوەم کەسێتی بو کە لەسەر شانۆی شەڕەکاندا ڕۆڵی هەبوبێ، نەمانزانیوە سەرکردەیەك یان فەرماندەیەك شوێنی سوڵتانی گرتبێتەوە، سوڵتان ئەنجومەنێکی ڕاوێژی هەبو لە نەخشەی شەڕەکاندا پرس و ڕای پێ دەکردن، کەم جار بوە ڕای هەڵەی ئەم ئەنجومەنە بەسەر ڕای ڕاستی سوڵتان زاڵ بوبێ، وەك لە شەڕی (صور) و (عەککا)دا ڕویدا، بەلاّم هیچ یەکێك لە ئەندامانی ئەم مەجلیسەدا سەلاحەددینی بە کەس نەدەگۆڕیەوە. برا و برازا و کوڕانی برازا و برادەرانی دێرین و والیە نوێیەکان و هۆشمەندان و دادوەر و زیرەکەکان و متمانەپێکراوە ئەمەکدارەکان و دەمارگیرەکان و ئامۆژگارەکان و زانایان، هەمو بۆ جیهاد یەك دەنگ و یەك سەنگەر بون، شان بە شانی یەکتر لەژێر ئالاّکەی سەلاحەددیندا بە هەمو هێز و بازو و وتە و تواناوە ئامادە بون، هەمو دەیانزانی سەلاحەددین گەورە و فەرماندەی هەموانە، لە کاتی تەنگانە و قەیرانی جۆراوجۆر و شەڕی بێئامانـدا یەك دڵ و یەك ئیرادە سەرکردایەتی دەرکردن، ئەویش دڵە بەهێز و ئیرادە پۆڵاّیەکەی سەلاحەددین بو)).

## بێ سەرکردایەتی جیهانی ئیسلامی لە دوای سەلاحەددیندا :

سەلاحەددین دوای ئەوەی ئەرکە گرنگەکەی خۆی تا ڕاددەیەکی دور بەجێ گەیاند کۆچی دوایی کرد، ئەو مەترسیە نزیك و توشەی هەڕەشەی لە قەوارە و مەڵبەندی ئیسلام دەکرد ڕەویەوە، لافاوی خاچپەرستان بەرەو دواوە کشایەوە، بەلاّم خاچپەرستەکان چەندین دەرسی بە سودیان وەرگرت و لایەنە بەهێز و بێهێزەکانی هەردو سەنگەریان تۆژیەوە، گەڕانەوە تا خۆیان بۆ هەڵمەتی خاچپەرستانەی سەدەی نۆزدەم ڕێکخەنەوە ، موسڵمانەکانیش بۆ ڕەوشی دابڕدابڕبون و بەربەرەکاری و ڕکوکینە و بێئاگابونی جاران گەڕانەوە، ئیتر لەو کاتیوە جیهانی ئیسلامی بە پەیدابونی سەرکردەیەك خۆشبەخت نەبوە کە بۆ ئیسلام دڵسۆز بێت و لە پێناو بەرژەوەندی ئیسلامدا خۆی لە هەوەست هەڵبوێرێ و بۆ جیهاد خۆی تەرخان کردبێ و لەبەر دڵان خۆشەویست بێ و خەڵکی لە

دەوردا کۆ بێتەوە و وەك سەلاحەددین بێ، کە سەلاحەددین بە یارمەتی خوا و بە هۆی بەهرە مەزنەکانیەوە توانی پاشەکشە بە هەمو ئەوروپا بکات و موڵك و شکۆی ئیسلام بپارێزێ. بۆیە لەدوای سەلاحەددینەوە داڕوخان سەرتاپای جیهانی ئیسلامی گرتەوە و داڕوخانەکەش ڕۆژ بە ڕۆژ زێتر دەبو.

## بەرهەمی سەدە هەڵوەشاوەکان:

شانەی ئیسلام لە ڕۆژگاری داڕوخانیشدا هەمیشە هەنگوینی وەبەرهەم هێناوە، جیهانی ئیسلامی ناوەناوە پاشاو سەرکردەی وای لێ هەڵکەوتوە کە لە ڕەوشت و ڕێژین و دین و تەقوادا وەك یاوەر و پێشینە چاکەکان بێ و پیاوی وای لێ پەیدا بوە کە مێژویان ڕازاندۆتەوە .

موسڵمانەکان —هەرچەندە لە ڕێژین و ڕێوشوێنی پیاوانی پێشین لارێ ببون[1]، بەلاّم- لە ڕێبازی پێغەمبەرانەوە نزیکتر بون. بە بەراود لەگەڵ نەتەوە نەفامە هاوچەرخەکانیانەوە ئەوان پتر بۆ خوا گوێڕایەڵ بون و وجود و دەوڵەتەکەشیان گەورەترین کۆسپ بوە لە بەردەم بلاّوبونەوە و بوژانەوەی نەفامێتیو هەرچەندە کەم و کوڕییان هەبو بەلاّم گەورەترین هێزی جیهان بون و هەمو جۆرە حیسابێکیشیان بۆ دەکرا.

## داڕمانی کۆشکی هێزی ئیسلامی:

ئەم هێزە ئیسلامیە بەرەبەرە لاواز و زەبون دەبو بێئەوەی بیانیەکان هەستی پێ بکەن، تا ئەو ڕۆژەی لە سەدەی حەفتەمی کۆچیدا پشتی موسڵمانان شکێندرا، کە تەتەر هێرشیان هێناو حکومەتی خوارەزمشا- کە دواهەمین ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی بو ـ پارچە پارچە کراو بەغدایان داگیر کرد.. ئەوسا

---

(١) لاڕێبون: إنحراف.

سامۆتكی ترسناك سامی نەما و داهۆڵ[1] كەوتە سەر زەوی و باڵندە و دڕندەش بە دەرفەتیان زانی و بە كێڵگە وەربون و خەڵك لە موسڵمانان و وڵاتی ئیسلامی گیڤ بونەوە.

تەتەر و مەغۆلەكان كەلەپوری موسڵمانانیان هەڵگرتەوە و لە حكومەتدا جێیان گرتنەوە، جا وەرە تێفكرە ئەگەر نەتەوەیەكی نەفام و دڕندە و بێدین و نەزان و ناشارستان و نارۆشنبیر سەركردایەتی جیهان بگرێتە دەست؛ دەبێ مرۆڤایەتی دوچاری چ كلۆڵی و بەدبەختیەك ببێ و جیهان دوچاری چ وێرانیسەك ببێ.



(١) داهۆڵ: شتێكە وەك زەلام لەدار دروست دەكرێ لەنێو كشتوكاڵدا دەچەقێنرێ بۆ لێسڵەمینەوەی باڵندەو جانەوەران.

**بەندی سێیەم**

## رۆژگاری سەرکردایەتی عوسمانی

### عوسمانیەکان لەسەر شانۆی مێژودا:

پاشان تورکە عوسمانیەکان هاتنە سەر شانۆی مێژو، موحەممەدی دوەمی کوڕی موراد کە تەمەنی بیست‌وچوار ساڵ بو قوستەنتینیەی مەزنی پایتەختی وڵاتە بێزەنطیەکانی لە ساڵی (٨٥٧ك-١٤٥٣ز) فەتح کرد، لەگەڵ ئەم فەتحەدا هومێدی ئیسلام نوێ بوەوە و هیوای موسڵمانان بوژایەوە. تورکەکان، لەناو هەموشیان بنەماڵەی عوسمان بۆ سەرکردایەتی نەتەوە ئیسلامیەکان و بۆ گێڕانەوەی هێز و جێڕێزی[1] موسڵمانان لە جیهاندا جێی باوەڕ و متمانە بون، فەتحکردنی قوستەنتینیە کە موسڵمانان بۆ ماوەی هەشت سەدە بو پێیان فەتح نەدەکرا[2]، دەسەلمێنێ کە پیاوی زیرەك و کارامە و بەهێز بون، لە پیشەسازی چەك‌و تفاقی شەڕدا دەسڕەنگین بون، لەسەرکردایەتی سەربازیدا هەڵکەوتو بون، لە ئامراز و کەرستەی شەڕ و بەکارهێنانی هێز و زانست و ئەزموندا لە نەتەوە هاوچەرخەکان پێشکەوتوتر بون، هەڵبەت هەمو نەتەوەیەك دەبێ ئەم سیفەتانەی تێدا هەبێ تا بتوانێ باڵادەست بێ.

---

(١) جێڕێز: شوێنپایە.

(٢) گەلدەکەشتی(اسطول) عەرەبی بە سەرکردایەتی بوسری کوڕی ئەرطەئە ویستی لە ساڵی (٤٤ك-٦٦٤ز) قوستەنتینیە بگرێ. یەزیدی کوڕی موعاویەش لە ساڵی (٥٢ك-٦٧٢ز) قوستەنتینیەی گەمارۆدا، پاشان عەرەبەکان بەلای کەمەوە چوار جار گەمارۆیان داوە بەلام لەبەر سەختیەکەی پێیان فەتح نەکراوە.

## پێشکەوتویی موحەممەدی فاتیح لە هونەری شەڕدا:

موحەممەدی فاتیح –وەك درابەر دەڵێ-: لە زانستی بیرکاریدا شارەزا بو و بە زیرەکانەش لەشەڕدا بەکاری دێنا، بۆ فەتحە مەزنەکەش خۆی ئامادە کردبو و سودی لە هەمو کەلوپەلو کەرستەیەکی شەڕی ئەوکات وەرگرتبو.

گەشتیارێکی خەڵکی شاری بوندوقییە[1] کە ناوی ( GIACOM DE LANGUSCHI) یان لەنگاستۆ (LANGASTON ) بو لە سەروبەندی فەتحکردنەکەدا موحەممەدی فاتیحی بینیوە و بەمجۆرە وەسفی کردوە:

((گەنجێکی تەمەن ٢٦ساڵە[2]، (پاشان دوای ئەوەی وەسفی ئاکار و رەوشتە بەرز و رۆشنبیریە بەرفرەوانەکەی دەکات، دەڵێ: ((زۆر بە وردی لە رەوشی ئیتالیاو پایتەختی پاپا و ئمپراتۆر و ژمارەی پاشانشینەکان دەکۆڵێتەوە و زانیاری کۆدەکاتەوە، نەخشەیەکی لەلایە گشت دەوڵەتو هەرێمەکانی ئەوروپای لەسەر نیشان کراوە، هێندەی تامەزرۆی تۆژینەوە و ناسینی رەوشی جیهان و زانستی جەنگیە تامەزرۆی هیچ شتێکی تر نیە، لێوەتۆژێکی زیتو زیرەکە، بۆ حوکم بە جۆش و خرۆش و بەدەستوبردە، جا ئەی مەسیحیەکان ئەمەیە ئەو پیاوەی کە دەبێ بەرەنگاری ببینەوە کە تا بڵێی وریایە، لە سەرماو گەرما باکی نیە و لە تێنوێتی و برسێتیدا خۆی رادەگرێ... دەڵێ: رۆژگار گۆڕاوە، پێشان رۆژئاوا بەرەو رۆژهەڵات دەخشین، بەڵام ئەمرۆ رۆژهەڵات بەرەو رۆژئاوا هەڵدەکشێ. دەڵێ: دەبێ یەك ئیمپراتۆریەت لە جیهاندا هەبێ، یەك دین و یەك دەوڵەت هەبێ، بۆ هێنانەدی ئەم یەکێتیەش هیچ شوێنێك لەسەر زەویدا لە قوستەنتینیە گونجاوتر نیە))[3].

---

(١) بوندوقیە: Venise : شار و بەندەرێکی بەناوبانگی سەرکەناری دەریای ئەدریاتیکە لە باکوری ئیتالیا.

موئجید -وەرگێر

(٢) ئەوەی راستی بێ تەمەنی ئەوکاتی لە (٢٤) ساڵ تێنەپەڕیبو. -نەدوی-

(٣) (استنبول و حضارة الامبراطورية العثمانية) ل ٣٦-٣٧، نوسینی‌ئوستاد (برنارد لویس) تەعریب: ئوستاد رضوان علي الندوي.

بـارۆن (کـارادڤۆ)(Baron Carra de Vaux) لـه بەشـی یەکـەمی پەرتوکەکەیدا بەناوی (بیرمەندەکانی ئیسـلام) لـەبارەی سـەربردەی موحەممـەدی فاتیحدا دەڵێ:

((موحەممەدی فاتیح ئەم فەتحەی بە پەیمان و بەڵێننامە وەدەست نەهێنا، تەنها بە لاوازێتی وڵاتی بێزەنطی رێی بۆ خۆش نەبو، بەڵکو سولڵتان پێـشـتر نەخـشەی بۆ کێشابو و تـەگبیری کاروبارەکـانی کردبـو و هێـزی زانـستی ئـەو سـەردەمی خستبوە کار. ئەوسا تازە تۆپ دروست دەکرا، بەڵام ئەو زەبەللاحترین تۆپی ئـەو سـەردەمی دروسـت کـرد، ئەنـدازیارێکی شـارەزاو بـە ئـەزمونی تـەرخان کـرد سەرپەرشتی دروستکردنی تۆپێك بکات کە کێشی گوللەتۆپەکەی ٣٠٠ کلیۆغرام بو، مەودای هاوێشـتنەکەی پتر لە یەك میل بـو، دەڵـێن: تۆپەکـە ٧٠٠ کەسـی ویسـتوە تا رابکێشـرێ، تا گوللە تۆپیان خـسـتۆتە نـاوی و ئامـادەی تەقانـدن کـراوە دو سـەعاتی ویـسـتوە، کاتێـك موحەممـەدی فـاتیح بـەرەو فـەتحی قوسـتەنتیـنیە کەوتە رێ سێـسەد هـەزار جـەنگاوەر لـەژێر سـەرکردایەتیەکەی دابـون، ژمـارەتۆپێکی گـەلێك زۆریـشی لەگەڵـدابو، ئـەو گەلەکەشـتیەی قوسـتەنتیـنیەی گەمارۆ دابو بریتی بو لە ١٢٠ کەشتی جەنگی، بە زیرەکایەتی خۆی شێوازێکی دۆزیەوە بۆ ئەوەی بەشێك لە گەلەکەشـتیەکەی[١] لە وشاکانیەوە بخاتە ناو کەنداو، کەشـتیەکانی لەسەر چـەند تەختـەدارێکی بـە بـەز چـەورکراو راخزاندە نێو دەریاوە، بەم رێگەیە لە لای قاسم پاشاوە (٧٠) کەشـتی دابەزانـدە نێو دەریا))[٢].

(١) گەلەکەشتی: گەلەگەمیە، اسطول.

(٢) لە پەراوێزەکانی ئەمیـر شـکیب ئەرسەلانەوە لەسەر (ئێستای جیهانی ئیسـلامی): ١/٢٢٠، چاپی دوەم.

## تازیاریەکانی گەلی تورك :

ئەوسا گەلی تورکی موسڵمان بەسەرکردایەتی بنەماڵەی عوسمانیەکان چەند تازیاریەکی تایبەتیان بەسەر گەلە ئیسلامیەکانیتردا هەبو، بۆیە شایستەی رابەرایەتی موسڵمانان بون:

یەکەم: گەلێکی بێدار و خوێنگەرم و بە ئاوات بون و روحی جیهادیان هەبو و وەك نەتەوە ئیسلامیەکانی رۆژهەڵات توشی نەخۆشیە کوشندە خورەوشتیو کۆمەڵایەتیەکان نەببون -چونکە پەروەردەبونەکەیان لە فیطرەوە نزیك بون و ژیانێکی سادەیان هەبو-.

دوەم: خاوەنی هێزێکی جەنگی بەهێز بون، کە دەیانتوانی بەهۆیەوە دەسەڵاتی ئیسلامیانەی ماددیو روحی رابهێلن و بەرپەرچی شاڵاوی دوژمنانی پێ بدەنەوە و سەرکردایەتی جیهانی پێ بگرنە دەست، عوسمانیەکان هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی دەوڵەتەکەیانەوە پەنایان وەبەر بەکارهێنانی چەكوتفاقی جەنگی برد، بە تایبەتی چەك و تفاقی ئاگردار، بایەخیان بە دروستکردنی تۆپ دا و نوێترین کەرستە و ئامرازی شەریان بەکاردێنا، گرنگیان بە هونەری جەنگو رێکخستن و پرچەککردنی لەشکر دەدا، گەیشتنە رادەیەك کە لە پیشەسازی جەنگیدا لە پێشەوەی گشت گەلاندا بن و ببنە سەرمەشق و پێشەنگی ئەوروپا.

حوکمیان لەسەر سێ کیشوەر دەکرد: ئەوروپا، ئاسیا، ئەفریقیا، لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا لە فارسەوە تا مەراکیشیان گرتە دەست، ئاسیای بچکۆڵەیان خستە ژێر رکێف و پێیان نایە ئەوروپاش و تا شورەکانی ڤیەننا نەگیرسانەوە، هەر خۆیان میر و گەورەی دەریای ناوەراست بون و کەس نەبو لەبەردەمیان قیت بێتەوە... دەریایان کردبوە دەریایەکی عوسمانی و هیچ بێگانەیەکی لێ نەبو، متمانەداری قەیسەر (پەترۆسی گەورە) لە ئاستانەدا نامەیەکی بۆ قەیسەر نوسی و گوتی: ((سوڵتان دەریای رەش بە موڵکی خۆی حسێب دەکات و رێگە بە بێگانان نادا بچنە ناوی)). گەلەکەشتیەکی وایان دروست کرد ئەوروپا رێی پێ نەدەبرد، تەنانەت لە ساڵی (٩٤٥ك-١٤٥٧ز)

میرنشینەکانی پاپا و ڤیەننا و ئیسپانیا و پورتوگال و ماڵتا هەمو بەیەکەوە بۆ تێکشکاندنی ئەم گەلەکەشتیە کۆبونەوە کەچی دادی نەدان و پێیان نەکرا.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە رۆژگاری دەسەڵاتی سلێمان قانونی گەورەدا هەردو دەسەڵاتی وشکانیو دەریاییو، رامیاری و روحی بەیەکەوە کۆ کردبونەوە.

لە رۆژگاری دەسەڵاتی سوڵتان سلێماندا سنوری دەوڵەتی عوسمانی لەلای باکورەوە: (طونە) و (صاوەی روباری) گرتبوەوە، لەلای باشورەوە: گەیشتبوە سەرچاوەی نیل و ئۆقیانوسی هیندی، لەلای رۆژهەڵاتەوە: گەیشتبوە زنجیرە چیاکانی قەفقاسەوە، لەلای رۆژئاواشەوە: گەیشتبوە چیاکانی ئەتڵەس، کە روبەری سەرجەمیان لە (٤٠٠) هەزار میل دوجا زیاتر بو.

گەلەکەشتی عوسمانیەکان پتر لە(٢٠٠٠) کەشتی جەنگی پێکهاتبو، لە بەشی رۆژهەڵاتدا دەسەڵاتی بەسەر دەریای سفید و دەریای ئەدریاتیك و مەرمەڕا و ئەزاق و رەش و سور و فارسدا هەبو.

ئوستاد بەرنارد لویس- مێژوناسی پسپۆر لەبارەی مێژوی تورکیا، لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (ئەستەنبۆڵ) دەڵێ:

((حوکمی سلێمان (١٥٢٠-١٥٦٦ز) کە لەلای تورکەکان بە ( ئەلقانونی ) ناسراوە و لەلای ئەوروپیەکانیش بە ( لوتکەی هێز و شکۆی عوسمانیەکان)...))

((ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دوای ئەوەی چەندسەرکەوتنێکی نوێی وەدەستهێنا؛ روبەرەکەی نێو خاکی ئەوروپاشی گرتەوە، هەروەها لە رۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاستیشدا هێزی دەریاوانی عوسمانی دامەزراند، دوای ئەوەی لە ساڵی (١٩٥٢ز) دەستی بەسەر دورگەی رۆدەس(RHODES) داگرتو لە ساڵی (١٥٢١ز) بەلگردای فەتح کردو خستیە بەر ئەمری خۆی و، سەرکەوتنێکی گەورەشی لە شەڕی مۆهاکس (MOHACS) وەدەست هێنا کە رێگەی فەتحکردنی مەجەر بو، ململانێیەکی بەردەوامی توندوتیژیش لەگەڵ بنەماڵەی

هاپس بێرگ(HAPSBURGS) پەیدابو لەسەر ئەوەی کامیان سەرکردایەتی ئەوروپای ناوەڕاست بکات))[١].

((هەروەها لەشکرێکی عوسمانی لە ساڵی (١٩٢٩ز) شاری ڤیەننای گەمارۆ دا، لە ساڵی(١٥٣٧ز) هێزێکی بچوکی عوسمانی هەوڵیدا پورتوگالیەکان لە دەریای هیندی دەر بکەن، لە ساڵی (١٥٥٣ز) سولتان سلێمان بەسەرکردایەتی خۆی لەشکرێکی بردە سەر ئێران، لە ساڵی (١٥٥٥ز) گەلەکەشتیەکی عوسمانی هەوڵیدا مالتا بگرێ، تا دوای رۆژگارێکی درێژیش هیچ کەس نەیدەزانی ئەم دەسکەوتانە بەرزترین هەڵکشانی رەوتی عوسمانیەکان بون))[٢].

((لەگەڵ فرەوانبونی ئیمپراتۆریەت و هێزی سەربازی عوسمانیەکان باری ئابوریش لەبارتر دەبو، کارگێڕیش وردەکارتر دەبو، رۆشنبیریش دەوڵەمەندتر و ئاستی بەرزتر دەبوەوە))[٣].

((ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە دوای مردنی سولتان سلێماندا پتر لە یەك سەدەش هەر بە هێزێکی بەزەبروزەنگ مایەوە، لە ساڵی (١٦٨٣ز) توانای هەبو دوبارە شالاوێکی گەورە بباتەوە سەر ڤیەننا))[٤].

((لە نامەیەکدا کە کۆچوبێگ(KOCHUBEY) بۆ سولتان موورادی چوارەمی دەنێرێ، دەڵێ: لەدوای رۆژگاری خەلیفە یەکەمینەکانی ئیسلامیەوە هیچ بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوا وەك سولتانە عوسمانیەکان ئاوا بۆ ئیسلام دڵسۆز نەبونە، نەبوە وەکو وان رێزی رێبیرەکانی شەریعەتی ئیسلام و زاناکانیان گرتبێ، ئەم قسەیەش هیچ زێدەڕۆییەکی تێدا نیە. چونکە ئەو رێز و روەتە قوڵەی بنەماڵە تورکەکان و پێشتریش سەلجوقیەکان بەرامبەر بە رێبیرەکانی شەریعەت و زانایان دەیاننواند، لەسەردەمی حوکمی عوسمانیەکان بەردەوام بو بەڵکو پتریش بو، سولتانە عوسمانیەکان بۆ ئەوەی شەریعەت ببێتە یاسای کارپێکراوی وڵات

---

(١) پەرتوکی (تەستەنبۆل) ل٤١-٤١ .

(٢) هەمان سەرچاوە، ل ٤٢-٤٤ .

(٣) هەمان سەرچاوە، ل ٤٣-٤٤ .

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشو.

لەپێش سەرجەم پێشـینانیان دابوەوە، ڕەفتارە چاکەکانیشیان ئەوە دەردەخەن کـە هەسـتێکی قوڵی واجب ئامێزیان لەمەڕ ئەمانەتی ئاینی پیرۆزدا هەبوە))[1].

ڕۆما نەبێ ئەگەرنا گشت شارە بەناوبانگەکانی جیهانی کۆن چونە ناو سنوری دەوڵەتی عوسمانی[2]. تەواوی ئەوروپا لێیان دەترسانو لەبەریان دەلەرزین و پاشا گەورەکانیان دەهاتنە بەر پەیمانی پاشاکانیان، تورك بـچونایە نێـو هـەر گونـد و شارێك خەڵکەکە وەك ڕێزلێنانێك زەنگۆڵی کلێساکانیان لـێ نـەدەدا، پاپـا کـە وەسفو ئاکاری موحەممەدی فاتیحی پێگەیشت فەرمانیکرد وەك جەژن ئاهـەنگ بگێڕنو بۆ ماوەی سـێ ڕۆژیش نوێژ و نزای سوپاسگوزاری ئەنجام بدەن.

سێیەم: گەلـی تورك، نیشتمانەکەیان چاکترین جەرگـە بـو بـۆ سـەرکردایەتی جیهان، نیشتمانەکەیان لە نیمچە دورگـەی بـەلْقان دابـو کـە دەڕوانیتـە ئاسـیاو ئەوروپا. پایتەختەکەشیان لە نێوان دەریای ڕەشوسپی دابو کە وشکایی ئاسـیا و ئەوروپای بە یەکەوە دەبەستەوە، بۆیە باشترین پایتەختی گەورەترین دەوڵەت بـو، حـوکمی ئاسـیاو ئـەوروپا و ئـەفریقایان دەکـرد، تەنانـەت نـاپلیۆن گوتویـەتی: ((ئەگەر دنیا هەموی یەك دەوڵەت بوایە قوسـتەنتینـیە گونجاوترین شار بو ببێتە پایتەخت)).

ئـەوروپا لـە داهاتویـەکی نزیکـدا ترسـناکیەکی گـەورەو کاریگەریـەکی زەبەلاحیشـی لەسەر دەوڵەتی عوسمانی هەبو، چونکە هێزی بـە گـوڕوتینی تێـدا دەوروژا و هۆکارەکانی پێشکەوتنی لە سینگدا وەکەفوکوڵ کەوتبو، بۆیە تورك — ئەگەر خوا مەیلی لـێ بوایە- دەیانتوانی لـە مەیـدانی زانسـتو ئـاوەزدا پـێش بکەون و پێش نەتەوە نەسـرانیەکانی ئەورپاش بکەونەوە، دەیانتوانی بەر لەوەی ئەوروپا جلەوی جیهان بگرێتە دەستو بەرەو ئاگر و کاولکاری ببات، خۆیـان بـبن بە پێشەوای جیهان و بەرەو ڕێی هەقو ڕاست ڕێنونی بکەن.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل (٥٠-٥١) .

(٢) فلسفة التأريخ العثماني، محمد جميل بَيْهم، ص (٢٨٠-٢٨١) .

## داڕوخانی تورك لە خوڕەوشتو متبونیان لە زانست و لە پیشەسازی جەنگیدا: (١)

بەڵام گەلی تورك-وێڕای بەدبەختی خۆیان- بۆ بەدبەختی موسڵمانانیش رویان لە نشێوی و داڕوخان کرد و توشی هەمان نەخۆشیە کوشندەکانی گەلە فەوتاوەکانی رابردو بون، وەکو ئیرەیی(٢)، رکوکینە، ستەمو ئیستبدادی پاشاکان، پەروەردەی کرچوکاڵ، رەوشتی گەندەڵ، ساختەو گزیکاری سەرکردەکان لەگەڵ خەڵك، سستی و هەسانەوەخوازی گەل، بگرە گەلێك رەوشتی بەدو نزمیتریش کە شەقڵی نەتەوە داڕوخاوەکانن، هەر هەموش لەنێو دوتوێی پەرتوکە مێژوییەکانی دەربارەی تورکیای نوسراون باس کراون و لێرەدا ناکرێ بە درێژی باسیان لێوە بکەین. بەڵام نەخۆشی هەرەسەختو کوشندە ئەوەبو کە لە زانستو پیشەسازی جەنگی و رێکخستنی لەشکردا دوچاری متبون ببون. فەرمودەکەی خواو پێغەمبەریان لەبیر کردبو کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمْ : تا بۆو دەکرێ چەك و جبەخانەی شەڕ و ئەسپی سواری پەیدا بکەن و دوژمنی پێ بترسێنن؛ کە دوژمنی خوداشن. غەیری وانیش دوژمنو هەن کە نایانناسن. ﴾الانفال: ٦٠، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ حَيْثُ وَجَدَهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا: حیکمەت بزربوی بڕواداره لە کوێ دۆزیەوە ئەو پێی شایەنترە)). جا لەبەرئەوەی جەرگەو ناوەندێکی زۆر گرنگی رامیاریو جوگرافیان هەبو و وڵاتە ئەوروپیەکانیش وەك شورەیەك دەورەپشتیان تەنیبوەوە، بۆیە دەبوایە هەرگیز لە ئامۆژگاریەکەی سەرکردەی گەورەی ئیسلامی (عەمری کوڕی عاص)-خوا لێی رازی بێ- لانەدەن و ئەوان شایەنترین و لەپێشترین کەس بنو بۆ گوێڕایەڵی هەردەم ئامۆژگاریەکەیان لەبەرچاو بێ کە لە نامەیەکدا بۆ

---

(١) متبون: جمود.

(٢) ئیرەیی: حەسودی.

موسـڵمانەکانی میسـری دەنێریّو دەڵێ: ((براکانم! بزانن دەبـێ تـا ڕۆژی دوایـی لەسەنگەرنشینی دابن، چونکە دوژمنانی دەوروبـەرتان گەلـێ زۆرن و هەمیـشە چاویان بڕیوەتە خاکو وڵاتتان و لێتان وەئاگان)). بەڵام گەلـی تورك ڕاوەسـتان و ڕۆژگاریش بەرەوپێش ڕۆیشـت، گەلـی تورك وەدواکەوتو نەتەوە ئەوروپیەکانیش وەپێش کەوتن.

## متبونی زانستی لە تورکیا:

خاتو (خالیدە ئەدیب هانم) جوان وەسفی متبونی زانـستی تورکیـای کـردوە، پێمان باشە لێرەدا بیهێنینەوە، دەڵێ:

((تا ڕۆژگار ڕۆژگاری فەلسـەفەی کەلامناسی بو زانا ئیـسلامیەکانی تورکیـا ئەرکی سەرشانی خۆیان بە ڕێکـوپێکی ڕادەپەڕانـد، قوتابخانـەی (سـلێمانیە) و (ئەلفاتح) دو مەڵبەندی زانسـتی و هونەریی بەربڵاوی ئەو ڕۆژگـارە بـون، بـەڵام کاتێـك ئـەوروپا تەکانیـدا و فەلسـەفەناس و کەلامناسـەکان بـەردی بناغـەی زانـسـتی نوێیـان دامەزرانـد وەرچـەرخانێکی وا لـە جیهـان رویـدا ئـیتر زانـا ئیسـلامیەکان نەیانتوانی بە ئەرکی فێرکـردن و کـاری مامۆسـتایانەی خۆیـان هەڵبسـتن، زانا ئیسـلامیەکان وا تێدەگەیشتن زانسـت هـەر لـە دۆخـی سـەدەی سـێزدەمی زاینینـدا سـڕ بـوەو هـەنگاوی بـەرەو پێـشـتری هەڵنـەگرتوە، ئـەم تێگەیشتنە چەوتە بەربڵاوە تا سـەدەی نـۆزدەمیش خـۆی بەسـەر سیـسـتەمی خوێندن سـەپاند بو)).

ئەم هزرە چەوتەی زانـا ئیـسـلامیەکانی تورکیـا و وڵاتـانیتر پەیوەنـدی بـە ئیسـلامەوە نەبو، چونکە فەلـسـفەی خواناسـیو کەلامناسـی کـە موسـڵمان و نەسرانیەکانی پێسەرگەرم ببو، لەسەر بناغەی فەلسەفەی ئیغریقیەوە هەڵچنرابو، زۆربەی هەرە زۆریشـی بریتی بو لە بیرو هزرەکانی (ئەرستۆ) کـە فەیلەسـوفێکی بتپەرست بو. من لێرەدا پێم باشە بەراوردێکی تێکڕایی لـە نێـوان ئـاوەزی زانـا مەسیحیەکان و زانا موسڵمانەکان بکەم.

قورئانی پیرۆز بە درێژی باسی بەدیهێنانی بونەوەری نەکردوە، بایەخی هەرەگەورەی بە لایەنی خورەوشتو کۆمەڵایەتی داوە، مەبەستی گەورەی ئەوەبوە باش لە خراپ و جوان لە دزێو جویێ کاتەوە، قورئان بەرنامەکەی بۆ سەرجەم جیهان هێناوە، کە لەبارەی ئەودیو سروشتەوە دواوە یان کە دەرگای بابەتێکی روحی کردۆتەوە کەم جار بوە ئاڵۆزکاوی و گرێوگاڵی تێدا بویێ، مەبەستی سەرەکی قورئان ئەوەبو خەڵك فێری یەکخواناسی بێت. ئیسلام ئاینێکی لێبوردەو سادەیە و سینەی لە سینەی ئاینەکانیتر فرەوانترە و بیردۆزە نوێکانی دەربارەی سروشتو بونەوەر پتر لە ئامێزی ئەودا جێگەیان دەبێتەوە، بەڵام بەداخەوە ئەو لێبوردەییو سادەییەی کە هاندەرێك بو بۆ لێکۆڵینەوەی زانستە تازەکان درێژەی نەخایاند. زاناو کەلامناسەکان لە سەدەی نۆیەمی کۆچیەوەرا- جگە لە فیقهـ- زانستی خواناسیشیان پڕ کۆتو زنجیر کرد، دەرگای لێوەکۆڵین[1] و ئیجتهادیشیان داخست، ئیتر لەوێوە هزرەکانی (ئەرستۆ) خزیە نێو فەلسەفەی ئیسلامی.

بەڵام ئاینی مەسیحی-کە هەرچەندە شایستەترە پێی بگوترێ ئاینی رەبەن پۆڵس-لە (سیفری سەرەتای پەیدابون)دا بە درێژی باسی جیهانی سروشتی کردوە، نەسرانیەکان پێیان وابو هەرچی لەوێدا نوسراوە وتەی پیرۆزی خوایە و لەسەریانە بڕوای بەهێزی پێ بێنن، بەڵام کە بینیان واقیع شتێکیترەو ئەزمون بۆیان ناسەلمێنێ، پەنایان وەبەر رێگەی بەڵگەخوازی بردو خۆیان بە بژانگی ئەرستۆوە هەڵواسی، چونکە ژیربێژیکاریەکەی ئەرستۆ وەك جادو بەکار بو.[2]

کاتێك رۆژئاوا لە رێی بینینو ئەزمونو شیکردنەوە و بەشبەشکاریەوە لە سروشتی کۆڵیەوە، پیاوانی کەنیسە دەستیان لە هەمبانەی بەتاڵ مایەوە، هەروەها کاتێك کە زاناکان لە رێگەی ئەزمونی کرداریەوە گەیشتنە کۆمەڵێك دۆزینەوەی گرنگو سەرکەوتنیان وەدەست هێنا، زانا نەسرانیەکان ترسی لەناوچونی دەسەڵاتی کەنیسەیان لێ نیشت، بۆیە کەوتنە دژایەتیکردنی زانایان

(١) لیوەکۆڵین: تحقیق.

(٢) بەڵگەخوازی: استدلال.    ژیربێژی: منطق.

و ململانێیەکی توندوتیژ لە نێوان ئاینو زانست پەیدا بو، گەلێك زانای گەورەی سروشتناسی کۆڵنەدەریش بونە قوربانی دژایەتیەکانی کەنیسە.

کەنیسە دوای شەڕە خوێناویەکەی نێوان ئاین و زانست ناچار بو ملکەچی واقیع بێت، زانستە سروشتناسیەکان بخاتە نێو پرۆگرامی خوێندنگەو کۆلێژەکانی، زانکۆکانی کە تا دوێنێ جیاوازی لەگەڵ فێرگە ئیسلامیەکان نەبو، بونە مەڵبەندی زانستە تازە و سروشتیەکان، فەلسەفەکەی خۆشی بەجێ نەهێشتو وازی لێ نەهێنا، بەم شێوەیە کەنیسە توانی دەسەڵاتەکەی لەسەر چینی رۆشنبیران بپارێزێ، کەشیشە[1] کاتۆلیكو پرۆتستانتەکانیش دەستێکی باڵایان لە زانستە نوێیەکان پەیدا کردو توانیان لە بابەتە تازەکان بتۆژنەوە.

بەڵام زاناکانی تورکیا لە رەوشێکی پێچەوانەدا بون، بایەخیان بە زانستی نوێ نەدەدا و نەیاندەهێشت هزری تازە رویان تێکا و رێگەیان نەدەدا زانستی نوێو ناوازەیان لێ نزیك بێتەوە، هەڵبەت جڵەوی خوێندنو فێرکردنی نەتەوەی ئیسلامیش هەر لە دەست ئەواندا بو، بۆیە سیستەمە فێرخوازیەکەیان جمودی بەسەردا زاڵ بو، هەروەها لە رۆژگاری داڕوخانەکەدا کێشە و گرفتە سیاسیەکانیش هەمو روێکی داگرتبوەوە و بواری بۆ زاناکان نەهێشتبوەوە بەکاری ئەزمونو سەرنجکاری[2] هەڵبستن، هەر پێیان دەکرا لە فەلسەفەکەی ئەرستۆدا رۆبچن و بە زانستی بەڵگەخوازی خەریك بن، جا بۆیە رەوشو چۆنیەتی خوێندنگە ئیسلامیەکان لەسەدەی سێزدەمدا چۆن بو لەسەدەی نۆزدەمیشدا هەروا مایەوە))[3].

---

(١) کەشیش: قەشە.

(٢) سەرنجکاری: المشاهدة.

(٣) (صراع الشرق والغرب في ترکیا) کۆمەڵە وتارێك بون خاتو خالیدی لە زانکۆی گەلی ئیسلامیدا بە زمانی ئینگلیزی پێشکەش کردوە، وتاری دوەم ( داڕوخانی عوسمانیەکان )، ل ٤٠-٤٣:
Conflict of East and west in Turkey by halide Edib. p.٤٠-٤٣

## داڕوخانی هزری و زانستی گشتی:

متبونە زانستی و کفتبونە هزریەکە وەنەبێ تەنها تورکیا و نێوەندە زانستی و دینیەکانی داگرتبێتەوە، بەڵکو سەرتاپای جیهانی ئیسلامی لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوای داگرتبوەوە، هەموی دوچار نەزۆکی زانستی و نیمچە ئیفلیجبونێکی هزری ببون، توشی شەکەت و ساردبونەوە ببون و لە حاڵەتی وەنەوز و بۆرژان[1] دابون، ڕەنگە سەدەی نۆزدەم -ئەگەر نەڵێین سەدەی هەژدەم- دواهەمین سەدەی چالاکی و بەرهەمهێنان و داهێنانی زانست و ئاین و شیعر و پەندو ئەدەب بوبێ، سەدەی دەیەمیش یەکەمین سەدەی دامرکانەوەو لاساخوازی و سوان بوبێ.

دامرکانەوەکە سەرتاپاگیر بو، گشت بوارەکانی ئاین و ئەدەب و واتا شیعری و پەخشانیەکان و مێژو و پرۆگرامی خوێندنی داگرتبوەوە، لەو پەڕتوکانەی کە دەربارەی سەربردە و ژیانی ناوداران دانراون ناسناوی عەبقەری یان هەڵکەوتو یان تەنانەت لێکۆڵەرەوە بە باڵای هیچکامێکیاندا نەبڕاوە، کەسێك نەبو لە هونەرێك لە هونەرەکان شتێکی ناوازە و تازەی داهێنابێ یان زانستێکی دەوڵەمەند کردبێ، مەگەر چەند تاکێك کە ئەوانیش لە دەوروبەری جیهانی ئیسلامیدا ژیاون، وەکو: شێخ ئەحمەدی کوڕی عەبدولئەحەدی سەرهەندی (لە ١٠٣٤ ك مردوە)کە خاوەنی (الرسالة الخالدة في الشريعة والمعارف الالهية)یە، شێخ ولی‌اللەی کوڕی عبدالرحیمی دەهلەوی (لە ١١٧٦ ك مردوە) کە خاوەنی ئەم کۆمەڵە پەرتوکەیە: (حجة الله البالغة)، (إزالة الخفاء)، (الفوز الكبير)، (رسالة الإنصاف)، کوڕەکەی: شێخ رفیع الدین (لە ١٢٣٣ ك مردوە) کە خاوەنی (تکمیل الأذهان) و(أسرار المحبة)یە، شێخ ئیسماعیلی کوڕی عبدالغنی کوڕی ولی‌اللەی دەهلەوی (لە ١٢٤٦ مردوە) کە خاوەنی ئەم پەرتوکانەیە: (منصب الإمامة)، (العقبات والصراط المستقیم)[2].

---

(١) بۆرژان: خەوەکوتکە، النعاس.

(٢) لە بەرگی (٥،٦،٧)ی پەرتوکی (نزهة الخواطر)ی دانراوی زانای هەرەزان (عبدالحي الحسني) دا سەربردەکانیان بخوێنەوە.

لە سەدەکانی کۆتاییدا -لەگەڵ ئەوەی گەلێك شیعر دانراون و زۆریشیان تێدا گوتراوە، بەڵام- شیعرێك نیە بە ئاسانی ئەزبەر بکرێ[١]، پەخشانێك نیە دڵان گوشاد و شاد کا، ئەدەبێکی سارد و سست وەدی دەکەی کە لە وشەئارایی و زێدەڕۆیی‌و وتە و واتای فشۆڵ پڕکراوە و لە مەدحی خۆڕاپێشکەرانەو عەشقی لوسکە و ڕەوالان سیخناخ[٢] بوە. تەنانەت لە نامە گۆڕینەوەی نێوان برا و برادەران و نوسینی ئاسایی و نائەدەبیشدا خۆگوشین‌و ئاڵۆزی تێ ئاخنراوە، تەنانەت ئەو پەرتوکانەی دەربارەی سەربردەو مێژوش دانراون بە سەروادارى نوسراون.

لە کۆڕ و مەکۆی خوێندندا پەرتوکی زاناکانی پێشان پشتگوێ خرابون، پەرتوکی ئاڵۆزی پڕ پەراوێز و تەقریر و کورتکردنەوەو مەتنی قورسی زاناکانی پاشینیان دەخوێند کە دڵیان نەدەهات کاغەزی زۆر بەکاربێنن‌و بە ئەنقەست گرێوگاڵیان تێدەخست و ئاڵۆزیان دەکرد، دەتگوت لەبارەی پیشەی چڕدادڕی شت دەنوسن، ئەمانە ئەوە دەردەخەن کە جیهانی ئیسلامی دوچاری چ داڕوخانێکی هزری‌و زانستی بوە و چۆن هەناوی داهێزراوە.

## هاوچەرخانی عوسمانیەکان لە ڕۆژهەڵاتدا:

لە ڕۆژهەڵاتدا دو دەوڵەتی بەهێز هاوچەرخی دەوڵەتی عوسمانی بون، یەکەمیان دەوڵەتی مەغۆلیەکان بو، (بابەری تەیموری) کە هاوچەرخی سوڵتان سەلیمی یەکەم بو لە ساڵی (٩٣٣ك-١٥٣٦ز) دایمەزراند، کەپاشای بەهێز و بەهێزتر حوکمی وڵاتیان دەگرتە دەست، لە هەمو پاشا موسڵمانەکان پتر خاوەنی زەبروزەنگ و هێزی جەنگی و خاکی فرەوان بون، بەهێزترین پاشاکانیان (ئەورەنگ زیب) بو، کە دواهەمین پاشای بەهێزی تەیموریەکان بو، دەسەڵات و ڕوبەری وڵاتەکەی لە وڵاتی گشت پاشاکانیتر فرەوانتر بو، خاوەن فتوحاتی مەزنتر

---

(١) ئەزبەرکردن: لەبەرکردن.
(٢) سیخناخ: پڕو تەژیبون بە تێپەستاوتن.

بو، دینداریکی پتەوتر بو، لە قورئانو سوننەت شارەزاتر بو، پتر لە نەوەت ساڵ ژیا و بۆ ماوەی پەنجا ساڵیش حوکمی گیڕا، لە ساڵی (١١١٨ك) یان لە بەرەبەیانی سەدەی هەژدەمی زاینیدا کۆچی دوایی‌کرد، کە سەردەمێکی زۆر گرنگی ئەوروپا بو، بەڵام نە ئەمو نە ئەوانی‌تر لە ئەوروپا ئاگادار نەبون کە چ راپەڕینو روداوێکی گەورەی تێدا دەتەقێتەوە و چ هۆکارێکی پێشکەوتنی تێدا دەدۆزرێتەوە. بە چاوی سوك و بە دڵی پڕ لە کینەوە دەیانڕوانیە بازرگانو پزیشکە گەشتیارەکانی ئەوروپا کە هەرچەندە لەبەر دوری رێگا کەمیشیان رویان لە وڵاتەکەیان دەکرد.

دەوڵەتی دوەم: دەوڵەتی سەفەوی بو، کە لەلای ئەفغانستانەوە دراوسێی دەوڵەتی عوسمانی بو، دەوڵەتێکی پێشکەوتو و شارستان بو، بەڵام جارێك بە کێشەی شیعەگەرێتیو هێرشبردن بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی خەریك بو جارێکی‌تر بە داکۆکی لەخۆکردن.

هەردو دەوڵەت لە سنوری خاکی خۆیاندا گرمۆڵە ببون و قەتیس مابون، هەرشتێك نەك لە ئەوروپاوە بەڵکو لە رۆژهەڵاتی نزیکیش روی دابوایە دورەپەرێز و بێئاگا بون، نەك لە رەوشی وڵاتە بیانیەکان بەڵکو لە رەوشی وڵاتە ئیسلامیەکانیش بێئاگا بون، هاوپەیمانێتی و یەککگرتن بگرە هەر بیریشیان لێ نەدەکردەوە، کە ئەمەش سروشتێکی وڵاتە رۆژهەڵاتیو حکومەتە تاکەکەسیەکانە و باوك بۆ کوڕی بەجێ‌هێشتوە، هەروەها بیریان لەوە نەدەکردەوە کە لە رەوشی زانستیو جەنگی ئەوروپا بتۆژنەوە و سودی لێ وەرگرن و زانستو پیشەسازی هەڵقۆزنەوە.

## راپەڕینی ئەوروپای نەفامێتی و رەوتی بێوچانی بەرەو زانستە سروشتیەکان و پیشەسازی:

سەدەی شازدەم و حەڤدەمی زاینی گرینگترین رۆژگاری مێژوی مرۆڤایەتی بون، سەرەتای سەرهەڵدان و پێشکەوتنی سەدەکانی دواتر بون، لەم دو سەدەیەدا

ئەوروپا لە خەوی قورس و درێژخایەنی رابو، تۆزی خامۆشی لـەخۆی داوەشـاند و روپـەڕی نـەزانی و بێئاگـایی هەڵدایـەوە، بـە تالۆکـە و هەڵـەداوان بـەرەو مەبەستەکانی هەنگاوی هەڵگرت، بـەڵکو بـە گـشت باڵـەکانی بـۆی هـەڵفڕی، هێزەکانی سروشـتی بەیدەسـت دەکـرد[١] و راز و نهێنیـەکانی گـەردونی ئـاوەڵا دەکرد، دەریا و کیشوەری نەدۆزراوەی دەدۆزیەوە و لە گـشت هونـەر و زانـستە جۆراوجۆرەکانی ژیان دەرگای نوێی دەکردەوە.

لەم مـاوە کورتـەدا لـە هـەمو زانـستێکدا پیـاوی زانـا و فـرەزانو هـۆزان هەڵکەوتن وەك: کۆپەرنیکـــــــــۆس(Copernicus)، برۆنـۆ(Bruno)، گالیلـــۆ (Galilio)، کیپلەر(Kepler)، نیـوتن(Newton)و گەلـێ زانای دیکەش، ئەم زانایانە سـیستەمی کۆنیان سڕیەوە و سـیستەمێکی نوێیـان دارِشت و گەلێك جیهانی نویێ زانستییان دۆزیەوە. هەروەها گەلێك گەریدەی[٢] بـەناوبانگیش هەڵکـەوتن وەکـو: کۆلـۆمبس(Columbus)، ڤاسـکۆ دیگاما(Vasco Degama)، ماجەلان(Maglin) .

مێژوی گەلان لەم رۆژگارەدا لە دارِشـتن و قاڵبرِێژی دابو، ئەسـتێرەی هەنـدێ گەلو نەتەوە ئاوا دەبون و هەندێکیتریش هەڵدەهاتن، ئەوەی ئاوا ببو هەڵدەهات و ئەوەی هەڵهاتبو ئاوا دەبو، یەك سـەعاتی ئەوسـا بەرامبـەری رۆژێـك بـەڵکو چەندین رۆژ بو، رۆژێکیش بەرامبەری ساڵێك بەڵکو چەندین ساڵ بو، هەر گەلێك ئەگەر یەك سەعاتی بە فیـڕۆ دابوایە وەك ئەوەبو رۆژگارێك بە فیـڕۆ بدات.

## پاشکەوتنی موسڵمانان لە بوارەکانی ژیاندا :

بـەڵام موسـڵمانەکان نـەك چـەند سـەعاتو رۆژ؛ بگـرە چـەندین سـەدەو وەچەیان[٣] بە فیـڕۆ دا، لە کاتێکدا گەلانی ئەوروپا گشـت دەقیقەو چرکەیەکیان

(١) بەیدەستکردن: تسخیر.
(٢) گەریدە: گەشتیار، رحّال.
(٣) وەچە: نەوە، جیل.

هەڵدەقۆزتەوە و لە بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا هەنگاوی خێرا و بێوچانیان هەڵدەنا و لە ماوەی چەندساڵێکدا رێی چەندین سەدەیان بڕی.

یەکێك لەو شتانەی کە سستو خاوی تورکیا لە روی زانستو پیشەسازیەوە وەدەردەخات ئەوەبو کە لە سەدەی شازدەمی زاینیەوە پیشەی کەشتی‌سازی گەییوەتە تورکیا و لە سەدەی هەژدەمدا ئامێری چاپ و نەخۆشخانە گەیشتۆتە پایتەختەکەی و قوتابخانەکانی هونەری جەنگی ئەوروپیانەش بەهەمان شێوە. تا کۆتایی ئەم سەدەیەش تورکیا لە پیشەسازیو دۆزینەوە تازەکان بێئاگا بو، تەنانەت جارێکیان کە باڵۆنێکیان بینی بە ئاسمانی پایتەختدا هەڵدەفڕی پێیان وابو جادوە یان فێڵێکی کیمیاویە! وڵاتە بچوکەکانی ئەوروپا بەر لە تورکیا دەستیان بەسەر هۆکارەکانی ژیار و خۆشبەختی داگرت، تەنانەت میسریش بە چوار ساڵ پێشتر هێڵی شەمەندەفەری راکێشا و بە چەند مانگێك پێشتریش پولی پۆستەی بەکارهێنا.

## پاشکەوتویی موسڵمانان لە پیشەسازی جەنگیدا:

داڕوخانی موسڵمانەکان تەنها لە بواری تیۆری و فەلسەفی و ژیاریدا نەبو، بەڵکو داڕوخانێکی گشتی بو و سەرجەم لایەنەکانی ژیانی گرتبوەوە، تەنانەت لە پیشەسازی جەنگیشدا لە پاش ئەوروپایان دایەوە، کەچی تورکەکان پێشتر هەرخۆیان سوارچاکی ئەو مەیدانە بون و جیهان هەر بەشان و باڵی ئەوانیدا هەڵدەگوت. بەڵام ئەوروپا بە هۆی دۆزینەوەو داهێنان و رێکخستنی نوێوە توانی لەپێش تورکیا بداتەوە، بەجۆرێك لە ساڵی (١٧٧٤ز) توانی شکستێکی گەورە بە لەشکری عوسمانیەکان بخوات، لەم شەڕەدا وەدەرکەوت کە ئەوروپا لە بواری شەڕ و کوشتاریشدا پێشکەوتوترن، ئەوجا دەوڵەتی عوسمانی کەمێك ئاگادار بۆوە و چەند کەسێکی زیرەك و کارامەی ئەوروپی هێنا تا لەشکرەکەی رێك بخەنو سەربازەکان مەشق بدەن.

سوڵتان سەلیمی سێیەم لە سپێدەی سەدەی نۆزدەمدا بایەخی بە چاکسازی دا، سوڵتان بەبێ مامۆستا خۆی پێگەیاندبو-بەپێچەوانەی سوڵتانەکانی پێشو-

لە دەرەوەی ئاستانە خوێندبوی‌و پەروەردە ببو، کە بوە سـوڵتان گـەلێك فێرگـەی دامەزراند، لە فێرگە ئەندازەییەکاندا خـۆی وانـەی دەگوتـەوە، لەشـکری لەسـەر نەشمو شێوازی نوێ رێکخسـتەوە و سـیسـتەمی رامیاری رێکوپێك کرد، بـەڵام لەبەرئەوەی گەلـی تورك توشی جمودێکی لەرادەبەدەر ببون و دەسـتیان لە شـتی کۆن بەر نەدەبو، بۆیە لەشکر لەدژی سولتان راپەڕین و تیرۆریان کـرد . لـە دوای ئەودا سوڵتان مەحمودی دوەم هات کە لە ساڵی(١٨٠٧ز تا١٨٣٩ز) حوکمی‌گێڕا، دوای ئەویش لەساڵی (١٨٣٩ز تا ١٨٥١ز) سوڵتان عبدالمجیدی یەکەم هاتە سـەر حوکم، هەردوکیان درێژەیان بە کارەکانی سوڵتان سەلیم دا و تورکیایـان کـەمێك بەرەو پێشەوە برد.

ئەگەر بەراوردێك لـە نێـوان پێـشکەوتنەکەی تورکیـای ئیـسـلامی سـەدەی هەژدەم و نۆزدەمدا لەگەڵ پێـشکەوتنەکەی ئـەوروپا بکـەی، بـۆت دەردەکـەوێ جیاوازیەکی لەرادەبەدەریان لە نێواندا هەبوە، پێشکەوتنەکەیان وەك پێـشـبڕکێی نێوان کیسـەڵ‌و کەروێشـك بوە، بەڵام کەروێـشکەکە شـەو نەنوسـتوە و بێوچـان غاری داوە، کیسـەڵەکەش خەوی بەسـەردا زاڵ بـوە و وردە وێـژینك دایگرتـوە و بۆرژاوە.

## ئەو بۆشاییەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەجێی هێشـت:

راستە دەوڵەتی عوسمانی دوچاری ئەو هەمو خەوش‌و نەخۆشـیە ببـو کـە وەك تۆمارێك بـۆ واقیـع و وەك ئەمانـەتێکی مێـژویی باسمـان کـردن، بـەڵام لەگـەڵ ئەمەشدا قەڵایەکی سەخت بو بۆ ئیسـلام و پەرژین و شـورەیەکی بـەهێز بـو بـۆ وڵاتانی ئیسـلامی و بۆ ئەو وڵاتانـەی کـە دەکەونـە رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت کـە حیجاز و فەلەسـتینیشی دەگرتەوە، رێگەی نەدەدا هێزی رۆژئاوا پـێ بخەنـە نـاو خاکـی ئەم وڵاتانە و نەیدەهێشـت وەك تۆپی بەرپێی یاریزانان یاری بـەو وڵاتانـە بکەن و موقەددەساتی پێشـێل بکەن.

رەوش[1] تا سەردەمی دەسەلاتی عبدالحمیدخان وەکو خۆی مایەوە، سولتان هەرچەندە ئەو هەمو رەخنە و تانوتانەشی لێی گیراوە، بەلام لەسەردەمی دەسەلاتەکەیدا گشت هەولە مەسیحیو پلانە جولەکەییەکانی دژ بە موقەددەساتی ئیسلامی پوکاندەوە، تا ئەوەی لە سالانی (١٩١٤-١٩١٨ز) کە جەنگی یەکەمی جیهانی بەرپا بو، هاوپەیمانەکان توانیان عەرەب بخەنە سەنگەری خۆیان و بەگژ تورکانیان وەنێن، ئەوکات هزری نەتەوەپەرستی عەرەبی سەری هەلدا و نیشتمانە عەرەبییەکان لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی جوێ بونەوە و بون بە چەندین ولاتو میرنشینی گەورە و بچوك و ماوەیەکی درێژیش لە ژێر حوکمی ئینتیدابدا مانەوە و پاشان سەربەخۆییان وەرگرت.

ئیتر دەستو بازوێکی بەهێز نەما بیانپارێزێ، دەسەلات و زەبرو زەنگێکی جیهانی نەما سامو ترسی هەبێ.

(ئیسرائیل) لە ئامێزی زلهێزە ئەوروپییەکانەوە لەناو جەرگەی جیهانی عەرەبیدا دامەزرا، لە سالی (١٩٦٧ز) دا توانی دەست بەسەر زیففەی رۆژئاوا و نیمچە دورگەی سینادا بگرێ، بۆ یەکەم جار لە مێژودا جولەکە توانی قودس داگیر بکات، جیهانی عەرەبیش بێئەوەی توانای داکۆکی و بەرگریکردنی هەبێ لەسەر ئەژنۆ و دەستەوگەردەن دانیشتبو! ئەو پەندە عەرەبیە کۆنەی دەگوتەوە کە دەلێ: ((إنما أكِلْتُ يوم أكِلَ الثور الأبيض: واتا ئەو رۆژە کەوتمە بەر خواردن کە گا سپیەکەیان خوارد))[2]. جا بێگومان کۆتایی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی -بەتایبەتی لە رۆژهەلات- گەورەترین سەرکەوتن بو بۆ خاچپەرستانی ئەوروپی و جولەکەکانی جیهانی.. بۆشاییەکیشی بەجێهێشت تا ئێستاش پڕ نەبۆتەوە.

---

(١) رەوش: حال و بار، الوضع.

(٢) کاتی خۆی ئیمام عەلی-خوا لێی رازی بێ- لەبارەی کوشتنی ئیمام عوسمانەوە ئەم پەندەی وت . (مجمع الامثال للميدان: ١/ ٢٥).

بەندی یەكەم

# ئەوروپای ماددەپەرست

## سروشت و مێژوی ژیاری رۆژئاوا:

بەر لەوەی بزانین كە گوازرانەوەی سەركردایەتی لە گەلانی ئیسلامیەوە بۆ گەلانی ئەوروپایی چ كاریگەرێكی لە ئاوەزی جیهان و خورەوشتی گەلانو نەتەوە شارستانەكانو رەوتو خواستی مرۆڤایەتی كردوە و ئایا مرۆڤایەتی چی لێ چنیوە و ئاخۆ قازانجی زیاتر بوە یان زیان و كارەساتەكانی یاخود بە پێچەوانەوە؟.. بەر لەمانە پێویستە سروشتو رەوشو روحی ژیاری رۆژئاوایی بناسینو لە فەلسەفەی ژیانی نەتەوەكانی شارەزا بینو بزانین چۆن ئەم ژیارە پەیدا بوە؟.[1]

ژیاری ئەوروپای سەدەی بیستەم لە دایكبوی سەدە كۆتاییەكانی دوای سەدە تاریكەكانی ئەوروپا یاخود لە دایكبوی سەدە تازەكان نیە وەك زۆرینەی خەڵك وا تێگەییون، بەڵكو مێژوەكەی بۆ هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە و لەسەر بنجی ژیاری یۆنانیو ژیاری رۆمیەوە رواوەو، كەلەپوری رامیاری و ئاوەزیو شارستانی ئەوانی هەڵگرتۆتەوەو، سیستەمی سیاسیو فەلسەفەی كۆمەڵایەتیو كەلەپوری ئاوەزیو زانستی ئەوانی وەرگرتۆتەوەو، شەقڵی ئارەزو و ئەنگێزە و تایبەتمەندیەكانی ئەوانی وەرگرتوە، تەنانەت هەمان رەگەزیشن.

ژیارەكەی یۆنان یەكەمین دیمەنە كە ئاوەزی ئەوروپایی بەرجەستە كردبێ. یەكەم ژیاریشە-مێژو تۆماری كردبێ- كە لەسەر بنچینەی فەلسەفەی ئەوروپایی بنیات نرابێو دەرونی ئەوروپایی تێدا وەدەر كەوتبێ. قوڵلەی ژیاری رۆمانیش لەسەر داروپەردوی ژیارەكەی یۆنان هەڵچنرا. هەردو ژیار یەك روحیان لەبەردا

(١) ئاوەز: عەقڵ          ژیار: الحضارة.

بو، ئەویش روحی ئەوروپایی بو. گەلانی ئەوروپا بە درێـژایی رۆژگـار سروشـت و تایبەتمەندێتی خۆیان پاراسـتوە و نەوە بۆ نەوە فەلسـەفە و زانسـت و ئـەدەب و هزرەکانیان هەڵگرتۆتەوە، تا لە ئەنجامدا لـە سـەدەی نۆزدەمـەوە بـە بـەرگێکی بریقەدارەوە دەرکەوتەوە،-کە خەڵك لەبەر روکەشە گەش‌و رەنگاوڕەنگەکەی- پێی وابێ رایەڵ‌و پۆیـەکی نوێیـە، کەچـی لـە راسـتیدا هـەر بریتـی بـو لـە ریس‌و گوریسـەکەی یۆنان‌و رۆمەکان.

یەکەمجار وا باشترە ژیاری یۆنانی‌و رۆمانی بناسـین‌و لە سروشت و روحەکـەیان شارەزا بین، تا کە رەخنە لـە ژیارەکـەی رۆژئـاوای سـەدەی بیسـتەم دەگـرین‌و مەحکومی دەکەین پەل نەکوتین و بەرچاومان گوشادو رون بێ.

## تایبەتمەندیەکانی ژیاری ئیغریقی:

یۆنانیەکان نەتەوەیەکی بەهرەدارن و لە روی زانسـت‌و ئەدەبـەوە زیـرەکترین و هەڵکەوتوترین نەتەوەن لە جیهان و خاوەنی رونتـریـن‌و گەشترین زەین‌و ئـاوەزن، بە هۆی فەلسـەفە و ئـەدەب و ژمـارە زۆری زانـاو دانـاو هۆزانـەکانی تێیانـدا هەڵکەوتوە؛ پەرتوکخانەکانی جیهانیان سـیخناخ کردوە و رۆڵێکی جاویدانیان لە دنیادا گێڕاوە. [1]

لێرەدا گرنگ ئەوەیە کە سروشـتی ژیـاری ئیغریقـی بناسـین، جـا ئەگـەر بـە دیدێکی شیکارئامێز و رەخنەگرانەوە لە سروشت و تایبەتمەندیەکانی بڕوانین‌و چاو لەم دیەن‌و رواڵەتانەش هەڵبوێرین کە دەگەڵ ژیارەکـانی‌تر تێکدەکەنـەوە، بۆمـان دەردەکەوێ کە لە چەند روێکەوە جیاوازی لەگەڵ ژیارەکانی‌تردا هەبوە-بەتایبەتی ژیارە رۆژهەڵاتیەکان-کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- بڕوابون بە شتە بەرهەستەکان‌و بە هەند هەڵنەگرتنی ئەو شتانەی ناکەونە بەر هەسـتەوە.

٢- بێدینـی‌و لە خوا نەترسـان.

---

(١) سیخناخ: شتی پڕ ئاخنراو. جاویدان: هەتاهەتایی.

٣- خۆهەڵواسینێکی لە رادەبەدەر بە ژیانی دنیاو بایەخدانێکی زۆریش بە چێژو قازانجەکانی.
٤- کێشەی نیشتمانپەرستی.
هەمو ئەم دیمەنە جیاوازانە لە یەك وشەدا کۆ دەبنەوە کە ئەویش بریتیە لە وشەی (ماددەپەرستی)، کەواتە ژیاری یۆنانی ژیارێکی ماددەپەرستی بوە، چونکە سەرلەبەری کلتور و زانستو فەلسەفەو شیعر و ئاینیان لەم سەرچاوەیەوە هەڵگۆزی بو، تەنانەت سیفەتەکانی خواشیان لە چەندین خواوەندی جۆراوجۆردا دەخستە بەرچاو؛ بۆ بژێوی خواوەندێك و بۆ بەزەیی خواوەندێك و بۆ تۆڵەو توڕەیی خواوەندێکیتر، بەم جۆرە بۆ هەر سیفەتێك خواوەندێکیان هەڵدەناو پەیکەرێکی تایبەتیان بۆ دادەتاشیو پەرستگەیان بۆ بنیاد دەنان. هەمو سیفەتێکی ماددیان لێ‌هێنابونە دی، بە دەیان ئەفسانە و سەربردەی پڕوپوچیان بۆ هەڵبەستبون، چەند واتایەکیان بە مێشك دادەهات ﷺ پاشان واتاکانیان لە پەیکەرو کۆتەلان بەرجەستە دەکرد و دەیانکردن بە خوا، هەر بەم جۆرە بۆ خۆشەویستی خواوەندێك و بۆ جوانی خواوەندێكو بۆ گەلێك شتیتر خواوەندیتری تایبەتیان دانابو.. سیستەمی دەئاوەز و نۆفەلەکەی ئەرستۆش هەر بریتی بو لە پژوپۆیەکی[1] ئەم ماددەپەرستیەی کە سروشتی یۆنانی دەقی پێوەگرتبو.
زانا ئەوروپاییەکان دانیان بەوە ناوە کە ژیاری یۆنانی، ماددەپەرستایەتی بەسەردا زاڵ بوە و لە پەرتوكو تۆژینەوەکانیشدا ئاماژەیان بۆ کردوە. زانای ئەڵمانی دکتۆر هاس (Hass) لە جنێفدا سێ وتاری لەژێر سەرناوی (ژیاری ئەوروپا چیە؟) پێشکەش کرد، دکتۆر (هاس) خۆی یەکێکە لەو زانایانەی کە پێیان وایە ژیاری رۆژئاوا نەکەوتۆتە بەر کاریگەری رۆژهەڵاتەوە، بەڵکو ژیارێکی سەربەخۆ و خاوەن ئەدگاری تایبەت بە خۆیە، ئێمەش وا لێرەدا هەندێ لەو وتانەی کە پەیوەندی بە باتەکەوە هەیە دەخەینە رو:

---

(١) پژوپۆ: لق وپۆپی درەخت کە برابێ.

((ژیارەکەی یۆنان هەوێنی ژیاری رۆژئاوای ئەمڕۆیە، پیاوانی ژیاری یۆنانی شتی گرنگیان لەلادا ئەوەبو کە هێزەکانی مرۆڤ بە نەشونمایەکی هاوڕێژە گەشە بکات، نمونە و سەرمەشقی هەرە تەواویان لەلادا بریتی بو لە جەستەی جوانی هاوڕێژە، ئەوەش لەبەر ئەوەبو کە بایەخێکی گەلێ گەورەیان بە شتە بەرهەستەکان و وەرزشی جەستەیی و یاریە وەرزشیەکانو سەماو شتیتر دەدا، رۆشنبیریە زەینەیەکەشان کە شیعر و گۆرانیو نواندنو فەلسەفەو زانستە سروشتیەکانی لەخۆ گرتبو و سنوری دیارو تایبەتی خۆی نەدەبەزاند تا بەڵکو پەرەسەندنە زەینیەکە لەسەر حیسابی جەستە نەبێ، دینەکەیان لە روحانیەتی مەعنەوی خاڵی بو، زانستی ئاینی و توێژی پیاوانی دینی تێدا نەبو، ئەو رەنگە روحیەش کە لە نەریت و رێوڕەسمەکانی (ئەزفس)دا هەبو لە رۆژهەڵاتەوە خوازرا بو، بۆیە راست نیە بە ژیاری یۆنانی حیساب بکرێ)).

زۆر زانای ئەوروپایی ئەوەیان تێبینی کردوە کە یۆنانیەکان دینێکی تەنكولاوازیان هەبوەو کەم لە خواترساون و کاریان بە جددی ئەنجام داوە و بەزمو رەزمو یاری و هەڵپەرکێو تەپڵ و زوڕنایان لە ژیاندا زۆر بوە. (لیکی) لە پەڕتوکەکەیدا بەناوی (مێژوی خورەوشتی ئەوروپا) دەڵێ: ((بزاڤی یۆنانی بزاڤێکی ئاوەزی و زەین ئامێزی پەتی بوە، بەڵام بزاڤی میسری بە پێچەوانەوە بزاڤێکی گیانیو دەرونی بوە. پاشان وتەکەی (ئەپۆلس)ی رۆمی دێنێتەوە کە دەڵێ: ((میسریەکان خواوەندەکانیان بە لالانەوە و گریان بە گەورە دەگرت، بەڵام یۆنانیەکان بە سەما و گۆرانی))، پاشان خۆی دەڵێ: ((بێگومان مێژوەکەی یۆنان ئەم وتەیە بە راست دەخاتەوە و پەسەندی دەکات، چونکە نەمانزانیوە نەریتو باوی هیچ ئاینێك وەکو نەریتو باوی دینەکەی یۆنان هێندە پڕ جەژنو شادی و یاری بوبێ و هێندەش کەم لەخواترس و بێباك بوبێ، یۆنانیەکان هەر هێندەی بە گەورە زانینی پیر و گەورەکانیان خوایان بە گەورە دەزانی، تەنها چەند رێوڕەسمو نەریتێکی ئاساییو سادەیان بۆ بەگەورەتنی خوا ئەنجام دەدا))[1].

---

(١) W.E.H Leaky ,History of European Morals,London,١٨٦٩. Vo١. pp٣٤٤-٥٠.

یۆنانیەکان فەلسەفە و بیروباوەڕێکی وایان دەربارەی خوا هەبو کە زۆر سەیر دەبو ئەگەر لەخواترسانو پەرستن و لالانەوە و هانا وەبەر خوا بردن و لەخوا پاڕانەوەی لەگەڵدا بوایە، چونکە یەکێك نەریٚ لە سیفەتو ویستو ئافەریدگاریتی[1] و فەرمانەکانی خوا بکاتو پێی وابێ (ئاوەزی هەرەبەکار و بزاوتی هەسارەکان) گەردون بەڕێوە دەبەن؛ هەڵبەت ئەو کەسە بە سروشتی ئەم جۆرە بیروباوەڕەوە-مەگەر وەك نەریتو باوێکی وشك و روت ئەگەرنا-هەرگیز لە ژیاندا بۆ خوا هیچ کارێك ناکات و هیوای پێ ناخوازێ و لێی ناترسێ و خۆشی ناوێ و بۆ مەزنێتیەکەی ملکەچ نابێ و لە کاتی تەنگانەدا هانای وەبەر نابات و سوپاس و ستایشی ناکات، وەك ئەوەی خوا و پەروەردگاری نەبێ ئاوا دەژێ. جا ئەگەر گوێمان لێبێ و بڵێن یۆنانیەکان لە خوا نەترساون و پەرستنکاری و دینداریەکەیان وەك لاشەی بێ روح بوە و هەرهێندەی پیرو مەزنەکانیان خوایان بە مەزن گرتوە سەرسام نابین و سەیر نامێنین، بەڵکو لەوە سەرسام دەبین ئەگەر شتی پێچەوانە ببیستین.

نرخ و گرنگی پێدانی لە رادەبەدەر بە ژیانی دونیا و هۆگربونی بێئەندازە بە پەیکەر و وێنە و گۆرانی و مۆسیقا-کە یۆنانیەکان بە هونەرەجوانەکان ناودێریان کردوە-و دەمودو و هەرزەگۆی نوسەر و ئەدیبان بۆ ئازادی بێسنوری تاکەکەسی؛ کارگەرێکی خراپی خستە نێو خوڕەوشتو کۆمەڵگەی یۆنانی، خوڕەوشت دوچاری پاشاگەردانی بو، شۆڕش لە دژی هەمو جۆرە سیستەمێك بەرپا بو، دروشمی کۆماریخوازەکان (کە مرۆڤە ئازادیخواز و روناکبیرەکان دەگرێتەوە)-وەك کەسێکی تێرنەخۆر و تامەزۆر-ببوە وەدەستهێنانی ئارەزوبازی خێراو لە ئامێزگرتنی خۆشیو لرفکردنی چێژی ژینی دونیایی. ئەفلاتونیش لە پەرتوکەکەی (میرنشین)دا هەمان وتەی راگواستۆتەوە- کە دەڵێی رەخنەگرێکی ئەم سەردەمەیەو رەخنە لە گەنجێکی سەدەی بیستەمی نێو پایتەختی یەك لە وڵاتە رۆژاواییەکان دەگرێ، دەڵێ:

---

(١) ئافەریدگار: بەدیهێنەر، خالق.

((ئەگەر پێی بگوترێ: کاکێ! هەندێ چێژ و حەزرەتی هەن چاك و پاکن و شایەنی شکۆ و رێزن، هێندێکیتریش پیس‌و نەگریسن و خواستی ئارەزوی ناپەسندن، بۆیە دەبێ بە گوێرەی جۆری یەکەم بگوزەرێین و جۆری دوەم بەربەست بکەین و بە پێوخواستی ئارەزوی بەد لە رێ نەخرێین. کەچی ئەو ئەم یاسا راستەی پێ راست نیە و گوێی بۆ ناگرێ، کە راستیەکەی بۆ دەخەینە رو بە گاڵتەوە سەر دەلەقێنێ‌و دەڵێ: نەخێر گشت ئارەزوێك وەکو یەکن بێ‌جیاوازی و هەموشیان شایەنی رێزو حورمەتن. ئیتر خۆی‌و فامی خۆی و هەڵکوت هەڵکوت بە پیر هەڵپەهەڵپی ئارەزوەکانی خۆ هەڵداوێ و بە رەزمی حەز دادەبەزێ و هەڵدەبەزێ، رۆژێك سەرمەست‌و لاکەلایە و گوێی بۆ گۆرانی هەڵخستوە، رۆژێکیتر بەرۆژوە و تەنها ئاوی پێ رەوایە، جارێك وەرزشوان و مەشقکارە، جارێکیتر خەمسارد و تەوەززەلی بێکارە، جار هەیە وەك پیتۆلان دەگوزەرێ، جاریش هەیە وەك رامیارێ وتار دەدا لە مینبەرێ، رەنگە حەزی لە سەربازی‌و جەرگەی شەڕ بێ، بەلام دەست دەکات بە بازرگانی چونکە مەراقیەتی بازرگانێکی دەولەمەند و دەست بەفەڕ بێ!، بەمجۆرە ژیانێکی بێ سیستەم و بێ سەروبەر دەباتە سەر، کەچی پێی وایە ژیانێکی تێروتەژی[1] و پڕ لە خۆشی پێ‌براوە، ئیدی تا مردن گوزەرانەکەی بەم نەشمەوە دەباتە سەر))[2].

سەبارەت بە نیشتمانپەرستی لە ئەوروپا؛ سروشتەکەی ئەوروپا وای خواستوە کە کێشەی نیشتمانپەرستی لە ئەوروپادا وەك بەراوردێك لەگەل ئاسیا دیارتر و بەهێزتر بێ، چونکە سروشتی جوگرافی‌و ناوچە سروشتیەکانی ئاسیا فرەوان و پانوپۆڕن و کەش‌و هەواکەی جۆراوجۆرن و خاکەکەی دەولەمەند و پڕ پیت و بەرەکەتە و هۆکاری بژێوی ژیانی گەلێ زۆرن، گەلێك رەگەز و جۆرە مرۆڤیشی تێدا دەژی، بۆیە ولاتانی ئاسیا خێوی روبەرێکی فرەوانن و لە مێژوشدا فرەوانترین ولات و پاشانشین لەسەر خاکی ئاسیا وەدەرکەوتوە، بەلام لە ئەوروپا کێشەی لەپێناو مانەوەدا توندوتیژە و خەباتی لە پێناو ژین بێوچانە،

(١) تەژی: پڕ.

(٢) Republic ,Book VII.

چونکە خانوبەرەکانی قەرەباڵغن و ناوچە و هەرێمەکانی بەرتەنگن و هۆکارەکانی بژێوی ژیانی کەمن، شاخ و داخ و روبارەکانیش رەگەزە جۆراوجۆرەکانی ئەوروپای لە سنورێکی هەمیشە تەسکی سروشتی پەستاوتوە، بە تایبەتی بەشی ناوەڕاستی رۆژئاوا و بەشی باشوری ئەوروپا، کە هەڵبەت ئەم سروشتە رێگە بەوە نادات وڵاتی گەورەو فرەوانی لێ بێتە ئاراوە. سروشتی ئەم کیشوەرە وای خواستوە وڵاتۆکەی بەرتەسکی لێ پەیدا بێ، بۆیە تێڕوانینی سیاسیانەی پێشانی ئەوروپا لە سنوری شارێك تێنەدەپەڕی- کە روبەرەکەی لە چەند میلێك زیاتر نەبو-شارەکەش سەربەخۆییەکی تەواوی وەك وڵاتێکی هەبو. یۆنان نمونەیەکی بەرچاوی ئەم حاڵەتە بوە، هەر لەگەڵ سپێدەی مێژوەوە دەیان شارو شارۆچکەی سەربەخۆی تێدا بوە.

لەبەر ئەوە سەیر نیە ئەگەر یۆنان پەیڕەوی لە رێبازی نیشتمانپەرستی کردبێ، (لیکی) دانی بەوە ناوە کە هزری بەربڵاوی یۆنان بریتی بوە لە نیشتمانپەرستی، هزری جیهانپەروەریش کە چەند هۆزانێکی وەکو (سوقرات) و (ئەنکساگورس) رایانگەیاند شتێکی ریزپەڕ[1] بو، لە سەرتاپای یۆنانیشدا هیچ کەس پشتگیری بۆ دەرنەبڕین و سەرکەوتنیشیان وەدەست نەهێنا. سیستەمە خوڕەوشتیەکەی ئەرستۆ کە لەسەر بنچینەی جیاوازی نێوان رەگەزی یۆنانیو رەگەزەکانیتر چنرا بو، خۆشویستنی نیشتمان لە پێشی هەرە پێشەوەی رەوشتە چاکەکان دەهات کە داناو هۆزانەکانی یۆنان لەسەری کۆدەنگ ببون. ئەرستۆ هەر بە خۆشویستنو پشتگیریکردنی نیشتمان نەوەستا بەڵکو تێی پەڕاند و گوتی: یۆنانیەکان بە چ شێوەیەك رەفتار دەگەڵ ئاژەڵدا دەکەن دەبێ بە هەمان شێوە رەفتار لەگەڵ بێگاناندا بکەن، بەمجۆرە هزری تەسکی نیشتمانپەرستی هەڕمێنی[2] لە نێوەندە یۆنانیەکان پەیدا کرد و پەلوپۆی بە هەناوی وڵاتدا هاوێشت، تەنانەت کە جارێکیان فەیلەسوفێك گوتی: من سودو بەهرەکانی خۆم

(١) ریزپەڕ: شاذ.
(٢) هەڕمێن: رەواج.

تەنها بە هاولاتیەکانم تایبەت ناکەم بەلکو بۆ گشت یۆنانیەکانی رادەنوێنم، خەلك بە سەرسامیو بە تورەیی تێیان هەلدەروانی.

## تایبە تمەندیەکانی ژیاری رۆمانی:

رۆمەکان جێی یۆنانیەکانیان گرتەوە و لە روی هێزو رێکخستن و فرەوانبونی ولات و لایەنی سەربازیدا وەپێشتر کەوتن، بەلام لە لایەنی فەلسەفە و ئەدەب و شیعر و پەروەردە و ژێهاتی[1] و ژیاردا بە ئاستی وان نەگەیشتن، ئیغریقیەکان لەم لایەنانەدا لەسەرجەم نەتەوە هاوچەرخەکانیان تەنانەت لە رۆمیش-کە هێشتا لە قۆناغی سەربازی دابون- پێشکەوتوتر بون و چاکێتیان بەسەر هەمواندا هەبو، بۆیە رۆمەکان لە لایەنی زانستەوە ملکەچیان بونو وەك مشەخۆر لەسەر خوانی زانستو فەلسەفە و هزری ئیغریقیەکان دامەزران.

(لیکی) دەلێ:

((یۆنانیەکان خاوەنی سامانێکی زانستی زەبەللاح بون و بە درێژایی رۆژگارو سەدە بۆ سەدە شتی نوێیان دەخستە سەر، رۆمەکانیش هێشتا لە قۆناغی سەربازیدا بون و خاوەنی هیچ شوێنەوارێکی ئەدەبی نەبون، تەنانەت لە دەربرینی هزرو واتای بەرزیشدا زمانەکەیان ئەو زمانە نەبو، جا لەبەرئەوەی رۆمەکان لە روی زانستەوە پاشکەوتو بون بۆیە ژێر کەوتن و بە سەری شۆرەوە چونە ژێرباری ژیاری یۆنانی کە یۆنانیەکان لە روی سیاسیەوە لەژێرتر بون، تەنانەت ئێستاشی لەگەلدا بێ لە هەمو بەشەکانی زانستدا هەر بەوان کارتێکراون، مێژونوسە کۆنەکانی رۆم پەرتوکەکانی خۆیان بە زمانی یۆنانی دەنوسی، تەنانەت دوای ئەو کاتەش کە شاعیرانی رۆم دەستیان پێکرد بە زمانی لاتینی شیعریان هۆنیەوە؛ هەر زمانی یۆنانی زمانی نوسینو زانست بو))[2].

---

(١) ژێهاتی: لێهاتو.

(٢) Lecky.Op.Cit.p ٢٤٣ .

ئەم ملکەچبونە تەنها بە جیهانی نوسینو ئەدەبەوە تایبەت نەبو، بەڵکو ژیاری ئیغریقی لە رەوشت و ئاکار، لە تێکەڵیو کۆمەڵایەتی، لە سۆز و ئەنگێزەکانو بگرە لە هەمو لایەنەکانی ژیانی گشتیدا بەسەر ژیاری رۆمیدا زاڵ ببون، رۆم بە هەمو شێوەیەك لاسای ئیغریقی دەکرەوە و شانازیشی پێوە دەکرد.

بەمجۆرە فەلسەفەو کلتوری یۆنانیەکان بگرە دەرونەکەشیان بۆ رۆمەکان گوازرایەوە و دەگەڵ خوێنی رۆمەکان ئاوێتە بون، رۆمەکان-بەهۆی سروشتە ئەوروپاییەکەیانەوە- لە رێختەوە[1] جیاوازیەکی زۆریان لەگەڵ یۆنانیەکان نەبو بەڵکو لە زۆر شت وێکیش دەچون، هەردولا بڕوایان تەنها بە شتە بەرهەستەکان هەبو، بایەخێکی لە رادەبەدەریان بە ژیانی دنیا دەدا، گومانیان لە دین هەبو، یەقینێکی شپرزە و بیروباوەڕێکی شێواویان هەبو، بە سوکی سەیری سیستەم و نەریت و باوی ئاینیان دەکرد، فیز و دەماری نەتەوەپەرستییان هەبو و لاف و گەزافیان پێ لێدەدا، لە رادەبەدەر نیشتمانیان خۆشدەویست، وێرای هەمو ئەمانەش لە راددەبەدەر بایەخیان بە هێزوبازو دەدا و بە جۆرێك پێی دەنازین، گەیشتبوە راددەی پەرستنو بە پیرۆز زانین .

لەمێژودا دەردەکەوێ رۆمەکان بڕوایەکی پتەویان بە دین نەبوە، رەنگە تەوازۆیان[2] هەبوبێ، چونکە ئەو سیستەمە دینیە پڕ بتپەرستیو ئەفسانەییەی لە رۆما بەربڵاو بو ببوە هۆی ئەوەی گومانو شێواویو لاوازی بخزێتە نێو بڕواوە. جا هەرچەندی لە روی زانست پێشدەکەوتنو هزرو هۆشیان روناکتر دەبوەوە؛ سوکتر سەیری دینیان دەکرد، لە سەرەتاشەوە بڕیاریان لەسەر ئەوەدابو کە خواوەندەکان پەیوەندییان بە سیاسەت و کاروباری دنیاوە نیە.

---

(١) رێخت: سروشت، فطرة.

(٢) تەوازۆ: عوزر.

سیسێرۆ (Sicsero) دەڵێ:

((ئەکتەرەکان لە شانۆدا کاتێك شیعریان لەو بارەوە دەگوت کە خواوەندەکان پەیوەندییان بە کاروباری دنیاوە نیە خەڵك گوێی بۆ رادەدێران و بە تاسەوە گوێبیستیان دەبون))[1].

رەبەن[2] ئۆگەستن (Auguosttne) دەڵێ:

((رۆمە بتپەرستەکان لە پەرستگەدا خواوەندەکانیان دەپەرست بەڵام لە شانۆدا گاڵتەیان پێ دەکردن))[3]، دینی رۆمەکان دەسەڵاتی بەسەر روحی دیندارەکان نەما بو، سۆزی ئاینیی نێو دڵی خەڵك بەجۆرێك سارد ببوەوە خەڵکانێك زۆر بە ئاسایی بوێرن قسەی ناشرین بە خواوەندەکان بڵێن و ریسوایان بکەن. مێژو دەگێڕێتەوە کاتێك گەلەکەشتیەکی[4] ئیمپراتۆر ئۆگەستس (Augustus) لە دەریادا نقوم بو ئیمپراتۆر لە تورەییان ئاگری لەچاو هەڵدەبو، پەیکەری نیپتۆن (خواوەندی دەریا)ی هێنا وردوخاشی کرد. کاتێك گێرمانیکەس (Germanicus) مرد خەڵك هەڵسان ئەو بت و پەیکەرانەیان سەنگەسار[5] کرد کە قوربانییان بۆ سەردەبڕی)[6].

دین کاریگەری بەسەر رەوشت و سیاسەت و کۆمەڵگەدا نەبو، دەسەڵاتی بەسەر هەست و نەست و رەوشت و ئارەزودا نەبو، دینێکی قوڵی ئەوتۆ نەبو حوکم بەسەر روحدا بکات و لە ناخی دڵەوە هەڵقوڵێ، بەڵکو نەریتێك بو هاوشێوەی نەریتەکانیتر، بەڵام سیاسەت وای دەخواست بیهێڵێتەوە ئەگەرچی بە ناو و رواڵەتیش بێت، (لیکی)دەڵێ:

((دینی رۆمەکان، خەڵك بۆخۆی ئازاد بو بیگرن یان نا، مەبەستی دین تەنها بۆ ئەوە بو تاکەکان ئاسودە بژین و لە تەنگانەو دەردەسەری وەدور بن، ئەوەتانێ

(١) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ١٧٨ .

(٢) رەبەن: راهب.

(٣) هەمان سەرچاوە پێشو، ل ١٧٩.

(٤) گەلەکەشتی: أسطول.

(٥) سەنگەسار: بەردباران.

(٦) تأريخ أخلاق أوروبا: History of European Morals (The pagan Empire),p١٧٨

لە رۆمادا سەدان پاڵەوان و پیاوی مەزن هەڵکەوتن بەڵام زاهیدێکی تەریکە دونیا پەیدا نەبو، هەر نمونەیەکی قوربانیدان و خۆفیداکردنیشت لە مێژوی رۆمدا بەرگوێ کەوێ هیچ کاریگەرێکی ئاینیی بەسەرەوە نەبوە و بەڵکو تەنها لە پێناو نیشتمانپەرستی بوە))[1].

ئەو دیاردەیەی نەتەوەی رۆمی پێ لەسەرجەم نەتەوە هاوچەرخەکانی ئەوساو دواتر پێ جوێ دەبێتەوە، کە وەك دینێك پەیڕەویان لێکردوەو وەك دروشمێکیش پێی دەناسرێنەوە، بریتیە لە روحی ئیستیعماریانە و تێڕوانینی ماددیانەی روت وپەتی بۆ ژیان، ئەوروپای ئەمڕۆش هەمان روحو تێڕوانینی لەوان هەڵگرتۆتەوە.

زانای موسڵمانی ئەڵمانی ئوستاد(موحەممەد ئەسەد) لەپەڕتوکە بەهادارەکەیدا بە ناوی (ئیسلام لە ئەرزی فرەڕێبوندا) وەسفێکی جوانی ئەم حاڵەتەی کردوە و دەڵێ:

((هزری زاڵی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی ئەوەبو کە هەمو هێزێك لە دەست خۆی کۆکاتەوە و گەلانیتریش لە پێناو بەرژەوەندی نیشتمانی رۆمدا بچەوسێنێتەوە، فەرمانڕەواکانی رۆم لە پێناو خۆشکردنی گوزەرانی چینێکی دیاریکراو دەستیان لە هیچ جۆرە زوڵمێك نەدەپاراست، ئەو دادگەریە بەناوبانگەی رۆمیش هەیبو هەر تەنها بۆ رۆم بو. بێگومان ئەم چەشنە ژینە لە تێڕوانینێکەوە سەرچاوە هەڵدەبەستێ کە بە شێوەیەکی ماددەپەرستانەی زۆر پەتی بۆ ژیان و ژیار بڕوانێ. ماددەپەرستیەکەی رۆم ئەگەرچی چەشەیەکی[2] ئاوەزی تێدا بو بەڵام لە گشت بەها روحیەکان دوربو. رۆمەکان قەت بە جددی ئاینداریيان نەکردوە، خواوەندە تەقلیدیەکانیان بریتی بو لە حەشاماتێك ئەفسانە و سەربردەی پڕوپوچی ئیغریقی، لەبەرئەوەش بڕوایان پێهێنابون چونکە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی دەپاراست و یەکێتی بۆ دابین دەکردن. رێگەیان بە خواوەندەکان نەدەدا دەست بخەنە کاروباری ژیانی رۆژانەیان، بەڵام لەبارەی مەسەلە پەنامەکیەکانەوە[3] بە

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ١٧٧.

(٢) چەشە: زەوق.

(٣) پەنامەکی: غیب.

هۆی کاهین و ئەستێرەناسانەوە ڕێگەیان دەدا پرسیار لە خواوەندان بکرێ، بەڵام بۆ یاساداڕێژی .. هەرگیز))[1].

## داڕوخانی خوڕەوشتی لە کۆماری ڕۆمیدا:

ڕۆمەکان لە ئاخروئۆخری ڕۆژگاری کۆماریدا دوچاری داڕوخانی خوڕەوشتی بون، دەریای خۆشگوزەرانی و تێروتەژی و دەسبلاوی لافاوێکی زەبەللاحی لێ هەڵکردن و تا گەردنان نغرۆی کردن، سیستەمە خوڕەوشتیەکانی تێکوپێکشکاند، بونیادی کۆمەڵایەتی وەلەرزەخست و خەریکبو لەبەریەکی هەڵوەشێنێتەوە، (درابەر)ی ئەمریکی بە پێنوسە بە پێزەکەی ئەم رەوشەی خستۆتە بەر چاو و دەڵێ:

((وڵاتی ڕۆم کاتێك لە لایەنی هێزی جەنگیو دەسەڵاتی سیاسیدا و لە لایەنی شارستانیدا گەیشتە ئەوپەڕی بەرزی، لە لایەنی خوڕەوشتو ئاین و چاکەکاری داڕوخا و گەیشتە ئەوپەڕی نزمی... ڕۆمەکان بەهۆی گوزەرانە گوشادەکەیانەوە لوتبەرز بونو پێیان وابو ژیانی دنیا نەبڕاوەیە، بۆیە بەوپەڕی کەیفوسەفاوە ڕایاندەبوارد. پێیان وابو ژیانی دونیا تاکە دەرفەتێکە بۆ ڕابواردن بۆیە مرۆڤ تا پێی بکرێ دەبێ خۆشیو نۆشی وەدەست بێنێ، کە جاروباریش هەندێ شتیان نەخواردوە و دەمی خۆیان گرتۆتەوە بۆ ئەوە بوە تاسەیان[2] تامەزرۆتر بێ، یاخود کە هێدی هێدی خواردویانە بۆ ئەوە بوە تەمەنی چێژو خۆشیەکەیان درێژتر بێ.

خوانی خواردنیان بە قاپو پیاڵەو کاسەی زێڕ و زیوی بە مرواری نەخشێنراو دەبریقایەوە، نۆکەری کەشخەی بەرگ قەشەنگو ئافرەتی شلكو جوان و شەنگ و سۆزانی بە لەختولار و نیوەڕوت خزمەتی دەکردن. گەلێك گەرماوی گەورە و گۆڕەپانی فرەوان و یاریگەی پانوپۆڕیان بنیات نابو، گەلێ یاری جۆراوجۆریان سازدابو، یاریگەی زۆرانبازێی تایبەتیان هەبو، کە پاڵەوان لەگەڵ پاڵەوان یاخود

(١) Islam at the Cross Roads,p.٣٨-٣٩ .

(٢) تاسە: تامەزرۆ.

پاڵەوان لەگەڵ دڕندە ململانێی دەکرد تا یەکێکیان نەمردایەو لە خلتانی خوێن نەگەوزایە یاری کۆتایی نەدەهات.

داگیرکەرەکانی جیهان گەیشتونەتە ئەوەی کە ئەگەر شتێك هەبێ شایستەی پەرستن بێ بریتیە لە هێز، چونکە مرۆڤ بە زەبری ئەم هێزەوە دەتوانێ سامانی رەنجو ئارەقەی خەڵك داگیر بکات، ئەگەر مرۆڤ بتوانێ بەزەبری هێزوبازو لە مەیدانی شەڕ سەرکەوێ ئەوکات بە ئاسانی دەتوانێ دەست بەسەر ماڵو موڵکی خەڵکی دابگرێو باجو دەرامەتیان لێوەرگرێ، جا سەکردەکانی وڵاتی رۆم هێمای ئەم جۆرە هێزە بەزەبر و زاڵە بون، شێرازە و شێوە ژیانی رۆمەکان خۆی وەك ژینی بەختەوەری پاشایان نیشان دەدا بەڵام لەڕاستیدا روکەشێکی خەڵەتێنەر و بریقەدار بوە و لەگەڵ رۆژگاری داڕوخانی ژیاری یۆنانیەکان هاوشێوە بوە))[1]

## بە نەسرانیبونی رۆمەکان:

ئا لێرەدا روداوێکی مەزن هەیە کە دەبێ مێژونوسەکان تۆماری بکەنو ئاماژەی بۆ بکەن، روداوەکەش ئەمەیە کە نەسرانیەت هاتە سەر تەختی حوکمی رۆمی بتپەرست، ئەمەش ئەو کاتە بو کە قوستەنتین بوە نەسرانی و لە ساڵی (٣٠٦ز) بوە ئیمپراتۆری وڵات. ئیتر نەسرانیەت وەسەر بتپەرستی زاڵ بو، لە پرونەکاوێکدا بوە خاوەنی سامانێکی زۆر و زەوەند و وڵاتێکی پانوپۆڕ و دەسەڵاتێکی بەهێز و بێهاوشان، کە بە خەونیش شتی وای نەدەدی، قوستەنتین کە هاتە سەر حوکم نەسرانیەکان لەوپەڕی پەشۆکاوی دابون و هەزارانیان لێ کوژرابو و خوێن روباری هەڵبەستبو، بۆیە چاکەی لەگەڵدا کردن و روی خۆشی پێ نیشاندان و ئامێزی بەزەیی بۆ رانواندن و پایە و دەسەڵاتیشی پێ بەخشین.

---

(١) History of the Conflict between Religien & Scince,London, ١٩٢٧.p.(٣١-٣٢).

## دۆڕانەکەی نەسرانیەت لەکاتی دەوڵەتداریدا:

نەسرانیەکان لە گۆڕەپانی شەڕدا سەرکەوتن بەڵام لە ململانێی ئاینییدا وەژێر کەوتن، سامان و موڵکێکی فرەیان قازانج کرد بەڵام دینێکی عەزیزیان لەدەست دا، چونکە بتپەرستێتی رۆمی دینداره نەسرانیەکان شپرزەکرد و دینی مەسیحیان تێکیان شێواند، گەورەترین شێواندن و شپرزە کردن بە دەستی قوستەنتین بو، قوستەنتینی نەسرانیەت پارێز و بەیداخ بەدەست!.

(درابەر) دەڵێ:

((بتپەرستی‌و هاوبەشپەرستی بەهۆی ئەو دوڕوانەوە کەوتە نێو دینی نەسرانی کە پلەوپایەی بەرزیان لە وڵات وەرگرتبو و خۆیان بە نەسرانی نیشان دەدا، کەچی هەرگیز بایەخیان بە کاروباری دینی نەدەدا و هیچ رۆژێکیش بۆی دڵسۆز نەبون، قوستەنتینیش هەروا بو، تەواوی تەمەنی خۆی لە ستەم‌و زۆرداری رادەبوارد و هیچ کاتێکیش ملکەچی فەرمانەکانی کەنیسە نەدەبو تەنها لە ئاخرو ئۆخری تەمەنیدا نەبێ (کە لە ٣٣٧ز مردوە).

نەسرانیەکان ئەگەرچی هێزوبازویان گەیشتبوە ئەوپەڕی و قوستەنتینیش پاشایەتی وەرگرتبو بەڵام نەیانتوانی رەگوریشاڵی بتپەرستی هەڵکێشن‌و ئاسەواری ببڕێنەوە، بگرە بتپەرستیشی دەگەڵدا تێکەڵ بو، تا لە ئەنجامدا دینێکی نوێی لێ کەوتەوەو، بتپەرستی و نەسرانیەتی تێدا وەکو یەك لێهات. لێرەدا ئیسلام لەگەڵ نەسرانیەت جیاوازە، چونکە ئیسلام بتپەرستی بە یەکجاری بنبڕ کردو ئاسەواری بڕاندەوە و بیروباوەڕێکی پاك و بێگەردیشی بڵاو کردەوە.

قوستەنتینی ئیمپراتۆر، کە بەندەی دنیا بو و بیروباوەڕێکی سوك و کاڵی هەبو، بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆی‌و بەرژەوەندی هەر دو دژ -واتا نەسرانی‌و بتپەرستی- وای بە باش زانی لەگەڵ یەکیان بگونجێنێ و دژایەتی نێوانیان نەهێڵێ، نەسرانیە تۆخەکانیش پلانی ئیمپراتۆریان پێ خراپ نەبو، رەنگە وای بۆچوبن ئەگەر دینی نوێ بە بیروباوەڕی کۆنی بتپەرستی متوربە بکرێ؛ ببوژێتەوە

و پتر بڵاوببێتەوە و لە کۆتاییـشدا لـە ژەنـگ و ژاری بتپەرسـتێتی رزگاربـێ و دینێکی نەسرانی پاك و بێگەرد بمێنێتەوە))[1].

## رەبەنایەتی لە رادەبەدەر:

نەسرانیەتی شـپرزەکراو و بە بتپەرستی موتوربەکراو کە روح و جوانیەکەی ون کردبو، نەیتوانی رێژینی[2] داڕوخاوی رۆمەکان بگۆڕێت و ژیانێکی تازە و پاك و بێگـەردی ئاینییـان تێـدا ببوژێنێتـەوە و رۆژگـارێکی گەشـاوە بـۆ مێـژوی رۆم بڕەخسـێنێ. بەڵکو رەبەنایەتیەکی وای داهێنا کە بۆ ژیـار و ژیـانی مرۆڤایـەتی رەنگـە لـە تاژەلایەتیـەکی رۆمـی بتپەرسـت کارەسـاتتر بوبـێ، رەبەنایەتیەکـە سەرلەبەری جیهانی نەسرانیەتی داگرتـەوە و گـشت سـنورێکی بەزانـد، ئێمـەش لێرەدا چەند نمونەیەك لە پەرتوکی (مێژوی خورەوشتی ئەوروپا) هەڵدەبـژێرین و- وەك مشـتێك لە هەشـتێك- دەیخەینە ڕو:

((ژمارەی رەبەنەکان لە ئەندازەبەدەر زیاد ببو، لـەناو خەڵکـدا شانوشـکۆیان پەیدا کردبو، بەکاریگەر ببون، گشت خەڵکیان گرفتار کردبو، ئێـستا نـاکرێ بـە وردی هەڵیانژمێرین، بەلام قـسەوباسی مێژوناسـان ئـەوە دەردەخـات کـە بـە چ رێژەیـەك زۆر ببـونو بزاڤەکـەیان چـۆن بڵاوببـوەوە، دەڵـێن: لـە رۆژانـی جەژنی(فیصـح)دا پەنجا هەزار رەبەن کۆدەبونەوە، لە سەدەی چـواردەمی زاینیـدا رەبەنی وا هـەبوە سەرپەرشـتایەتی پێـنج هـەزار رەبـەنی تـری کـردوە، رەبـەن (سـەرابین) سەرۆکایەتی دە هەزار رەبەنی کردوە، لە کۆتـایی سـەدەی چـوارەمدا ژمارەیان بە قەد ژمارەی دانیشتوانی میسـر زیادی کردبو)).

---

(١) هەمان سەرچاوە، ل (٤٠-٤١).

(٢) رێژین: سيرة.

## سەیر و سەمەرەی رەبەنان:

ئەشکەنجەدانی جەستە بەدرێژایی دو سەدان بە دینداری و رەوشتێکی بەرز حسێب دەکرا، مێژونوسەکان گەلێ شتی سەیرو سەمەرەیان لەم بارەوە گێڕاوەتەوە، لەبارەی رەبەن ماکاریۆسەوە دەڵێن بۆ ماوەی شەش مانگ لە نێو قوڕ و لیتاو و زۆنگاوان نوستوە تا بەڵکو مێش و مەگەزی ژەهرین لەشە روتەکەی بچزێنن، جگە لەمە (٢٠ تا ٣٠) کیلۆ ئاسنیشی لە کۆڵ داوە، رەبەن (یۆسیبیس)ی برادەریشی (٤٠ تا ٥٠) کیلۆ ئاسنی بەسەر شان دادابو و ماوەی سێ ساڵانیش لەناو بیرێکی کەمئاودا نیشتەجێ بو، رەبەن یۆحەننا ماوەی سێ‌ساڵان لەسەر قاچێك خواپەرستی کردوە، بە درێژایی ئەو ماوەیەش پاڵنەکەوتوە و دانەنیشتوە، کە ماندو بوە هەر بە پێوە پاڵی وەبەر گاشە بەردێك داوە. رەبەنی‌تر هەبون هەردەم روت بونو لەشی خۆیان نەدەپۆشی، پرچە درێژ و تیکقژقژاوەکەیان بەسەر خۆ دادەدا و وەکو ئاژەڵ لەسەر دەست و قاچ دەڕۆیشتن، زۆربەیان لەناو کونە ئەشکەوتی دڕندە و بیرە وشکبوەکانی نێو گۆڕستاندا دەژیان و بە زۆری گژوگیا و پوش‌وپەلاشیان دەخوارد. پێیان وابو پاك و خاوێنی جەستە دژی خاوێنی روحە و شوشتنی هەر ئەندامێکی لەشیان بە گوناح دادەنا، مرۆی زۆر زاهید و لەخواترسیان لەلادا ئەو کەسانە بون کە پیس‌و پۆخڵتر بون و لە خاوێنی وەدورتر بون.

رەبەن ئەتهینس دەڵێ: رەبەن ئەنتۆنی بە درێژایی تەمەنی خۆی گوناحی قاچ شوشتنی توشی خۆی نەکردوەو، رەبەن ئەبراهام ماوەی پەنجا ساڵ ئاوی بە روخسار و قاچی نەکەوتوە، رەبەن ئەسکەندەری دوای تێپەڕبونی رۆژگارێك بە داخ‌وپەژارەوە دەیگوت: داخی‌داخانم! پێشان شوشتنی روخسارمان بە گوناح دادەنا، کەچی ئەمرۆکەش بۆ گەرماو دەچین. رەبەنەکان لەشاردا دەگەڕان، منداڵو رۆڵەیان لە ئامێزی دایکان دەڕفاند و دەیانبردنە چۆڵیو پەرستگەکانو لەوێدا پەروەردەیەکی رەبەنانەیان دەکردنو دەیانکردنە رەبەن، حکومەتیش هیچی لەدەست نەدەهات، جەماوەر و رەمەکیەکانیش پشگیریان دەکردن، ئەو

کەسانەش کە باوکو دایکی خۆیان بەجێدەهێشتو ڕێی ڕەبەنایەتیان دەگرتە بەر خۆشیان دەویستنو ئافەرینیان دەکردن. گەورەی ڕەبەنەکان و ناودارانی مێژوی نەسرانی بەوە ناسرابون کە لە ڕفاندنی منداڵاندا بە دەستوبرد و جەربەزەن. دەگێڕنەوە، دەڵێن ڕفاندنی منداڵان گەیشتبوە رادەیەك کە دایکان ڕەبەن ئەمبرۆسیان دەدی هەر زو منداڵەکانیان دەشاردەوە، دایكو باوکان دەسەڵاتیان لەسەر منداڵەکان نەمابو، دەسەڵات و سەرپەرشتی منداڵان کەوتبوە دەستی کەشیش[١] و ڕەبەنان))[٢].

## کاریگەری ڕەبەنایەتی لەسەر خورەوشتی ئەوروپاییەکان:

لە ئاکامی ئەو ڕەبەنایەتیە لەرادەبەدەر و لاڕێبوەدا ڕەوشتی مەردانە و ئاکاری مەردومانە بە کاری ناپەسند و خەوشی نارێك حسێب دەکرا، خەڵك وازی لە روخۆشیو روحسوکی و وتەی ڕاشکاو و لێبوردن و ئازایەتی و مەردایەتی هێنا، یەك لە ترسناکترین ئاکامەکان ئەوەبو کە شیرازەی ژیانی نێومالّی شپرزە کرد و ركوکینەی لە نێوان خزمان پەیداکرد، ڕەبەنەکان کە دڵیان لە سۆز و بەزەیی تەژی ببو و چاویان لە فرمێسك پڕ ببو، لەمەڕ دایك و باوك و منداڵان دڵڕەق و چاو وشك بون، جەرگی دایکانیان دەسوتاند و ژنیان بە بێوەژنی دەهێشتەوە و منداڵانیان هەتیو دەکرد و دەبوایە خەڵك بەخێویان بکەن. رویان دەکردە بیابانو چۆڵەوانی و تاکە خەمیان ڕزگابونی ڕۆژی دوایی بو، لە مەرگو مان باکیان نەبو، (لیکی) لەم بارەوە ڕوداوی وای گێڕاوەتەوە کە دڵان پڕ لە داخ و خەم دەکات و فرمێسك لە چاوان هەڵدەوەرێنێ[٣].

ڕەبەنەکان پێیان وابو ئەگەر لە ژن نزیك ببنەوە یان لەگەڵیان کۆببنەوە گوناحێکی گەورەیان کردوە، بۆیە لە سێبەریشی دەسڵەمینەوە، پێیان وابو

---

(١) کەشیش: قەشە.

(٢) Lecky: History of Europan Morals chapter IV.

(٣) History of Europan Morals .Part II, chapter IV,From contantine to charlmagne.

ئەگەر لە ڕێگادا قەدەر وابو روبەڕوی یەکتربونەوە-با دایكو خوشكو ژنیشیان بن- ئیتر کار لە کار ترازاوە و کردوکۆشی گیان ئامێزی رابردویان پوکاوەتەوە!، (لیکی) لەم بارەوە گەلێك لێوبزوێنی دڵتەزێنی گێڕاوەتەوە.

## دەستە پاچەیی ڕەبەنایەتی لە ئاست راستەڕێکردنی مادده پەرستێتی بێڵغاودا :

کەس خەیاڵ نەکا پێیوابێ ڕەبەنایەتی لەرادەبەدەر تـوانیبێتی مادده‌پەرستایەتی بێجڵەوی راستەڕێ کردبێ یان ئارەزوی ئاژەڵانەی لغاو کردبێ، چونکە هەرگیز شتی وا نەبوە و ئەستەمیشە ببێ، چونکە سروشتی مرۆڤایەتی شتیوا رەت دەکاتەوەو مێژوش بەدۆری دەخاتەوە. چونکە سیستەمێك دەتوانێ مرۆڤایەتی راستەڕێ بکات و مادەپەرستایەتی هێور بکاتەوە و ژیان بکاتە ژیانێکی هاوسەنگو مامناوەندی کە سیستەمێکی روحی و دینی و رەوشتی و پڕ لە حیکمەت بێ و لەگەڵ سروشتی راستەقینەی مرۆڤایەتی بگونجێ و هەڵنەتۆقێ و بۆ راستەڕێ دەستی بگرێ نەك لەناوی با و بیفەوتێنێ، چونکە ڕێخت[1] لەناو ناچێ بەڵام دەکرێ لە ڕێی خراپەوە بەرەو ڕێی چاك وەچەرخێنرێ، ئیسلام وایکرد، موحەممەد ﷺ وای کرد؛ ئازایەتی کە عەرەب بۆ کێبەرکێو شەڕ و کوشتاری هۆزایەتی و رکوکینە و تۆڵەی دێرین بەکاریان دێنا، وای لێکردن بۆ جیهادی ڕێگەی خودا و باڵادەستبونی ئیسلام بیخەنە کار، دەسبڵاوی کە لەپێناوی شتی پوچ و نەشیاو بو وای لێکردن بیکەنە بەخشینو لە پێناوی خوا بێ، بە هۆی ئیسلامەوە لە نەفامێتی دابڕان، هەرشتێکی بە شتێکی ترەوە پێ گۆڕین، دەرونی مرۆی بە بەتاڵی بەجێنەهێشت بەڵکو گوڕوتینو ئاسودەیی پێ بەخشی، چونکە دەرون-وەك زانایەکی موسڵمان دەڵێ-بە هۆی شتێکیترەوە نەبێ شت بەجێ ناهێڵێ، دەرون بۆ ئەوە ئەفرێنراوە[2] تا بکارێ نەك بتارێ[1].

---

(١) ڕێخت: سروشتی مرۆڤ، الفطرة.

(٢) ئەفرێنراو: بەدیهێنراو بتارێ: لەناو ببرێ.

پێغەمبەرانیش بۆ ئەوە ناردراون تا سروشتی مرۆڤ داڕێژنەوە و بە چڵەپۆپەی بگەیەنن نەك لایبدەن یان بیگۆڕن(٢).

پێغەمبەر ﷺ کە چوە شاری مەدینە، خەڵکەکە دو ڕۆژیان هەبو یاری و ئاهەنگیان تێدا دەگێڕا، فەرموی ئەم دو ڕۆژە چنە؟ گوتیان: لەسەردەمی نەفامێتیدا یاری و ئاهەنگمان تێدا دەگێڕا، فەرموی: ((خوا لە جیاتی ئەم دوڕۆژە دو ڕۆژی چاکتری بۆ داناون: ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان))(٣). عائیشە -خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێ: منیش دو کەنیزەی ئەنساریم لەلادا بون و گۆرانییان بەسەر پاڵەوانێتی ئەنساریەکاندا دەگوت کە لەشەڕی بوعاث نواندبویان، کەچی گۆرانیبێژیش نەبون، لەو دەمەدا ئەبوبەکر هات، کە ئەمەی بینی، گوتی: لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ ئاوازی شەیتان دەچریکێنن؟! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەبوبەکر! هەمو نەتەوەیەك جەژنی هەیە، ئەوەش جەژنی ئێمەیە، لە گێڕانەوەیەکیتردا دەفەرموێ: ئەبوبەکر وازیان لێبێنە، چونکە جەژنە))(٤).

بەڵام نەسرانیەتی ڕۆمی ڕەمەکیانە هەوڵیدا سروشتی مرۆڤ بگۆڕێ و لەناوی ببات، ڕژێمێکی وای هێنا کە سروشتی مرۆڤایەتی لەباریدا نەبێ لەخۆی بگرێ، شتی وای خستە سەر دەرون کە نەتوانێ هەڵیبگرێ، بۆیە وەك کاردانەوەیەك ڕوی لە ماددەپەرستی کردو لەڕاددەبەدەر تێپەڕی، پاشان ماددەپەرستایەتیەکە لە ڕوی نەسرانیەت هەڵگەڕایەوە و لەناوی برد، نەسرانیەت -هەرچەندە لە زوهد و ڕەبەنایەتی ڕۆچو و دەگەڵ سروشت و واقیعی ژیانی مرۆڤ هەڵتۆقی، بەڵام- هەر نەیتوانی نەریت و باو و ژیاری داڕوخاو بگرێتەوە و نەهێڵێ هەڵبدێرێ. لە وڵاتی نەسرانیدا بزاڤی زوهد و ڕەبەنایەتی لەڕاددەبەدەر هەرچەندی زێتر پەرەی

---

(١) پاژێکە لە وتەی شیخ الاسلام: ئیبن تەیمیە (لە ٧٢٨ ك مردوە)، کە لە پەرتوکە نایابەکەیدا بەناوی (اقتضاء الصراط المستقیم) ل ١٤٣ فەرمویەتی.

(٢) ئیبن تەیمیە، لە پەرتوکەکەیدا بە ناوی (النبوات).

(٣) رواه ابوداود باسنادە عن أنس، واحمد، والنسائي.

(٤) متفق علیه.

دەسەند، بزاڤی بەدکاری و بەربەرەڵڵاییش بەهەمان هێند پەرەی دەسەند. بەڵکو راستتر ئەوەبو؛ رەبەنایەتی لە چۆڵی و لە بیابانـدا بەرکـەنار و لەسـەر ژیـان بـێ دەسەڵات بـو، بزاڤـی بەدڕەوشـتی و بەرهەڵـداییش سـەرجەم گونـدو شـارەکانی داگرتبوەوە و کارەساتی دەنایەوە.

## لە نێوان رەبەنایەتی سەرکێش و ماددەپەرستێتی چەموشدا:

(لیکی) رەوشی جیهانی سـەردەمی نەسـرانیەکان دەخاتـە رو کـە لـە نێـوان رەبەنایەتی و بەدڕەوشتیدا بەرز و نزم دەبو، دەڵـێ:

((رەوشت و کۆمەڵگەی خەڵك لەوپەڕی بێمروەتی و هەرزەیی دابو، بێئـابڕویی و بـەدکاری و رابـواردن و ئارەزوبـازی و کلکەسـوتێی[1] نێـو کـۆڕی پاشـا و دەوڵەمەند و کاربەدەستان و خۆ پۆشتەکردن و رازاندنەوە لە رادەبەدەر لە برەو و بەربڵاو بو، دنیای ئەو رۆژگار لە نێوان لوتکەی رەبەنایەتی و لوتکەی بەدکاریـدا جینگڵی دەخوارد و بەدکاریو خەیاڵی پوچ کە هـەردوك دوژمنـی رێـزو شـکۆی مرۆڤن بەیەکەوە کۆببونەوە، رای جەماوەر لاواز ببو و روداوی بەد و بێئـابڕوییش نەیدەبزواند، ویژدانی مرۆڤایەتی رەنگە لە ئاینو هەڕەشە ئاینییەکان ترسا بـێ، بەڵام بێمنەت و دڵنیاش بون، چونکە پێیان وابو نزاکـان سـەرجەم گوناحـەکانیان رەش دەکاتەوە. بازاڕی فڕوفێڵو درۆ کردن و خەڵەتاندن بـە هـەڕمێن و جموجـۆڵ بو، تەنانەت لەسەردەمی قەیـسەریەکاندا لـەم سەردەمەشـی تێپەڕانـدبو، بـەڵام ستەمو دەسـتدرێژی و دڵڕەقـی و نـاکۆکی کـەمتر ببونـەوە، لەگـەڵ ئەمانەشـدا ئازادی هزریو گڕوتینی نەتەوەپەرستیش لە داڕوخان دابو))[2].

---

(١) کلکەسوتێ: مەرایی، مادەلایی.

(٢) History of Európan Morals.Vol.ppII.١٦٢-١٦٣.

## ناپەسندکاری لە مەڵبەندە ئاینیەکاندا:

ڕەبەنایەتی و سیستەمە ئاینییە سلبیەکەی نەسرانیەت ڕووەڕو لەگەڵ سروشتی مرۆڤ هەڵدەزۆقی[1]، بەڵام خەڵکەکە بەهۆی تازەباوێتیو دەسەڵاتە روحیەکەی ئاینەکەو بەهۆی چەندین هۆکاریتریش هەر ملکەچ دەبون، پاشان رەوشی خەڵکەکەی تێکشێواند و لاڕێبون و لاوازی خزیە نێو مەڵبەندە رامیاریەکان بە جۆرێك هیچی وای لە شرۆپەشێوی مەڵبەندە دینیەکان کەمتر نەبێ، رەنگە لە بەدڕەوشتیو بەدکاریو بێئابڕوییدا تێشیان پەڕاندبێ، بۆیە حکومەت دەرگای ئادابگە ئاینیەکانی داخست کە ئامانجیان دروستکردنی برایەتی بو لە نێوان مەسیحیەکاندا، هەروەها جەژنو ساڵیادی شەهید و چاکانیشی نەهێشت چونکە بۆ کاری بەد و بەرەبەرەڵلایی بەکار دەهێنران و وەك پەناوپەسێوێکی رابواردنیشیان لێهاتبو، کەشیشەکانیش بە گوناحی گەورە و بەدکاری تۆمەتبار دەکران.

ڕەبەن جارۆم (Jarum) دەڵێ:

((رابواردن و خۆشگوزەرانی کەشیشەکان وەك کاربەدەست و دەوڵەمەندە پارەدارەکان وابو، پاپاکان لە روی خوڕەوشتەوە خراپ داڕوخا بون و چلێسیو پارەپەرستی لە لغاوی هەڵکێشا بون، وەك کەلوپەل پایە و پیشەیان دەفرۆشت و رەنگە مەزادی ئاشکراشیان بۆ هەڵبڕی بێ، خاك و زەمینی بەهەشتیان بە بەڵێن نامە و پسولەی لێخۆشبون بە خەڵك دەفرۆشت و وەك پەڕی پارەو پولی پۆستە گەواهینامەی لە دۆزەخ رزگاربون و روخسەتنامەی حەرامکارییان دەبەخشی، رێگەیان بە هەڵوەشاندنەوەی یاسا دەدا و بەرتیل و ریبایان دەخوارد و پارەوپولێکی بێئەندازەیان لە رابواردندا پاکوپوك دەکرد، تەنانەت پاپا (ئەنۆسنت)ی هەشتەم ناچاربو تاجی پاپایەتی بکاتە بارمتە، دەڵێن پاپا (لیوی دەیەم) سەرجەم پارەو سامانی بەجێماوی پاپاکەی پێشەخۆیو داهاتی خۆشیو دەرامەتی پاپای دوای خۆشی کردە خەرجی رابواردنەکانی، دەڵێن: کۆی داهاتی

---

(١) هەڵزۆقین: تصادم.

هەمو مەملەکەتی فەرەنسا بەشی خەرجیەکانی رابواردنو تێرکردنی ئارەزوبازی پاپاکانی نەدەکرد))[١].

## بەربەرەکانێی نێوان پاپا و ئیمپراتۆران:

لە سەدەی یازدەمدا لە نێوان پاپاکانو ئیمپراتۆرەکاندا کێشەو ململانێ دەستی پێکرد و تادەهات کێشەکە بە بڵێسەتر دەبو، یەکەم جار پاپاکان سەرکەوتن، تەنانەت (هێنری چوارەم)ی نوێنەری ئیمپراتۆریەت لە ساڵی (١٠٧٧ز) ناچار بو بە ملی شۆڕەوە بچێتە بەر ئاستانەی پاپایەتی لە قەڵای کانوسا، کەچی تا چەند کەسێك تکایان لە پاپا نەکرد رێگەی نەدا بچێتە ژورەوە، ئەویش بە مل کەچی و بە پێی خواسی و بە بەرگە خورینیەکەیەوە وەژورێ کەوت و لەسەر دەستی پاپا تۆبەیەکی موستەهەقی کرد، پاپاش لە گوناحەکانی بوری!. شەڕ و کێشەی نێوانیان دوای ئەم سەرکەوتنەش هەر بەردەوام بو، سەرکەوتنیش بە نۆرە بو، هەندێ جار پاپا سەردەکەوت و هەندێ جاریش ئیمپراتۆر، بە درێژایی ئەم رۆژگارەش خەڵك لە نێو هەردو بەرداشدا هاڕەهاڕیان دەدات.

پاپاکان لە سەدەکانی نێوەڕاستدا دەسەڵاتێکی گەورەو فرەوانی وایان هەبو تەنانەت پاشا و ئیمپراتۆرەکانیش نەیانبو، پاپاکان دەیانتوانی لەژێر سێبەری ئاینەوە ئەوروپا لە لایەنی زانست و ژیارەوە پێشبخەن، چونکە ئیعتیباریان لە لای هەمو خەڵکدا هەبو و نوێنەریان بەنێو گشت شارو وڵاتاندا دەگەڕا و بچوبانایە هەر شوێنێك خەڵکەکە لە خۆشترین و گەورەترین شوێنیدا مێوانداریان لێدەکردن و بە یەك زمان لەگەڵیان دەدوان، هەروەها دەستیان دەخستە نێو کاروباری زۆر گرنگی رامیاری و لە هەمو ناوچەیەکیشدا پیاوی دەمڕاستو سیاستمەداری لایەنگریان هەبو، کە بەیەك زمان دەدوان و لە کاروباری گرنگی دەوڵەتدا یارمەتیان دەدان.

---

(١) Conflict of Religion Science .p.٢٣٠.

## بەدبەختبونی ئەوروپا بە دەستی پیاوانی دینیەوە:

بۆ بەدبەختی نەسرانیەت و نەتەوە نەسرانیەکان؛ پیاوە دینیەکان دەسەڵاتە زلو زەبەللاحەکەیان بە خراپی بەکاردەهێنا و لە پێناو خۆسەپاندن و بەرژەوەندیو پشت ئەستوری خۆیان هەڵیاندەقۆستەوە، کەچی ئەوروپاش لە نێو شەوەزەنگی نەزانینو ئەفسانەو داڕوخاندا پەلی کوێرەوەری دەکوتا، ژیارەکەی لە ناخەوەڕا بە هۆی رەبەنایەتیو دەسەڵاتی پیاوانی دینەوە دوچاری پەشۆکاوی ببو، لە ماوەی هەزار ساڵدا ژمارەی دانیشتوانی کیشوەری ئەوروپا و لە ماوەی پێنج سەد ساڵدا ژمارەی دانیشتوانی ئینگلتەڕا زیادیان نەکرد، بێگومان یەك لە هۆیەکانی بریتی بو لە ژیانی سەڵتی کە کەشیش و رەبەنەکان لە بەردڵی خەڵکیان شیرن دەکرد و بە کارێکی چاکیان پیشان دەدا، کاهینو ئوسقوفەکان یارمەتی پزیشکانیان نەدەدا بۆیە نەخۆشی و پەتا سەرتاسەری کیشوەری داگرتەوە، گەشتەکەی (ئەنبیس سلۆئیس) بۆ جەزائیر لە ساڵی (١٤٣٠ز) کە دواتر بە ناسناوی ( Pus the Second) ناوبانگی دەرکرد، ئەوە دەردەخات کە ئەوکات جەزائیری ژێر دەستی بەریتانیا لە چ جۆرە ژیارێکی داڕوخاو و هەژاریەکی کوشندەدا دەژیا.

## تاوانی پیاوانی دین لەمەڕ پەڕتوکە دینیەکاندا:

یەکێك لە گەورەترین تاوانو هەڵەی پیاوە دینیەکانی ئەوروپا لەمەڕ خۆیانو دینەکەیانەوە-کە هەر خۆیان نوێنەرایەتیان دەکرد- ئەوەبو کە گەلێك زانیاری جوگرافی و مێژویی و سروشتی ئەو سەردەمیان تێکەڵ بە پەرتوکە پیرۆزە ئاینیەکان کرد، رەنگە زانیاریەکان بۆ ئەو سەردەم ئەوپەڕی زانست و وەك هەقیقەتی چەسپیو وابوبن و کەس نەبوبێ گومانی لێ هەبێ، بەڵام خۆ بریتی نەبون لەوپەڕی زانستی مرۆڤ. ئەگەر لەسەردەمێکدا زانستی مرۆڤ کۆمەڵێك دۆزینەوەو دەرەنجامی وەدەست هێنابێ رەنگە لەسەردەمی دواتردا گۆڕان و پێچەوانەبونەوەیان بەسەردا هاتبێ چونکە زانستی مرۆڤ بەرەبەرەیەو رۆژ بەرۆژ پێشکەوتوتر دەبێ، بۆیە ئەگەر یەکێك دینەکەی لەسەر جۆرە زانستێکی وا

بنیات نیّ وەك ئەو کەسە وایە کە کۆشکێکی لەسەر گردەلمێکی دارماو بنیات نابێ، پیاوانی دین رەنگە بە نیازێکی پاکەوە ئەم کارەیان ئەنجام دابێ بەلاّم گەورەترین تاوان بو بەرامبەر بە خۆیان و بە دینەکەیان، کە بوە هۆی شەڕوشۆقە رەشبینەکەی نێوان دین‌و زانست و کە دینیش تێیدا شکستی خوارد، ئەو دینەی کە لەگەلّ زانستی مرۆڤ تێکەلّ ببو و هەق و ناهەق و ساغ‌و ناساغی تێدا ون ببو، پیاوانی دینیش وا تێکەوتن و پشتیان وا بە ئەرزی کەوت نەتوانن جارێکی‌تر راست ببنەوە، لە هەمو ئەوانەش شومتر و بەدبەختیتر ئەوەبو کە ئەوروپا بوە نادینی.

پیاوانی دین بەو هێندە تاوانە نەوەستان و بەلّکو هەرچی شتێکیان لە دمودوی خەلّکەوە ببیستایە بە پیرۆزیان دادەنا. ئەوکات چەند زانیاریەکی جوگرافی و مێژویی و سروشتی لەنێو خەلّکدا هەبو و هەندێك لە راڤەناس و تەفسیر ناسانی تەورات و ئینجیلیش باسیان کردبو، هەلّسان ئەو زانیاریانەیان هێنا مۆرکێکی ئاینییان پێوە لکاند و کردیانە ئامۆژ و بنەڕەتی دین و گەلێك پەرتوکیان لەبارەوە نوسی و لەسەر خەلّکیان واجب کرد بڕوای پێ بێنن و هەر زانیاریەکیش پێچەوانە بوایە توڕیان دەدا، زانستە جوگرافیەکەش کە لە لای خواوە هیچ بەلّگەیەکی بۆ دانەبەزیبو ناویان لێنا جوگرافیای مەسیحی (Christian Geography) و توند دەستیان پێوە گرت، هەرکەسێکیش مشتومڕی لێ بکردایە یان گومانی لێ هەبوایە بە بێبڕوایان حسێب دەکرد.

## چەوسانەوەی زانست بە دەستی کەنیسەوە:

کەنیسە ئەو کاتە دژایەتی لەگەلّ زانست دەسپێکرد کە بورکانی ئاوەزی ئەوروپا دەتەقیەوە و زاناو سروشتناسەکان کۆت‌و زنجیری لاسائامێزی دینیان تێکدەشکاند، ئیتر ئەوانیش دەستیان.پێکرد بە بەلّگەی رونەوە رەخنەی راشکاویان لە بیردۆزە جوگرافیەکانی نێو پەرتوکە ئاینیەکان گرت‌و گشتیان بە دۆر دەخستەوە و ئەزمون و بیردۆزە تازەکانی پێی گەیشتبون بلاّویان دەکردەوە،

کەنیسە عەجمانی نەما و ئاگری لە چاوان دەباری، پیاوانی کەنیسە روبەڕوی زاناکان بونەوەو بە بێبڕوایان لە قەڵەم دان و خوێنوماڵیان حەڵاڵ کردن و دادگای پشکنینیان دامەزراند، -پاپا گوتەنی- دادگا کە بۆ ئەو زەندیق و خوانەناسانە بو کە بە نێو شار و گوندادا بڵاو ببونەوە و لەنێو ماڵو ژێرزەمینو دارستان و کونەئەشکەوتو کێڵگەکان خۆیان شاردبوەوە، شەو و رۆژ زاناکانیان راو دەکرد و توشی سزای سەختیان دەکردن، هەوڵیان دەدا هەر دڵێك دژ بە نەسرانیەت لێبدا رایگوشن و رایوەستێنن، هەر چاوێکیان لێ‌کردبونە سەد چاو و گشت پەناو پەسێوێکیان دەپشکنی، تەنانەت هەناسەی خەڵکیشیان حساب دەکرد و لەسەر سرپە و خەیاڵیش لێیان دەپرسینەوە، کار بە جۆرێك بو زانایەکی نەسرانی دەڵێ: ((نابێ پیاوێك مەسیحی بێ و بە زۆری زۆردارەکی بمرێ)). وا مەزندە دەکرێ ژمارەی ئەو کەسانەی کە بە سزاکانی داداگاکانی پشکنین کوژراون نزیکەی سێسەد هەزار کەس بوبن، سیودو هەزاریان بە زندوێتی سوتێنراون، یەکێك لەوانە زانا (برۆنۆ)بو کە دەیگوت جگە لەم جیهانە جیهانی‌تریش هەیە، کەنیسە لە سزای ئەم قسەیەدا بڕیاریدا بێ‌خوێنڕژان بکوژرێ واتا بە زندوێتی بسوتێنرێ، کە جێبەجێ کراو سوتێنرا، هەروەها زانای بەناوبانگ (گالیلۆ)ش کوژرا، لەبەرئەوەی دەیگوت زەوی بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە.

## شۆڕشی تازەخوازان:

روناکبیر و تازەخوازەکان ئارامیان لەبەر هەڵگیراو چیتر خۆیان بۆ نەگیرا و شەڕو شۆڕیان لە دژی گشت پیاوە دینیو کەنیسەپەرستو کۆنەپەرستان بەرپاکرد، لە هەرچی شتێکیش پەیوەندی بەوانەوە هەبو یان لەوانەوە بو وەکو: بیروباوەڕ، کلتور، زانست، خورەوشتو ئاداب، رکوکینەیان لێ هەڵگرت و جامی تورەیی بە گڕوفڕیان بەسەردا هەڵڕشت، بە پلەی یەکەم دینی مەسیحی پاشان هەرچی ناوی دین بو بێ‌خاترانە دژی وەستان، مەیدانی شەڕ گۆڕا، لە شەڕی نێوان زاناو هۆشمەندە سروشتناسەکان و زانا مەسیحیەکانەوە بو بە شەڕی نێوان زانست دژ بە هەمو دینێك. شۆڕشگێڕەکان بڕیاریان چەسپاند و گوتیان: زانست

و دین دو شتی ناکۆکن و قەت کۆك نابن، ئاوەز و سیستەمی دین دو شتی دژ بە یەکن و قەت کۆ نابن، هەرکەسێك رو لە هەر کامیان بکات دەبێ پشت لەوەیتر هەڵکا و گەر بڕوا بە یەکەمیان بێنێ دەبێ بە دوەمیان بێبڕوا بێ و هەرگیز پەسندی نەکا. تازەخوازەکان کاتێك خوێنە ئاڵەکانیان دەهاتەوە یاد کە لە پێناو زانستو ئەزمون و لێکۆڵینەوەدا بەناهەق رژا بون، یان کە مرۆڤە بێتاوانە کوژراوەکانی دەستی کەشیشانی کەنیسەیان وەبیر دەهاتەوە؛ کەشیشو پیاوە دینیەکانیان وەکو ئەرژەنگێکی[1] بیچم گرژ و رەزا قورس و مرومۆچ و چاومۆن و دەرون تەنگو تاریك و ئاوەز گەمژە و لاژگ دەهاتە بەرچاو و لە داخان خەریك دەبو شەق بەرن، لەوان و لە هەرچی لەوانیشەوە بو تا سەر ئێسقان تورە دەبون. بۆیە تا لە ژین بون دژ بە دین تێکۆشان کە مردیشن بون بە سەرمەشقی دژایەتیکردنی دینو گەلێك وتەو وتار و هەڵوێستو نوسراویان بۆ نەوەکانی دواتر بەجێ هێشت.

## پەلەو کەمتەرخەمی شۆڕشگێڕان:

شۆڕشگێڕە تازەخوازەکان وەکو زۆربەی شۆڕشگێڕانی گشت کات و شوێنێك ئارامیان نەبو بە قوڵی لە کێشەکە بکۆڵنەوە و وردبینەوە، هێمنو لەسەرخۆ نەبون، خاوەن هۆش و ئاوەزی ئەوتۆ نەبون بتوانن دین لە پیاوە دینیە خۆسەپێنەکان جوێ کەنەوە و دین لە تاوان و نەزانی و ستەمو کەموکوڕی پیاوانی دین بەجیا ببینن، هەڵبەت ئەویش لەبەر داخی ئەو تاوان و کۆنەپەرستیەی کە پیاوە دینیەکان ئەنجامیان دابو، هەروەها لەبەر پەلەو خێرایی خۆیان کە بواری نەدان هەڵوەستەیەك بکەنو لە دین بکۆڵنەوە.

تازەخوازەکان نە بۆخۆیان و نە بۆ خەڵکیش ئەو دڵسۆزە نەبون چونکە ئاوڕێکیان لە ئیسلام نەدایەوە و نەشیاندەویست ئاوڕی لێ بدەنەوە کە چەندین نەتەوەی هاوچەرخ پەیڕەویان لێدەکرد و لە قەیرانەکەش رزگاری دەکردن، چونکە

---

(١) ئەرژەنگ: گیانەوەری قەبەی ناشیرین.

ئیسلام ﴿ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنْ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمْ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمْ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ: فەرمانی پێدەکردن چاکە بکەنو واز لە کاری ناڕەوا بێنن، شتی پاکی بۆ حەڵاڵ دەکردن و شتی پیسی لێ حەرام دەکردن و کۆتو وزنجیری ستەمی لەسەر هەڵدەوەشاندنەوە﴾الاعراف:١٥٧. ئەمەش لەبەر ئەوە بو چونکە فیزودەمارێکی نەفامێتیان لە مێشکدا هەبو، هەروەها شەڕی خاچپەرستانەی نێوان ڕۆژئاوای مەسیحی دژ بە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی بەربەستێکی زۆری هەڵنابو، کاهینو پیاوانی کەنیسەش پڕوپاگەندەو تانەو تەشەرێکی زۆریان بە ئیسلام وپێغەمبەر ﷺ هەڵبەستا بو، ماندوبونی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەشیان نەدەچەشت و بایەخیان بە ڕزگاربونی ڕۆژی دوایی و ژینی دوای مەرگ نەدەدا، موسڵمانەکانیش لە بانگەوازی ئیسلامیدا کەمتەرخەم بون، گشت ئەم هۆکارانە بونە هۆی ئەوەی کە نەگەڕێنەوە سەر دینی ئیسلامی و دەستی پێوە نەگرن، لە کاتێکدا گەلێکیان پێویست بە ئیسلام بو تا ڕزگاریان ببێ.

## ئاڕاستەبونی ئەوروپا بەرەو ماددەپەرستێتی:

کار لەکار ترازا، ڕۆژئاوا ئاڕاستەکەی خۆی لە هەمو ڕویێکەوە؛ لە ڕوی بیروباوەڕ و دەرونو ئاوەزو ڕەوشت و کۆمەڵایەتی، لە ڕوی زانستو سیاسەت و فەرمانڕەواییەوە بەرەو ماددەپەرستی وەرچەرخاند، ئاڕاستەبونەکە بە شێوەیەکی پەیتاپەیتایی بو، یەکەجار هێواش و بە ئەسپایی بو، بەڵام بەهێزی پۆڵایی بو، زاناو فەلسەفەزانەکان سەرلەنوێ بەجۆرێکی وا لە گەردون رامانەوە کە خوای خالق وەدیهێنەری گەردون نەبێ و هیچ هێزێکی سەروی سروشت بونی نەبێ و گەردون لە خۆڕا بەڕێوە بچێ، زاناکان بەم جۆرە گشت دیاردە و شوێنەوارێکی (سروشت)یان بە ڕێگەیەکی ڕەهای میکانیکی شرۆڤە[1] دەکرد و شرۆڤەکەشیان بە بیردۆزەیەکی ڕەهای زانستی ناو دەبرد، هەر تۆژینەوە و بیرکردنەوەیەکیش

---

(١) شرۆڤە: تفسیر.

بڕوای بە بونی خوا هەبوایە بە ڕێگەیەکی لاسا ئامێزیان دەدایە قەڵەمو گاڵتە و لاقرتێیان پێدەکرد، لە ئەنجامدا نکوڵییان لە گشت شتێکی ئەودیوی جولە و ماددە کرد و هەرشتێك نەخرابوایە ژێر هەست وئەزمون و کێش و، بڕ و روبەری نەبوایە بڕوایان پێ نەدەکرد، بەجۆرە لەگەڵ ڕەوڕەوەی ڕۆژگاردا بڕوابون بە خواو بە شتی پەنامەکی وەك گریمانەیەکیان لێهاتو ئاوەز و زانست نەیاندەسەلماندن.

ڕۆژئاواییەکان تا ڕۆژگارێکی درێژیش نکوڵییان لە بونی خوا نەکرد و دژایەتیان بۆ دین ئاشکرا نەکرد، کە نکوڵیشیان کرد هەمو نەبون، بەلام ئەو جۆرە ڕێوشوێنو هەلوێستەی بۆ بیرکردنەوە و توێژینەوە و تێوەڕامان هەڵیانبژاردبو لەگەڵ دین تێکی نەدەکردەوە، چونکە دین لەسەر بنچینەی بڕواهێنان بە پەنامەکیو سروش و پێغەمبەرایەتیو ژیانی دوارۆژ دامەزراوە، ئاشکرایە هیچ یەکێکیش لەمانە ناچێتە ژێر پێوانەی هەستو ئەزمون و کێش و بڕ و روبەرەوە، بەجۆرە ڕۆژ بە ڕۆژ پتر گومانیان لە بیروباوەڕە دینیەکان پەیدا دەکرد و زێتر لێی دڕدۆنگ دەبون.

## ڕیسوابونی ماددەپەرستی لە دوایین ڕۆژگاردا:

ڕاپەڕیوەکانی ڕاپەڕینی ئەوروپا چەند سەدەیەك بو خەریك بون دیدو شێوەژینی خوانەناسانەی ماددەپەرستی لەگەڵ ڕێوشوێنی دینی مەسیحی بگونجێنن، جا لەبەر دەوروبەری نەسرانییانە بویێ یان لەبەر بەرژەوەندی خوڕەوشتو کۆمەلایەتی بویێ کە وای دەخواست-ئەگەر بە ناوی بێ ناوەڕۆکیش بێ- سیستەمێکی ئاینی هەبێ تا بتوانرێ تاکەکانی نەتەوە لەگەڵ یەکتر کۆبکرێنەوە و نەبێتە پاشاگەردانی، بەلام لە کۆتاییدا نەیانتوانی و ڕیسوا بون، چونکە ڕەوتی ژیاری ماددەپەرستی زۆر بە خێرایی پێشدەکەوت و ئاینیش وەپاش دەکەوت و نەیدەتوانی شانبەشانی پێشکەوتنەکە هەنگاو هەڵنێ، بۆیە گونجاندنەکە وەئەستەم کەوت و بگرە گەلێك ئەرکو کاتیشی بەفیڕۆ دەدا بێئەوەی هیچ بەرژەوەندیەکیان بۆ دابین کا، ئیتر ئەوکات پەردەیان لەسەر خۆ لادا و دەمامکی دوڕوێتییان فڕێدا و هەقیقەتی خۆیان وەدەرخست.

## سەرباز و بانگخوازانی ماددەپەرستی:

نوسەرانو ئەدیبان و مامۆستایان و کۆمەڵناسان و سیاسەتمەدارانی ئەوروپا لە گشت شوێنێك راپەڕین و زوڕنای ماددەپەرستیان ژەنی، لە نوکی خامەکانیانەوە ژەهریان هەڵدەڕشتە ناو ئاوەز و دڵی جەماوەر و خوڕەوشتیان لە روانگەیەکی ماددیەوە شرۆڤە دەکرد، جارێك بۆ فەلسەفەی بەرژەوەندی و جارێکیتر بۆ فەلسەفەکەی ئەپیکۆرۆس[1] دەهۆڵیان دەکوتی.

سیاسەتمەدارانی وەکو ماکیاڤیللی[2] پێشتر بانگەشەیان بۆ ئەمە کردبو و دەیانگوت: دەبێ دین لە سیاسەت جوێ بێتەوە و خوڕەوشتیش بکرێتە دوبەش؛ تاکەکەسیو کۆمەڵگەیی، دەیانگوت مادەم ناکرێ دین لەناو ببرێ با ببێتە کێشەیەکی تاکەکەسیو دەست لە کاروباری سیاسەت و وڵات وەرنەدات، دەیانگوت: دەوڵەت لە هەمو شت ئازیزترە، شوێنی نەسرانیەت لە رۆژی دوایی دایە، دیندار و پیاوچاکەکان ئەگەرچی بۆ کەنیسە سودیان هەیە بەڵام بۆ دەوڵەت بێسودن، چونکە پابەندی ئەحکامی دینن و ئەگەر بەرژەوەندی وڵاتیش وا بخوازێ لە دین لادەن لانادەن و هەمیشە ملکەچی رێبیرەکانی خوڕەوشتن، پاشا و سەرکردەکانیش دەبێ وەکو ریوی فێڵباز بن و پێیان شەرم نەبێ ئەگەر بۆ بەرژەوەندی وڵات - با بچوکیش بێ-پەیمان بشکێنن یان فێڵ و درۆ بکەن، یان گزیو دوڕوویی بنوێنن ... زۆر شتیتری لەم بابەتەوە، بانگەشەکەیان سەرکەوتنی هێنا و گەلێك هۆکاری نیشتمانپەرستیو نەتەوەپەرستیش کە جێی کۆنە دینیان گرتبوەوە یارمەتی سەرکەوتنەکەیان دا.

---

(١) ئەپیکۆرۆس (٣٤١-٢٧٠ پ.ز) فەیلەسوفێکی یۆنانی بوەو بڕوای بە چاودێرایەتی خوا نەبوە، لە فەلسەفەکەیدا دەڵێ: مرۆڤ تەنها بە چێژ ئاسودە دەبن، بەر لە هەمو شتێکیش چێژی ئاوەزیو روحی. وەرگێڕ لە مونجیدەوە

(٢) ماکیاڤیللی(١٤٦٩-١٥٢٧ز) نوسەر و سیاسەتمەدار بوە، لە ئیتالیا لەدایك بوە، پەرتوکێکی بەناوی (میر) داناوە. وەرگێڕ لە مونجیدەوە

ئەدیبو نوسەر و زیتو زیرەك و بەهرەمەندەكان بە تایبەتی ئەوانی شۆڕشی فەرەنساو دواتر؛ توانیان شۆڕش لە دژی خوڕەوشتی کۆنو سیستەمی کۆمەڵایەتی بەرپا بکەن و گوناح بۆ خەڵك بڕازێننەوە و هەوەست لە کۆتو بەندان ئازاد بکەن و تاك لە بەرپرسێتی رەها بکەن. بانگەشەیان بۆ ژیانێکی ئاژەڵانەی پڕ خۆشی و ئارەزوی بێسنور و تەژی لە نۆش و چێژی زو بەدەست دەکرد و نرخێکی لەرادەبەدەریان بە ژینی دنیا دا و نکوڵیشیان لە گشت شتێك کرد تەنها چێژی زوبەدەست و قازانجی بەرهەست نەبێ.

## وێنەیەکی دەقاودەقی ژیانی یۆنان:

ژیانی ئەوروپای سەدەی نۆزدەم و بیستەم دەقاودەق وەك ژیانی یۆنان و رۆمای بتپەرستی لێهات، سروشتی ئەوروپا(کە نەسرانیەتی رۆژهەڵاتی بەسەردا زاڵ ببو) سەرلەبەری هاتەوە رو.[1]

سەیر لەمەدا نیە چونکە ئەوروپاییەکانی ئەمڕۆ لە یۆنانیو رۆمەکان کەوتونەتەوە و نەژاد و رەگەزە ئەوروپاییەکانیتریش دێنێکی وا دەبینن کە روحی تێدا نیە، هەروەك دکتۆر(هاس) لە باسکردنی ژیاری یۆنانیدا پەنجەی دەخاتە سەر.

ئەوروپاییەکان دینیان لەناودا لاوازە، کەم لە خوا دەترسن، لە ئیشو کاردا جددیو بە هەڵمەتن، رابواردنو هەڵپەڕکێ و تەپڵ و دەهۆڵیان لە ژیاندا زۆرە، (لیکی)ش هەمان شتی لەبارەی دینی یۆنانیەکان باس کردوە، هەڵبەت ئەمەش لە ئەنجامی رەوشە ئاینیەکەی ئەوروپا بو کە پێی وانەبو لەخواترسان و جددیەت لە کردەوەدا بە یەکەوە کۆببنەوە، هەروەها لە ئەنجامی ئەو تێور و دەرەنجامانەش بو کە زانا و سروشتزانەکانی ئەوروپا بڵاویان دەکردنەوە و خەڵکیش زۆر بە گەرمی پێشوازی لێ دەکردن تا سەرەنجام جێگەی دینی لێ گرتنەوە.

---

(١) هاتنەڕو: هاتنەئاراوە، وەدیهاتنەوە.

ئەوروپا پێی وایە تا بۆی بکرێ دەبێ چێژ و خۆشی وەرگرێ، دەبێ وەك تامەزرۆی کەسێکی تێنو و وەك پەروانەی شەیدای ئاگر پڕ بدەنە خۆشیەکانی دنیا و بەروبومەکانی بچنن، سوقراتیش بەهەمان شێوە وەسفی پیاوی کۆماری یۆنانی سەردەمەکەی خۆی کردوە.

هەروەها گومانیان لە ئاین هەیە، بیروبڕوایان تێکشێواو و شپرزەیە، بە سوك سەیری سیستەم و رێورەسم و نەریتەکانی دین دەکەن، رۆمای دوای سەردەمی روناکبیریش هەمان شێوە بو.

## ئاینی ئەوروپای ئەمڕۆ، ماددەپەرستیە نەك نەسرانی:

گومانی تێدا نیە ئاینەکەی ئەمڕۆی ئەوروپا کە هەوساری[1] هەست و دڵانی گرتۆتە دەستو روحی خستۆتە ژێر چنگی خۆی؛ ماددەپەرستیە نەك نەسرانیەت، ئەم راستیە لەلای گشت ئەم کەسانەدا رونە کە نەفسیەتی ئەوروپایی دەناسن و لە نزیکەوە نەك لە تەریکەوە-یان تەنانەت لە رێی پەڕتوکیشەوە- پەیوەندیان لەگەڵ ئەوروپاییەکان هەیە، بە دیاردە ئاینییەکانیش کە وڵاتەکانی کەشوفشی پێوە دەکەن و خەڵك پێی ئاسودە دەبن هەقیقەتیان لێ نەگۆڕابێ، یاخود کە خەڵك سەردانی کەنیسە دەکەن و لە رێوڕەسمەکان ئامادە دەبن رەشیان لێ نەبوبێتە سپی.

ئوستادی موسڵمانبوی ئەڵمانی؛ محمد ئەسەد کە لە باسەکانی پێشتردا ناومان هێناوە، لەپەرتوکەکەیدا بەناوی (ئیسلام لە ئەرزی فرەڕێبوندا) زۆر جوان و رون ئەمەی دەرخستوە و دەڵێ:

((بێگومان لە رۆژئاوادا هێشتا کەسانێك ماون کە بە نەشمو شێوازی ئاینییەوە بژین و هەوڵیش بدەن بیروباوەڕەکانیان لە ژیاردا رەنگ داتەوە، بەڵام کەسانێکی ژمارە کەم و دەگمەنن. پیاوی ئاسایی لە ئەوروپادا جا دیموکراتی بێ یان فاشیزمی، سەرمایەدار بێ یان سۆشیالیزمی، کرێکارێکی دەست قڵیشاو بێ

---

(١) هەوسار: جڵەو.

یان هزرڤان[١]، تەنهاو تەنها یەك جۆرە دین دەناسێ کە ئەویش بریتییە لە پەرستنی پێشکەوتنی ماددەپەرستی و لەو بیروباوەڕەی کە وادەزانێ تاکە مەبەست و ئامانجی ژیان بە ئاسانی ژیانە، یان بە گوزارشتی سەرزاری خەڵکی ئەوەیە کە لە گشت کۆتوبەندێکی سروشتی رەهابێ و مرۆڤێکی ئازادی تەواو ئازاد بێ، کەنیسەکانی ئەم دینەش بریتین لە کارگەی زل و زەبەلاح و سینەما و ئەزمونگە کیمیاوی و سەماگە و مەڵبەندە وەبەرهەمهێنە کارەباییەکان، کاهینەکانی بریتین لە کەسانی سەرمایەدار و پارەدار و خاوەن بانكو ئەندازیار و نمایشکار و بازرگان و خاوەن کارگە و فڕۆکەخانە و ئەستێرە سینەماییەکان و پاڵەوانە سەرچڵەکان کە پێشبڕکێی پێوانەیی تۆمار دەکەن، جا لە ئەنجامی ئەو هێزپەرستی و چێژپەرستیەدا کە ئەوروپا وەك دین وەریگرتوە، وەك ئەنجامێکی حەتمی، چەندین پێڕو گروپی پڕچەکی بەربەرەکار پەیدا بون و چەندین خۆسازدانی جەنگی هاتنە ئارا، کە لە پێناو هەوەستو ئارەزودا ئامادەبون یەکتری تێکبشکێنن، لە لایەنی ژیارو شارستانیشەوە ئەنجامەکەی بەمجۆرە کەوتەوە؛ جۆرە مرۆڤێك پەیدا ببێ پێی وابێ تەنها قازانجی کرداری بەردەست بریتیبێ لە پایەداری، تەنها سەرکەوتنی ماددیش بریتی بێ لە سەرمەشق و جیاکەرەوەی خێر و شەڕ))[٢].

((ژیاری رۆژئاوا بەشێوەیەکی توندوتیژ و روەورو ئینکار لە بونی خوا ناکات بەڵام لەراستیدا لە سیستەمە هزریەکەیدا هیچ شوێنێکی بۆ خوا تەرخان نەکردوەو هیچ سودێکی لێ رەچاو ناکات و هەست ناکا ئاتاجی[٣] پێ هەبێ))[٤].

رەنگە لەبەرئەوەی خاوەنی ئەم وتانە لە نەسرانیەتەوە بەرەو ئیسلام و لە ئەوروپاوە بەرەو رۆژهەڵاتی ئیسلامی کۆچی کردوە، نرخی گەواهیدانەکانی کە

---

(١) هزرڤان: مفكر.
(٢) Islam At the Cross Roads,p.٥٠. Fifth Edition.
(٣) ئاتاج: پێویستی.
(٤) هەمان سەرچاوە. ل ٤٠ .

لەبارەی مەڵبەندە ئاینیەکانی ژیانی ئەورووپاوە داونی بەکەم دابنرێ و مەودای کاریگەریەکەی تەسك بکرێتەوە، بەڵام ئەوەتانێ نوسەرێکی ناوداری ئینگلیزی و مامۆستایەکی گەورەی (لەندەن)یش گەواهیەکی راشکاوتر و بەڵگەدارتر لە بارەی پوکانەوەی ئاینی رەسمی لە گەورەترین مەڵبەندەکانی وڵات دەدات.

ئوستاد جۆد(**Joad**) سەرۆکی بەشی فەلسەفەو دەروونناسی لە زانکۆی لەندەن لە پەرتوکەکەیدا بەناوی ( **Guid to Modern Wickedness**) دەڵێ:

((لە بیست خوێندکاری کوڕ و کچی تەمەن (دە-دوازدە)ساڵانم پرسی داخۆ چەند کەسیان بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان مەسیحین؟ تەنها سێ کەسیان بە (بەڵێ) وەڵامیان دایەوە، حەفتیشیان گوتیان هەرگیز بیرمان لەم بابەتە نەکردۆتەوە، دە خوێنکارەکەیتر بێ پێچ و پەنا گوتیان: دژی مەسیحیەتین. جا من وادەزانم ئەم رێژەیەی نێوان بڕوادار و دیندارە مەسیحیەکان لەگەڵ بێبڕواکان لەم وڵاتەدا شتێکی ریزپەڕ و نامۆ نەبێ. بەڵێ راستە ئەگەر هەمان پرسیار بەر لە پەنجا یان بیست ساڵێك ئاڕاستەی گروپێکی لەم جۆرە بکرابوایە وەڵامەکان بە شێوەیەکیتر دەبون، کەواتە بە گوێرەی ئەم تاقیکردنەوەیە؛ ژمارەی ئەو کەسانەی هاوڕای (کانون بێری)نو وادەزانن راپەڕینێکی گەورەی مەسیحایەتی جیهان رزگار دەکات، گەلێ کەم دەبێ. من پێم وایە هیچ پاساو و بەڵگەیەك پاڵپشتی ئەم رایە ناکات تەنها هەواو هەوەست نەبێ، چونکە گەلێجار هەواو هەوەست هزر و بۆچون دروست دەکات بەڵام هەرگیز بەڵگە و گەواهی پەیدا ناکات. بە گوێرەی ئەم رەوش و شوێنەوارەی کە وڵات تێیدا دەژی دەبێ کەنیسەی نەسرانیەت لەسەدەی ئایندەدا بمرێ، ئەم بەڵگەیەش کە لە رۆژنامەیەکدا بڵاوکراوەتەوە پاڵپشتی ئەم وتەیە دەکات:

((پیاوێکی تەمەن حەفتاوحەفت ساڵی رێگەیەکی دۆزیوەتەوە کە بەهۆیەوە دەتوانێ پەرتوکە پیرۆزە کۆنەکان بگۆڕێ بۆ باروتی تفەنگو ئاوریشمی دەسکردو پلاستیك و پەڕی پارەی بەهادار. ئامێرەکەی لە کارگەی (کاردیف) و هەشت کارگەیتر داناوە و لە تەوراتە کۆنەکانەوە چەکی شەڕ دروست دەکات، کابرای

داهێنەر کە پێشتر هەژارێك بو و ژیانی هەڵنەدەسورا، ئێستا بە هۆی ئەم ئامێرەوە پارەوپولێکی زۆری کۆکردۆتەوە)).

ئوستاد بەم رستە جوانە کۆتایی بە نوسراوەکەی دێنی کە ئاراستەی کەشیش و پیاوە دینیەکانی وەکو (کانون بێری)و کەسانیتری دەکاتو دەڵێ: ((جا ئەوەی گوێچکەی هەیە با گوێ بگرێ)).

هەمان نوسەر لە پەرتوکی دوەمیدا بەناوی ( Philosophy for our Times) دەڵێ:

((ئاوەزی ئینگلتەرا بە درێژایی ئەو هەمو سەدەیەوە تەنها خۆشەویستی پارە و خاوەنداریتی بەسەردا زاڵ بوە، حەزی پارە پەیداکردن بەهێزترین فاکتەری گوزەران و کاریگەرترین ئەنگێزەی[1] کارکردن بوە، چونکە پارەوپول ئامرازێك بوە بۆ خاوەنداریتی، دەوڵەمەندیو پارەداریش پێوەر بوە بۆ لێهاتویی مرۆڤ. بە درێژایی ئەو هەمو سەدەیە و تا ئێستاش خەڵك-لەرێی سیاسەتو ئەدەب و تەمسیل و سینەما و ئێزگە و بێتەڵەکان و هەندێ جار لە رێی مینبەرەکانی کەنیسەشەوە، لە هەمو ساڵو مانگێکدا- هان دراون و هان دەدرێن بۆ ئەوەی پارە کۆ بکەنەوە و ئەگەر لە قورگی شێریش بێ وەچنگی بخەن، هەروەها هەوڵ دەدەرێ خەڵك قەناعەت بەوە بێنن کە نەتەوەی شارستان ئەو نەتەوەیەیە کە سۆزی پارەپەرستی و خاوەنداریتیەکەی کلپەی سەندوە.

بێگومان ئەم پولپەرستیە دەگەڵ بیروباوەڕی ئاینیمان ناگونجێ و دژی یەکن، چونکە ئاین بە پەسندێتی هەژاری هەڵدەڵێ و بە ناپەسندێتی دەوڵەمەندی دادەڵێ، ئاین دەڵێ: هەژار بۆ چاکەکاری لەبارترە تا دەوڵەمەند. جا هەرچەندە حیکمەت و ئاینیش دەڵێن هەژاریی بۆ پەرستنی خوا و گەیشتن بە بەهەشت گونجاوترە، بەڵام خەڵك لەمەدا بڕوایان بە دین نەکرد و کاریان پێنەکرد، بۆیە سامانی حازر بەدەستیان پێ لە بەهرە بەڵێن پێدراوەکانی بەهەشت باشترە، رەنگە

---

(١) ئەنگێزە: باعث.

وابزانن ئەگەر لە کۆتایی تەمەندا بۆ لای خـوا وەرچـەرخێنو ژیـوان ببنـەوە وەك چۆن دنیایان بردۆتەوە و پارەوپولیان لە بانکەکان داگرتوە؛ ئاخیرەتیش دەبەنەوە.

سامۆئیل باتلەریش لە پەرتوکەکەیـدا گوزارشـتی لـەو جـۆرە هـزرەی خـەڵك کردوە و دەڵێ:

((هەندێ نوسەر دەڵێن: ئێمـە نـاتوانین خواپەرسـتیو پولپەرسـتی بەیەکـەوە کۆبکەینەوە، منیش وادەزانم کارەکە وا ئاسان نیە، بەڵام کـەنگێ کـار لـە دنیـا ئاسان بوە؟!)).

هەرچـەندە وەك رێبیـــر جیـاوازیش بـین بـەڵام لـە راسـتیدا هـەمومان لـە لاسـاکاریەکەی باتلەر و شوێنکەوتوانی نغرۆ بوین و خۆشەویستی پارەوپول دڵـی داگیر کردوین، وادەزانین سامان و دەوڵەمەندی پێوەری تەواوە بۆ نرخاندنی تـاكو دەوڵەت، هەڵبەت ئەم بیروبۆچونە بو کـە بـوە هـۆی وەدەرکـەوتنی دو رێبیـــری بایەخداری مێژویی:

یەکەمیان: رێبیری توخننەکەوتنی ئابوری[1] کە لەسەدەی نۆزدەمدا باو و بڵاو بو، بانگخوازانی ئەم رێبیرە پێیان وایە مرۆڤ لەسەر ئـەو بنـچینەیە کردەوەکـانی ئەنجام دەداتو نەخشەی بۆ دەکێشـێ کە گەورەترین سودی لـێ وەدەسـت بێنـێ، پاڵنەرو ئەنگێزەی ئەنجامدانی کردەوەکانیش بریتین لە چێژ وەرگرتن لە سـامان و پارەوپول نەك سۆزە نێودڵیەکان.

رێبیری دوەمـیش کـە سـەدەی بیسـتەمی داگرتۆتـەوە: بریتیـە لـە رێـبیری رێکخستنی ئابوری[2] کە مارکس رێبەریەتی. ئەم رێبیرە پێی وایـە سـیـستەمی ئابوریی مرۆڤایەتی لەسـەر بنـچینەی ئاتاجـە داراییـەکانی مـرۆڤ دادەمـەزرێ، ئەدەب و رەوشت و دیـن و لۆجیـك[3] و رژێمـی حکومـەتیش بـە گـوێرەی ئـەم سیستەمە ئابوریەوە پەیدا دەبێ. بێگومان ئەگەر خـەڵکی وڵاتەکـەمان ئەوەنـدە

(١)توخننەکەوتنی ئابوری: عدم التدخل الاقتصادي. رێبیر: مبدأ.
(٢) رێکخستنی ئابوری: التنظيم الاقتصادي.
(٣) لۆجیك: ژیربێژی، منطق.

پارەپەرست و مشورخۆری کۆکردنەوەی ماڵ و سامان نەبونایە ئەم دو ڕێبیرە هەرگیز وا لە ئامێز نەدەگیران))[١].

لە شوێنێکیتری هەمان پەرتوکدا دەڵێ:

((تیۆری ژیانی ئەمڕۆ کە لەم سەردەمەدا بڵاوە و حوکم بەسەر خەڵکیدا دەکات؛ لە هەمو کاروبار و بابەتێکدا لە روانگەی بەرِك[٢] و گەدەوە لە شتان دەڕوانێ: Stomach and Pocket View of Life).

ڕۆژنامەنوسی بەناوبانگی ئەمریکی (Jhon Gunther) لە پەرتوکەکەیدا بەناوی ( لەناوەوەی ئەوروپادا Inside Europe:) جوان وێنەی ئەم جۆرە دەرونە دەکێشێ و دەڵێ:

((ئینگلیزەکان حەفتەی شەش رۆژان بانکی ئینگلتەرا دەپەرستن و لە رۆژی حەفتەمدا رو لە کەنیسە دەکەن)).

## دیمەنە سروشتیەکانی ماددەپەرستی لە ئەوروپادا:

کەسانێك بڕوایان بە ژیانێکیتر نەبێ و وابزانن ژین جگە لە چێژ و رابواردنی خۆش و باڵادەسبون هیچ ئامانجێکیتری نیە و بە حاڵ خوایان لە یاد بێ و گەورەیی خوایان نەناسیبێ، چۆن چاوەڕوان دەکرێ لەکاتی تەنگانە و مەترسیدا هانا وەبەر خوا ببەن و دەستی نزای بۆ بەرز بکەنەوە؟!، تەنانەت وەك ئەو هاوبەشپەرستانەش نابن کە خوا لەبارەیانەوە فەرمویەتی: ﴿ وَإِذَا غَشِيَهُمْ مَوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ : ئەگەر وەك نسار شەپۆلی دەریا دایانپۆشێ ئەوکات بە تەنها هاواری خوا دەکەنو تەنها خوا دەپەرستن.﴾لقمان:٣٢. ئەوروپاییەکان لەبەرئەوەی لەنێو دەریای ماددەپەرستیدا لغاو ببون و توند دەستیان بە هۆیە رواڵەتیەکانەوە گرتبو و پاساوی گشت روداوێکیان لە روانگەیەکی ماددیەوە شرۆڤە دەکرد و رویان لە خوا وەرگێرِا بو

(١) Philosophy for our Times p.٣٨-٤٠.

(٢) بەرِك: گیرفان.

بۆیە ئەوەندە دڵرەق و سەرسەخت و بێئاگا ببون؛ ئەو فەرمودەی خوایان لەسەر جێبەجێ ببێ کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَى أُمَمٍ مِنْ قَبْلِكَ فَأَخَذْنَاهُمْ بِالْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ، فَلَوْلاَ إِذْ جَاءَهُمْ بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا وَلَكِنْ قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ : پێغەمبەرانمان بۆ گەلێك گەلی پێشی تۆ ناردوە، کە بڕوایان پێنەکردون ئێمەش دوچاری هەژاری و نەخۆشیمان کردون تا بەڵکو بۆ لای خوا بگەڕێنەوە و لە خوا بپاڕێنەوە. کە دوچاری گرفتاری بون خۆزگە وابو بگەڕێنەوە کەچی نەگەڕانەوە چونکە دڵیان رەق ببو و شەیتانیش کردەوە ناشرینەکانی بۆ رازاندبونەوە ﴾الانعام:٤٢-٤٣.
﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُمْ بِالْعَذَابِ فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ: دوچاری ئەشکەنجەمان کردن بەڵام بۆ خوا ملکەچ نەبونو نەگەڕانەوە﴾المؤمنون:٧٦.

لە وتاری سەرکردەو وەزیرەکانی ئەوروپادا تەنانەت لە سەختترین ساتەکانی شەڕیشدا هەست بەوە ناکەی دڵیان بۆ خوا نەرم و نیانی تێدابێ یان لە خوا بپاڕێنەوە و هانای وەبەر بەرن، لە رەوشت و کردەوە و بۆنەکانیشدا شتی وا لە (گەل) بەدی ناکەی. بیرمەند[1] و ئەدیبەکانی رۆژئاوا ئەم حاڵەتە بە جۆرێك لە نەبەردیو گەردەنکەشی لێکدەدەنەوە. یەکێك لە سەرکردە و گەورە سیاسەتمەدارەکانی ئینگلیز لەناو پەرلەمانی ئینگلیزدا شانازی دەکرد و دەیگوت، ئینگلیزەکان لە بەرامبەر کارەسات و تەنگانەدا دەست بەخۆدا شۆڕ ناکەنەوە، ئەمەشی بە بەڵگە دێناوە کە لە سەنگافورەدا سەماکەر و سۆزانیەکانی ئینگلیز لەو کاتەی فڕۆکەکانی یابان ناپاڵمیان بەسەر شاردا دادەباراند وازیان لە نمایشی سەما و گۆرانیەکان نەهێناو دوایان نەخست.

هیندستانیەك سەربردەی ئاهەنگی شەوێك دەگێڕێتەوە کە خۆی دیویەتی و دەڵێ: (( لە گەرمەی سەماکردن دابوین گوێمان لە زەنگی هێرشێکی ئاسمانی بو، هۆڵەکە تێکڕا کڕ و بێدەنگ بو، پاشان یەکێك لە ئامادەبوان دەنگی هەڵبڕی و گوتی: دەی چ دەڵێن، سەما بەردەوام دەبێ یان دوا دەخرێ؟ ئافرەتێك هاتە وەڵام

---

(١) بیرمەند: مفكر.

و گوتی: بەڵکو بەردەوام دەبین، ئیتر نەك لە هۆڵەکە بەڵکو لە ژورەکانیتریش دەنگو هەرای سەماو گۆرانی دەستی پێکردەوە))[1].

هەروەها دەڵێ: وەك نەریتێکی رۆژانەی نێو سینەماکان بە خەڵکیان رادەگەیاند و دەیانگوت: بۆ ئاگاداری؛ ئێستاکە هێرشی ئاسمانی دوژمنان دەست پێدەکات بەلاّم ئەم بەشەش رادەنوێنرێ جا ئەو کەسەی دەیەوێ بچێتە ژێرزەمینەوە با بڕواتە خوارەوە لای دەستەچەپی بگرێ. بەلاّم خەڵکەکە شوێنی خۆیان بەجێ نەدەهێشتو بەشەکەش دەستی پێدەکرد))[2].

نوسەرێکی ئینگلیزی تەعلیقێکی لەسەر وێنەیەك نوسیوە کە لە بەناوبانگترین رۆژنامەی هیندستانی (Statesman) کە لە ٢٤ی یەنایەری ١٩٤٢ بلاّو کرابووەوە، دەڵێ : ((سەیرە! جوانترین نمایش لە رۆژانی شەڕی گەورە گەورەی مێژودا وەدەرکەوتوە!! بەریتانیای ئەمڕۆکەش هەر وایە، رابواردنگە و سینەما و نمایش و وێنەی وای تێدا دەبینێ کە بەر لەشەڕ شتی وا جوانو نایابی تێدا نەبوە، تەماشاکار شتی پڕ بەدڵو پڕ بەزەوقی خۆی لە رابواردنگەکانی لەندەندا وەدی دەکات)). لە ژمارەیەکی دیکەی هەمان رۆژنامەکەی رۆژی (١٥)ی دێسێمبەری ١٩٤٣ز نوسراوە: ((فیلمسازی لە (لەندەن) و (لیشبۆنە) و (مۆسکۆ)دا روی لە پێشکەوتنو پەرەسەندنە)).

مەگەر لە یۆنان و رۆمای سەردەمی کۆندا شتی وا هەبوبێ ئەگینا لە هیچ شوێنێکیتر ئەو جۆرە دلڕەقی و چێژپەرستی و رابواردنە وەدی ناکەی کە خەڵك لە ناخۆشترین و سەختترین کاتو لە ترکزەی[3] سەرەمەرگدا بەم جۆرە رەفتار بکەن.

پەیامنێرێکی (رۆیتەر) ئەوە دەگێڕێتەوە کە (مستەر چەرچل)ی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا چۆن پێشوازی لە ساڵی نوێ و ماڵئاوایی لە ساڵی کۆچکردو کردوە، کە رۆژێکی زۆر سەختی رۆژانی شەڕ بو، مرۆڤ لە تەنگانەی وادا پەنا

---

(١) الغارات الجویە، ئاغا محمد ئەشرەفی دەهلەوی. ل ٧١ .

(٢) هەمان سەرچاوە ل ٧٠.

(٣) ترکزە: مەترسی.

وەبەرخوا دەبات و تەنانەت ئەگەر سەرخۆشیش بێت وەئاگا دێتەوە و دڵی وەك بەردیش رەق بێ نەرمو نیان دەبێ، فەرمو لەگەڵ دەقی راپۆرتەکەی که دەڵێ:
((واشنتۆن..ئەمڕۆ: یەکەم رۆژی یەنایەری ساڵی ١٩٤٢ز، شەوی رابردو کە ساڵی تازە بە دیداری ساڵی کۆچکردو ئاشنا دەبو، مستەر شەرشل-سەرەك وەزیر بە سواری شەمەندەفەرێکی رەسمیەوە لە ولاتی کەنداوەوە بەرەو ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا سەفەری کرد، لە پڕو نەکاوێکدا سەرەك وەزیر دەگەڵ سێر (چارلز بۆڵتەر) لە پەیتونەکەی هاتە دەرەوە و بەرەو خواردنگەی شەمەندەفەرەکە رۆیشتن، جگەرەیەکی لە دەم و پەرداخێکی پڕ لە شەمپانیاشی بە دەستەوە بو، ئەو رۆژنامەنوسانەی لەگەڵیدا بون دیمەنەکەیان زۆر پێ سەیر بو مستەر شەرشل بە بزەوە پەرداخەکەی گرتە دەست و گوتی: بەناوی ساڵی ١٩٤١ز، ساڵی کۆشش و ماندوبون و ئازادکردن)). لەو کاتیدا ساڵی کۆچکردو دوا هەناسەی دەدایەوە و ساڵی تازەش یەکەم هەناسەی هەڵدەکێشا، ئەو شاندانەی لەوێدا ئامادە ببون لەگەڵ رۆژنامەنوس و کاربەدەستانی شەمەندەفەرەکەش پیرۆزباییان لەگەڵ مستەر دەگۆڕیەوە. (مستەر چەرچل) بە دەستێکەوە دەستێکی (سێر چارلز بۆڵتەر) و بە دەستەکەی تریشی دەستێکی (کاربۆڵ هارنەر)ی گرتبو، ئەوانیش هەردوکیان دەستی یەکتریان گرتبو، کردیانە سەما و گۆرانی گوتن، پاشان مستەر چەرچل چوە لای دەرگا و هاواری کرد، لە هەموتان پیرۆز بێ، خوا سەرکەوتنمان پێببەخشێ. خەڵکیش لێکرا دەنگی گۆرانیان هەڵبڕی و کردیانە چەپڵەڕێزان، سەرەك وەزیر پیتی V[1] کێشا و پاشان بە دڵخۆشی و بە ئاسودەییەوە گەڕایەوە نێو پەیتونەکەی[2])).
بەراوردێك لە نێوان ئەم سروشتە ماددیە لەگەڵ دەرونی ئاینیی و ئامۆژە ئاینیەکان و هەڵوێستی دینداران لەکاتی شەڕ و مەترسیدا بکە ئەوجا بۆت وەدەردەکەوێ کە چتۆ جیاوازیان لە نێواندا هەیە، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ : بڕواداران!

---

(١) کە تەعبیرە لە وشەی Victory واتا: سەرکەوتن.    وەرگێڕ
(٢) پەیتون: عەرەبانەیەکە دو ئەسپ رایدەکێشن.

ئەگەر لە شەڕدا بەرەنگاری دوژمنان بونەوە، زۆر یادی خوا بکەنەوە، تا بەڵکو سەرکەون.﴾الانفال:٤٥، پێغەمبەر ﷺ کاتێك توشی تەنگانەیەك دەبو نوێژی دەکرد[1]. لە ژیاننامەکەی ئیبن هیشام لە شەڕی بەدری گەورەدا هاتوە کە ئیبنی ئیسحاق گوتویەتی : ((دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ریزەکانی رێکخستو گەڕایەوە ناو بارەگاکەی، تەنها ئەبوبەکری سددیقی لەگەڵدا لە ژورێ بو، پێغەمبەر ﷺ لە خوا دەپاڕایەوە تا ئەو سەرکەوتنەی بەڵێنی پێدا بو پێی ببەخشێ، لە نزاکەیدا دەیفەرمو: ((**اللهم إن تهلك هذه العصابة اليوم لا تعبد:** خوایە گیان! ئەمڕۆ ئەگەر ئەم کۆمەڵە موسڵمانە لەناو بچن کەس نامێنێ بتپەرستێ)).

هەر لە دێرینەوەڕا لەبەر چەندین هۆی حەتمیو سروشتی و مێژویی و زانستی؛ ماددەپەرستێتی بۆتە دروشمی ژیار و ژیانی رۆژئاوایی. پێگەیشتنی نوێ و راپەڕینە زانستی و رامیاریەکەی ئەوروپاش پتر باقوبریق و هێزی وەبەرنا، گەلێك زانای رۆژئاوا و رۆژهەڵاتیش هەستیان بەم تازیاریە[2] کردوە. یەکێك لە زانا رۆژهەڵاتیەکانی سەرەتای ئەم سەدەیە، ئوستادی ژیرمەند و گەڕیدەی بیرتیژ: (عبدالرحمن الكواكبي)یە، کە لە پەڕتوکەکەیدا بەناوی(طبائع الاستبداد) دەڵێ:

((ژیانی مرۆی رۆژئاوایی ماددەپەرستیە، دەرونی قایمو پتەوە، رەفتاری توندوتیژە، خۆپەرستێکی لە رادەبەدەرە، تۆڵەستێنە و لێخۆش نابێ، دەڵێی ئەو رێبیرە بەرز و سۆزە پیرۆزانەی لەلادا نەماوە کە مەسیحیەتی رۆژئاوا بۆی راگواستبۆوە، بە نمونە پیاوی ئەڵمانی سروشتێکی وشکی هەیە، پێی وایە مرۆی لاواز لە ژیانی مرۆڤایەتیدا پێویستە بمرێ، وا دەزانێ گشت پایەدارییەك لە هێز دایە، هەمو هێزێکیش لە پارە دایە، زانستی خۆشدەوێ بەلام لە پێناو پارەدا، شکۆمەندی خۆش دەوێ بەلام لە پێناو پارەدا. پیاوی لاتینیش هەیە

---

(١) حوذەیفە -خوا لێی رازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کارێکی نەستەمی هاتبوایە پێش نوێژی دەکرد)) ئەبوداود گێڕاویەتیەوە.

(٢) تازیاری: امتیاز.

سروشتەکەی وایە کە خۆی پێ گەورە و پەسندە، وادەزانێ دەبێ ئاوەز رەها بێ، دەبێ ژیان بێئابڕو بێ، شان و شکۆ بە هۆی ڕواڵەتی جوان و پۆشاکی کەشخەیە، عیززەت و سەربەرزی بە هۆی زاڵبونە بەسەر خەڵکدا)).

بەڕاستی وێنەیەکی دەقاودەقی بۆ سروشتی ئەوروپایی کێشاوە و زۆر جوان دەرونی ئەوروپایی شی کردۆتەوە، پێمان وایە کەواکیبی-خوا لێی خۆش بێ- کە باسی رەگەزی تری جگە لە ئەڵمانی و لاتینی نەکردوە لەبەر ئەوە بوە تا توشی درێژدادڕی نەبێ، بۆیە مرۆی ئەڵمانی و لاتینی وەك نمونەیەك بۆ سەرجەم ئەوروپاییەکان هێناوەتەوە.

## مەبەستە ماددیەکانی بزاڤە روحیە زانستیەکان:

روحی ماددەپەرستی لە سەرجەم ئەو سیستەمە سیاسیو کۆمەڵایەتیو رەوشتیانە بەدی دەکەی کە ئەوروپا خۆی دایهێناون یان گەلانی ئەوروپایی لەم سەردەمەدا تازەیان کردۆتەوە، تەنانەت روحیەتی ئەو بزاڤە روحیەش هەر ماددەپەرستی بو کە لەم دواییانەدا سەری هەڵدا و خەڵکی سەرقاڵ کرد، بزاڤە روحیەکەش وەکو سەرجەم هونەر و پیشەسازیەکانی ئەوروپا بۆتە هونەر و پیشەسازی، مەبەستەکەی هەر ئەوەیە کە سەیر و سەمەرەکانی نێو جیهانی روح ببینێ و پەی بە راز و نهێنیەکانی روح ببات و قسە لەگەڵ روحی مردوان بکات و خۆشی و ئارامی بە دەرون ببەخشێ و کاتی پێ راببوێرێ، دەنا بە هیچ جۆرێك پەیوەندی بە پاککردنەوەی دڵو دەرون و سازدانی کردەوەی چاك نیە، بۆ ئەوە نیە خۆی بۆ مردن ئامادە بکات و لە کاتی تەنگانەدا ئارام بگرێ و تەنگژەکانی ژینی لەبەر ئاسان ببێ و سینە و دڵی گوشاد ببێ، تەواو پێچەوانەی بزاڤە روحیو تەسەووفە رۆژهەڵاتیەکەی ئیسلامە. هەروەها مەبەستی زۆربەی هەرەزۆری ئەو کردەوانەش کە خەڵکی رۆژئاوا خۆیانی بۆ دەکەنە قوربانی لە پێناو دەسکەوتی ماددیو ناوبانگو سینگ دەرپەڕاندن و ئافەرینی خەڵكو مێژوە، بە پێچەوانەی ئەو کردەوانەی کە لە پێناو خوا ئەنجام دەدرێن، چونکە موسڵمان کە چاکەیەك دەکات خۆی لە چڵکی ریابازی و ناوبانگ دەرکردن دەپارێزێ، تا بەڵکو لەلای

خوا قبولّ ببێ، گوێڕادێری فەرمودەی خوایە کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً، الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا، أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلاَ نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا : پێتان بلّێم کێ لە هەمو کەس رەنجەڕۆترە؟ ئەوانەی لە دنیادا کردوکۆششیان بە فیڕۆ چوە و وادەزانن کارێکی چاکیش ئەنجام دەدەن! ئەو کەسانەن کە بە دیدار و نیشانەکانی خوا بێبڕوان، بۆیە کردەوەکانیان پوکەڵ بۆتەوە و لە رۆژی ژیانەوەشدا هیچ نرخێکیان بۆ دانانێین. ﴾الکهف:١٠٣-١٠٥، ﴿ وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُورًا: بێبڕواکان هەر کردەوەیەکی لەدنیا دەیکەن و بۆ دوارۆژی دەنێرن پاداشتیان بۆ نانوسرێ و وەك تۆز و گەردی پەرش و بلاّوی ناو تیرۆژی[1] لێ دەکەین. ﴾الفرقان:٢٣، جارێکیان یاوەران لەبارەی پیاوێکەوە لێیان پرسی کە لە پێناو ئازایەتی یان بۆ ریابازی بجەنگێ، گوتیان کامیان لە پێناوی خوایە؟ فەرموی: مَن قاتَلَ لِتَكُون كلمةُ الله هِيَ العلْيا فَهُوَ فـي سَبِيلِ الله[2] ئەوەی شەڕ بۆ بەرزی وشەی خوا بکات لە پێناو خوایە)).

عومەری کوڕی خەتتاب-خوا لێی رازی بێ- لە پاڕانەوەدا دەیگوت: ((خودایە وابکە گشت کردەوەکانم کرەوەی چاك بن، پاك لە پێناو تۆدا بن و بۆ غەیری تۆی تێدا نەبێ))، لەنێو دوتوێی مێژونامە و سەربردەنامەی پیاوچاکانی ئەم نەتەوەیەشدا دیارە پیاوچاکەکان چ کردوکۆشێکیان کردوە تا عیبادەت و خێرەکان لە خەڵکی بشارنەوە و کەس پێیان نەزانێ.

## تەسەووفی ماددە پەرستانەی رۆژئاوایی و یەکێتی بونی ئابوری:

دید و هزری ئەوروپا گەیشتە رادەیەك کە لە نێو ماددەپەرستیدا نغرۆ ببێ و خۆی بزرکا و هەمو شتێك لەبیر بکات تەنها بەها و پێودانە ماددیەکان نەبێ،

(١) تیرۆژ: تیشکی رۆژ کە لە کلاوڕۆژنانەوە دێنە ژورەوە.

(٢) رواه مسلم .

با کارل مارکس (١٨١٨-١٨٨٣ز) دامەزرێنەری فەلسەفەی کۆمۆنیزمی بە نمونە بێنینەوە.

کارل مارکس پێیوایە تەنها سیستەمی ئابوری دەبێتە روحی کۆمەڵگا، دین و ژیار و فەلسەفەی ژین‌و هونەرە جوانەکانیش هەموی رەنگدانەوەی ئەو سیستەمە ئابوریەن. مارکس خۆی دەڵێ: لە گشت سەردەم‌و رۆژگارێکی مێژودا رێگەیەکی تایبەتی بۆ بەرهەمهێنانی پیشەسازی هەیە، پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان بە گوێرەی ئەم رێگەیە هێوێن دەبن، جا پاش ماوەیەکی کەم تێدەپەڕێ پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لەگەڵ رێگەکەی بەرهەمهێناندا بە هاوسازی نامێننەوە، بۆیە خەڵکانێك رادەپەڕن تا پەیوەندیەکان بە شێوەیەکی‌تر دارێژنەوە، مێژونوس بێئەوەی لە ماهییەتی راپەڕینەکە بگات-کە سەیریش نیە تێنەگات- لە مێژودا بە شۆڕش و کودەتا ناودێری دەکات، چونکە ئەو کەسانەی لەم جۆرە شۆڕشانەدا بەشدار دەبن رەنگە هەست بەو مەبەستە نەکەن کە شەڕەکەی بۆ دەکەن، بەڵام بۆمان هەیە ئەم مەتەڵە شی بکەینەوە و بزانین ئەو هەمو پێشکەوتن و کەم‌وزیاد و چاکسازی‌و پەرەپێدان و گۆڕانکاریەی لەپێناو سیستەمی سیاسیدا دەکرێن تەنها وێنەیەکی نوێی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانن و بۆ ئەوە دێنە ئارا تا سەرلەنوێ لەگەڵ رێگە تازەکەی بەرهەمهێناندا بگونجێنەوە، جا لەبەرئەوەی پەیوەندی نێوان رێگەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی‌و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان بەردەوام لە گۆڕان و جیاوازی دان بۆیە راپەڕینیش لەپێناو سازاندنەوەکەدا بەردەوام دەبێ، خۆ ئەگەر گۆڕان‌و جیاوازیەکە لە رادەی خۆی تێپەڕی‌و توندوتیژ بو ئەوا لە شێوەی شۆڕشدا دەردەکەوێ، بەڵام ئەگەر جیاوازیەکە رون‌و ئاشکرا نەبێ بۆمان نیە نکوڵی لێبکەین. گۆڕان‌و جیاوازیەکەش لە شەڕی چینایەتیدا وەدەردەکەوێ، چونکە سەرجەم چینەکانی کۆمەڵگا بەشێکن لە سیستەمە ئابوریەکە. ئەم لێکدانەوەیە ئەو ئەنجامە وەدەست دێنێ کە دەبێ مێژوی مرۆڤایەتی-ئەو رۆژگارە نەبێ کە ژیانی مرۆڤایەتی لە قۆناغی ساوایەتیدا بوە- هەموی بریتی بوە لە چیرۆکێکی دورودرێژی شەڕی نێوان چینە جیاوازەکانی کۆمەڵایەتی.

مارکس بەم لێکدانەوەیەی نکـوڵی لەسـەرجەم لایەنـەکانیتری ژیـانی مـرۆڤ کردوە تەنها لایەنی ئابوری نەبێ، گرنگی بـە هـیچ لایـەنێکیتر نـەداوە و هـیچ سەنگو نرخێکی بۆ ئاینو رەوشتو روح و دڵ و تەنانەت بۆ ئـاوەزیش دانـەناوە، دانی بـە هیـچکامێکیان نـەناوە وەك هۆکـارێکی کارتێکـەری مێـژو بـن، وای لێکداوەتەوە گشت شـەڕ و شۆڕشـەکانی مێـژو لـەپێناو ورگێـك بـوبن لـە دژی ورگێکیتردا، لە پێناو رێکخستنێکی نوێی لەنێوان سیستەمی ئـابوریو رێگـەی بەرهەمهێنانی پیشەسازیدا بوبن، وای لێکداوەتەوە تەنانەت شـەڕە دینیـەکانیش شەڕی چینایەتی بوبن، بەرەیەکیان خاوەنی سـامانو رێگـەکانی وەبەرهـەمهێنان بوبێ و بەرەکەی تریش تێکۆشـابێ تـا بەشـەمافی خـۆی بـستێنێو سـەرلەنوێ هاوسازیەکە رێکخاتەوە، لە ئەنجامی ئەم بەربەرەکاریەدا شەڕ بەرپابوە. بەگوێرەی ئەم لێکدانەوەیە بێ دەبێ شەڕی بەدر و ئوحد و ئەحزاب و قادسـیە و یـەرموك و سەرجەم شەڕ و روداوەکانیتری مێژو شەڕی چینایەتی بوبن!!.

ئائەمەیە تەسەووفی ماددەپەرستانەی رۆژئاوا، ئەمەیـە فەلـسەفەی یـەکێتی بون: یەکێتی بونی ئابوری. رۆژهەڵاتیەکان کاتی خۆی لەبەرئـەوەی روحـی دیـنو خواوەندایەتیان بەسەردا زاڵ بو بۆیە دەروێشو سۆفیەکان هەمو شتێکیان نـەفی دەکرد و هاواریان دەکرد: ((لا موجود الاّ الله: جگـە لـە خـوا هیـچیتر نیـە))، هەمان شت بیرمەندانی ئەوروپاش نەرێیان لە هەمو شـتێك کـرد تـەنها لایـەنی ئـابوری نـەبێ، هاواریـان دەکـرد: ((جگـە لـە ورگ و گـەدە هیـچیتر نیـە))، سـۆفیگەرێتی رۆژهـەڵات پێـی وابـو مـرۆڤ سـێبەرێکی پەروەردگاریـیـە، ماددەپەرستانی رۆژئاواش پێیان وابو وجودێکی ئاژەڵانەیە.

## تیۆری داروین و کاریگەریەکەی لەسـەر هـزر و ژیاردا:

تیۆرەکەی داروین بوە پاڵپشـتێك بۆ بیروبۆچـونی ماددەپەرسـتانی ئـەوروپا و قوڕەکەی خەسـتتر و ئاوەکـەی شـێلوتر کـرد. تیۆرەکـە لـە سـەدەی نۆزدەمـدا لەبارەی پەرەسەندنی مرۆڤەوە دەنگی هەڵبڕی، بە گوێرەی ئـەم تیـۆرە مـرۆڤیش وەکو سەرجەم ئاژەڵەکانیتر جۆرە ئاژەڵێکە بەڵام لە ئاژەڵەکانیتر پەرەسەندوترە و

بە درێژایی هەزاران ساڵ بەر لەئێستا قۆناغ بە قۆناغ و جۆر بە جۆر پەرەی سەندوە، لە ئەمیباوە تا مەیمون و لە مەیمونیشەوە تا مرۆڤو لە مرۆڤی سەرەتاییشەوە تا مرۆڤی پێگەیشتو. رێبەر و پاڵەوانی ئەم تیۆرە داروینی خاوەن پەرتوکی (بنەرەتی جۆرەکانە)[1] کە لە ساڵی (١٨٥٩ز) بڵاوکرایەوە، تیۆرەکە بو بە شاباشی یانە و کۆڕ و مەکۆ و خوێندگەکان و خەڵکی لێکرا سەرقاڵ کرد، تیۆرەکە ئاراستەیەکی نوێی لەمەڕ مەسەلەکانی تایبەت بە مرۆڤ گرتبو، رەوتی هزری خەڵکی وەرگەڕاند و دیدی مرۆڤی لەبارەی مێژو ناسینی مەسەلەکانی تایبەت بە مرۆڤ وەرچەرخاند و لە ئادەمیزادییەوە بەرەو ئاژەڵزادی راپێچی کرد، وای نیشان دا کە گەردون بەبێ ویستو توانا و چاودێری خوا هەڵدەسوڕێ و لە یاسا سروشتیەکان بترازێ هیچ هۆکار و هێزێکی ناسروشتی شوێنپەنجە و کاریگەری تێدا نیە، سەرلەبەری بونەوەریش بە کردارێکی بەرەبەرەی لەئاوەز و مەبەست بەدەرەوە لە ئاستە سەرەتاییەکانی ژیانەوە بەرەو ئاستە بەرزەکانی ژیان پەرەدەستێنێ.

مرۆڤو جۆرە ئاژەڵەکانیتریش خولقێنراوی کردگارێکی کاربەجێ نین، بەڵکو لە ئەنجامی کۆمەڵێك رێسای سروشتییەوە پەیدابون، ململانێی لەپێناو مانەوە و یاسای مانەوەی گونجاوتر و هەڵبژاردنی سروشتی وایان کردوە ئەم ئەنجامە بێتەدی، هەمو بونەوەر و تەنانەت مرۆڤی ئاخێوەریش[2] بەرەژێری ئەم یاسایەن!.

ئاشکرایە تیۆرەکە لە روی رێبیر و مەبەست و ئەنجامە هزری و رەوشتی و ئاسەوارە کرداریەکانەوە لەگەڵ دین و عەقڵ پێچەوانەبو، بگرە تیۆرەکە خۆی ئاینێکی نوێ بو و ئاینی کۆنی لە بنوبۆتکەوە هەڵدەتەکاند و جێی لێ دەگرتەوە، بۆیە سەیر نیە ئەگەر پیاوانی دین بەم تیۆرە شلەژاو و نیگەران بوبن، یان حیسابێکی وردیان بۆ کردبێ و لە چارەنوسی دینی ئەوروپا ترسابن.

ئوستاد جۆد لە پەرتوکەکەیدا دەڵێ:

---

(١) بنەرەتی جۆرەکان: أصل الأنواع، Origin Species.

(٢) ئاخێوەر: قسەکەر.

((ئەستەمە ئێستا بتوانین پەی بەو دۆشـدامان و سەیرمانە ببەین کە باپیرانمان بە دەرچونی پەڕتوکی (بنەڕەتی جۆرەکان)ی داروین توشی ببون، چـونکە داروین ئەنجامە سەلمێنراوەکانی-یان کە خۆی پێیوایە سەلماندونی- بەو جـۆرە خـستەڕو کە کرداری پەرەسەندنی ژیان لەسەر ئەم هەسارەیەدا (واتە زەوی) هەر لە رۆژگاری شێوە سەرەتاییەکانی ئەمیباو چکۆڵەی دەریاوە (**Jelly Fish**) تا دەگاتە شێوە بەرزە کۆتاییەکەی کە بـالاترین و پەرەسـەندوترین شـێوەی ژیانـە هێشتا نەپچڕاوە و بەردەوامە، پەرەسەندنەکە هەر لە ئەمیباوە تا دۆخـی ئێمـەی مرۆڤ بێپسانەوە هەر بەردەوامە)).

بە پێچەوانەوە ئـەو کەسانەی لەسـەردەمی ڤیکتۆریـادا ژیـاون وا پـەروەردە کرابون کە مرۆڤ ئافەریدەیەکی[١] سەربەخۆیە و لە راسـتەقینەشدا جۆرێکـە لـە فریشتەیەکی نزم، جا ئەگەر داروین راستیش بکات مرۆڤ مەیمونێکی پەرەسەندو بێت خەڵکەکە هەر زۆری لەبەر زەحمەت بو بڕوا بکات، بۆیە بە تیۆرەکـە دڵـشاد نەبون و گەلێکیش تێکۆشان تا ئەم بیروباوەڕە لە خۆیان دامالن کە وەك نـەنگێك بە مرۆڤ لکێنرا بو، بەم مەبەستەشەوە چەندین پێشنیاریان پێشکەش کرد))[٢].

## بە پیرەوەچونی جەماوەر بەرەو تیۆری پەرەسەندن:

جەماوەر و خەڵکی رەشـۆکی -بـە تێگەیـشتنو بێتێگەیـشتن- پێـشوازیەکی گەرمیان لـە تیۆرەکـە کـرد-هەرچـەندە لـە روی زانستیـشەوە گـەلێك لاوازیو کەموکوڕیشی تێدابو-، خەڵك دەتگوت دەمێکـە مێـشکی بـۆ فەرتەنەیـەکی وا ئامادەیە، دەتگوت شتێکی دژ بە دین و پیاوانی دینیـان وەچـەنگ کـەوتوە تـا دژایەتی پێ بکەن. بۆ پیاوانی دین ئەستەم بو بتـوانن بـەرەنگاری ئـەو شـەپۆلە هزریو مگێزئامێزەی خەڵك ببنەوە، ئەستەم بو بتوانن بەر لە سێلاوی بلاوکـراوە

---

(١) ئافەریدە: بەدیهێنراو.
(٢) Guide to Modern Wickdnss, p.٢٣٥-٢٣٦ .

و کوڕ و موحازەرەکان بگرنەوە،[1] بۆیە کەنیسە ناچار بـو چـۆك دابـدا و ئـاڵای سـپی بەرزەوە کا، کەنیسە بەجۆرێك ملی بۆ تیۆرەکە شۆڕ کرد تەنانـەت کاتێـك داروین لەساڵی (١٨٨٣ز) دا مرد کەنیسەی ئینگلیزی روخسەتی دا لـە شـوێنی ناشتنی پیاوە دینیەکان لە (وسـت منـسترایبی) ئەسـپەردەی خـاك بکـرێ کـە گەورەترین رێزە کەنیسە بە مرۆڤی ببەخشـێ!.

تیۆرەکەی داروین کارگەریەکی گەلـێ قوڵو فرەوانی خستە سەر هزر و ژیار و ئەدەب و سیاسەت، شوێنکارێکی بەرچاویشی لەسەر خوڕەوشـتی خـەڵك بـەجێ هێشتو لە رەفتاران رەنگی دایەوە، دنـەی خەڵکیـدا کـە هـەوڵ بـدەن بـۆ ئـەو سەردەمە وەرچەرخێن کـە بـەهۆی رێختـە[2] پاکەکەیانـەوە بـە روت و رەهـایی دەگوزەران، وای لە خەڵك کرد وەك ئاژەڵێکی پەرەسەندو لە خۆیان بـڕوانن و لـەو سـۆنگەوەش رەفتـار و هەڵـسوکەوت بکـەن. تیۆرەکـە ژیـانی نێـو ماڵیـشی تێکشێواند، (مستەر شـێبەرد) کـە زانایـەکی ئینگلیـزیە دەڵـێ: ((ئینگلیــز نەوەیەکی لـێ پەیدا بوە کە لە ژیانی نێومـاڵ نـەزانو بێئاگایـە و تـەنها ژیـانی مێگەڵ و مالاَتان فێربوە)).

## هەندێ لە تاوانەکانی ماددەپەرستی:

لە ئەنجامی ئەو ماددەپەرستیو ئەو پەروەردە نادینیەدا کـە هـیچ پـشکێکی خوڕەوشــت و ترسـی خـوا و بڕوابـون بـە دوارۆژی تێـدا نـەبو، دەسـەڵاتدار و سـیاسەتمەدار و کاربەدەستەکان بە بیانوی چەند بەرژەوەندیەکی خەیاڵاوی سیاسی وڵات و نەتەوە یان لەپێناو گلدانەوەی چەند دەسـتکەوتێکی دارایـی بـۆ خۆیـان؛ جاربوە تاوانی وا گەورەیان دەرهەق بە خەڵك کردوە کـە گـەورەترین تاوانبـاریش شتیوا نەکات، یەك لە روداوە هەرە کارەساتو ستەمئامێزەکانی ناو مێـژو ئـەو برسیەتی و قاتوقڕیە بەربڵاوەی بەنگال (هیندستان) بو کە ئینگلیز بـە ئەنقەسـت

---

(١) مگێز: ئارەزو، مەیل　　سێلاو: لافاو.

(٢) رێخت: فطرة.

خەڵکی توش کرد کە نەیاندەهێشت خەڵك ئەو بەلەمانە بەکاربێنن کە بۆ دروێنەی کێڵگەکانی برنج-کە خۆراکی بەنگالە- بەکاریان دێنا، بڕە دانەوێڵەیەکی ئێجگار گەورەشیان بۆ سەربازان گل دایەوە و ڕێگەشیان بە خەڵك نەدەدا کێڵگەکان بدورنەوە تا لە ئەنجامدا هەموی بە خەسار چو. بەم شێوەیە قاتوقڕی کەوتە ناو خەڵكو سەدان هەزار کەس لە برسان مردن، لەکاتێکدا هیندستان تا بڵێی دانەوێڵەیەکی زۆری هەیە و ڕێگاوبانی هاتوچۆشی فرە ئاسانەو خاکەکەشی بە بڕشت و باوبارانە، تەنانەت دەتوانێ وڵاتێکیتریش نان بدات، ئەم قاتوقڕی و برسیەتیەیان کە توشی خەڵکەکە کرد بۆ ئەوەبو خەڵك رو لە سەربازی بکەنو هەروەها واش نیشان بدەن کە حوکمی زاتی لەم وڵاتەدا سەرناگرێو شکست دێنێ.

لۆرد(ماونت بیتن)ی حاکمی هیندستان لە ساڵی (١٩٤٧ز)دا خۆی لەو پلانو نەخشانە نەبان[1] کرد کە بۆ لەناوبردنی موسڵمانانی شاری دلهیو بەنجابی رۆژهەڵات ڕێك دەخرا، پێشیان گوتبو کە کەینوبەین و پلانێك لەم ناوچانەدا لەئارادایە بەو مەبەستەی رەگەزی موسڵمانەکان قڕ بکەن، پسپۆڕەکانیش ئاگاداریان کردبوەوە کە خەریکە شەڕوشۆڕ و هەرایەکی گەورەی تایفەگەری روبدات، بەڵام ئەو وەك تۆڵەستاندنێك لە موسڵمانەکان خۆی لێ خەواند و وەك لە گوێی گادا نوستبێ هیچی نەکرد. چونکە کاتی خۆی موسڵمانەکان بە پێچەوانەی هیندیەکان بۆ حاکمێتی هیندستان هەڵیاننەبژاردبو، هەروەها تا ببێتە بیانویەکیش لەسەر ئەوەی کە خەڵکی ئەم وڵاتە شایەنی سەربەخۆیی نین، بگرە لەسەر شانی ئینگلتەرا بارگرانیشن و دەبێ ڕژێمو ئاسایشیان بۆ بپارێزێ، لە ئەنجامدا ئەوقەسابخانە گەورەیەی لێ کەوتەوە کە خەڵکێکی بێشوماری تێدا کوژرا، بەجۆرێك لە هیچ سەردەمێکدا قەسابخانەی وا روی نەدابێ.

جگە لەمە دو سەرلەشکری هیندی بۆ یەکلاکردنەوەی ئەم کێشەیە (رید گۆلف)یان بە ناوبژ هەڵبژارد کە ئەویش حوکمێکی ناڕەوای رۆنا و شارەکانی

(١) نەبان: بێئاگا.

بەنجابی بەگەڵ هیندستان دا و لە پاکستانی دابڕاند پاشان موسڵمانەکانیان لە (فیرۆزبۆر)و(کۆرداسبۆر) ئاوارە کرد و توشی دەردەسەری‌و خەسارەتێکی گەورەی گیانی‌و ماڵییان کردن.

پشتگیریەکەی واشنتۆن و (ترومان)ی سەرۆکی ئەمریکا بۆ زایۆنیزم و دامەزراندنی وڵاتی ئیسرائیل لە فەڵەستیندا و دژایەتیکردنی کێشەی عەرەبی کە ئاشکرایە هەق بەلای عەرەبەکاندایە، ئەمەش بەو مەبەستەی تا بتوانن دەسەڵاتی سیاسی‌و دارایی و رۆژنامەوانی جولەکەکان بۆ خۆی راکێشن‌و لە هەڵبژاردن دەربچن، هەروەها کەچاوی لە ئاست هەمو بەڵگە رۆشنەکانی وڵاتانی عەرەبی نوقاند، وێڕای ئەمە بێدەنگیەکەی ئەمریکا لەمەڕ کارە دزێوەکەی فەرەنسا دژ بە وڵاتی جەزائیری موسڵمان بەڵکو هاوسەنگەربونیشی دەگەڵ فەرەنسا، هەروەها هاوکاری زلهێزەکانی رۆژئاوا لەسەر تاوان و دەستدرێژیەکان... هەمو ئەوانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خوڕەوشتی گەورەپیاوانی ئەوروپاو ئەمریکا ئەوپەڕی نامەردی و نامەردومانەیی تێکەوتوە و ژیانی سیاسیشیان لە دەوری قازانج و بەرژەوەندیدا دەگەڕێ نەك رێبیر و بنەما.



**بەندی دووەم**

## نەتەوەپەرستی و نیشتمانپەرستی لە ئەوروپادا

## تێکشکانی کەنیسەی لاتینی هۆی هێزی دەمارگیری و نەتەوەپەرستی و نیشتمانپەرستی بو:

پێشتریش باسمان کرد نیشتمانپەرستی و نەتەوەپەرستی و بایەخدانی لە ڕاددەبەدەر بە گەل و شوێنی جوگرافی؛ خەسڵەتێکی ئەوروپاییەکان بوە بەجۆرێك کە تا سەر روحیان رۆچوە و دەگەڵ جەستەیان ئاوێتە بوە و بوەتە سروشتی دوەمینیان. بەڵام کە نەسرانیەت هات سروشتەکەی لەناوبردن و چونکە نەسرانیەت -لەگەڵ گشت نەخۆشی و دەستتێوەردان و گۆڕانەکانیشدا- هێشتا شوێنەواری زانست و ئامۆژەکانی مەسیحی بەسەرەوە مابو و ئاینی ئاسمانیش هەرچەند دەستی تێوەردرێ و بگۆڕدرێ هێشتا ئەو جیاوازیە دەستکردانە ناناسێ کە بۆ جیاکردنەوەی مرۆڤ لە مرۆڤ دانراون و قەت بە چاوی جیاوازی ناڕوانێتە ڕەگەزو ڕەنگ و نیشتمانەکان. دینی نەسرانی سەرجەم نەتەوە ئەوروپاییەکانی یەك خست و لە ژێر ئاڵای ئاینی کۆ کردنەوەو جیهانی نەسرانیەتی کردە یەك تیرە و گشت گەلانی بۆ کەنیسەی لاتینی گەردەنکەچ کرد و توانی بۆ ماوەیەکی دورودرێژ بەسەر فیزودەماری نەتەوەپەرستیی و بانگەوازی نیشتمانپەرستی زاڵ ببێ و خەڵکی لێ وەلانێ.

بەڵام لۆثەر لە ساڵی (١٤٨٣-١٥٣٦ز) بزاڤێکی بەناوبانگی چاکسازی ئاینی دژ بە کەنیسەی لاتینی بەرپا کرد و واشی بە چاك زانی بۆ هەموارکردنی بزاڤەکەی پشت بە ئەڵمانە هاوڕەگەزەکانی ببەستێ، لە ئەنجامدا سەرکەوتنێکی دیارو بەرچاوی وەدەست هێنا و کەنیسەی لاتینی شکستی خوارد و ڕیسی ساڵەهای ساڵی لێ بوەوە خوری !، نەتەوەکان لەیەکتر جوێ بونەوە و سەربەخۆیی خۆیان وەرگرت و هیچ پەوەندیەك نەما دەگەڵ یەکیان ببەستێتەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ

سەربەخۆتر و پەرتەوازەتر دەبون تا لە ئەنجامدا دینی نەسرانی لە ئەوروپادا پوکایەوە و فیز و دەماری نەتەوەپەرستی و نیشتمانپەروەریش گەیشتنە ئەوپەڕی هێز. ئاین و نەتەوەپەرستی وەك دو تای تەرازوێکن ئەگەر یەکێکیان قورس بێ ئەوەی تر سوك دەبێ، جا دیارە (تا) کەی ئاین ڕۆژ بە ڕۆژ سوکتر دەبو و (تا)کەی هەمبەریشی قورستر دەبو. بەڕێز لۆرد لۆثیەن (**Lord Lothian**)ی بەناوبانگی ئینگلیز کە باڵیۆزی پێشوی بەریتانیا بو لە ئەمەریکا، ئاماژە بەو حەقیقەتە دەکات و لە وتارێکدا کە لە ساڵی (١٩٣٨ز) لە ئاهەنگێکی زانکۆی (عەلیکرە) پێشکەشی کرد ، دەڵێ :

((بزاڤەکەی لۆثەر کە بانگەشەی چاکسازی ئاینی دەکرد کاتێك یەکێتی کلتور و دینی ئەوروپای هەڵوەشاندەوە کیشوەری ئەوروپا بۆ چەندین میرنشینی گەلئامێزی لێکجودا[1] دابەش بو، ناکۆکی و مونافەسەکانی نێوان میرنشینەکانیش مەترسیەکی هەمیشەیی لەسەر جیهان دروست کرد)).

لە ئەنجامی داڕوخانی ئاین و پوکانەوی ڕێبیرە دینی و ڕەوشتیەکانەوە؛ تای نیشتمانپەرستی و نەتەوەپەرستی قورس بو ، (لۆرد لۆثیەن) لە هەمان وتاردا دەڵێ:

((ئاین ڕێبەرێکە مرۆڤ هەمو دەم پێویستیەتی، تەنها ئاین دەتوانێ ئامانجە ڕەوشتیەکان و شکۆ مەعنەویەکان بۆ ژیانی مرۆڤایەتی دابین بکات، ڕۆژئاوا لە ئەنجامی داڕوخانی دەسەلاتی ئاینی دوچاری ئاژاوەی ڕاڕەوە سیاسیەکان بو کە لەسەر بنچینەی جیاوازی ڕەگەز و چینایەتی دامەزرابون، بەهۆی کاریگەری زانستە سروشتیەکانەوە وای لێهات بڕوا بەوە بێنێ کە ئامانج و مەبەستی مەزن و هەرەبەرز بریتی بێ لە بالادەستبونی ماددەپەرستی، کە هەڵبەت ئەمەش بەردەوام گرێ و گرفت و ئەرك و بارگرانی زیاتر بۆ ژیان پەیدا دەکات . ئەنجامێکی تر ئەوە بو کە ئەوروپا زۆری لەبەر زەحمەت بێ بتوانێ گونجان بخاتە

(١)میرنشینی گەلئامێزی لێکجودا: امارات شعبیة مختلفة.

نێوان ڕوح و ژیانەکەی ، گونجانێك بتوانێ لە نەتەوەپەرستی رزگاری بکات کە دێوەزمەی هەرەگەورەی ئەم سەردەمەیە))[١]

## سەیرو سەمەرەکانی فیز و دەماری نەتەوەپەرستی لە ئەورووپادا :

کە سیستەمی ئاینی لەبەریەك هەڵوەشایەوە، یەکەم شت نەتەوەپەرستی هەناسەی هاتەوەبەر و ئەورووپا بو بە یەك سەربازگەی دژ بە سەرجەم ڕۆژهەلات، نەتەوەپەرستیەکە هێلێکی جیاکەرەوەی لە نێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات یان لە نێوان ئەورووپا و کیشوەر و ناوچەکانیتر کێشا و ڕەگەزی ئاری لە ڕگەزەکانی تری مرۆڤایەتی بە بەرزتر هەڵبوارد. وای لە ئەورووپاییەکان کرد وا لەخۆ بگەن کە چاکە و بەرزێتیان بەسەر گشت ڕەگەز و گەل و کلتور و ژیار و زانست و ئەدەبی ئەودیوی هێڵەکەدا هەبێ و پێیان وابێ خۆیان بۆ قەڵەمڕەوی و فەرمانڕەوایی خولقێنراون و خەڵکانیتریش بۆ ژێردەستەیی و بەرفەرمانی، خۆیان دەبێ هەمیشە بژێنن و گەشە بکەن خەڵکانیتریش بپوکێنەوە و بمرن. یۆنانی و ڕۆمەکانیش لە سەردەمی خۆیاندا هەمان بیروباوەڕیان هەبو و بەهەمان شێوە بیریان دەکردەوە، پێیان وابو تەنها ڕەگەزەکەی خۆیان پاك و نەجیمزادەن و هەمو شتێکیان بە نامۆ ناو دەبرد بەتایبەتی ئەو نەتەوانەی کە دەکەونە ڕۆژهەلاتی ئۆقیانوسی ئەتلانتیکەوە کە بە دڕندەیان ناودێر کردبون.

بە هۆی ئەم دەرونە ڕەگەزپەرست و دەمارگیریانەوە کە دژ بە گشت شتێکی دەرەکی و بیانی بو؛ هەندێ لە گەلانی ئەورووپا گەیشتنە رادەیەك دینی نەسرانیشیان پێ لاییدە و نامۆ بێت، بۆیە هەوڵیان دەدا لە وڵاتی دەربەدەر بکەن و گەلی لێ دابڕن، وتەکەی پرۆفیسۆر (ئاتەرنی) کە یەکێکە لە مامۆستاکانی ئەڵمانیا ئەم بیروبۆچونە دەردەخات کە دەڵێ :

---

(١) Canvoation Adress of Lothian at muslim university Alrgrah

((منداڵەکانمان لە پێناو چدا مێژوی نەتەوەیەکیتر بخوێنن ؟ بۆچی چیرۆکەکانی ئیبراهیم و ئیسحاق فێر بن؟ تەنانەت خواکەشمان پێویستە ئەڵمانی بێ)).

لە ئەڵمانیا کۆمەڵێك پەیدابون خۆیان لە مەسیح -سلاوی خوای لەسەر بێ- بێبەری دەکرد لەبەر ئەوەی دەیانگوت لە بەنی ئیسرائیل بوە ، ئەو کەسانی خۆشیشیان دەویستن و بەمەزن و بەرێزیان دادەنان زۆریان هەوڵ دەدا بسەلمێنن لە نەژادی ئاری بوین، دەمارگیریەکیش پەیدا بو دەیگوت دەبێ خواوەندی دێرینی نەتەوەیی زندو بکرێتەوە کە پێشان گەلی ئەڵمان دەیانپەرست.

خۆ کەفوکوڵی فیزودەمازی ڕەگەزپەرستی و نیشتمانپەرستیەکەی ڕوسیای جیهانپەوەریش لە هی ئەڵمانیای مونافیسی دێرین کەمتر نەبو.

ڕوسەکان وا دەزانن ئازایەتی زۆربەی داهێنانە مەزنەکانی سەردەمی نوێ بۆ ڕوسەکان دەگەڕێتەوە. وادەزانن ئەو کەسەی یاسای پێکهاتەی ماددەکانی دۆزیەوە (لافوازێ) نەبو، بەڵکو زانای روسی (میشێل لۆمۆتۆسۆف) بو . دەڵێن (لووجین)ی روسی بە شەش ساڵ بەر لە (ئەدیسۆن) کارەبای بۆ ڕوناککردنەوە بەکار هێناوە. ڕۆژنامەی (براڤدا) بلاوی کردۆتەوە و دەڵێ، زانا ڕوسیەکان بەر لە (مۆرس) توانیویانە تەلەگراف دابهێنن و بەر لە (سێتفنسن) توانیویانە شەمەندەفەری هەڵمی وەگەڕ بخەن.. گەلێ جۆرە قسەی تریش لەم بارەوە دەکەن و دەگەڵ مێژو ڕوبەڕو دەبنەوە . هەڵبەت تاکە ئەنگێزەی[1] ئەم ورتەورتانە تەنها بریتیە لە فیز و دەماری ڕەگەزپەرستی و بە پیرۆز گرتنی ڕوسیا.

## پەتای نەتەوەپەرستی لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا :

بە داخ و کەسەرێکی زۆرەوە پەتای نەتەوەپەرستی هەندێ لە وڵاتانی ئیسلامیشی گرتەوە کە دەبوایە ببنە ڕابەری بانگەوازی جیهانیی ئیسلامی و، مەشخەڵی پەیامی ئاسایش و ئاشتی هەڵگرن و بەرەیەکی بەهێزی یەکانگیر پێك

(١) ئەنگێزە: پاڵنەر.

بێـــنن و دژی نەتەوەپەرســـتی و نیـــشتمانپەرستی بوەســـتن ، بـــەلاّم لەبـــەر هەڵوەشانەوەی دین و بە کاریگەری داب و نەریت و ژیاری ڕۆژئاواوە پێـچەوانەی ئەمە رویدا ، تورکەکان کێشەی تەورانیەتیان لە ناودا پەیدا بو کە بانگەشەی بـۆ ژیاندنـــەوەی داب و نـــەریت و کلتـــور و جاهیلیەتـــە دێرینەکـــەی دەکـــرد، وەك ئەڵمانەکان چۆن بە چاوێکی نامۆوە تەماشای ئەو ئاین و نەریت و کلتور و بەرز و بالاّ و پاکەیان دەکرد کە پەیامبەرانی ڕەگەز ناناری هێنابویان، تورکـەکانیش بـە هەمان شێوە دەیانڕوانیە شەریعەت و کلتور و زمانی دینـی ئیـسلام کـە لەسـەر دەستی عەرەب بلاّو ببوەوە. هەندێ لە بیرمەندانی تورکیای فـەتات پێیـان وابـو ئیسلام دینێکی لاییدە و نامۆیە و بۆ گەلی تورك ناگونجێ، چاکتر وایە بگەڕێنەوە سەر ئەو بتپەرستیە کۆنەی کە باووباپیران بەر لـە وەرگرتنـی ئیـسلام پـەیرەویان لێکردوە . خاتو خالیدە ئەدیب هانم لە بارەی (زیاء کوك ئەلب) کە یەکێکە لـەو گەورە دامەزرێنەرانەی لە ڕوی ئەدەب و تازەگەریـەوە تورکیـای نوێیـان هێنایـە دامەزراندن، دەڵێ:

((زیـاء کوك ئەلب دەیویست تورکیایەکی تازەی وا دروست بکات کـە ببێتـە پردێك لە نێوان تورکە عوسمانیەکان و تەورانیە کۆنەکان، بە هۆی ئەو زانیاریانەی کە لەبارەی سیستەمەکانی سیاسی و شارستانی سـەردەمی تورکـەکانی بـەر لـە ئیسلام کۆی کردبوەوە دەیویست چاکـسازیەکی شارسـتانی بـەرپا بکـات، زیـاء دەیگوت ئەو ئیسلامەی دایانڕشتوە بە کەڵکی کاروبارەکانی ئێمە نایەن، ئەگـەر نەشتوانین بۆ سەردەمی نەفامەتی کۆن بگەڕێینەوە دەبێ چاکـسازیەکی ئـاینی وا بەرپا بکەین لەگەڵ شەقڵ و سروشتی ئێمە بگونجێ))[1]

ئەو کێشەیەی کە لە نێو تورکـەکان پەیـدابو هـەمان شـت لـە ڕۆژگارەکـانی کۆتاییدا لە ناو ئێرانیەکانیش پەیدا بو.

(١) محاضرات (خالدة أديب هانم) في الجامع الملية بدهلي .

ئەمیر شەکیب ئەرسەلان -خوا ڕەحمی پێ بکات- کە نەك لە بارەی عەرەب بەڵکو لە بارەی تورکیشەوە شارەزا و جێباوەڕە -چونکە زۆر لە تورکیا ژیاوە- و لە ئەنجومەنی نەتەوەییشدا ئەندام بوە، لەم بارەوە دەڵێ:

((دەستەیەکی تر هەبون پێیان دەگوترا دەستەی تەورانیەکان، لەگەڵ دەستەی یەکەم -کە بڕوایان بە نەتەوەی عوسمانی ئیسلامی هەبو- ناکۆك بون، بەناوبانگترین بانگخوازەکانی ئەمانە بون:

زیاء کوك ئەلب، ئەحمەد ئاغائیف، یوسف ئەقشورا کە هەردوکیان لە ڕوسیاوە هاتبون، جەلال ساهیر، یەحیا کەمال، حەمدوڵڵا سبوعی سەرکردەی وجاق (تورك بوردی))، محمد ئەمین بەگ شاعیری میللی و گەلێك ئەدیب و بیرمەندی تر و زۆربەی قوتابیو لاوانیش . پێیان وابو گەلی تورك یەکێکە لە کۆنترین نەتەوە سادەکان و خاوەنی ڕەگاژوترین[1] شکۆیە و بەر لە گشت نەتەوەیەکیش ژیاری بنیات ناوە، پێیان وابو تورك و مەغۆل یەك ڕەگەزن دەچنەوە سەر یەك نەژاد و پێویستە بەیەك ڕەگەزیش حیساب بکرێن، بەم هەمو نەژادییەیان دەگوت کۆنەژادی[2] تەورانی. کۆنەژادە تەورانیەکان تەنها لەسەر تورکەکانی سیبیریا و تورکستان و چین و فارس و قەوقاز و ئەنادۆڵ و روملی کورت هەڵنەهێنا بگرە مەغۆلەکانی چین و مەجەڕ و فنلەندیەکانی ئەوروپاشیان دەخستە بەرێ و جگە لەمانە هەر رەگەزێکیتر بۆنی تەورانیەتی لێ بهاتایە دەیانگوت بەڵێ ئەویش هەوە.

ئەم دەستەیە بە پێچەوانەی دەستەی یەکەم دەیانگوت: ئێمە یەکەم جار تورکین دوەم موسڵمانین، دروشمەکەیان بریتی بو لە نادینداری و فەرامۆشکردنی جامیعەی ئیسلامیو مەگەر لەو کاتەی کە خزمەت بە دەسەڵاتی تەورانیەکان بکا! ئەو کات وەك ئامڕازێك بەکاریان دێنان نەك وەك مەبەست. ئەم دەستەیە زێدەڕۆییەکی ڕاددەبەدەریان لە بارەی تەورانیەتگەریەوە دەکرد و تەنانەت گەیشتنە ڕاددەیەك بڵێن: ئێمە تورکین و روگەکەمان تۆرانە. گۆرانیان بە شان و

---

(١) رەگاژۆ: رەگداکوتاو.

(٢) کۆنەژاد: جامیعە.

باڵی جـەنگیزخان هەڵـدەگوت و سەرسـامی خۆیـان بـۆ فتوحـاتی مەغۆڵـەکان دەردەبڕی وهیچ کردەوەیەکی ئەوانیشیان بە ناپەسند و نـاڕەوا نەدەدایـە قەڵـەم. سرودیان لە بارەی روداو و شەڕە جەنگیەکان دەهۆنیەوە بەو مەبەستەی دەق بەوە بگرن خۆیان بە جەنگیزخان هەڵدەنەوە و ورەیان پێ بەرز ببێتەوە))[1].

هەروەها دەڵێ:

((لەبەر ئەوەی سەردەم سەردەمی نەتەوەپەرستی بـو کـە ئـەویش دیـارە وەك چاولێکەریەك بو لە نەتەوەپەرسـتایەتی ئەوروپاییـەکان، بۆیـە فارسـەکانیش لـە جـارانی پێـشتر پـتر دەسـتیان بـە نەتەوەپەرسـتی گـرت و هـەمان هەڵوێـستی تورکـەکانیان دوبـارە کـردەوە، ڕوناکبیرەکانیـان وەك ڕونـاکبیرە تورکـەکان لـە پەرستنکاری باوباپیرانیان دەکۆڵیەوە، کۆنە ئاینە فارسیەکانیان سۆراغ دەکـردەوە و لەو گورگە سپیە دەگەڕان کە لە دێرینـەوە پەرسـتویانە، تەنانـەت لـە هەنـدێ پەرتوکە تازەکاندا وێنەکەشیان کێشاوە. شێخلئیسلام: موسا کازم —خوا بیخاتـە بەر میهری خۆی — خۆی بۆی گێڕامەوە گوتی: پێم گوتـون: پێـشان عەرەبـەکان عیبادەتی وایان هەبو پیاو موی دەگەڵ گـرژ دەبـو، کـە ئیـسلام هـات هـەموی لەناوبرد، بەڵام ئەوان شانازیان بەمە دەکرد کە خوا میهرەبانی لەگەڵدا کردون لەو جۆرە هەرزەییو عیبادەتەی رزگار کردون، کەچی ئێوە دەتانەوێ خوا لەبیر خۆتان ببەنەوە و یادی پەرستنی گورگی سپی بکەنەوە، بەڕاستی زۆر بەداخەوە !!. ئـەو شتەی لەلای تورکەکان ڕویدا لـەلای فارسـەکانیش ڕوویـدا، ڕوناکبیرەکانیـان بـە دوای ئاینە کۆنەکانیان وێڵ ببون کە ئاینێکیان بریتی بو لە کیومەرتیە (واتا بـە گەورە گرتنی ڕوناکی و خۆ دور گرتن لـە تـاریکی)، ئـا لێـرەدا بـو کـە توشـی ئاگرپەرستی بون. ئاینێکیتر بریتی بو لە زەردەشتی کە بانگـەوازی بـۆ تـاکێتی خوا دەکرد و دەیگوت: خوا خالقی ڕوناکی و تاریکیە، خێر و شەڕیش لە ئەنجامی تێکەڵبونی ئەم دوانەوە هاتونەتە پەیدابون، ئەگەر تێکەڵ نـەبویان جیهـان پەیـدا نەدەبو، جگە لەم ئاینانە لەگەڵێك بیروباوەڕ و پەرستگە و شوێنەوارە دێرینەکانی

(١) پەراوێزەکانی ئەمیر: شەکیب ئەرسەلان لەسەر (ئێستای جیهانی ئیسلامی)١/١٥٨-١٥٩

فارسیان دەکۆڵیەوە وەکو: دوپەرستی، زەردەشتی، مانەوی، ئی واشیان هەبو لە مەزدەکایەتی دەکۆڵیەوە کە بانگەشەی خوانەناسی و بەربەرەڵلایی دەکرد))[1]

## هزری نەتەوەپەرستی لە ناو عەرەبدا:

زەبرەبەندی هەرە تاڵ ئەوە بو کە پەتاکەی نەتەوەپەرستی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا عەرەبەکانیشی داگرتەوە، ئەو عەرەبانەی کە بەسای ئەو دینەی خوا بۆی هەڵبژاردبون ماوەی سێزدە سەدە بانگەوازی برایەتی و یەکسانیان لە نێو مرۆڤایەتیدا بلاّو کردەوە، پەتاکە لەبەر چەند هۆیەکی ناوەکی و دەرەکی دەگەڵ خوێنی عەرەبەکانیش ئاوێتە بو و بو بە سروشتێکی هەمیشەیان.

یەکێك لە گرنگترین هۆکارە ناوەکیەکان بریتی بو لەو فیزوودەمار و کەشوفشە نەتەوەپەرستیەی کە هەندێ لە دەسەڵاتدارەکانی تورك خۆیان پێ هەڵدەدایەوە، هەروەها ئەو لاف و گەزافەش بو کە تورکەکان لە هەندێ ڕەفتار و هەڵسوکەوتدا نیشانیان دەدا، ئەمانە وایان لە عەرەبە ناسك و زێدە حەساسەکان کرد بۆنی ئیستعمارێتی لە تورکەکان بکەن و واش لەخۆیان بگەن نەتەوەیەکی پلە دوی لاوەکی بێ بایەخ بن. هۆکارێکی تری یاریدەدەر ئەوەبو کە تورکەکان شوێنێکی شیاویان بە زمانی عەرەبی نەبەخشیبو و وەك زمانی گەلێکی فەرمانڕەوا و ڕەسمی تەماشای زمانی تورکیان دەکرد، جگە لەمانە گەلێ هەڵەی تری سیاسیش کە تورکەکان رەفتاریان پێ دەکرد، بڕیارەکانی جامیعەی ئیسلامیش لەولاوە بوەستێ کە تورکەکان لە سەردەمەکانی کۆتاییدا بانگەوازیان بۆ هەڵدەبڕی، ئەم هۆکارانە وای لە عەرەبەکان کرد توڕەییان بوروژێ و ژیلەمۆی عەرەبایەتیان جۆش بخوات و کڵپە بسەنێ، هەروەها گەورە ڕۆشنبیرانی عەرەبی مەسیحیش رەگ و ریشاڵی عەرەبایەتیان لە دڵ ڕەگاژۆتر بو چونکە ئەوان هیچ پەیوەندیەکی بڕوا و ئاین و برایەتی ئیسلامی دەگەڵ تورکانی پەیوەست نەدەکردن، وێڕای ئەمەش کلتورەکەی ڕۆژئاواشیان وەرگرتبو کە بەپیرۆز زانینی

---

(١) حواشي حاضر العالم الاسلامی: ١/١٦٤-١٦٥

ڕەگەز و نەژاد و هزری نەتەوەپەرستی تێ ئاخنرابو و وەك خوێن هاموشۆی تێدا دەکرد.

هۆکاری دەرەکی دوەمیش ئەوەبو بانگخواز و سەرکردە سیاسیەکانی ڕۆژئاوا کە لە مێژبو خەونیان بە روخانی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانیەوە دەدیت و بە حەزرەتی ئەو ڕۆژە بون لەبەریەك هەڵوەشێتەوە و دەسەڵاتە روحی و رامیاریەکەی لە ڕۆژهەڵاتدا تارومار ببێ؛ هزری نەتەوەپەرستی عەرەبییان برەو پێدا و بایەخێکی زۆریان بۆ دانا کە دەگەڵ خوێنی هەندێ لەگەنجە عەرەب پەروەرەکانیشدا خەریك بو تێکەڵ دەبو، بەهۆی پەڕتوك و نوسراو و گەشت و گەڕانیان بەنێو شارە گەورەکانی عەرەبی و پەیوەندیکردنیان بە دەمڕاست و خاوەن خامە و سەرۆك هۆزو تیرەکانی عەرەبی؛ پتر کێشەکەیان دەوروژاند و خۆشیان وا نیشان دەدا کە عەرەبیان خۆشدەوێت و دەیانەوێ داکۆکی لە مافەکەیان بکەن، خۆیان وەك دڵسۆزێك رادەنواند و دەیانگوت لەپێناو بەرژەوەندی ئێوەدا دەمانەوێ مەڵبەندی خەلافەت کە لە سەدەی دەیەمی کۆچیڕا زەوت کراوە و لە ئاستانە پەستێنراوە بگوازینەوە شوێنی شەرعی و سروشتی خۆی کە یەکێکە لە دو حەرەمە پیرۆزەکان، یان بیگوازینەوە بۆ یەکێك لەپایتەختەکانی وڵاتە عەرەبیەکان. جا ئەم هزرە چۆن خۆی دەمێشکی عەرەبان ئاخنی و چۆن دەستبەکار بو؟ ڕۆڵی بیرمەندانی ڕۆژئاوا لە بەرپاکردنی ئەم هزرەدا چبو؟ چۆن توانیان خەڵکی پێ ڕازی بکەن و برەوی پێ بدەن و لەم هەمو شوێنە دەنگ و پاڵپشتی بۆ پەیدا بکەن؟ وەڵامی گشت ئەم پرسیارانە لە چەند پەڕەگرافێکی پەرتوکی ئایندەی ئیسلام (Future of Islam) دەخوێنینەوە کە مستەر ( ولفەرد بلانتی) لە ساڵی(١٨٨٢ز) نوسیویەتی. بێگومان بلاوبونەوەی ئەم پەرتوکە دەنگ و سەدایەکی گەورەی لە نێوەندە عەرەبی و ئیسلامیەکان پەیداکرد و بۆ هەردو زمانی عەرەبی ئوردیش وەرگێڕدراوە و هەریەکەشیان چەندین نۆرە چاپی لێ دەرچۆتەوە. مستەر بلانتی لە پێشەکی پەرتوکەکەیدا دەڵێ:

((سەرکردەکانی میسر ڕێگەیەکی ناوەنجیان لە مەڕ کێشەی خەلافەت هەڵبژارد، هێزو فشاری خۆیان لە پێناوی (ئازادی) خستبوە کار، هەڵوێستی ڕکەبەر و نەیارانەیان وەرنەگرت، شەقاریان[1] لەقەڵای ئیسلام دروست نەکرد و نەشیاندەویست دروست ببێ، هێشتا ئیعتیڕافیان بە خەلیفایەتی سوڵتان عبدالحمید خان دەکرد و پێیان وابو ئەو لە یەکێکی تر شایانتر و لە پێشترە، دامەزراندنی خەلافەتی دوەمیشیان تا کاتی مردن و نەمانی خەلافەتی عوسمانی دواخست، بەڕاستی هەڵوێستێکی ڕەسەن و مەردانەیە و هەر لە خۆیان دەوەشێتەوە )).

پاشان دەڵێ:

((ئەم سەرکەوتنە –ئەگەر چەند ساڵێك ئارامی لەسەر بگرین – بۆی هەیە ببێتە سەرکەوتنێکی فراوانتر و سەرتاپاگیرتر، چونکە مردنی سوڵتان عبدالحمید یان دابەزاندنی لە حوکم دەبێتە هۆی گواستنەوەی مەڵبەندی خەلافەت بۆ قاهیرە، عەرەبەکانیش دەرفەتیان بۆ دەڕەخسێ سەرلەنوێ سەرکردایەتی (لە دەستچوی) ئاینییان بگەڕێننەوە )).

لە شوێنێکی دیکەی هەمان پەرتوك لە باسی (مەککە، پایتەختی ڕاستەقینە)دا دەڵێ :

((هۆشمەندو زانا موسڵمانەکان بە ڕونی بۆیان دەرکەوت کە ئەگەر گەشتەکەمان بەرەو دواوە[1] ببەینەوە ئەوا ناچار دەبین قۆناغێکی گەلێ دور بڕین، ئەگەر مەڵبەند و پایتەختی ئاین لە نیمچە دورگەی عەرەبی بێ کە لانەی ئیسلام وشوێنی دابەزینی سروشە، کە تاکە وڵاتێکە خاوەنی گشت سیفەتەکانی حوکمی ئاینی بێ و بتوانێ حوکمی خۆی تائەوپەڕی ڕابنوێنێ، کە مەسیحی و جولەکەی تێدا نیە تا بکەوێتە کێشەو بەربەرەکانێ کردنیان، وڵاتێکی وا بە خێر و بەرەکەتیش نیە تا ڕۆژئاوا لیکاوی بۆ هەڵڕژێ، خەلیفە لەوێدا ترسی گەفوگوڕی

---

(١) شەقار: قەڵشت، درز.

(١) مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر مەڵبەندی خەلافەت لە قوستەنتینیەوە بگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی تری ئاسیا .

باڵوێزی ئینگلیزی و فەڕەنسی و ترسی هەڕەشەی نێردراوی بێگانەی نابێ و دەتوانێ وەك جێگرەوەیەکی پێغەمبەر بە ئازادی خۆی هەڵسوکەوت بکات، ئیسلامیش لە گشت ژەنگوژار و خلتوخاڵێك مشتومالّ دەبێ، لەبەر هەمو ئەو هۆیانە ڕەنگە خەلافەت بگەڕێتەوە دەست خەڵکی خۆی، بۆ مەککە یان بۆ مەدینە )).

بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

((گواستنەوەی پایتەختی ڕوحی لە قوستەنتینیەوە بۆ مەککە کردارێکی ئاسان و سروشتیە و هزر و بیروباوەڕی ئێستای جەماوەر ناگۆڕێ و دەگەڵ ڕاوبۆچونی زانایانیش ئێکاوئێکە، مەککە و مەدینە هەوارگەی شەرعی و پەناگەی ڕوحین بۆ ئەهلی حەلل و عقد، بۆیە هەر ئەم دو شارە دەبنە مەڵبەندی هێزی ڕوحی. هەمو ئەو کەسانەی لەم بارەوەش قسەم لەگەڵدا کردون ڕاکەیان پەسند کردوە و پێشیان وایە سەرجەم زاناکان ئەم هزرە پەسند دەکەن تەنها برادەرانی تورك نەبێ، بەڵام من خۆم وای دەبینم کە مەککە بارەگای سەرەکی خەلافەت بێ. لە مێژ بو گوێمان لەو ڕستەیە دەبو کە دەیگوت: (ڕۆما پایتەختە) بۆیە ڕستەی (مەککە پایتەختە) کاریگەرێکی قوڵ دەخاتە نێو مێشك، خۆ ئەگەر ئەوەشی بخرێتە سەر کە دەڵێ: (خەلافەت دەبێ لە قوڕەیش بێ ) ئەوا هەر هیچ نەبێ بومەلەرزەیەك دەخاتە ناخی عەرەبە عەرەبپەروەرەکان و مەستیان دەکات، بێگومان ڕەگەزی عەرەب پشتگیری لەم پێشنیارە دەکات، لە بیریشمان نەچێ دەسەڵاتی عەرەبەکان لە مەراکیشەوەڕا درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە (بوشەهر)، پانتاییەکەشیان موسڵمانەکانی هیندستان و (مەلایۆ)شی گرتۆتە خۆ، بگرە گشت ڕەگەزە ئیسلامیەکانیتریش هەر بەدەوری ئەم فەلەکەدا دەخولێنەوە، تەنها تورکەکان نەبێ کە ڕۆژ بە ڕۆژ پتر گرنگی خۆیان لە دەست دەدەن))[١].

کاتێك جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨ز) بەرپا بو؛ وڵاتانی عەرەبی دەرفەتیان بۆ هەڵکەوت لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی جیا ببنەوە، هاوپەیمانەکان

---

(١) Future of Islam

ئەم دەرفەتەیان هەڵقۆستەوە و فویان بە موشەدەمێنی نەتەوەپەرستیدا کرد و (لۆرانس)ی فیڵزان ڕۆڵی نەگریسانەی خۆی ڕاپەڕاند و تینوتاوی نەتەوەپەرستی وەجۆش هێنا و عەرەبەکانی لە ڕوی تورکان قیت کردەوە. (شەریف حوسێن) لە حیجاز و خەڵکی شامیش لە شامدا شۆڕشیان بەرپاکرد و پێیان باشتربو بچنە ژێر ئالآی هاوپەیمانەکان نەك لەتەك تورکە موسڵمانەکان بمێننەوە کە تورکەکان هێماو هێزی ئیسلام و چقڵی چاوی دوژمنان بون. عەرەبەکان لەم کێشەیەدا فەرمانەکانی قورئان و سوننەتیان لە بیر کرد و متمانەیان کردە سەر بەڵێنی فشوفۆڵ و سیاسەتی بێوەفا کە تەنها بەرژەوەندی دەناسێ و هێز و بازو دەپەرستێ. حکومەتێکی هاشمیٚ عەرەبی لە سوریا دامەزرا، بەلآم لای هەموان ئاشکرایە کە هاوپەیمانەکان چۆن پەیمانیان شکاند و خۆیان لێ گێل کرد و پشتیان تێکرد تا لە ئەنجامدا خێرا هەڵوەشایەوە.

پاشان چەمکی نەتەوەپەرستی عەرەبی (کە چەمکێکی ڕۆژئاواییە) سەری هەڵدا، کە بۆ خۆی هزرێکە و فەلسەفەیەکی سەربەخۆیە، وەك دین تین و تاو و خوێنگەرمی و دروشم و موقەددەساتی خۆی هەیە. عەرەبە ڕۆشنبیرەکان -بە تایبەتی گەنجەکان – کە لەبەر چەندین هۆ پەیوەندیان بە دین لاواز ببو و بە حەزرەت بون بەزوترین کات شکۆ وگەورەیی بۆ عەرەب بێننە دی و لە ئازادی و پێشکەوتن و شارستانیدا هاوشانی گەلان بن، جا -بەگوێرەی قسەی خۆیان – جگە لە (نەتەوەپەرستی عەرەبی) هیچ دەرەتانێکیتریان شك نەبردوە تا مرازەکەیان بێنێتە دی، هەروەها لە بارودۆخ و ڕەوشەکەش هەراسان و بێهومێد بون، لەپشتیوانی ولآتانی ڕۆژئاواش ڕەش بین ببون چونکە ئەوان ئیسرائیلیان دروست کرد و تا ئێستاش بەردەوام یارمەتی دەدەن و سۆزی بۆ دەردەبڕن، بۆیە وەك کاردانەوە و شۆڕشێکی هزری توندوتیژ کە توندڕەوەکان زێدەڕۆییان تێدا کرد پەنایان بردە بەر نەتەوەپەرستایەتی عەرەبی و گەیشتنە ڕاددەیەك نکوڵی لە هەمو شتێك بکەن تەنها ئەم هزرە نەبی کە وەك بەهێزترین چەك لە ڕوی دوژمن و وەك گەورەترین ئامراز بۆ هێنانەوەی ڕێز و شکۆی فەوتاوی نەتەوەی عەرەب پەنایان وەبەر بردبو. بەلآم هزری نەتەوەپەرستایەتی عەرەبی کە بینرا بەروبومی

خوازراوی نەبەخشی متمانەی لەلای عەرەبەکان کەم بـوەوە و تینوتـاوی لـە دلان لاواز بو، بەتایبەتی لە شەڕی عەرەب و ئیسرائیلی سـاڵی (١٩٦٧) کـە نـەبینرا هیچ پەرجوێك[1] بەرپا بکات.

## ئاینی نەتەوەپەرستی ئەوروپا و ئەستوندەکانی[2]:

هەنگاوی دوەمـی سـەر ئـەم ڕێگایـە ئـەوە بـو کـە گـەل و وڵاتـە گـەورە و بچوکەکانی ئەوروپا هەریەکەو بۆ خۆی بو بە جیهانێکی سـەربەخۆ و لـەو دیـوی ئەو سنورەی کە سروشـت بـە شـاخ و ڕوبـاران کێـشابوی یـان هـەر خۆیـان بـە مەرامێکی سیاسی و ئیمپریالی کێشابویان" ئیعتیرافیان بـەبونی هـیچ مرۆڤێـك نەدەکرد و کەسیان بە پیاو نەدەزانی و ڕێزو حورمەتی هیچ کەسێکیان نەدەگرت. گەل و وڵاتەکان ببون بە خوا و بەنـدە دڵـسۆزەکانیش بەوپـەڕی لەخۆبوردەییـەوە دەیانپەرست و بە پیرۆزیان دەزانی، خوێن وماڵ و خاکی خەڵکانیتریان لە پێناودا دەکردە قوربانی، سەروماڵی خۆشیان لە ڕێ دادەنا و مـان و مردنیـان لـە پێنـاو شکۆداری ئەو بەناو خوایە فیدا دەکرد.

ئـاینی نەتەوەپەرسـتی هـەر دولایـەنی خۆپەسـندی و پێهیـچبونی خـەڵکان دەگرێتە خۆی؛ لایەنە خۆپەسندیەکە بریتیە لەو بیروباوەڕەی کە وا دەزانێ گـەل و نەتەوە لە سەروی هەمو شتێك دان و لە هەمو شتێك چاکترن و خـودا – ئەگـەر گەل بڕوای پێ هەبێ یان نا یاخود ئەگەر لەبەر چەند بەرژەوەندیـەك وشـەی خـوا هەڵقۆزێتەوە – لەم گەلەی چاکتر و بەرێزتر و نەجیمزادەتر و زیرەکتر و بەهێزتر و هەڵکەوتوتری نەخولقاندوە و هەر گەلەکەی خۆیان شایەنی قەڵەمڕەوی و گەورەیی سەرگەلانی ترن و جیهان دەبێ لە ژێر سەرپەرشـتی خۆیـان دابـێ و هـەر خۆیـان دەبێ ئەمیندار و بریکار و ڕاسپێری سەر زەوی بن. خوا وڵاتێکـی لـە وڵاتەکـەی خۆیان خۆشەویستتر و بە بەرەکەتتر و پاکتـر نەخولقاندوە، ئا ئەمەیـە دینەکـەی

---

(١) پەرجو: معجزة.

(٢) ئەستوند: کۆڵەکە، پایە، رکن.

نەتەوەپەرستی کە ڕێگە بە هیچ مرۆڤێك نادات لە نیشتیمانەکەیدا بژی تەنها ئەگەر بڕوای پێ هەبێ.

گەل و وڵاتەکانی ئەوروپای ئەمڕۆ هەموویان وەکو یەك پەیڕەو لە دینی نەتەوەپەرستی دەکەن، بەڵام هێندێکیان بەڕاشکاوی ڕایدەگەیەنن و هێندێکیش دەمامکی خۆیان بەستوە، هێندێکیان بە وتە ڕایدەگەیەنن و بە کردەوەش پەیڕەوی لێ دەکەن بەڵام هێندێکیتر بە وتە دەیشارنەوە بەڵام بە کردەوە ڕەفتاری پێ دەکەن. تۆوی نەتەوەپەرستی و نیشتیمانپەرستی فڕێ بدرێتە سەر هەر خاکێك هێندەی پێناچێ گەشە دەکات و ڕەگ و ریشاڵ ڕەگاژۆ دەکات و پاشان نەشونما دەکات و دەبێتە درەختێك پاشان دەبێتە دارێکی ئەوتۆ کە سێبەرەکەی سەرجەم گەل بگرێتەوە. چۆن ئەگەر یەکێك بادەیەکی[1] زۆر بخواتەوە ناتوانێ سەرخۆش نەبێ، هەمان شت ئەگەر گەلێك بڕوا بە نەتەوەپەرستی بێنێ ناتوانێ دەستوپێ درێژی نەکات و رقی لە گەلانی تر نەبێتەوە و بە سوکی سەیریان نەکات، ئەگەر یەکێکیش فڕێ بدرێتە ناو ئاو لەشی هەر تەڕ دەبێ، شاعیر دەڵێ:

**دەستی بەستەوە و خستیە ناو دەریا**
**پێی وت تەڕ نەبی وریا بە وریـــا![2]**

بەتایبەتی ئەگەر زانست و ئەدەب و فەلسەفەو مێژو و تەنانەت زانستە سروشتیەکانیش بۆ بنیادنانی سۆزی گەلپەرستی و لاف و گەزافی ڕەگەزپەرستی یاریدەدەر بن و، دنەی گەل بدەن[3] شانازی بە باب‌وباپیران بکەن و بە رابردوی خۆیان بنازن و دینپەروەرێکیش نەبێ خەڵك لە ڕەگەزپەرستی بسەنگرێنێتەوە و کەسانێکیش سەرکردایەتی خەڵکەکەیان گرتبێتە دەست لە ڕەگەزپەرستی و شکۆی نەتەوەپەرستی بترازێ هیچ پێودان و بەهای تر نەناسن.

---

(١) بادە: مەی.

(٢) ألقاه في البحر مكتوفا وقال　له إياك إياك أن تبتلّ بالمـاء !

(٣) دنەدان: هاندان.

کینه و ترسیش یەکێکن لەو بنەمایانه کـه ئەگـەر وجودیـان نـەبێ شـیرازەی ژینی نەتەوەپەرستی دروست نابێت، که ئەمەشیان بریتیه له لایەنی پێهیـچبونی خەڵکان. بێگومان ئەو کاتەی که گەل شتێکی هەبێ لێی بترسێ و کینـەی لـێ هەڵگرێ حەماسەت و تینوتاوی نەتەوەپەرستی وەکوڵ دێت و تەمەنی درێژ دەبێت بۆیە سەرکردە نەتەوەپەرستەکان هەمیشه سـۆزی نێـو نـاخی گـەل دەوروژێـنن و ژیلەمۆکانی وەجۆش دێنن و ژێی هەرە بەکار و ناسکی دەبزوێنن، که بریتیـه لـه ترس وکینه. چونکه بەهۆی ئەم دوانەوە نەبێ هەوری نەتەوەپەرستی ناتریشـقێنێ و لافاو دەنیشێتەوە .

ئوستاد (جۆد) شیکردنەوەیەکی فەلسەفی و دەرونی لەم بارەوە کردوە و دەڵێ:

((ئەو سۆزانەی که لەگەڵ یەکدا بەشدارن و دەتوانرێ به ئاسانی بوروژێنـدرێن بـریتین لـه سـۆزی (تـرس) و (کینـه) کـه دەبنـه مایـەی بزوانـدن و دنـەدانی جەماوەرێکی گەورەی خـەڵکی رەشـۆکی. بـەزەیی و پیـاوەتی و بەخـشندەیی و خۆشەویستی ناتوانن بەم جۆرە کار له خەڵکی بکـەن، ئـەو کەسـانەی دەیانـەوێ سەرکردایەتی گەل بکەن ئەو کاته سەرکەوتن وەدەسـت دێـنن کـه شـتێکیان بـۆ بدۆزێتەوە لێی بترسن و کینەی لـێ هەڵگرن، بۆیه ئەگەر بمەوێ گەلانی سەر رِوی زەوی یەك بگرن دەبێ دوژمنێکیان لەسەر هەسارەیەکیتر –بۆ وێنه مانگ– بـۆ بدۆزمەوە لێی بترسن. بۆیه سەیر نیه که ئەمرِۆ حکومەته نەتەوەپەرستەکانی ئەم سەردەمه له سۆنگەی سـۆزەکانی تـرس و کینـەوە رەفتـار لەگـەڵ دراوسـێکانی بکات، چونکه ئەم سۆزانه دەبێ هەردەم له دڵی خەڵکانی حوکمکراودا بـژین بـۆ ئەوەی یەکبونی نەتەوەپەرستی به هێز ببێ))[1] .

## رێگەچارەی ئیسلامی بۆ تەنگژەی شەرِو مونافەسەی نێوان گەلان:

ئەو رێگه چارەیەی که ئوستاد جۆد بـۆ چارەسـەرکردنی گرفتـی نەتـەوەکان و تەنگژەی شـەرِ و مونافەسـەی نێـوان گـەلانی پێـشنیار کـردوە رێگەچـارەیەکی

(1) Guide to Modern Wickdness. P.١٥٠.

دادگەرانە و ئاراستەگاریەکی هۆشمەندانەی تێدایە، دەڵێ بۆ ئەوەی دوژمنایەتی گەلانی سەر زەوی ڕوەو یەکتر ئاراستە نەکرێ پێویستە دوژمنێکی وا هەبێ هەمو لە دوژمنایەتیەکەی بەشدار بن و لێی بترسن و بیبوغزێنن و لە یەك سەنگەردا دژی بوەستن. ئێمەش دەڵێین ڕێگەچارەکە پێویست بەداهێنان و پەیداکردنی دوژمنێکی ئاوا ناکات و مەرجیش نیە دوژمنەکە لەسەر هەسارەیەکی تری وەکو مانگ و مەریخ بێت، جا بۆ وا دور بڕۆین؟ ئەی ئەوە نیە ئاین پێمان دەڵێ ئەو دوژمنە سەرسەختەی کە دژایەتی جۆری مرۆڤ و ئادەمیزادان دەکات وا لەسەر زەوی دایە و لەسەر هەمو مرۆڤێکیش پێویستە دوژمنایەتی بکات و خۆی لێ بپارێزێ و لەگەڵ مرۆڤانیتر دەست لەناو دەست ڕوبەڕوی بوەستن. قورئان دەفەرموێ :﴿ إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ: شەیتان دوژمنتانە، ئێوەش بیکەن بە دوژمن، شەیتان بانگی شوێنکەوتوەکانی دەکات تا لەریزی دۆزەخیەکان بن﴾ فاطر:٦ هەروەها دەفەرموێ: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلاَ تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ: بڕواداران! بڕۆنە ناو هەمو ئیسلام و وەدوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە﴾البقرة:٢٠٨.

ئیسلام مرۆڤایەتی تەنها بۆ دو بەش دابەش کردوە: خواپەرست و شەیتانپەرست، هەقپەروەر و ناهەقپەروەر، جەنگ و جیهادیشی لە دژی شەیتانپەرست و ناهەقپەرستان بەرپا کردوە، جا لە هەر کوێ بن و هەر کەسێکیش بن. قورئان دەفەرموێ:﴿ الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا: بڕواداران لە پێناوی خوا دەجەنگن و بێبڕوایانیش لەپێناو تاغوت، شەیتانپەرستەکان بکوژن، نەخشەو فێڵی شەیتان لاوازە ﴾نساء:٧٦.

ئەو جەنگانەی ئیسلام کردونی هەرگیز لە مێژودا جەنگی ئاوا پڕ خێرو بەرەکەت روی نەداوە، کەمترین خوێنی تێدا ڕژاوە و کەمترین کەسی تێدا کوژراوە، هەرگیز جەنگی ئاوا نەبوە هێندە چاکەو ئاسودەیی و بەرژەوەندیەی بۆ

مرۆڤایەتی تێدا بوبێ. ژمارەی کوژراوانی هەردو لا (بە موسڵمانەکان و کافرەکانەوە) لە سەرجەم جەنگ و کوشتار و هێرش و بەرەنگاریەکاندا کە لەساڵی دوی کۆچی تا نۆی کۆچی خایاند ناگاتە هەزار و هەژدە (١٠١٨) کوژراو، موسڵمانەکان دو سەد و پەنجاو نۆ (٢٥٩) کوژراویان بوە و کافرەکانیش حەفت سەدو پەنجاو نۆ (٧٥٩)کوژراو.[١]

بەلاّم ژمارەی قوربانیانی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨ ز) بە گوێرەی ڕاسترین ئامار دەگاتە بیست و یەك ملیۆن کەس[٢]، حەفت ملیۆنیان کوژراو و ئەوانی تریش بریندار. مستەر (Maxton)ی ئەندام پەرلەمانی ئینگلیزی وا مەزەندە دەبات کە ژمارەی قوربانیەکانی جەنگی دوەمی جیهانی (١٩٣٩ ز) لە پەنجا ملیۆن کەمتر نەبوبێ. خەرجی کوشتنی یەك پیاو لە جەنگی یەکەمی جیهانی (دە) هەزار جونەیهـ بو. بەلاّم خەرجیەکانی یەك سەعاتی جەنگی دوەمی جیهانی بریتی بو لە یەك ملیۆن جونەیهـ))[٣].

جەنگە ئیسلامیەکان بۆ ئەوە بون چیتر خوێن بە فیڕۆ نەڕژێتو سەروماڵی خەڵك بپارێزرێو دەروی خێروخۆشیو بەختەوەری بە روی جیهاندا بکرێتەوە. بەلاّم شەڕە مونافەسەییو فیز و دەمار ئامێزەکانی نەفامیتی کە بە شەڕی هەرە گەورەی جیهانی ناوزەد کراون لە پێناو حەسمکردنی چەند شەڕێکی یەك لە دوای یەکی پێشتر بو، فەرمو ئەمەش وتەکەی مستەر (لوید جۆرج) پاڵەوانی شەڕی هەرەگەورە و سەرەك وەزیرانی ئینگلیزی کە دەڵێ:

---

(١) ئەم ژمارانە لە ئامارەکەی نوسەری بە ناوبانگی ژینامەی پێغەمبەرﷺ: قازی محمد سلیمان المنصور الفوری لە بەرگی دوەمی کتێبی (سیرة رحمة العالمین)م وەرگرتوە، کە ئەویش سەرجەم کوژراوەکانی گشت غەزا و نێردەو شەڕە بچوك و گەورەکانی حسێب کردوە. ئاماری نوسەرەکانی تر لەم ژمارەیە کەمترن.

(٢) مستەر هـ. تاوسەند (E.H.Tawansend) لە ڕۆژنامەیەکی هیندۆ – ئینگلیزیدا تەحقیقێکی بلاّو کردۆتەوە دەڵێ ژمارەی قوربانیەکانی جەنگی هەرە گەورە لە (٣٧,٥١٣,٨٨٦) کەمتر نیە کە (٨,٥٤٣,٥١٥)یان کوژراو بون.

(٣) مەقالەکەی تاوسەند لە ڕۆژنامەی هیندۆ.

((ئەگەر مەسیح بگەڕێتەوە ناتوانێ زۆر لەسەر زەویدا بژێ چونکە دەبینێ مرۆڤ دوای دوهەزار ساڵ هێشتا هەر خەریکی شەڕو شۆڕ و کوشت و بڕ و تالآن و بڕۆ و وێرانکردنی یەکترن. ئەگەر کار وا بڕوات دنیا گەورەترین شەڕی مێژو دەبینێ کە دەبێتە هۆی ئەوەی خوێنی مرۆڤایەتی ڕوبار هەڵببەستێ و خانوبەرە خاپور ببێ‌و قاتوقڕی بلاّوببێتەوە. ئاخۆ ئەگەر مەسیح بێتەوە چ ببینێ؟ مرۆڤ ببینێ وەك برا و برادەر تەوقە لەگەڵ یەکتر بکەن ؟! نەخێر، بەڵکو دەبینێ وا خۆیان بۆ شەڕێکی وێرانترو کارەساتتر و مەرگەساتتر ئامادە کردوە، دەبینێ هەمو خەریکی داهێنان و دۆزینەوەی چەکی دۆزەخین، خەریکن لە کەرەستە و ئامێری ئەشکەنجەداندا بەهرەمەندتر دەبن )).[٤]

ئەو شەڕ و کوشتار و دوژمنکاریەی نێوان گەلان و ئەو نەتەوەپەرستی و نیشتیمانپەرستی و هەراو هۆریایە، گشتی لە ئەنجامی ئەوە بو کە دوژمنی سەرسەختی ڕاستەقینەیان لە یاد نەمابو و لە دژایەتی ئەو دوژمنە وەرچەرخا بون، دیارە ئاگریش ئەگەر سەرەبزوتی نەبێ خۆی دەخواتەوە، شاعیری نەفامێتی گوتەنی:

**گەر کەسمان دەست نەکەوێ     برا بەر شەڕمان دەکەوێ**[١]

ئەم گەلانە ئەگەر دوژمنی ڕاستەقینەی خۆیان ناسیبوایە و ڕاددەی زیان و مەترسی و هێزەکەیان لە لادا رون بوایە هەرگیز دوچاری ئەو هەمو شەڕو کینە و تورەیی و ڕکەبەرایەتیە خەیاڵیە نەدەبون، پێشینانی عەرەب ڕاستیان گوتوە: ((عند الحفيظة تذهب الاحقاد، واتا: ئەگەر تەنگانە هەڵیکرد رکوکینە باری کرد)). محمد ﷺ بەم جۆرە گشت هۆزە دوژمنکارە عەرەبیەکانی کردە برا کە شمشێرەکانیان خوێنی یەکتریان لێ دەچۆڕایەوە و بەخوێنی سەری یەکتر تێنو

---

(٤) پێشبینیەکەی (لیۆد جۆرج) هاتە دی ،شەڕی داهاتو ڕوی دا و گەلێکیش لە جەنگی یەکەمی ڕابردو گەورەتر بو، مرۆڤ و گیانەوەرێکی زیاتری لە ناو برد و خانوبەرەیەکی پتری وێران کرد و شارو گوندێکی زیاتری خاپور کرد، شتی وای تێدا بەرپابو سەری منداڵی ساوای سپی کرد، نرخی شمەك و کەلوپەل لە ڕاددەبەدەر بەرزبوەوە و زۆر ولاّت توشی قاتوقڕی بو.

(١) وأحيانا على بكر أخينا     اذا ما لم نجد إلاّ أخانا

بون، وەکو ئەوس و خەزرەج لە مەدینەدا، بەنی عەدنان و بەنی قەحطان لە جەزیرەدا، وێڕای ئەمان هەمو ڕەگەزە جۆراوجۆرەکانی کردە یەك نەتەوە و یەك سەربازگەی دژ بە بێباوەڕی و نەفامی، دوژمنێکی لە دەرەوە پێ‌نیشان دان تا دوژمنایەتی و رکوکینەی لەگەڵدا بەرپا بکەن، ئەو دوژمنەش بریتی بو لەناهەق و تاغوتان و دەست و پێوەندەکانیان، بە شەڕی ئەو دوژمنەی خەریك کردن و ئایەتی بۆ دەخوێندنەوە کە دەفەرموێ: ﴿ الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا: ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوە لە پێناوی خوا دەجەنگن، بەڵام ئەو کەسانەی بێباوەڕن لە پێناوی تاغوت دەجەنگن، دەجا بڕوادارینە! شەیتانپەرستەکان بکوژن، فڕوفێڵی شەیتان لاوازە﴾النساء:٧٦، بە هۆی ئەم دوژمنەوە ڕك‌وکینەی یەکتریان لە بیر نەما، تەنها ئەو کاتانە وەبیریان دەهاتەوە کە دوژمنی ڕاستەقینەی خۆیان لە بیر دەکرد و وازیان لە شەڕ و دژایەتی ئەو دێنا، هەر بۆیەش شەڕە نێوەخۆیی و ئاشوب و ئاژاوەکان پەیدا بون کە هەمو کەس پێیان ئاگادارە.

## پڕوپاگەندەی نەتەوەپەرستەکان و زەرەر و زیانیان بۆ گەلانی بچوك :

نەتەوەپەرستەکان لە ناوەوەو لە دەرەوەی وڵاتدا نەتەوەپەرستایەتی بۆ گەلانی بچوك دەڕازێننەوە و بە شان و شکۆی ئەدەب و زمان و ڕۆشنبیری و پاکێتیی گەل هەڵدەڵێن و مێژوەکەی گەلێ بە پیرۆز و بەرز دەخەنە ڕو، تا ئەوەی گەل خۆی لێدەگۆڕێ و سۆز و گودازی نەتەوەپەرستی دێتە جۆش و دوچاری فیز و دەمار و کەشوفشان دەبێ، وا دەزانێ قوللەو قەڵای پۆڵایینی هەڵچنیوە وخۆی بۆ شەڕی توندوتیژ و بێئامان شەتەك داوە، بۆیە خۆی لە جیهان دادەبڕێنێ و جارجاریش بوغرا دەبێت و تەشقەڵە بە وڵاتێکی زل دەفرۆشێت، جاریش هەیە وڵاتەکان هێرشی دەکەنە سەر و لە ماوەی چێشتەنگاوێك لە ناوی دەبەن و دەبێتە قوربانی نەتەوەپەستێتی و جوغزە تەسکەکەی، بەناو بەرپرسەکانیش دادیان نادەن

﴿كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلإِنسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكَ: وەکو شەیتان کە بە مرۆڤ دەڵێ بێبڕوا بە کە بێبڕوا بو دەڵێ: من لێت بەریم.﴾الحشر:١٦. پۆڵەندا و بەلجیکا و هۆڵەندا و یۆنان و دانیمارك و عێراق و ئێرانیش لە جەنگی دوەمی جیهانیدا بەم دەردەوە چون.

## تەماحی ولاَتە گەورەکان:

ولاَتە گەورەکان بە واجبێکی نەتەوەیی دەزانن ئەگەر دەسەلاَت بەسەر گەورەترین ناوچەی سەرزەوی دابگرن و ئالاَ لەسەر فرەوانترین ڕوبەر هەڵکەن، ئەگەرچی چۆل و بیابانیش بێ، موستەعمەرات و مومتەلەکاتیان لە گشت کیشوەرەکاندا هەبێ ئەگەرچی لەپێناو پاراستنی موستەعمەرە و ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانیشیان باجێکی گەورەی لەشکرو پارەو پۆلیسیش بدەن یان توشی ناڕەحەتی و ئەستەمیش بن، پێیان وایە ئەم کارانە واجبێکی شەرعیەتی نەتەوەپەرستایەتیە. ئەم ولاَتە گەورانە هیچ ئامانجێکی ڕەوشت ئامێزو بەروبومێکی داب و نەریت ئامێزیان نیە، تاکە ئامانجیان بریتیە لە (شەڕەف و شکۆی نەتەوایەتی )[1].

ئوستاد (جۆد) شکۆی نەتەوایەتی پێناسە دەکات و دەڵێ:

((شکۆی نەتەوایەتی[2] واتە گەل هێزێکی وای هەبێ لە کاتی پێویستدا بتوانێ حەزو ئارەزوەکانی خۆی پێ بەسەر گەلانی تر پیادە بکات. شکۆی نەتەوایەتی کە پێی دەڵێن (سەرمەشقی کاملی گەل ) هێندەی بەسە بە دزێو و کرێت بناسرێ کە دژی سیفەتی پاك و ڕەوشتی بەرزە. ئەگەر ولاَتێك درۆ نەکات و ڕاست بوێژێ و بەڵێنەکانی نەشکێنێ و دەگەڵ بێدەسەلاَت و زەبونان مەردومانە ڕەفتار بکات؛ ئەوا نەتەوەکان وادەزانن ئاستی شەڕەفی ئەم ولاَتە

---

(١) یەك لەو نمونانە داگیرکاریەکەی ئەمەریکا بو بۆ ڤیێتنام کە قوربانیەکی سەر و ماڵی بێشوماری لە پێناودا بە فیرۆ دا.

(٢) شکۆی نەتەوایەتی: المجد القومي.

دابەزیوە. شەرەف -هەروەك مستەر بلدۆن پێناسەی دەکات - بریتیە لەو هێزەی کە نەتەوە شانازی و شکۆی پێ وەدی دێنێ و سەرنج و هزری خەڵکان بەرەو خۆی دەجمێنی. ئاشکرایە ئەم جۆرە هێزەش کە نەتەوە شەرەفی پێ وەدەست دێنێ لەسەر بۆمبای وێرانکەر و ئاگرپژێن و لەسەر وەفا و دڵسۆزی ئەو گەنجانەوە بەندە کە حەز دەکەن شارو ولاتانیتر بۆردومان بکەن، ئەو شەرەفەی گەلی پێ ستایش دەکرێ پێچەوانەی ئەو سیفەت و ڕەوشتانەیە کە تاکی پێ مەدح دەکرێ، من وادەزانم گەل بیەوێ چەندی شەرەفمەند بێ دەبێ ئەوەندەش ناپاك و درندە بێ، بەڵام شەرەف ئەوە نیە کە مرۆڤ یان گەل بە فرۆفێڵ و تەڵەکەبازی و ستەمکاری شەرەفمەند بێ))[٢].

لە شوێنێکیتردا دەڵێ :

((خۆبەزلزانین -پتر لە چاوتێبڕین - وای لە چینی دەسەڵاتداری بەریتانیا کردەوە پلان و نەخشەی وا دانێنەوە لەگەڵ دیمەنی دەرەوەیان جیاواز بێ کە خۆیان بە مەسرەفخواز و تەباخواز نیشان دەدەن، بۆ نمونە با پیاوێك بچێتە لای کاربەدەستانی بەریتانیا و پێیان بڵێ: دەستبەرداری قاقرترین و بەیارترین لاتە خاکێکی ولاتەکەتان بن، ئەو ولاتەی لەبەر پانوپۆڕی و فراوانیدا خۆری لێ ئاوا نابێ، ئەوجا بزانە پاڵەوانانی پارێزگارانی ئینگلیز دنیای لە سەر وێك نانێن و جامی تورەیی بەسەردا هەڵنارێژن و ڕۆژنامەکان هەراو زەنا بەرپا ناکەن؟!، کەواتە پارێزگاران تەنها چاوتێبڕ نین بەڵکو خۆبەزلزان و سەرسەختیشن))[٣].

## موناڧەسەی گەلان لەسەر بازاڕ و موستەعمەران:

هەندێ نەتەوە زو دەستی خۆیان دیت و گەلێك موستەعمەرەیان دامەزراند و دەستیان بەسەر زۆر ولات داگرت، بەڵام هەندێ نەتەوەیتر بەمجۆرە نەبون و وەدوا کەوتن، پاشان ڕاپەڕین و کەوتنە بەربەرەکارێکردنی نەتەوە دەستوەشێنەکان و

(٢) Guide to Modren Wickdness .p.١٥٣

(٣) Guide to Modern Wickdness .p.١٨٠

داوای پشکی خۆیان دەکرد، ئیتر ئەمانیش وەك ئەوان بەدوی پێگە دەگەڕان و هەوڵیان دەدا بازاڕان بۆ خۆ وەدۆزن تا بتوانن کەلوپەلی خۆیان تێدا بفرۆشن، وەدوی تەپۆڵکان دەگەڕان تا ئاڵای شکۆ و شانازی تێدا هەڵکەن و وەك ئیمپڕاتۆریەتە مەزنەکان تەماشا بکرێن. پاشان ئەوانی یەکەم لێی قیت دەبونەوە و هەوڵی ڕامالینیان دەدا و دەبونە لەمپەر و نەیاندەهێشت ئارەزوەکانی بێنێتە دی، واشیان نیشان دەدا لە پێناو نەتەوە بچوکەکاندا خۆیان پچڕیوەتەوە و دەیانەوێ گەلانی ستەمدیدە ڕزگار بکەن. بەلاّم زۆر لە خەڵکی خۆیان و لە بێگانەکان گومانیان لە دڵسۆزی و نیەتپاکی و بانگەوازەکەیان هەبو.

ئوستاد (جۆد)ی ئینگلیز لە وتەیەکیدا لە بارەی دابەشکردنی ولاّتان بەسەر ئیمپریالیزمەکان دەیەوێ تورەیی هەندێ لە گەلانی وەك گەلی یابان هەڵمژێ —جا بە ئەنقەست بێ یان بە نەزانی - وا دەردەخات کە گەلی ئینگلیز نەتەوەیەکی ئاشتیخواز بێ و یابانیەکانیش بە شەیدای کوشتن وبڕین و شەڕانگێزی دەخاتە ڕو، دەڵێ: ((بێگومان گەلی ئینگلیز ئاشتیخوازن، بەلاّم ئاشتیخوازیەکەیان وەك دزێك وایە وازی لە پیشە کۆنەکەی خۆی هێنابێ، گەلی ئینگلیز بەسای دەستکەوتەکانی پێشانی توانیویەتی شەرەف و شکۆ بۆ خۆی وەدی بێنێ، گەلێکیشیان ڕك لەو کەسانە دەبێتەوە کە پیشەکۆنەکەی ئەوان دوبارە دەکەنەوە، ئینگلیز ماڵ و دەستکەوتێکی لەخۆ زیادیان هەیە و ئیستیهلاکیش ناکەن، بەلاّم ئەوکەسانەش بە شەڕخواز ناوزەد دەکەن کە دەیانەوێ بەشداری لەو پیشەیەدا بکەن ))[1]. گەلێ جار شەڕ لە نێوان ئەو گەلانەی دەسەلاّتیان بەسەر ولاّتانیتر داگرتوە لەگەڵ ئەو گەلانەی هەوڵ دەدەن دەسەلاّتیان فراوان بکەن ڕودەدات، بەلاّم بە یەکچاو تەماشاکردنی ئەم شەڕانە دەگەڵ ئەو شەڕانەی لەپێناو هێنانەدی دادگەری و بەرەنگاربونەوەی ستەمکاران و ڕزگارکردنی ستەمدیدان بەرپا دەکرێ شتێکی ڕاست نیە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ

---

Guide to Modern of Wickdenss .P.١٨٠. (١)

إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ: ئەگەر دو چین لە بڕواداران بوە شەڕیان، ئێوە ئاشتیان بکەنەوە، بەلاّم ئەگەر چینێکیان دەستدرێژی کردو نەوەستا لەگەڵیدا بجەنگن تا ملکەچی فەرمانەکانی خوا دەبێ، ئەگەر ملکەچ بو ئەوا بە داد و ڕەواوە مەسرەتیان لە نێواندا بکەن، خوا دادگەرانی خۆش دەوێ. ﴾الحجرات:٩، ئەمەش لەبەرئەوەی شەڕە پاوانخوازیەکان شەڕی کینە وهەوەست و مونافەسە و دەمارگیری و تیرەیین. ئەو شەڕانەی لەژێر سەرپەرشتی (کۆمەڵەی گەلان)ی پێشان و (نەتەوە یەکگرتوەکان)ی ئێستا ڕودەدەن وەك ئەمیر شەکیب ئەرسەلان گوتەنی: ((وەك کێشی عەروزی دەریایە بەلاّم بێ ئاوە، تەنها لەم پێناوەدا بەرپا کراون تا بەرگێکی یاسایی بەبەردا ببڕدرێ و داگیرکاریەکانیش بە ناوێتر داڕێژنەوە و تەنها زەبون و بێدەسەلاّتەکان ملکەچیان بن کە لە مەڕ زلهێزی پێدرێژدا دەستەپاچەن))، یان دکتۆر محمد ئیقبال گوتەنی: ((مەکۆی دز و کفندزانن کە لە پێناو دابەشکردنی کفنی مردوان یەکیان گرتوە)).

ئوستاد (جۆد) دەڵێ:

((ئەم شەڕانەی لە ژێر سەرپەرشتایەتی (کۆمەڵەی گەلان[1])دا بەرپا دەکرێن لەپێناو ئەوەدا نیە دادگەری لەنێوان گەلان دابین بکرێ و دەستی ستەمکاران بڕدرێ و تۆڵە لە تاوانکاران وەرگیرێتەوە. شەڕەکان شەڕی نێوان گروپ و چینە مونافیسەکانە لە پێناو بە هێزبون و بالاّدەستبوندا، یەکێکیان دەیەوێ گەورەترین بەشەسامان و دەرامەتی جیهان بۆ خۆی گل داتەوە ئەوەیتریش هەڵپەی بۆ دەکات و شمشێر لە خۆی هەڵدەسوێ، ئەم شەڕانە هیچ جیاوازیەکیان لەگەڵ شەڕەکانی پێشان نیە کە لە نێوان چینە مونافیسەکان ڕوی دەدا، هیچ جیاوازیەکیان نیە لەگەڵ شەڕی نێوان نەمسا و پروسیا[1] و شەڕی حەفت ساڵە[2]

---

(١) کۆمەڵەی گەلان: عصبة الأمم.

(١) شەڕی تەماح و مونافەسەی نێوان فەرەنسا و ئیسپانیا و ئینگلتەرا و هۆڵەندا بو ، کە لەسەر دابەشکردنی سنور و گەنجینەکانی نەمسا بەرپا بو . شەڕەکە هەر دوابەدوای مردنی فرێدریکی

و شەڕەکانی ناپلیۆن و شەڕەکانی ساڵی (١٩١٤-١٩١٨ز)، تەنها بەناو جیاوازن، بەلاّم ئەگەر یەکێك زێدەڕۆیی بکات و بڵێ شەڕەکان بۆ بەرگریکردن لە دیموکراتیەت و (کۆمەڵەی گەلان)و لە دژی فاشیزم و دەستدرێژی بون ئەوا هەر قسەیەکە دەیکات و هیچ لە واقیع ناگۆڕێ)) [٢].

## جیاوازی نێوان حوکمی باجەستێن و حوکمی ڕێنوێنی بەخش:

دەگێڕنەوە جارێکیان عومەری کوڕی عبدالعزیزی خەلیفەی موسڵمانان بە سەرکارەکەی دەڵێ : ((مالۆیران ! خۆ خوا موحەممەدی ﷺ بە ڕێنوێنی بەخش ناردوە نەك بە باجەستێن)). ئەم رستەیە گوزارشت لە روحیەتی حوکومەتێکی ئاینی وا دەکات کە لەسەر بنچینەی ڕێوشوێنی پێغەمبەرایەن دامەزرابێ و بە گوێرەی نەخشەو شوێنەوارو کارگێڕایەتی پێغەمبەران بەڕێوە چوبێ. ئەم جۆرە حکومەتە زیاتر بایەخ بە دین و ڕاستەڕێکردنی خوڕەوشت و ئەو شتانە دەدات کە زیان و قازانجی دوارۆژی پێوە بەندە نەك کۆکردنەوەی باج و خەراج و دەرامەت، لە ڕوانگەی ئاینەوە لە کێشە و گرفتە سیاسی و ئابوریەکان دەڕوانێ، ڕێبیرە ئاینی و خوڕەوشتیەکان دەخاتە سەروی قازانج و بەرژەوەندیە ماددیەکان، عەرەق و زینا و بەرهەڵدایی و خراپەکاری حەرام دەکا، ڕێگە بە مامەڵەی وا نادات قازانج بە تاك بگەیەنێ و زەرەریش بە کۆمەڵ، ڕیبا و قومار قەدەغە دەکات ئەگەرچی زیانێکی گەورەی مالیش بە ولاّت بگەیەنێ، پرۆژەی چاکسازی و ڕاستەڕێکردن پەیدا دەکات، بایەخ بە ڕەوشت و پەروەردەکردنی دڵو دەرونان دەدات ئەگەرچی پارەیەکی ئەستورو ئابوریەکی گەورەشی گەرەك بێت، ئەم جۆرە

---

پاشای نەمسا و هاتنە سەر حوکمی ماریا تیریزای کچی بە وەسیەت و رازیبونی ولاّت؛ دەستی پێکرد، لە ساڵی (١٧٤٠ز ) تا ساڵی (١٧٤٨ز) خایاند.

(٢) شەڕێك بو لەپێناو دەستدرێژی و بەرگری بو ، فەرەنسا وروسیا وسوێد و زۆربەی میرنشینەکانی ولاّتی ئەڵمانیا و پروسیا و ئینگلتەڕا بەژدار بون، لە ساڵی (١٧٥٦ز) دەستی پێ کرد و لە ساڵی (١٧٦٣ز) کۆتایی پێهات.

(٣) Guide to Modern Wickedness P.١٩١.

حکومەتانە لە هەر ولاتێك دامەزرێن بەوجۆرە دەبن کە قورئان لە بارەی کۆچەران رونی کردۆتـەوە: ﴿ الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوْا الزَّكَـاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنْ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الأُمُورِ: ئەوانـەی کـە ئەگـەر دەسەلاتمان پێبەخشین، نوێژ و رۆژو بەرپا دەکـەن و فـەرمان بـە چـاکە دەکـەن و رێگە لە خراپە دەگرن، سەرەنجامی کاروبارانیش هەر بۆ خوایە ﴾الحج: ٤١.

بەلاّم ئەو جۆرە حکومەتانەی کە لەسـەر باجەسـتێنی نـەك لەسـەر رێنـوێنی دادەمەزرێن، کە لەپێناو قازانج بۆ خۆ نەك بۆ خەلکی بەرپا دەبن ئـەوا بایـەخی هەرە گەورە و گرنگی خۆی بۆ باج و خەراج ودەرامەتی زۆر و جۆراوجۆر تـەرخان دەکات، گەلـیجاریش رەوشت و کاری خێر وشیرازەی نێو مالّی دەبنـە قوربـانی. جۆرەها روتـی و بـەرەلایی و بـەدکاری بـە رەوا لەقەلـەم دەدا و رێوشـوێنی بـۆ دادەرێژێ، رێگە بە داوێنپیسی رەسمی دەدات و رەنگە هانیشی بدات. لە ژێر ناو و پەردەیتردا ودم[1] بە قومار وگەلێك تاوانی دژ بە رەوشت دەدا، هەندێ شتیش لە پێناو بەرژەوەندی خۆی سنوردار دەکا، نەك هەر رێگە بە عـارەق دەدا بـەلکو دەشیفرۆشێ و بازرگانیشی پێ دەکات و یاساشی بۆ دادەرێژێ، حوکم و سزاش بە بەبالای ئەوانەدا دەبرێ و دژیان دەوەستێ کە هەولّ دەدەن عەرەق قەدەغە بکـەن، رەنگە خەلکی هەندێ ولات ناچار بکات مادده سڕکەرەکانیشی لێ بکڕن، چـەند حکومەتێکی ئەوروپایی لە ئاسیا هـەمان رەفتاریـان دەرهـەق بـە خـەلکی چـین بەکارهێنا. بێگومـان رەوشتی ئـەو گەلانـەی لـەژێر دەسـەلاتی حکومـەتی لـەم جۆرەدان ناخۆش وپەریشانە، چونکە لە لایەنی رەوشتەوە دادەڕوخـێن، لەلایـەنی روحەوە پەژموردە و بێ تین و توان دەبن، هەلّبەت بونی ئەو جۆرە دەسـەلاتدارانە وا لە خەلکی ولات دەکەن ئاستی رەوشتیان دابەزێ و توشی هەمان ئەو نەخۆشیە رەوشتیانە بن کە ئەوروپا بەهۆی ژیاری ماددەپەرستیەوە توشـی بـوە، تەنانـەت بەخۆشیان دانیان بەو کارەساتە ناوە و لە دەستی بە نالە نالّن.

---

(١) ودم: رێگەدان.

حکومەتە ئەوروپاییەکان شەڕ و خراپەکاریەکانی ژیاری ئەوروپایان لەگەڵ خۆدا هەڵگرتوە، کەواتە چۆن ئومێدیان لێدەخوازرێ لە سایەو دەسەلاتی ئەو جۆرە حکومەتانەوە ڕەوشتی بەرز و کاری چاکە ببوژێنەوە و ئاستی ڕەوشت بەرز بێتەوە؟! لە کاتێکدا ئاشکرایە لە ولات و نیشتیمانی خۆشیاندا شتی وا ڕوی نەداوە، وێڕای ئەمانە پەیامەکەشیان شتی وا ناخوازێ و خۆشیان نە بڕوایان پێ هەیە و نە ملکەچیشی دەبن، گۆزەش چی تێدا بێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ. ڕێبازی پاشا و داگیر کەران هەرگیز وەك ڕێبازی پێغەمبەرو ڕێنوێنی بەخش و چاکەخوازان نەبوە، ئەو حەقیقەتەی قورئان لەسەر زاری شاژنی شاری سەبەئەوە ڕایگەیاندوە ئێستاکەش هەر حەقیقەتە و لە هیچ شوێن و کاتێکدا گۆڕانی بەسەردا نایەت ﴿ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً وَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ: پاشاکان پێ بنێنە هەر ئاواییەك وێرانی دەکەن و خەلکی بەرێزی تێدا ڕیسوا دەکەن، ئەمە ئاکار و کردەوەی هەمیشەییانە﴾النحل:٣٤.



**بەندی سێیەم**

# ئەوروپا لە خۆکوشتن[١] دایە

## سەردەمی دۆزینەوەو داهێنان:

ئەگەر هەر یەك لەسەردەمەکانی مێژو بە شتێکی تایبەتی ناسراو بێ و لەسەردەمەکانیتری جوێ کردبێتەوە دەتوانین ئەم سەردەمەش بە ناوی: سەردەمی دۆزینەوە و داهێنان و بێتەل و کارەبا جوێ بکەینەوە. نکوڵی لەوەدا ناکرێ کە ئەوروپاییەکان دەستێکی باڵایان لەم بوارەدا هەبوە و گەلێکیشیان بەرەوپێش بردوە و پیاوی بلیمەت و زانای داهێنەرو دۆزەرەوەی گەلێك بە تواناشیان تێدا هەڵکەوتوە.

بەڵام هەر چەندی بە شان وباڵی پیشەسازی و داهێنانە تازەکانی ئەوروپا هەڵبڵێین و بە داهێنەر و دۆزەرەوەکان سەرسام بین، نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە هەمو ئەو پیشەسازی و داهێنان و دۆزینەوانە بریتین لە ئامراز و کەرستە و پێناو نەك مەبەست و ئامانج. دەبێ لەو ڕوانگەوە سەیریان بکەین ئاخۆ تاچەند قازانج و زەرەر دەبەخشن، دەبێ بەگوێرەی ڕاددەی ئەو خزمەتەی لە پێناو چاکەدا پێشکەشیان کردوە سەرکەوتنیان بۆ دیار بکەین، دەبێ تەماشای ئەو ئەنجامانە بکەین کە دابینیان کردوە و لەو ڕۆڵە بڕوانین کە لە ژیان و کۆمەڵگە و ڕەوشت و سیاسەتدا گێڕاویانە.

## مەبەست لە پیشەسازی و داهێنان و هەڵوێستی ئیسلام:

پێم وایە مەبەست لە پیشەسازی و داهێنان بریتیە لە زاڵبون بەسەر ئەو کۆسپ و تەگەرانەی کە بەهۆی نەزانی و لاوازیەوە لەسەر ڕێی خەڵك قوت

---

(١) خۆکوشتن: الأنتحار.

دەبنەوە، بریتیە لە سود وەرگرتن لە گشت ئەو هێزە سروشتی و خێروبێر و خەزینە بەربڵاوانەی لە گەردوندا هەن تا بۆ ئامانجی ڕاست و دروست نەك بۆ لوتبەرزی و نانەوەی ئاژاوە کەلکیان لێ وەربگیرێ.

پێشان مرۆڤ گەشت و گوزاری بە پیادە بو، پاشان بە دڵی داهات ئاژەڵ ژێربار بکات، پاشان ڕەوڕوەی بەکار هێنا، پاشان هێستر وعارەبانە، بەم جۆرە بەرەبەرە خێراییەکەی زێتر دەکرد و داهێنانی نوێتری دەدۆزیەوە، لە عارەبانەوە بۆ شەمەندەفەر، لە شەمەندەفەرەوە بۆ ترومبێل، لە ترومبێلەوە بۆ فڕۆکە، لە بەلەمیشەوە بۆ کەشتی. ئەم پێشکەوتنە شتێکی خوازراوە بەڵام خۆزگە هەموی لە پێناوی نیازی چاك و بۆ ڕاژەی[1] مرۆڤ بە کار دەبران، خۆزگە بۆ مرۆڤ دەبو تا بیتوانیبایە لە پێناو کاری خێردا ڕێی هەزاربەهەزار و پڕ ئەستەمی پێ ببڕێ، خۆزگە بۆ ئەوە دەبو کات بۆ مرۆڤ بگەڕێنێتەوە و هێزی بۆ زیاد بکات تا بیتوانیایە سودی ڕەوای لێ ببینێ و بۆ نیازی پاکی بەکاربێنێ.

هەڵوێستی ئیسلام لە بەرامبەر داهێنان و دۆزینەوەی تازەدا ڕون و ئاشکرایە، خوا هەواڵی پێداوین مرۆڤ لەسەر زەویدا جێنشینە و هەر چی شتێکی خوا لە جیهانی ئەفراندوە بۆ مرۆڤی موسەخخەر کردوە، خوا دەفەرموێ:

﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا: خوا هەرچی لە زەویدا هەیە هەموی بۆ ئێوە ڕام کردوە﴾البقرة:٢٩.

﴿ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ وَسَخَّرَ لَكُم الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُم الأَنْهَارَ، وَسَخَّرَ لَكُم الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُم اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ، وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ: خوا ئەرزو ئاسمانەکانی ئەفراندوە و بارانی لە ئاسمان باراندوە و بەروبومی پێ ڕواندوە تا بۆتان ببێتە بژێوی، کەشتی بۆ ئێوە ڕام کردوە و بە فەرمانی خوا لەسەر دەریا دەڕوات و ڕوبارەکانی بۆ مسەخخەر کردون. خۆر و مانگی بۆ

---

(١) ڕاژە: خزمەت.

مسەخخەر کردون کـە هەمیـشە وا لـە گـەڕ دان، شـەو و ڕۆژی بـۆ مـسەخخەر کـردون. هەرچـی داواتـان لێکـردوە و پێویـستتانە پێـی بەخـشیون، ئەگـەر بەخششەکانی خـوا هەڵـژمێرن بۆتـان نـاژمێردرێ، بـەلاّم مـرۆڤ ستەمئامێز و ناسوپاسگوزارە ﴾ ابراهيم:٣٢-٣٣ .

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَـرِّ وَالْبَحْـرِ وَرَزَقْنَـاهُمْ مِـنْ الطَّـيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً: ڕێزمان لە ئادەمیزاد ناوە و وامان کردوە بتوانێ بەسەر بەژ[1] و دەریادا بڕوات، لە شتە پاکـەکان بـژێویمان پێ بەخشیون و بەسەر زۆر لـە ئافەریدەکراوەکانیـشدا ڕێـزی پتـرمان پێـداون ﴾ الاسراء:٧٠ ، جا بـــا خوێنەری بەڕێز لـە ڕەهـاوەتی[2] ئـەم وتەیـە بڕوانـێ: ﴿وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾، ﴿وَرَزَقْنَاهُمْ مِنْ الطَّـيِّبَاتِ﴾.

﴿ وَالأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ، وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ، وَتَحْمِلُ أَثْـقَالَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلاَّ بِشِقِّ الأَنفُسِ إِنَّ رَبَّـكُمْ لَـرَءُوفٌ رَحِـيمٌ، وَالْخَيْـلَ وَالْبِغَـالَ وَالْحَمِـيرَ لِـتَـرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَـخْلُقُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ: ئاژەڵی بۆ ئێوە ئافەریدە کردوە کە بە هۆی پێست و خوریەکەیەوە گەرم دەبنەوە، جگە لەمە گەلـێ سـودی تریـشی لـێ دەبینن و گەلـێ جۆریشیان دەخـۆن. کـە دەیانبەنـە لـەوەڕ و دەیانهێننـەوە دیمەنی جوان و دلڕفێنتان بۆ دەنوێنن و باری قورستان بۆ شوێنی وا بۆ هەڵـدەگرن کە ئەگـەر بـەهۆی ئـەو ئاژەلاّنـەوە نەبوایـە گەلـێ بەزەحمـەت و دەردەسـەری دەیگەیشتنێ، خوا بەسۆز و میهرەبانە. هەروەها ئەسپ و هێستر و کەریـشی بـۆ مسەخخەر کردون تا سواری ببن و دیمەنی جـوانی پـێ وەدی بێـنن، خـوا گەلـێ شتیتریش ئافەریدە دەکات کە هێشتا نازانن چیە ﴾ النحل:٥-٨ .

﴿ وَالَّذِي خَلَقَ الأَزْوَاجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ الْفُلْكِ وَالأَنْعَامِ مَا تَرْكَبُونَ، لِتَسْتَوُوا عَلَى ظُهُورِهِ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَانَ

---

(١) بەژ: وشکانی.

(٢) ڕەهاوەت: فرەوانی.

ئامێرەکان بکەن و پێی بڵێن لەم مەبەستەی بەکاربێنە و لەو مەبەستی بەکار مەهێنە. بۆ وێنە شقارتە ئاگر دەبەخشێ بەڵام تۆ دەتوانی هەم خانوبەرەی خەڵکی پێ بسوتێنی هەم خۆتی لەبەر گەرم بکەیەوە و خواردن و گۆشتی پێ ببرژێنی.

تەنها دین دەتوانێ مرۆڤ فێری ئەوە بکات کە چۆن و لە کوێ ئەم هێزە ماددیە بەکاردێنێ، دین رێ بە مرۆڤ نیشان دەدات بە چ شێوەیەك سود لە هێز و وزەکانی وەرگرێ و چۆن سوپاسی بەخشکەکانی خوا بکات. دین دەستی مرۆڤ دەگرێ و لێناگەرێ ئەو هێزەی خوا پێی بەخشیوە لە پێناو ستەم و تاوان و دەستدرێژی و خراپەکاریدا بەکاری بێنێ، هەروەك پێغەمبەر موسا ﷺ فەرمویەتی: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَا أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِلْمُجْرِمِينَ: پەروەردگارا بەو بەخشانەی تۆ بەمنت بەخشیوە قەت نابمە پاڵپشتی تاوانکاران﴾القصص:١٧، سلێمانیش ﷺ فەرمویەتی: ﴿هَذَا مِنْ فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَنْ شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ: ئەمە فەزلی خوایە، پێی بەخشیوم تا تاقیم بکاتەوە کە ئاخۆ سوپاس دەبژێرم یان سپڵە دەردەچم، ئەو کەسەی سوپاسبژێر بێ بۆ خۆیەتی، ئەو کەسەش سپڵە بێ خوا باکی پێ نیە و هەر بەخشندەیە﴾النمل:٤٠.

## تێکەڵکردنی ئامرازو مەبەست:

ئەوروپاییەکان خۆیان لە دین بێبەش کردبو، بۆیە پەرژینی خورەوشتی و رێکخەری ئاینییان نەبو، رێبەری خواناسیان نەبو بەرەو راستەرێ رێنوێنیان بکات، ئامانجی ئافەریدەبون و سەرەتا و سەرەنجامی ژیانی خۆیان لە بیر کردبو، دەیانگوت: ﴿إِنْ هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ: ژیان هەر ئەوەندەیە کە دەبین ودەمرین و هەرگیز زندو نابینەوە﴾. پێیان وابو زەوی بێ ساحێبە و ئامانج لە خەلقبونی مرۆڤیش هەر ئەوەیە بە دوای چێژ و خۆشی و

قازانجی ماددی و باڵادەستبوندا بگەڕێ و هەوڵ بدا بەسەر خەلکان زاڵ ببێ و خێروبێرەکانی زەوی بخاتە ژێر دەستی خۆی.

بەهۆی ئەم تێڕوانینەوە زانست و هێزیان لە پێناو دابینکردنی چێژ و خۆشی و زاڵبون بەسەر خەڵك و داشکاندنی خەڵکی مونافیس بەکارهێنا، مونافەسەیان لە داهێنان و دۆزینەوەی ئامێر و ئامرازی نوێ دەکرد تا بەهۆیەوە بتوانن مەرامەکانیان بێننە دی و خەڵکانیتری پێ بەرزەوت کەن. بەم شێوەیە بەردەوام بون تا وای لێهات ئامراز و مەبەستیان تێکەڵ کرد وئامرازیان لێ بو بە مەبەست، وەك (ئامانج و مەبەست) هەوڵی دۆزینەوە و داهێنانی شتی نوێیان دەدا و شەو و ڕۆژیان بە بێوچان گرێ دەدا و زۆر سەرقاڵو خەریکبون وەك خەریکبونی منداڵ بە بوکەشوشە و یاری. ئیتر وایان لێهات پێیان وابێ ژیار بریتی بێ لە خۆشی و هەسانەوە، پاشان وەپێشتر کەوتن و وایان لێهات ژیار بە (خێرایی) تێبگەن.

ئوستاد (جۆد ) دەڵێ:

((دزرائیلی (Disraeli) دەڵێ: کاتی خۆی کۆمەڵگە پێی وابو ژیار بریتیە لە خۆشی و هەسانەوە، بەڵام ئێمە پێمان وایە بریتیە لە خێرایی، خێرایی بۆتە خواوەندی گەنجانی ئەم سەردەمە، لە پێناو بتەکەیدا بێڕەحمانە قوربانی بە ئارامی و ئاشتی و سۆز و بەزەیی دەدات))[1].

## نا بەرانبەری هێز و خوڕەوشت لە ئەوروپادا:

ئەوروپاییەکان لەمێژە یەکسانبونی هێز و خوڕەوشت و هاوسەنگێتی زانست و دینیان لە دەست داوە، لە وەتەی ڕاپەڕینە تازەخوازەکەی ئەوروپاوە تا ئێستاکەش هەر هێز و زانست لەسەر حیسابی دین و خوڕەوشت گەشە دەکەن، ئەوان بلند و باڵا دەبن و ئەمانیش نزم و نشێو، تا ئەوەی مەودای ترازانی نێوانیان لە ڕادەبەدەر دور و بەرین بێ و نەوەیەکی وا پەیدا بێ وەك تای تەرازوی ناهاوسەنگ

(١) ( Guide to Modern of Wickdenss .P.٢٤١

بن، کە باڵێکی لەبەر قورسی لەسەر ئەزی بێ –کە باڵی زانست و هێزە–، باڵکەیتریشی–کەباڵی دین و خورەوشتە– لەبەر سوکی تاچاو برکا لە بەرزی بێ.

ئەگەر پیاو لەم نەوەیە بڕوانێ کە چۆن ئەم هەمو پێشکەوتنە سەیروسەمەرانەی داهێناوە و چۆن توانیویەتی ئەم هەمو هێز و وزە سروشتیە مسەخخەر بکات؛ تاس دەبیاتەوە و واقی وڕ دەمێنێ و دەڵێ نابێ ئەمانە مرۆڤ بن و هەبێ و نەبێ مەخلوقێ‌ترن، کەچی لە هەمان کاتیشدا دەبینێ لە ڕەوشتێکی پەشۆکاو و پڕ نیگەرانیدا دەژین، خورەوشتیان داتەپیوە، چێژو ئارەزویان هەڵبڕوسکاوە، تورەبون و هەڵچونەکەیان نابەجێیە و بەزەییان بە گیانلەبەران نایەتەوە و زۆر بە نامەردی ستەم دەکەن.. کورت و کرمانجی دەبینێ هەمو ئامراز و کەرەستەیەکی ژیانیان مسەخخەر کردوە بەلام نازانن چۆن چۆنی بژین!،دەبینێ ئەوپەڕی مەبەستیان هێناوەتە دی و هەرچی پێداویست و خۆشی ژینە دابینیان کردوە کە چی لە سەرەتاترین بنەماکانی ژیار و ڕەوشت و ژیانی مەردومانەدا کۆڵەوارن، دەبینێ بە ئاسماندا هەڵدەگەڕێن و گەرەکیانە بە بورجی جەوزا بگەن کەچی هێشتا کاروباری زەمینی ژێر قاچی خۆیان ڕێك نەخستوە، زانستە سروشتیەکان هێزو وزەی لە ڕاددەبەدەری پێبەخشیون کەچی نافامن بۆ چاکەکەری دەکاری نێن، وەك منداڵێکی ساوا و شێتێکی گەمژە وان جلەوی کار و کلیلی گەنجینەکانی زەمینیان لە دەست دایە بەلام هەر ئەوەندەی لێ دەفامن گاڵتەو یاری بە گەوهەر بەهادار و کەرستە بە نرخەکان بکەن و خوێن و ماڵی خەڵکیش بە فیڕۆ دەن.

## هێزی خواوەندانە و ئاوەزی منداڵانە:

ئوستاد (جۆد) دەڵێ: ((زانستە سروشتیەکان هێزی وای پێ بەخشیوین تەنها بەخواوەندان شایەن بێ، بەلام ئێمە بە ئاوەزێکی منداڵانەو دڕندانە بەکاری دێنین))[1].

---

(١) Guide to Modern of Wickdenss .P.٢٦١

لە شوێنێکی تردا دەڵێ:

((ئەو جیاوازیە گەورەیەی لە نێوان پێشکەوتنە سەر سوڕهێنەرە زانستیەکان و ژیانی منداڵانەی کۆمەڵایەتی و خەجاڵەتباریەکەماندا هەیە، لە هەمو شوێن و چالاکیەکاندا وەدەرکەوتوە. ئێمە دەتوانین بەهۆی زانستەوە کیشوەر و دەریاکان ببڕین و وێنە بە بروسکە شەپۆل بنێرین و بێتەل لە ماڵ دامەزرێنین و لە سەیلانەوە گوێبیستی کاتژمێرە گەورەکەی بیگبن ( Big Ben)ی لەندەن ببین، دەتوانین بەئاسماندا هەڵفڕین و لەسەر زەوی و دەریادا ڕێ ببڕین، منداڵەکانمان بە فاکس و تەلەفۆن قسە بۆ یەکتر دەکەن، ددانی کلۆر بێ ئێش وژان پڕ دەکرێتەوە، کشتوکاڵ بە کارەبا نەشونما دەکات، شەقامەکان بە مافوری پلاستیکی روپۆش دەکرێن، تیشکی ڕۆتنجن (X-Rrys) بۆتە پەنجەرەو لە هەناومان دەڕوانێ، وێنەی جولەدار دەدوێ و گۆرانی دەچڕێ، تاوانکار و تیرۆرست بە ئامێری بێتەڵ دەستگیر دەکرێ، کەشتیە ژێر دەریاییەکان تا جەمسەری باکور دەریا دەبڕن، فڕۆکەکان تا جەمسەری باشور بە ئاسمانا هەڵدەفڕن، کەچی لەگەڵ ئەو هەمو پێشکەوتنە زانستیەشدا ناتوانن گۆرەپانێك لە نێوەڕاستی شارە گەورەکاندا بۆ منداڵی هەژار و کەساسان دروست بکەین تا بەهێمنی و بەئارامی یاری تێدا بکەن. لە ئەنجامی ئەو ترازان و جیاوازیە فرەوانەی کە لە نێوان لایەنی زانست و لایەنی کۆمەڵایەتیماندا هەیە نەك هەر ئەم کارە ناکەین بەڵکو ساڵانە دوهەزاریشیان لێدەکوژین و نەوەت هەزاریشیان لێ بریندار دەکەین.

جارێکیان لە وتارێکدا کە بەشان و باڵای ژیاری لای خۆمانم هەڵدەگوت و شانازیم پێوە دەکرد –بە تایبەتی ئەو کات کە هەندێك لە شۆفێرەکان توانیبویان سێسەد یان چوار سەد میل لە سەعاتێکدا لە ئاقارە لماویەکەی پەندینا (Pendine) ترومبێلەکانیان لێبخوڕن، فڕۆکەیەکیش لە ماوەی بیست یان پەنجا دەقیقەدا (باش نایەتەوە بیرم) توانیبوی لە مۆسکۆوە بگاتە نیویۆرك– فەیلەسوفێکی هیندی ڕەخنەیەکی توندوتیژی لێگرتم و گوتی: ڕاستە ئێوە

دەتوانن وەك باڵندە بە ئاسماندا هەڵبفڕن و وەكو ماسی لەژێر ئاودا مەلە بكەن، بەڵام هەتا ئێستا نازانن چۆن بەسەر زەویدا بڕۆن))[1].

## شتی وا فێر دەبن كە زەرەریان پێ ببەخشێ نەك قازانج:

داهێنراو و دۆزراوە نوێیەكان وایان لێهاتوە زەرەریان لە قازانج زیاتر بێ، وەك خوا لە بارەی جادودا دەفەرموێ: ﴿ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ ﴾ البقرە:١٠٢، خۆ ئەگەر بەكارهێنەرەكانیش خێر و چاكەیان بناسی بوایە و بیانزانی بوایە چۆن لە كاری خێریان بە كار دێنن ئەوا بێگومان قازانج و سودێكی گەورەی بۆ مرۆڤایەتی دێنایە دی، دەفەرمو گوێ ڕادێرە بۆ وتەی یەك لە شاهیدەكانی نێو ماڵی خۆیان و بزانە چ دەوێژێ، شاهیدەكەش پێشتر ناومان هێناوە كە بەڕێز ئوستاد (جۆد)ی بلیمەتە، بزانە بە چ جۆرێك ڕەخنە لەم داهێنراو ودۆزینەوە تازانە دەگرێ:

((توانیومانە بەخێرایی لە ڕاددەبەدەرەوە لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر سەفەر بكەین، بەڵام ئەو شوێنانەی سەفەریان بۆ دەكەین كەمجار هەیە بۆ سەفەر بگونجێن، گەشتیارەكان ڕێگای دورودرێژیان بۆ كورت بۆتەوە، گەلان لە یەكتر نزیك بونەتەوە و هەندێكیان لەگەڵ یەكتر تێكهەڵكێشیش بونە، بەڵام لە ئەنجامی ئەمەدا پەیوەندی نێوان گەلان گرژی تێكەوتوە و لە جاران گەلێك خراپتر بوە، هەمان ئەو ئامێر و ئامرازانەی كە وایان كردوە لەگەڵ گەلانی دراوسێ ئاشنا بین دنیای یەك پارچە لێكردوین بە شەڕ. ئێزگەمان داهێنا و توانیمان لەگەڵ دراوسێ و گەلان بدوێین، بەڵام لە ئەنجامدا هەر گەلێك هەوڵی دەدا لەم ڕێگەیەوە سود لە بواری هەوا وەرگرێ و ئازاری دراوسێكەی بدات، گەلێكی دەكرد و دەكۆشا تا بسەلمێنێ ڕژێمەكەی خۆی لە ڕژێمی ئەو باشترە))[2].

---

(١) هەمان سەرچاوە . ل ٢٩٣ .

(٢) هەمان سەرچاوە . ل ٢٣٩.

((کە سەیری فڕۆکە دەکەی بە ئاسمان هەڵدەفڕێ، وات بە خەیاڵ دادێ ئەوانی دروستیان کردوە مرۆی گەلێك زانا و کارامە و دەستڕەنگینن و لەسەروی مرۆڤانیترن، هەڵبەت ئەو کەسانەی وێراون بۆ یەکەمجار پێی هەڵفڕن مرۆڤی چاونەترس و ورە بەرزو پاڵەوان و سەرچڵ بون[٣]، بەلاّم ئێستاکە بڕوانە و بزانە بۆ چ مەبەستێك بەکاربراون و بەکار دەبرێن، دەبینی بۆ هەڵداشتنی ناپاڵم و هەلاربەهەلارکردنی جەستەی مرۆڤ و قڕکردنی زیندەوەر و سوتاندنی خەڵك و باراندنی ژەهری کیمیایی و تەفروتوناکردنی گەل و نەتەوەی بێکەس و چەوساوە بەکارهێنران و، بێگومان ئەمەش مەرام و مەبەستی مرۆی کەللە بۆگەن و شەیتانەکانە))[٣].

((جا کە سبەی ڕۆژێ مێژونوسێك لێمان دەکۆڵێتەوە ئاخۆ چۆن زێڕیان بەکار هێناوە؟ باسمان دەکات و دەڵێ توانیویانە بە هۆی شەپۆلی بێتەلەوە زێڕی ژێر زەوی بدۆزنەوە، وێنەی ئامراز و ئامێرە پێشکەوتوەکانیش دەخاتە ڕو کە خاوەن بانکەکان زێڕیان پێکێشاوە و ژماردویانە، لێدەکۆڵێتەوە و دەڵێ: توانیویانە بەرەنگاری یاسای کێشکردنی زەوی ببنەوە و زێڕ لەپایتەختێکەوە بۆ پایتەختێکیتر بگوازنەوە، لە مێژوەکەیاندا تۆمار دەکات و دەڵێ: نیمچە دڕندەکان کە لە پێشکەوتنی پیشەسازیدا گەلێك زیرەك و بە جورئەت بون نەیانتوانی هاریکاری نێودەوڵەتی دابین بکەن، کە وا دەخوازێ مەسەلەی زێڕ ڕێك بخرێت و بە شێوەیەکی ڕاست و دروست دابەشکاری بۆ ئەنجام بدرێ، دەڵێ: تەنها بایەخیان بەوە داوە کە هەر خێرا زێڕ وەشارن، دەڵێ: زێڕو کانزاکانیان لە هەناوی خاکی باشوری ئەفریقیاوە دەردەهێنا و لەبانکەکانی لەندەن و نیۆرك و پاریسیان دەشاردەوە))[١]. هزرڤانێکی تر-هەمان بابەت- بابەتی دابڕانی نێوان زانست و پیشەسازی لەگەڵ خوڕەوشتی مرۆڤایەتی، یان بابەتی داتەپینی ژیاری نوێ کە

---

(٣) سەرچڵ: مغامر.

(٣) هەمان سەرچاوە . ل ٢٦٢ .

(١) هەمان سەرچاوە . ل ٢٩٢

ناتوانێ پەیامەکەی ڕاپەڕێنێ، لە ڕوانگەی فەلسەفە و زانستە سروشتیەکانەوە بە شیکارێکی وردترو بە نەشم و شێوازێکی قوڵتر شرۆڤە دەکات کە ئەویش دکتۆر ئەلکسیس کاریل ( Alixes Carrel)ـە، لە پەڕتوکەکەیدا بەناوی (مرۆڤ نەناسراوێکە: Man the unknown ) دەڵێ:

((وادیارە ژیاری ئەم سەردەمە ناتوانێ پیاوی داهێنەرو بلیمەت و چاونەترس بێنێتە بەرهەم، هەمو کەسێ لە گشت شوێنێ تێبینی ئەوە دەکات کە ئاستی ئامادەیی هزری وخوڕەوشتی ئەو چینەی کاروباری وڵات هەڵدەسوڕێنن لە داڕوخان دایە.

ئێمە تێبینی ئەوە دەکەین کە ژیاری ئەم سەردەمە نەیتوانیوە ئاواتە گەورەکانی مرۆڤایەتی بێنێتە دی، نەیتوانیوە پیاوی هۆشمەندو گورجوگۆڵی وا پەیدا بکات ئەم ژیارە لەسەر شەقامی پڕ مەترسی ڕزگار بکات و بەرەو ئەمانی ببات. تاکەکان و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەگەڵ خێرایی پێشکەوتنی دەزگا زانستیەکان کە هەر بە ژیری خۆیان دایانهێنا بو هاوتەریب نەبون، ئەویش بەهۆی سەرکردە سیاسیەکانەوە کە لە خوڕەوشت و هزردا کەم و کورتییان هەیە و لە گەلێك شتدا نەفامن، ئەو نەفامیەی کە چارەنوسی گەلانی سەردەم دەخاتە بەر مەترسی))[٢].

((ئەو نێوەندەی کە زانستە سروشتی و پیشەسازیەکان بۆ مرۆڤیان ڕەخساندوە بۆ مرۆڤ لە بار و گونجاو نیە، چونکە نێوەندێکە بە حوکمی ڕەمەکیانە ڕەخساوە نەك بە نەخشە و بیرکردنەوەیەکی پێشو، ڕەچاوی ئەوەشی تێدا نەکراوە لەگەڵ کەسایەتی مرۆڤ بگونجێ. ئەم نێوەندە کە هەر بەرهەمی ژیری و داهێنانی خۆمانە؛ لەگەڵ بەژن و باڵا و سەروسەکوتی ئێمەدا ناگونجێ، بۆیە ئاسودە نین و لە داڕوخانێکی خوڕەوشتی و ئاوەزی داین. ئەو گەلانەی ژیاری پیشەسازییان لە ناودا بوژاوەتەوە و گەیشتونەتە چڵەبەنانی پێشکەوتن لە جاران گەلێك لاوازترن و

Man the unknown p.٣٣ . (٢)

بەرەوتێکی بێوچان بەرەو درِندەیی شۆڕ دەبنەوە، بەلاّم هەستی پیێ ناکەن. ئەو دەوروبەرە وروژاوەی کە زانستە سروشتیەکان بە دەوری گەلانیان هەڵچنیوە ئەمان و پاسەوانی نیە.

لە ڕاستیدا ژیارەکەی ئێمەش وەك ژیارە رابردوەکان چەند مەرجێکی بۆ مانەوە فەرز کردوە، کە لە داهاتودا — لەبەر چەند هۆیەکی شاراوە —وای لێدێ ژیان مەحالْ بێ. ئەو زانستەی کە ئێمە لەبارەی ژیان و چۆنیەتی گوزەرانی مرۆڤ هەمانە لە چاو ئەو زانستەی کە لە بارەی ماددەوە هەمانە گەلێك پاشکەوتوە، هەر ئەم پاشکەوتنەشە کە دوچاری ئەم نەهامەتیەی کردوین))[٣].

((با هەر ژمارەی ئامێرە داهێنراوەکان زۆرتر بکرێن، با هەر گرنگی گەورە بە دۆزینەوەی زانستە سروشتیەکان و گەردونناسی و کیمیاگەری بدرێت، ئەگەر ئەم کارانە ببێتە مایەی لاوازیمان و نەتوانین بۆ بەرژەوەندی خۆمان سودی لێوەرگرین و نەبێتە مایەی زیادبونی ئاسودەیی و خۆشبونی گوزەران و جوانبونی ژیارەکەمان چ قازانجێکی هەیە؟، هیچ خێرو قازانجێك لەوەدا نیە ڕێگەیەك بۆ ژیان بەهێز بکرێ بەلاّم خوڕەوشتی لێ دامالْدرێ و شکۆدارترین ڕەگەزی نەتەوە مەزنەکانی لێ دابڕێندرێ . وا ڕاسترە پتر گرنگی بە خۆمان بدەین نەك بە پیشەسازی کەشتی خێراتر و ترومبێلی نەرمتر و ڕادیۆی هەرزانتر، یان بە تەلسکۆبی پێشکەوتوتر تا گەلەستێرەی دورتری پێ ببینرێ)).

(( بڕی ئەو پێشکەوتنە ڕاستەقینەیە چەندە کە ئەگەر فڕۆکەیەك لە ماوەی چەند سەعاتێکی کەمدا بمانگەیەنێتە ئەوروپا و چین؟ ئایا زەروریە هەر هەوڵدەین بەرهەم زیاد بکەین تا مرۆڤ بتوانێ بڕ و ئەندازەی زۆر و زۆرتر لە شتی بێهودە بە فیڕۆ بدات؟ ئایا گومان لەوەدا هەیە کە زانستەکانی میکانیك و سروشتی و کیمیا ناتوانن ژیری و سیستەمی خوڕەوشتی و لەشساغی و هاوسەنگی هەست و ئاسایش و ئاشتیمان پێ ببەخشن؟))[١].

(٣) هەمان سەرچاوە . ل ٣٨

(١) هەمان سەرچاوە ل (٥٠-٥١)

## ئەوروپا لە خۆکوشتن دایە:

کاتێك ڕۆژئاواییەکان ئارەزوی خێر و چاکەیان نەما و بنەما و ڕێبیرە ڕاستەکانیان لە دەست دا، دڵیان چیتر بۆ هەق و ڕاستی لێی نەدا و چێژیان ژەنگ و ژاری گرت و بەری نەدا و زانست و دۆزینەوە تازەکان لە زیان بترازێ چیتری پێ نەبەخشین و وەك خواردنی پاك و چاکی لێهات کە بۆ نەخۆش نەخۆشی زیاد دەکات. وێڕای ئەمانە ئامێر و داهێنراوەکان هێز و خێراییشی پێ بەخشین تا زوتر خۆ بکوژن. مستەر ئیدن ( Eden )ی سەرەك وەزیرانی پێشوی بەریتانیا لە وتارێکیدا لە ساڵی (١٩٣٨ز) قسەیەکی زۆر جوانی گوتوە، دەڵێ:

((خەڵکی سەر زەوی لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا خەریکبو بەرەو وەحشیەت و دڕندایەتی وەرسوڕێنەوەو چەشنی ژیانی نێو ئەشکەوت و زەندۆڵان بگوزەرێن. زۆر سەیرە و جێی پێکەنینە کە وڵاتەکان بە ملیۆنان جونەیهـ خەرج دەکەن تا خۆیان لە مەترسی چەکێکی کۆکوژ و قڕتێخەر بپارێزن بەڵام بۆ ڕێکخستنی ئەم چەکانە هیچ شتێ تەرخان ناکەن. هەندێ جار سەیر دەمێنم و دەڵێم: ئەگەر یەکێك لە هەسارەیەکیتر سەردانی سەر زەوی بکات چ دەبینێ؟ دەبینێ وا ئێمە خەریکی ئامادەکردنی کەلوپەل و ئامێری جۆراوجۆرین تا یەکتری پێ لەناو ببەین، دەبینێ لە کەینوبەینی ئەوە داین کە یەکتر فێر بکەین چۆن ئەم ئامێرە دۆزەخیانە بەکار بێنین)).

## بۆمبای ئەتۆمی و مەرگەساتەکانی:

مستەر (ئیدن) کەئەو قسانەی گوتوە ڕەنگە بە خەیاڵی دانەهاتبێ کە جیهانی شارستان لە سەروی هەموشیانەوە ئەمریکای بە ناو ئاشتیخوازو ڕابەری ژیارو جیهانی نوێ! لە شەڕدا چەکێك بەکاردێنێ کە گشت چەك و دۆزینەوەو داهێنراوەکانیتر بارتەقای نابن و لە کوشتن و وێرانکاریدا تۆزی ڕێگاشی ناشکێنن.. چەکێکی ئەوتۆ کە کارەسات و مەرگەساتێکی وا بنێتەوە بە خەیاڵ و

مێشکی هیچ مرۆڤێك دانەهاتبێ. ئەم چەکە بریتی بو لە بۆمبای ئەتۆمی کە ئەمریکا جاری یەکەم وەك تاقیکردنەوە لە بیابانی (نیومەکسیکۆ) بەکاری هێنا وجاری دوەمیش لەسەر سەری (هیرۆشیما)و پاشانیش لە شاری (ناگازاکی) کە دو شاری یابانن. سەرۆکی شارەوانی هیرۆشیما لە (٢٠ی ئۆگەستی ١٩٤٩ز)دا لە ڕادیۆ ڕایگەیاند و گوتی: ئەو یابانیانەی لە ڕۆژی (٦ی ئۆگەستی ١٩٤٥ز)دا بە بۆمبە ئەتۆمیەکە کوژران ژمارەیان لە (٢١٠٠٠٠ تا ٢٤٠٠٠٠) کوژراو دەبو.

مستەر ستورات (**Sturat Gilder**) لە مەقالەیەکدا کە لە (١٦ی سێبتێمبەری ١٩٤٥)دا لە رۆژنامەی هیندی زمان ئینگلیزی: (**Statesman**) بلاوی کردۆتەوە دەڵێ:

((پرۆفیسۆ (**Plesch**) دەڵێ:

ئەو خەڵکەی تا نزیکەی سەد میلیش لە شوێنی تەقینەوەکە دور بون ڕەنگە هەر کاری تێکردبن، بۆیە دەبێ پشکنینێکی پزیشکانەی چاکیان بۆ بکرێ. سەیر نیە ئەگەر ڕۆژێك لەرۆژان خەڵك لە ڕۆژنامەکان بخوێننەوە کە ئەوانەی لە دوری هەزاران میل لە یابان نیشتەجێ بونە ئاسەوارو نیشانەکانی پەتای بۆمبی ئەتۆمییان لەسەر بەدیار بکەوێ. پرۆفیسۆر (م. ی.ئۆلی ڤینێت) مامۆستای زانکۆی بێرمنگهام و ئەندامی دەستەی پیشەسازی دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی، دەڵێ:

((ئەگەر کەسێك وا بزانێ بەریتانیا یان هەر ولاتێکی تر دەتوانێ نهێنیەکانی بۆمبای ئەتۆمی بپارێزێ ڕاست ناکات، چونکە ئەو یاسا و بنەمایانەی بۆمبی ئەتۆمی پێ دروست کراوە لە لای هەمو ولاتێك ڕونە، بەریتانیا و ئەمریکاش سودیان لە ئەزمونی پێشینان وەرگرتوە تا توانیویانە بۆمبی ئەتۆمی دروست بکەن. بۆمبی ئەتۆمی مەگەر ماوەیەك دەنا نابێتە نهێنیەکی جەنگی، چونکە هەمو ولاتێك دەتوانێ لە ماوەی پێنج ساڵدا بۆمبی ئەتۆمی دروست بکات، خۆ

ئەگەر کردوکۆشێکی پتری بۆ تەرخان کرد و چاکتر خۆی سازدا ئەوا دەتوانێ بە ماوەی دو ساڵ دروستی بکات)).

هەر هەمان پرۆفیسۆر دەڵێ:

((من دڵنیام لە ماوەیەکی کەمی داهاتودا بۆمبی ئەتۆمی وا دێتە سەر شانۆی جیهان کە هێزی تەقینەوەکەی بە دەهەزار تەن لە هی یەکەم گەورەتر بێ، دوای ئەمەش بۆمبیەتری وا دروست دەکرێ هێزی تەقینەوەیان بە قەد یەك ملیۆن تەن بارود بێ، بەجۆرێك قەت بەرگری ناکرێ، تەنها شەش بۆمبی لەم جۆرەش دەتوانێ ئینگلتەرا تەفروتونا بکات و ئاساری لەسەر پاتاری نەهێڵێ. زانا روسیەکانیش لە ماوەیەکی زۆر کەمی داهاتودا دەتوانن بۆمبی ئەتۆمی دروست بکەن)).

ئەمریکا جۆرە بۆمبێکیتری داهێناوە کە هێزو کارەساتەکەی گەلێك لە بۆمبی ئەتۆمی گەورەترە، کە ئەویش بریتیە لە بۆمبی هایدرۆجینی. بۆ دوەم جار لە ئۆقیانوسی هێمن لە رۆژی (٢٦ی مارسی ١٩٥٤)دا تاقی کردۆتەوە.

مستەر چارلس .ی.ولسن: سکرتێری وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا دەڵێ: ئەنجامەکەی بەجۆرێك بو پیاو بروا ناکات.

مستەر لویس ستراس: سەرۆکی وزەی ئەتۆمی لە ئەمریکا دەڵێ: یەك بۆمبی هایدرۆجینی دەتوانێ روبەرێکی بەرفراوانی وەك شاری نیویۆرك کاول بکات.

زانای سروشتناسی بەناوبانگ و جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی ئاسایش؛ (ئەللیواء: صاحب سنگ) لە دەهلی تازەدا دەڵێ:

چوار بۆمبی هایدرۆجینی کە کێشی هەر یەکەیان سەد تەن بێ دەتوانن گشت خەڵکی سەر روی زەوی بکوژن. لەم دواییانەش دەنگۆ هەیە کە روسیا بۆمبی نایترۆجینی دۆزیبێتەوە کە گەلێك لە بۆمبی هایدرۆجینی کارەساتتر و وێرانترە.

## زڕکەتاڵ[1] هەر تاڵی دەدات:

بنچینەی ژیاری ئەوروپا وەکو بە درێژی باسمان کرد لەرزەی تێکەوتوە و ئێستاش هەر لە لەرزە دایە، هەرچەندی کاتی بەسەردا تێپەڕێ و بالاکەی بلندتر ببێ پتر رادەخزێ و دەلەخشێ . ژیاری ئەوروپا لەبەرئەوەی تۆوەکەی ناجسن بۆ بۆیە زڕکەتاڵی وەبەر هێنا ﴿ وَالْبَلَدُ الطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَالَّذِي خَبُثَ لاَ يَخْرُجُ إِلاَّ نَكِدًا: خاکی ئادان بە ئیزنی خوا درەختی جوان و بەسود دەڕوێنێ، بەلاّم خاکی بێماد ڕوەکی بێسود دەڕوێنێ﴾ الأعراف:٥٨.

ئوستاد (سەید ئەبولئەعلای مەودودی) لە پەرتوکە زمان ئوردیەکەیدا بە ناوی (التنقیحات) زۆر جوان و پوخت ئەمەی ڕون کردۆتەوە و دەڵێ:

((ژیاری ڕۆژئاوا لە ئامێزی نەتەوەیەکدا هاتە پەیدابون کە خاوەنی کانیاوێکی پاك و بێگەرد و سەرچاوەیەکی سازگاری بەرنامەی خوایی نەبو. سەرکردەی دینییان لە ناودا هەبو بەلاّم خاوەن حیکمەت و زانست و بەرنامەیەکی خوایی نەبون، بەڵکو تارمایی دینیان لەلادا بو کە ئەگەر گەرەکیشیان بوایە مرۆڤایەتی بخەنە سەر ڕاستە شەقامی هزر و کردەوەی چاك نەیاندەتوانی، بەڵکو ئەو شتی پێشیان بو بوە کۆسپ و بەربەستی پێشکەوتنی زانستو حیکمەت. بەمجۆرە بو بۆیە لەئەنجامدا پێشکەوتنخوازەکان دینیان بە دیوار دادا و ڕێگەیەکیان هەڵبژارد کە تەنها بەڵگەی ئەزمون و کێشان و پێوان و بەچاودیتن قبوڵ بکەن، متمانەیان تەنها بەوجۆرە بەڵگانە دەکرد کە خۆیان پێویستیان بە ڕێنوێنی و ڕوناکی هەبو، بە کەوشی ئەوجۆرە بەڵگانەوە ڕێی هزر و نوارین و لێوەکوڵین و دۆزینەوەو بنیاتنان و ڕێکخستنیان گرتەبەر. بەلاّم هەر لە هەنگاوی یەکەمەوەڕا لە گشت رەخ و ڕویێکەوە[1] بە گومڕا چون، ئەو پێشکەوتنەی لە بواری زانست و لێکۆڵینەوە وەدەستیان دێنا و ئەو کردوکۆشەی لەپێناو هزر و تێوەڕوانینەوە

---

(١) زڕکەتاڵ: جۆرە کاڵەکێکی زڕکی تاڵە.

(١) رەخ و ڕو: لا.

ئەنجامیان دەدا گشتی بەرەو مەبەستێکی ناڕاست و نادروست روی وەرسوڕا، لە ڕوانگەیەکی خوانەناسانە و ماددەپەرستانەوە دەستیان پێکرد و هەنگاویان نا، وایان لە گەردون دەڕوانی بێ خوا بێ، لە ئاسۆی ئاسمان و دەرونی مرۆڤدا تەنها شتی بەرچاو و بەر هەستیان دەدی و بڕوایان بە غەیب نەبو. درکیان بە یاسا و ڕێسای وەدیهێنراوان کرد بەلاّم نەگەیشتە وەدیهێنەرەکەی، زانیان ئەو شتانەی لە گەردوندا هەن بەیدەستن و بۆمەبەست و داخوازیەکانی خۆیان بەکاریشیان هێنا بەلاّم نەیانزانی خوا خاوەن و بەرێوەبەرەکەیەتی و ئەوانیش مرۆی جێنشین، پێیان وانەبو بەرپرس بن و ئۆباڵ و ئەرکیان لە ئەستۆ بێ؛ بۆیە بنچینەی ژیار و پێشکەوتنەکەیان شپرزە بو و ڕویان لە خواپەرستی وەرگێڕا و بۆ پەرستنی نەفس چۆکیان دادا و هەوەست وئارەزویان کردە خوا، بەلاّم ئەم هەوەستپەرستیە توشی دەردەسەری کردن و وای لێکردن لە هەمو بوارەکانی هزر و کردەوەدا لەسەر ڕێگایەکی چەوتوچەوێڵ و دلّڕفێن و رازاوە بڕۆن بەلاّم سەرئەنجامیان فەوتان و تیاچون بێ.

بەجۆرە زانستە سروشتیەکان رورەش کران، خوڕەوشت لە قالبی ئارەزوبازی و روتی و بەڕەڵلاّیی و ریابازیدا دارێژرا، شەیتانی خۆپەرستی و رژدی و ئیرەیی و رکوکینە بەسەر ژیاندا زاڵ بو، ژەهری نەفسپەرستی و خۆهەڵبژێری و نانی نەرم و جێگای گەرم بەنێو ڕەگ و دەمارەکانی کۆمەڵگەدا بلاّوبوەوە، سیاسەت شەقڵی[1] ڕەگەزپەرستی و نیشتمانپەرستی و جیاوازی ڕەنگ و خوێنی وەرگرت و هێزی بە خوا دادەنا و دەیپەرست، کە ئەمانە بونە مایەی گەورەترین نەفرەتی سەر مرۆڤایەتی.

ئەو تۆوەی کە لە خاکی ڕاپەڕینەکەی دوەمی ئەوروپا داچێنرا چەند سەدەیەکی نەخایاند درەختێکی زەبەلاحی پیسی لێ روا، بەرەکەی شیرن بو بەلاّم ژەهر بو، گوڵەکانی جوان بون بەلاّم دڕکاوی بون، پەلوپۆ و لك و گەلاکانی

(١) شەقڵ: مۆرك.

دلڕفێن بون بەلاَم گازێکی ژەهرینی نەبینراوی دەردەدا و خوێنی مرۆڤایەتی ژەهراوی دەکرد.

ڕۆژئاواییەکان کە ئەو دارە پیسەیان ڕواندوە ئێستا لێی بێزارن و ڕقیان لێیەتی، چونکە لە هەمو لایەنەکانی ژیاندا گرێ و گرفتی بۆ پەیدا کردون، هێشتا گرفتێکیان چارەسەر نەکردوە یەکێکیتریان لێ قیت دەبێتەوە، هەر لکێکی لێ دەقرتێنن دەیان لکی درکاوی تری لێ دەڕوێ، لە چارەسەری گرفتەکان و ڕێکخستنی کاروبارەکانیان وا قوڕیان بە سەری بوە دەرد بە دەرد دەرمان بکەن و دڕك بە دڕك بقرتێنن. دژایەتی سەرمایەدارییان کرد کەچی لەملاوە کۆمۆنیزم سەری هەڵدا، هەوڵیان دا دیموکراتیەت ڕیشەکێش بکەن کەچی دکتاتۆریەت پەیدا بو، ویستیان گرفتەکانی گشت کۆمەڵگە چارەسەر بکەن کەچی بزاڤی بە نێرکردنی ئافرەتان (**Feminism**) و بزاڤی نەهێشتنی منداڵبون پەیدا بو، ویستیان یاسا بۆ بنبڕکردنی بەدڕەوشتی داڕێژن کەچی بزاڤی سەرپێچی و تاوانکاری دنیای تەنیەوە. ئێستاش هەر خراپیەك لادەدەن خراپیەکی تر سەر هەڵدەدا و هەر بەدکاریەك وەلادەنێن بەدکاریەکیتر دێتە جێی. ئەم دارەی ڕواندویانە هێشتا بەردەوام گرفت و بەڵای جۆراوجۆریان بۆ وەبەرهەم دێنێ. ژیانی ڕۆژئاوا وەك جەستەیەکی زامداری لێهاتوە زامەکەی کێم و خیزاوی لێ بێت و لەبەر ئازارەکەی گشت جەستەکە وەناڵەناڵ کەوتبێ، پزیشکەکانیش لە دەرمانکردن و چارەسەریدا حەیران بن و هەر پینەیەکی بۆهەڵدورن پتر ڕیزاڵ ڕیزاڵ ببێ. نەتەوەکانی ڕۆژئاوا لە نێو ژان و ئازاردا زاڵە و ناڵە و هاوار هاواریانە، دڵیان پەشێو و نیگەرانە، ڕوحەکەیان بۆ ئاوی ژیان تینوە بەلاَم نازانێ کانیاوی ژین لە کوێیە و سەرگەردانە.

زۆربەی پیاوەکانی ئەوروپا وا تێدەگەن سەرچاوەی گرفت و بەلاَکان لە لق و پەلوپۆکانەوەیە بۆیە دەیقرتێنن و کات و کۆششێکی زۆریشی بۆ تەرخان دەکەن، کەچی نازانن سەرچاوەی دەردەکە لە ڕەگ و ڕیشاڵەکانیەتی. هەڵبەت ئەگەر مرۆڤێك گەمژەو کەودەن بێ چاوەڕێ دەکا لە دارێکی ڕەگ گەندەڵەوە لق و پۆپی

چاك بڕوێ. بەڵێ چەند هۆشمەندێکیان هەستیان کرد ژیارەکەیان لە ڕەگ و بنجەوە گەندەڵە بەڵام ئەوانیش کە لە سێبەری بەر دارەکەوە چەند سەدەیەکیان بەڕێ کرد و گۆشت و ئێسقانیان لە بەری دارەکەوە تێشوی وەرگرت، گەیشتنە ڕاددەیەك پێیان وانەبێ ڕەگ و بنکێکی تر هەبێ بتوانێ لك وپۆپ و گەلای ساغ و چاك دەربکات. هەردو چین لە ئەنجامدا یەك دەگرنەوە و هەردوکیان وەدوای ڕێگەچارەیەك وێڵن کە دەردەکەیان چارە بکات و تەنگانەکەیان لە کۆڵ بکاتەوە بەڵام ڕێگەچارەکە ناناسن و نازانن لە کوێیە))[1].

(١) التنقيحات ، ((امم العصر المريضة )) ل ٢٤-٢٦

بەندی چوارەم

## کارەساتە مەعنەویەکانی مرۆڤایەتی
## لە ڕۆژگاری ئیستیعماری ئەوروپاییدا

لێرەدا نامانەوێ باسی کارەساتە ڕامیاری و ئابوری و بازرگانی و پیشەسازیەکان و زەرەر و زیانە موڵك و ماڵییەکانی گەلانی ئاسیای ڕۆژهەڵاتیی بکەین. باسی ئەوەش ناکەین کە چۆن گەل لە دوای گەل و وڵات لە دوای وڵات لە بەرامبەر هێزی ماددەپەرستانە و فڕوفێڵە سیاسیەکانی رۆژئاوا داشکاون، چونکە ئەم هەویرە ئاو زۆر هەڵدەگرێ و ئەم پەرتوکە قەبارە بچوکەش پاروی وا گەورەی پێ قوت نادرێ. پاشان گەلێك لە نوسەر و مێژونوسانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە دەرگای ئەم بابەتانەیان داوە و زۆر کتێبی گەورە و بچوك و ناوەنجییان لەم بارەوە داناوە و هەمو مەسەلەیەکیشیان تێدا هەڵناوە.

بەڵام ئەوەی بەلامانەوە گرنگ بێ- کە وا ئێمەش لەم پەرتوکەدا دەربارەی ئەو زیانانە دەدوێین کە بەهۆی داڕوخانی موسوڵمانەکانەوە دوچاری جیهان بوە و ئەوروپاییەکانیش جڵەوی سەرکردایەتیان وەرگرتوە- ئەو کارەساتە روحی و رەوشتی و دەرونیانەن کە بەسەر جیهانی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی داهاتون، ئەو واتا بەرزانەن کە لە ماددە و لە گشت شتێکی پەیوەست بە زەوی بەرزترن، بزانین ئاخۆ ڕۆژگاری دەسەڵاتی ئەوروپایی و لافاوی بێئامانی ژیارەکەی چ داشکان و کارەساتێکیان بەرپاکردوە، کە هەڵبەت داشکانی هێند سەختن هەرگیز ناتوانن راست ببنەوە و کارەساتی هێند جەرگبڕن پیاو لە داخان بتوێننەوە. ژمارەی ئەو کەسانەی هەستیان بەم کارەساتە کردوە کەمن، بەڵام ژمارەی ئەو کەسانەی شتیان لەسەر نوسیوە و لە بارەیەوە دواون کەمترن.

ئاشکرایە مادەم سیستەمی ژیانی ئیسلامی موناڤیسی سیستەمی نەفامێتی بێ، کەواتە ئەو کاتەی حوکمی نەفامێتی سەرکەوتن وەدەست دێنێ

موسڵمانان لە هەمو کەس زیاتر دوچاری کارەساتی گەورەتر و قوڵتر دەبن. چونکە ئیسلام و نەفامێتی وەك دو (تا)ی تەرازوێکن ئەگەر یەکێکیان داکەوێ ئەوی تر بە هەوادا دەچێ. ئێستاکە ئێمەش یەك یەك باسی کارەساتەکان دەکەین.

## پوکانەوەی هەستی ئاینی:

جیهان بەرەو چ مەبەستێك دەڕوات ؟ سەرەنجامی بە کوێ دەگات؟ دوای ئەم ژینە ژیانی تر هەیە؟ ئەگەر هەیە چۆنە؟ ئایا ئەو ژیان پێڕەو و ڕێنمایی بۆ ئەم ژینە هەیە؟ ئەگەر هەیەتی سەرچاوەکەی چیە؟ ئەدی ئەو ڕێگەو بنچینانە چین کە ئەگەر مرۆڤ لەسەریان بڕوا بتوانێ لە ژیانی دواییدا خۆشنود بێت و بسێتەوە؟ سەرچاوەکەی ئەم ڕێگایانە چیە؟ ئەدی ڕێگای هەرەهەموار کامەیە کە لەدوای مردندا بە نازونۆشی نەبڕاوە و بەختەوەری هەمیشەیی بگات؟ ئەم ڕێگایە لە کوێوە دەست پێدەکات؟. پیاوی ڕۆژهەلاتی لە دێر زەمانەوە هزرو ئەندێشەی بەم پرسیارانە وروژاوەو وەلامەکانیشی پشت بە پشت هەڵگرتۆتەوە و قەت نەیتوانیوە فەرامۆشیان بکات و خۆی بخاتە غەفلەتەوە، تەنانەت نەیتوانیوە لە کاتی ڕابواردن و کەیف و سەفاشدا لەبیر خۆیان بباتەوە. ئەم پرسیارانە هەمو هاندەر و دنەدەری دەرون و، ناڵە و هاواری ویژدانی بون، نەیتوانیوە لێیان بێدەنگ بێ یان ڕویان لێ وەرگێڕێ، بەڵکو بە شەوق و تاسە و پڕ بەدڵەوە گوێی بۆ ڕادێراون و یەکەم کاری ژین و نێو دەرونی بریتی بوە لە وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە، بەدرێژایی هەزاران ساڵی دێرینەوە شەن وکەو و تاووتوێی کردون. میتافیزیکا و فەلسەفە و ئیشراق و وەرزشی دەرونی و زانست و حیکمەت گشتیان بریتی بون لە موغامەڕاتی سەر ئەو ڕێگایە دورودرێژ و تاریکانەی کە وەلامی ئەم پرسیارانە دروستی کردون، خەڵك یەك لەدوای یەك خۆیان خستۆتە نێو شوێنە تاریکەکان تا وەلام و خواستەکانیان وەدەست بێنن. بێگومان ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕۆژهەلات بایەخێکی گەلێ گەورە بەم بابەتە دەدات و هەردەم شەوق و تاسەی بۆ هەیە.

ئەمەیە سروشتی پیاوی ڕۆژهەڵاتی، بگرە سروشتی زۆربەی مرۆڤانی ناوچە مامناوەندیەکانیتریش بەر لەوەی ڕۆژئاواییەکان دەرکەون. ئەگەر لێرەدا زمان و تەعبیری فەیلەسوفەکان بخوازین دەڵێین: خەڵك هێشتا-جگە لەپێنج هەستە دیارەکەی- هەستێکی شەشەمیشی هەیە کە دەکرێ پێی بڵێین (هەستی ئاینی). جا وەك چۆن هەر هەستێك بوارێکی تایبەت بەخۆی هەیە کاری تێدا بکات بە نمونە چاو دەبینێ و گوێش دەبیستێ، هەستی ئاینییش بە هەمان جۆر بەروبوم وکاریگەری تایبەت بە خۆی هەیە و خەڵکی ڕۆژهەڵاتیش شەقڵیان پێوەگرتوە. جا وەك چۆن ئەگەر کەسێك هەستێکی لە دەست بدات ناتوانێ لەم بوارەدا هەست بە شتەکان بکات و هەستێکی تریش هەرچەندی بەهێز و تەواویش بێ جێی ناگرێتەوە و بۆی قەرەبو ناکاتەوە و هەمان شت ئەگەر یەکێك بە کاریگەرێکی ناگەهان یان بە هۆی کەموکورتیەکەوە هەستە ئاینیەکەی لە دەست بدات ئەوا ناتوانێ لەم ڕێگەیەوە ئەنجام وەدەست بێنێ و کاروباران لێکداتەوە، تەنانەت ناتوانێ تەسەووریشی بکات یان بڕواشی پێ بێنێ، وەك کابرای کوێر کە ڕەنگ و سەنگ نابینێ و ڕەنگە هەر نەشیان سەلمێنێ و لامل و لالوتیش بێ، یان وەك کابرای کەڕ کە دنیای پڕ هەراو زەنای پێ شاری خامۆشانە و وادەزانێ کەس دەنگی نایێ، بە هەمان شێوە ئەگەر یەکێك لەهەستی ئاینیی بێبەش بێ نکوڵی لە غەیب دەکات و هەر شتێکیش لەم دیوی پەردەی سروشتەوە بێ نایسەلمێنێ و واتا ئاینیەکانی پێ ڕاست نابێ و وتە و ئامۆژ و سەربردەیەك کە دڵ نەرم بکات و دەرون بوروژێنی و چاو بگریێنی کاری تێ ناکات و بەبێ ئەمیەت تێی دەڕوانێ.

## بڕینی مردو بێ ئێشە:

گەورەترین و سەختترین کۆسپ و تەگەرە کە ڕوبەڕوی پێغەمبەر و ئاینخوازان بویێتەوە و بەڕوی وتار و ئامۆژ و بانگەوازەکەیان هەڵتەقی بێ ئەو جۆرە کەسانە بونە کە لە هەستی ئاینی بێبەش بونە یان هەر نەیانبوە، ئەو کەسانە بونە کە لە ئاست ئایندا دڵیان وەك بەرد ڕەق بوە و ناخ و دەرونیان مردو بوە، ئەو کەسانە

بون کە قەت بیریان لە دین و ئاخیرەت نەدەکردۆتەوە و ئامادە نەبونە بۆ بابەتی ئاوەها گوێ رادێرن، ئەوکەسانە بونە کاتێك کە گوێبیستی وتە کاریگەرەکانی پێغەمبەر ﷺ دەبون سەرسەختتر و لاسارتر دەبون، لەکاتێکدا وتەکان بەردیان نەرم دەکردەوە و دڵ و دەرونیان دەتاواندەوە. دەیانگوت: ﴿ إِنْ هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ: تەنها ژیانی دنیا هەیە و ژیانی تر نیە، دەمرین و دەژین و هەرگیز زندو نابینەوە﴾المؤمنون:٣٧، هەروەها کە پێغەمبەر ﷺ لە وتە شیرن و ژیرئامێزەکانی دەبوەوە کە بەزمانی پوختەو پاراوی خۆیان دەدوا و تەنانەت منداڵیش تێیدەگەیشتن، دەیانگوت: ﴿مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَاكَ فِينَا ضَعِيفًا: لەو قسانەی دەیکەی گەلێکی لێ نافامین، وا دەزانین تۆش لاوازی و بەرگەمان ناگری ﴾ هود:٩١. ﴿ وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنْ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ: دڵمان پەردە داپۆشیوە و لە بانگەوازەکەت ناگەین، گوێمان کەرە و گوێبیستت نابین و بەربەستمان لە نێواندا هەیە، جا بۆ خۆت کاری خۆت بکەو ئێمەش کاری خۆمان دەکەین ﴾ فصلت:٥.

ئەم پرسیارانە لە بەرەبەیانی ڕاپەڕینی نوێی ئەوروپاییدا بابەتی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زانا و هزرمەندەکان بو کە بەردەوام تاووتوێ و گفتوگۆیان لەسەر دەکرد و شتیان لەبارەوە دەنوسی، بەڵام هەرچەندی ژیاری ئەوروپایی قۆناغێکی بەرەو پێشەوە دەبڕی باسوخواسی ئەم پرسیارانەش قۆناغێك وەپاش دەکەوت. جا کاتێك تایبەتمەندیەکانی ئەم ژیارە دەرکەوت و لە ڕواڵەتە ماددیەکەیدا درەوشایەوە؛ هەرا و زەنای ئەم پرسیارانەش دامرکایەوە کە لە ناخی دڵ و قوڵایی ویژدانی زندوی مرۆڤایەتیەوە دەردەچو. ڕاستە ئەم پرسیارانە لە بەشەکانی فەلسەفە و زانستە میتافیزیکیەکان و خوێندنگە و زانکۆکان و نوسینگە گشتیەکان دەخوێندرێن و پسپۆڕانیش لێی دەتۆژنەوە و ماوە ماوەش چەند پەرتوکێکی لە بارەوە بلاو دەکەنەوە، بەڵام گومانی تێدا نیە ئەم خوێندن و توێژینەوانە دەسەڵاتیان بەسەر دڵ و هزری خەڵکیدا نەماوە و نیشانە پرشنگدارەکانی پرسیارەکان ڕەش بونەتەوە کە گشت مرۆڤێکی ژیر دەیانبینێ و

لـە ئاسـتیاندا دەوەسـتێ و ڕادەمینـێ، چەشـنی شـەمەندەفەر کـە لـە بـەردەم نیشانەکانی ڕێگادا دەوەستێ. شرۆڤە و شیکردنەوەکان نقورچـە لـە دڵـی مـرۆی ئەوروپایی نادات و سەری گەرم ناکات وەك کاتی خۆی کە بابوباپیرانی سـەرگەرم کردبو. ئەمەش لەبەرئەوە نا کە بڕوایەکی بێگەرد و ئاوەرێکی[1] ڕونیان لە دڵـدا بێ یان گەیشتبنە دەرەنجامی ڕاست و ڕەوان و دڵیان ئۆقرەی پـێ گرتبـێ، نـەخێر لەبـەر ئەوەیـە کـە پرسـیارەکان گرنگـی خۆیـان لـە دەسـت داوە و پرسـیاری ماددیانەیتر جێگایان گرتونەتـەوە کـە لـە دیـدی نـەوەکانی سـەدەی نـۆزدەم و بیستەمدا زۆر لەمانە گرنگترن.

لەبەر ئەوەی پیاوی ئەم سەردەمە خۆی لەم مەسەلانە لاتەراز[1] کـردوە و روی وەرگێڕاوە بۆیە پێی گرنگ نیە ئەگەر لە دوای ئەم ژیانـەدا ژیـانێتر هـەبێ یـان نەبێ، بەهەشت و دۆزەخ و سزا و پاداشت هەبن یان نەبن، ئەم شـتانە چ بە سلبی چ بە ئیجابی کاریان تێناکات چونکە هیچ گۆڕانکاریەك ناخاتە ژیانی ڕۆژانـەی و موچەکەی کەم و زیاد ناکات و کار لە پەیوەندی نێوان خۆی و خێزانەکەی ناکات، هەروەها بڕوای بـە پاشـەکەوت نیـە و ئێـستا بـە ئاینـدە ناگۆڕێتـەوە و شـتێك پەیوەندی پێوە نەبێ بایەخی پێنادات، بۆیە خۆی ناخاتە ناو گێـژاوی ئـەم باسـە بەتاڵانە و بۆ مامۆستاکانی زانکۆی بەجێ دەهێڵـێ تـا ئـەوان ڕاوبۆچـونی تێـدا دەربڕن، بەڵام خۆی پیاوی کارە، تەنها ژینـی نێـو کـار و کارگـە و کـارگێڕی و ئامێرکاری دەناسێ، تەنها ئەوەی لەلادا گرنگـە کـە چـۆن ئێـواران وچـانێك بـە دەرونی بدات و ڕاببوێرێ، چۆن لە دەرەنگی شەودا بە ئارامی بخەوێ، چـۆن بگاتـە پشوی هەفتەو موچەی سەرەمانگی وەرگرێ، کەی بگاتە سەری ساڵ و کۆقازانجی بژمێرێ و چۆن لە پیریدا گەنجایەتی بگەڕێنێتەوە، ئەمانە هـەموی گـرنگن بـەڵام ژیانی دوای مەرگ شتێکی خەیاڵی و نەبینراو و نەبیسراوە: ﴿ بَلْ ادَّارَكَ عِلْمُهُمْ فِي الآخِرَةِ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِنْهَا بَلْ هُمْ مِنْهَا عَمِينَ: لە ڕۆژی دواییدا بەتـەواوی

---

(١) ئاوەر: یقین.

(١) لاتەواز: بێلایەن.

دەزانن ئەم ڕۆژە ڕاست بو، بەڵام ئێستا گومانیان لێ هەیە، بەڵکو لە کوێراییدا دەژین.﴾النمل:٦٦.

ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارە و بایەخی ئەو جۆرە کەسانە لە نێو هەمو گەل و وڵاتێکدا بە هۆی کاریگەری ژیاری ئەوروپاوە زیاتر دەبێ، ئەو جۆرە خەڵکەی کە هێند سەرقاڵی ژینی دنیان تەنانەت پەنجەرەیەکیشیان نەهێشتۆتەوە تیشکی بانگەوازی دینییان پێ بگات؛ کە ئەگەر یەکێك بۆ ئاین و ژینی دوارۆژ بانگیان بکات سەرسام دەبن، چەشنی سندبادی دەریایی —کە هەقایەتەکانی هەزارو یەك شەوە بۆمان دەگێڕێتەوە —کاتێك هێلکەیەکی تەیری عەنقا دەبینێ سەرسام دەبێ و وا دەزانێ باڵاخانەیەکە و لە گاشەبەرد هەڵچنراوە، چەند جارێك بەدەوریدا دەسوڕێتەوە هیچ دەرگایەکی لێ نادۆزێتەوە بچێتە ناوی، بانگخوازی دینیش بە هەمان شێوە بە دەوری سەر و سەکوتیان دەسوڕێتەوە بەلام هیچ پەنجەرەیەك نادۆزێتەوە پێی بچێتە ناو مێشکیان و بانگەوازە ئاینیەکەی بخاتە دەرونیان، چونکە ژیان و کێشەکانی ماددەپەرستی گشت دەرگاکانی لەسەر گاڵە داون و سەرجەم پەنجەرەکانی هزریشی داخستون.

پیاوێك ئەگەر چەشەیەکی ئەدەبی نەبێ کاتێك کە گوێی لە چەند ئاوازێکی دلڕفێن دەبێ یان گوێبیستی چەند دێڕە شیعرێکی ناسك دەبێ وا دەزانێ هەر دەنگە دەنگێکە و هیچی بەسەر هونەرەوە نیە، یەکێکیش ئەگەر لە هەستی ئاینی بێبەش بێ ئەوا بانگەوازی پێغەمبەران و ئامۆژگاری وتاربێژان و حیکمەت و پەندی دانایان و وتەی نەستەقی پەیامەکانی ئاسمان کاری تێناکات و قسەی ڕێك و پاراوی ڕوانبێژان و کردو کۆشی دڵسۆزانی لێ خەسارە، پێی وایە نەبایە و نەبارانە، هەرچی بۆ بکەی فو لە خۆڵەمێش کردن و ئاسنی سارد کوتانە:

**لقد اسمعت لو ناديت حيا    ولكن لاحياة لمن تنادى**

واتا: گەر بانگی زندوێکت بکردایە گوێبیستت دەبو، بەلام ئەو کەسەی کەبانگی دەکەی ژیانی تێدا نیە.

هەر یەکێك توشی کەسانێکی وا بوبێتەوە لە نهێنی ئەم ئایەتانە دەگات و هەقیقەتی بۆ دەردەکەوێ، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ خَتَمَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَعَلَى

سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ: خوا مۆری له دڵ و لـه گـوێ داون، چاویـشیان پەردە دایپۆشیوە، بۆیـە نـە لـە هـەق دەگـەن و نـە دەبیـسن و نـە دەبیـنین﴾ البقرة:٧.

﴿ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْـثَـرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلاَّ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلاً: یاخود وادەزانی زۆربەیان گوێیان لێتە و لێت تێدەگـەن، نـەخێر ئەوانە وەك ئاژەڵن بەڵكو گومڕاتریشن ﴾ الفرقان:٤٤.

﴿ وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا كَمَثَلِ الَّذِي يَنْعِقُ بِمَا لاَ يَسْمَعُ إِلاَ دُعَاءً وَنِدَاءً صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ: نمونەی ئەو كەسانەی كە بێبڕوان وەك ئاژەڵ و مـاڵاتن كە تەنها هاوار و دەنگەدەنگ دەبیستن و هیچ تێناگەن، كەڕ و لاڵ و كوێرن و لـە هیچ ناگەن. ﴾البقرة: ١٧١.

ئەو بانگخوازانەی دەگەڵ ئەو جۆرە مرۆڤانە روبەڕو دەبنەوە زۆرچاك شـارەزای ئایەتەكان دەبن و لە تەفسیر و واتاكەشیاندا توشی ئەو ئەستەمی و ئەزیەتە نابن كە تەفسیرزانەكان توشی بون، ئەو تەفسیر زانانەی كە دوچاری ئەو جۆرە كەسـانە نەبونە.

دەردی بێدەرمانی ئەم سەردەمە ئەوەیە كە خەڵك بە تەواوی دەستیان لە ئاین بەرداوە و پێیان وایە ئەم مەسەلانە چەند بابەتێكی جەدەلیـن و هـیچ كارێكیـان پێ نەماوە بۆیە ڕویان لـێ وەرگێڕاوە، جا بانگخوازەكـان لـە دەسـت ئـەم جـۆرە كەسانەوە دوچاری ئەستەمی وا دەبن كە لە داڕوخاوترین سەردەمی بێڕەوشـتی و بەدكاریدا و لە ڕەشترین سەردەمی گوناحكاری و بێئاگاییشدا ئەستەم و سـەختی وایان نەهاتۆتە پێش: ﴿إِنَّكَ لاَ تُسْمِعُ الْمَوْتَى وَلاَ تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ: تۆ ناتوانی مردو گوێبیست بكەی و ناشتوانی وابكەی كەڕ لـە هـاوارت بگاَ، ئەگەر پشت لە بانگەوازەكەت هەڵبكەن. ﴾النمل: ٨٠.

مامۆستایەكی فەلسەفە و دەرونزانی بە ناوبانگ كـە لـە یـەكێك لـە زانكـۆ ناودارەكانی ئەوروپا مامۆستایە، زۆر بە زیرەكانە هەستی بەم جیاوازیـەی نێـوان دەرونی نەوەی كۆن و نەوەی تازە كردوە و بە چـەند ڕسـتەیەكی پوخـت و نایـاب دەریبـڕیوە كە ئەویش ئوستاد (س.م.جۆد)ە و دەڵێ:

((پێشــان گەلێك گومان ورەخنە و پرسیار لەبارەی دین دەوروژێنران، هەندێك لە زاناكان ئارخەیان نەدەبون و وەلامێكی وایان وەدەست نەدەكەوت دڵیــان ئــاو بخواتەوە، بەلام یەك لەو سیفەتانەی كە ئەم نەوەیەی پێ جوێ دەكرێتــەوە ئەوەیــە كە پرســیارەكان یەكســەر هەراســانیان ناكــەن و دڵیــان نــابزوێنن، بــەڵكو لــەم سەردەمەدا هەر لە سەرەتادا پرسیارەكان دروست نابن)).

## نەمانی سۆزی ئاینی:

لە سەردەمی كۆتاییدا كاتێك دەریای ماددەپەرستی لافــاوی بــەرەو جیهــانی ئیسلامی هێنــا و گشت شوێنێكی داگرتــەوە؛ دینپــەروەرەكان گــەلێك دورگــەی بچوك بچوكیان لەنێو ئەم دەریایەدا دروست كرد، خەڵكی خواپەرست و بێــزار لــە ژینی غەفلەت و ماددیەت پەنایان وەبەر دەبردن وكۆچ و باریان بــۆ هەڵــدەگرتن، دینپەروەر هەبو وەك مەشــخەڵ لــە نێــو تاریكــستانی ماددەپەرســتیدا تــاریكی دەتاراند و پەروەردەیەكی ئاینی و ڕەوشتێكی بەرزی پێشكەش بە خەڵك دەكرد و دڵ و دەرونی مشتومالٚ دەكرد.

لە سەرتاپای جیهانی ئیــسلامیەوە كــاروان و كــۆچ و بــار بــەرەو دورگــەكان بەردوام بن، دەتدی لەم سەری خۆرهەلاتەوە تا ئەوســەری خۆرنــشین و لــەم پــەڕی باكوری جیهانی ئیسلامیەوە تا ئەوپــەڕی باشــور لــە گــشت لایەكــەوە كــاروانی ڕێبەرانی ڕوحی و پەروەردیارانی ئاینی بەرەو دورگەكان بەرێوە بون و لە تەگەرە و ئاستەنگە سیاسیەكان و كۆسپە جوگرافیەكانیان نەدەسلەمینەوە. دورگەكان ببونە ئاوەدانیــەكی ئــاینی، جیــاوازی ڕەگــەز و زێــدیان لــە نــاودا نــەبو، هــەمو وەك مەكۆیەكی مرۆڤایەتی بــون، ڕۆژهــەلاتی و ڕۆژئــاوایی، بوخــاری و مەراكیــشی، ئەنادۆڵیو ئەندەلوسی كۆكردبوەوە، كە هەمویان لە پێناو ئایندا كۆچ و ڕەویان بۆ كردبو و هانایان وەبەر خوا بردبو، شەو و ڕۆژ لە خوا دەپاڕانەوە و تــەنها خوایــان مەبەست بو، دوای ئەوەی پەروەردەیــەكی ئــاینیی ڕێكوپێكیــان وەردەگــرت وەك بانگخواز و چاكساز و مامۆستا و ڕێبەر بەدنیادا بلاٚو دەبونــەوە و لــەنێو بەشــی

شەتیان بەشی خوایان هەڵدەگرتەوە و خاکی مردوی نێو دڵانیان دەژیاندەوە و تۆوی ئاینیان دەبوژاندەوە.

لە پاڵ بەهێزترین و فرەوانترین وڵاتدا چەندین وڵاتی روحی هەبون کە دەسەڵاتیان لە سەروی دەسەڵاتی وڵاتە ماددەپەرستەکەدا بو، لەم وڵاتە پیاوی مەزنی وا هەڵدەکەوت کە خەڵك لە هەمو لایەکەوە رویان تێدەکرد و پاشا و کاربەدەستانیش بە ملکەچی دەچونە لایان ، وڵاتە روحیەکان وەك دەوڵەت سیستەمیان هەبو، دایاندەمەزراندو بڕیاریان دەدا و دەیانگواستەوە و جێگریان دادەنا، لەگشت وڵاتە ماددیەکاندا (بالوێز و کونسولیان) هەبو، دەتگوت نەخشەی جیهانیان لەبەردەست دایە، ئەگەر لە هەر شوێنێك سەنگەرێکی ئیسلام چۆڵ ببوایە، دەستبەجێ سەنگەرنشینێکی دینداریان بۆ دەنارد تاخەڵکەکە لە غەفلەت و دورلەخوایی و لە گوناحکاری بپارێزێ و نەهێڵێ پەردەی نەزانی باڵ بکێشێ و نەفامێتی و لەخوایاخیبون بلاوبێتەوە[1].

وڵاتە ڕوحیەکان لە بەڕێوەبردنی کار و سیستەمی نێوەخۆیاندا سەربەخۆ بون و پاشا و کاربەدەستەکان هەقیان بەسەرەوە نەبون، گۆڕانی بارودۆخی سیاسی و ڕوداوی ناوچەیی کاری تێنەدەکردن، هەر بۆ نمونە با وڵاتە ڕوحیە بەناوبانگەکەی (بویاغث فور) بێنینەوە کە شێخ (نظام الدین البداوني الهندي) کە لە ٧٢٥ك مردوە، لە هەمان پایتەختی هیندستان دایمەزراندوە. شێخ هاوچەرخی حەفت پاشای بەزەبر و زەنگ بوە (هەر لە غیاث الدین بلبن ٦٦٤-٦٨٦ك بگرە تا

(١) شێخی پیاوچاك : ئەبولحەسەن عەلی ئەلهجویری (لە لاهور نێژراوە) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: جارێکیان شێخەکەم فەرمانی پێکردم کۆچ و بار بۆ لاهور هەڵگرم و بچم لەوێدا نیشتەجێ بم، منیش تەوازۆم بۆ خواست و گوتم مادەم شێخ حوسێنی زنجانی برادەرمان لەوێ بێ پێویست ناکا بچم. گوتی: نەخێر هەر دەبێ بچی. دەڵێ: منیش بنەوبارگەم تێك پێچا و فەرمانی شێخم جێبەجێ کرد. کە گەیشتمە لاهور شەو ڕاشکابو و خەڵك دەرگایان پێوەدابو، بۆیە ئەم شەوم لە دەرەوە لە بن دیواری شورەی شار بەسەر برد، بۆ بەیانی کە دەرگای شورە کرایەوە بینیم خەڵك تەرمی شێخ حوسێنیان لەسەر شان هەڵگرتوەو بەرەو گۆڕستانی دەبەن، ئەو کات نهێنی فەرمانەکەی شێخم بۆ وەدەرکەوت و زانیم لەبەرچ منی بۆ ئێرە ناردوە ئیتر چومە ناوشار و شوێنی ئەوم گرتەوە و بانگەوازم دەست پێکرد.(کشف المحجوب للهجویري)

دەگەیە غیاث الدین تغلق ٧٢٠-٧٢٥ك) کەچی دەستی یەك پاشاشی بۆ درێژ نەکراوە و سەربەخۆیی خۆی بە تەواوی پاراستوە، خەڵك لە سنجاری ئێرانەوە دەهاتنە ڕۆژهەڵاتی هیندستان تا بگەنە لای.

ئەم مەڵبەندانە بە پیاوە هەژارەکانیشیانەوە سام و ویقار و شەرم و شکۆ و ڕێزێکی هێند گەورەیان لەلای خەڵکدا هەبوە تەنانەت گەورەترین پاشای جیهانیش حەسودی پێ بردون، ڕەنگە یەك لە هۆیەکانی ئەوە بوبێ کە نزیکایەتیان لە نێواندا نەبوە، هۆیەکیتریش ئەوەبو کە خەڵك لێکرا ڕویان لە پیاوە ئاینیەکان کردبو و گەردەنکەچیەکی بێ چەندوچونیشیان بۆ دەسەڵاتی ڕوحی هەبو. پیاوچاکێکی وەکو سەید ئادەم بەنوری هیندستانی (کە لە ١٠٥٣ك لە گۆڕستانی بەقیع نێژراوە) هەمو ڕۆژێ هەزار پیاو لەسەر خوانەکەی نانی دەخوارد، کە بۆ شوێنێك دەردەچو هەزاران پیاو و سەدان زانای لەگەڵدا دەبو، لە ساڵی (١٠٥٢ ك) کە چوە شاری لاهور (دە) هەزار شێخ و ردێن سپی و پیاوماقوڵی لەگەڵدا بو، تەنانەت شاهجانی پاشای هیندستان ترسی لێنیشت تەختوبەختی وەرگەڕێنن بۆیە پارەوماڵێکی فرەی بە دیاری بۆ نارد و پاشان پێی گوت: خوا حەجی لەسەر فەرز کردوی بۆیە بۆ حیجاز بڕۆ، ئەویش لە قسەکەی پاشا گەیشت و کۆچی بۆ حەرەمەین کرد و هەتا مرد لەوێدا نیشتەجێ بو[1].

شێخ محمد معصوم (١٠٧٩ ك مردوە)ی کوڕی شێخی گەورە: شێخ ئەحمەد سەرهەندی، نۆسەد هەزار پیاو لەسەر دەستی تۆبەیان کردوە و بەیعەتیان داوەتێ، لە دوای خۆیدا حەفت هەزار پیاوی بەجێهێشت خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکەن و پەروەردەو ڕینماییان پێشکەش بکەن[2].

سیف الدین السرهندی کوڕیشی (١٠٦٩ ك مردوە) هەمو ڕۆژێ هەزارو چوارسەد کەس نانی لەسەر خوانی دەخوارد و بە ئارەزوی خۆشیان جۆری خواردنەکەیان داوا دەکرد و هەڵدەبژارد[3].

---

(١) التذكرة الآدمية (بەزمانی فارسی)
(٢) نزهة الخواطر. ب٥.نوسيني شێخ عبد الحي الحسيني.
(٣) ذيل الرشحات (بەزمانی فارسی)

شێخ محمد زوبێری سەرهەندی (١١٥١ ك مردوە) ئەگەر لەماڵێ دەرچوبایە دەوڵەمەندەکان شاڵ و مەندیلیان لەبەر پێ ڕادەخست نەوەك شێخ پێی بەزەوی بکەوێ، ئەگەر بۆ سەردانی نەخۆشێك یان بە ئیشێك دەرچوبایە هەرچی دەوڵەمەند و کاربەدەست هەبو لەگەڵیدا دەردەچون، دەتگوت کاروان و کەژاوەی پاشایانە[1].

مەبەستمان لەو چەند نمونەیەی هێنامانەوە ئەوەبو بسەلمێنین کە دین و دینداران چتۆ پایە و شان و شکۆیان لەلای خەڵکدا هەبوەو خەڵك چۆن بۆ دەسەڵاتی دین نەك بۆ دەسەڵاتی هێز ملکەچ بونە، چۆن ڕویان کردۆتە دین و ڕێگەکەی. ئەم چەند نمونەیەمان هەر بە پەلەپرۆزێ و بە چەند چاوتروکانێك لە مێژوی هیندستانی ئیسلامی هێنایەوە، خۆ ئەگەر نمونەو دیمەنیتر لە تەواوی مێژوی ئیسلامی بێنینەوەو سەربردەی دیندارانی شام و میسر و مەغریبی پەڕگە و عیراق بەسەر بکەینەوە ئەوا پەرتوکێکی قەبارە گەورەی لێ دەردەچێ.

لێرەدا تەنها باسی شێخ خالیدی شارەزوری (١٢٤٢ ك مردوە) دەکەین کە خەڵك لە بەغدا سڕەی دەبەست تا تۆبەی لەسەر دەستدا بکەن و سودی لێوەرگرن. لە نامەیەکدا کە بۆ شێخەکەی دەنوسێ دەڵێ: سەد زانای هەرەچاك و زیرەکم پێگەیاندوە، پێنج سەد زانای گەورەش بەیعەتیان پێداوم، خەڵکی ڕەمەکیش لە ژمارە نایەن[4].

خەڵك تا سەرەتای سەردەمی ئیستیعماری ئەوروپاییش بەردەوام ڕویان لە دین دەکرد و بۆ وەدەستهێنانی عیلمی بە سود و فێربونی کردەوەی چاك گەشتو گەڕانیان ئەنجام دەدا، لە پێناو پاککردنەوەی دەرون و فێربونی ڕەوشتی بەرزو ڕون و گەیشتن بە پلەی سەرڕاستییێتی و خۆئامادەکردن بۆ ڕۆژی دوایی باکیان بە ئەستەم و مەترسی ڕێوبان نەبو و لە کۆچ و گەشتان نەدەسڵەمینەوە. لە هەمو وڵاتە ئیسلامیەکاندا گەلێك مەڵبەندی ئاینی و پەیمانگەی روحی هەبون و خەڵك لە هەمو لایەکەوە ڕوی تێدەکردن، گەلێ پیاو هەبون حکومەت دنیای زۆری

---

(١)درّ المعارف (بەزمانی فارسی) ، نزهة الخواطر (بە زمانی عەرەبی).
(٤) درّ المعارف .

پێدەبەخشین و پایەی بەرزی پێدەدان کەچی نەیاندەویست و بە هەڵەداوان پەنایان وەبەر هەواری پڕ لە ئارامی ڕوحی دەبرد و سەرگەرمی ئەوە دەبون کە ناخی خۆیان لە خلتەوخاڵ داوەشێنن و بەشی شەیتانی لێ هەڵتەکێنن.

حاڵ تا نێوەڕاستی سەدەی سێزدەمی کۆچی ئاوا بڕی کرد بەڵام کە ئینگلیز هیندستانی داگیر کرد ژیار و فەلسەفەی ژیانی ئینگلیزان کەم و زۆر کاری لە کۆمەڵگەی هیندستان دەکرد هەرچەندە دیاردەو دیمەنی ژیانی پێشوی ئاینی لە ناو نەچوبون و هەرمابون. مێژونوسێك[1] باسی هەیوانەکەی شێخ غولام عەلی دەهلەوی (١٤٢٠ مردوە) دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

(( بەچاوی خۆم گەلێك پیاوی خەڵکی ڕۆم و شام و بەغدا و میسر و حەبەشەم دیت بەیعەتیان بە شێخ دابو و وایان دەزانی ئەگەر لە حزوری شێخدا بن چاکەی ڕۆژگار و ئاسودەبونی تەمەن وەدەست دێنن، ئەو خەڵکەش کە لە وڵاتانی نزیکی وەکو هیندستان و ئەفغانستان ئامادە ببون وەك کلۆمسکە[1] زۆر بون، ژمارەی ئەوکەسانەی لەم هەیوانەدا بون لە پێنج سەد کەس کەمتر نەبون، نان و بەرگی هەموانیش لەسەر هەیوان بو))[2].

. شێخ ڕەئوف ئەحمەدی موجەددیدی لە ڕۆژی بیست و هەشتی جەمادی یەکەمی ساڵی ١٢٣١کۆچی چاوی بەم هەیوانە ڕون دەبێ، کە چەندین پیاوی خەڵکی سەمەرقەند و بوخارا و تەشقەند و حەسار و قەندەهار و کابوڵ و پیشاوەر و کشمیر و میللەتان و لاهور و سەرهەند و ئومروهە و سونبوهل و رامبوٚر و بریلی و لوکنهو و جائیس و بەهرائیج و کور و کوهبور و عەزیم ئاباد و دوهارکە وحەیدەر ئاباد و بونە و خەڵکی چەندین شاریتری تێدا بەرچاو دەکەوێ))[3].

---

(١) سەید ئەحمەدخان کە ڕێبەری بانگەوازی ئینگلیزی بو لە هیندستان و دامەزرێنەری زانکۆی (عەلیکرە)ی بەناوبانگیش بو.

(١) کلۆمسکە: هەزارەزیلەی کوللە.

(٢) آثار الصناديد (بە زمانی ئوردی)

(٣) دار المعارف (بەزمانی فارسی)

خوێنەری خۆشەویست! دیارە ئەم دیمەنە ناوازانە لە ڕۆژگارێکدا بوە کە ڕێوبانی هاتوچۆ وەکو ئەمڕۆ پێشکەوتو نەبوە، بەڵکو هەموی بە پیادەو گەشتی کاروانان بوە.

دیمەنە کۆتاییەکانی ئەم سەردەمە کۆچکردوە لەو مێژوەدا دەردەکەوێ کە زانای مەزنی چاکسازیخواز و موجاهیدی بەناوبانگی هیندستان: پێشەوا سەید ئەحمەدی کوڕی عیرفانی شەهیدکراو لە ساڵی (١٢٤٦ ك) نەخشاندویەتی. ئەگەر مێژوی ژیانی ئەم پیاوە بخوێنینەوە کە لە پێناو بانگەوازی یەکخواناسی و سونەتی پێغەمبەر ﷺ و بەرپاکردنی جیهاددا هەزاران سەراو و دەراوی بینیوە؛ ئەو کات بۆت دەردەکەوێ کەچۆن هەزاران کەس لەسەر دەستی ئەو پیاوچاکەدا تۆبەیان کردوەو لە گوناح و تاوان و شرك وبیدعە خۆیان داشۆریوە و گەڕاونەتەوە، خەڵك وا گەڕابونەوە تەنانەت مەیخانەکان چۆل و هۆل ببون و وەك کاولگەیان لێ هاتبو، مزگەوتەکانیش جێ نەبو خەڵك لێیان دابنیشێ. خەڵك پێشبڕکێی بو و هەرکەس دەیویست خۆی میوانداری شێخ و شوێنکەوتوەکانی بکات کە بەسەدان کەس دەبون، بۆ دابینکردنی نانی ئەم میوانداریە باکیان بە پارەوپول و ماڵی گران و بەهادار نەبو و هەمویان هەرزان فرۆش دەکرد و خواردنیان پێ دەکڕی، جار هەبو میوانداریەکە تیروپشکی لەسەر دەکرا.

موسڵمانان پیاوەتی ومەردایەتی و سەربەرزی و لەخۆبوردەیی و میوانداریەکی هێند بەرێزو حورمەتیان لەناودا هەبو کە پاشان شتی وا پەیدا نەبۆتەوە. کاتێك سەیدی شەهید لە ساڵی (١٢٣٦ ك) بەرەو حەج بەرێ دەکەوێ، حەفسەد (٧٠٠) کەسیشی لەگەڵدا دەبێ، موسڵمانان لەهەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی ڕێگەدا میوانداریان دەکردن. لە (رائی بریلی)[1]یەوە تا (کەلکەتتە) بەسواری کەشتی بەرێکەوتن، کە لە ئیلاهئاباد دابەزین شێخ غولام عەلی میوانداری کردن و ماوەی (١٥) ڕۆژ خزمەتی کردن، لەم ماوەیەدا خەڵکی گوندو شارەکانیش ڕویان لەوێ دەکرد و لەسەر خوانە نایابەکەی شێخ دەبونە میوان، ئەمە وێڕای ئەو

---

(١) شوێنی لەدایکبونی سەید

هەمو بەرگ و تێشو و دیاریانەش کە پێیانی دەبەخشی. لەکاتی گەڕانەوەشدا کە کاروان لە (کەلکەتتە)وە بەرەو (رائی بریلی) دەگەڕایەوە و لە شاری مورشیدئاباد نزیك بویەوە دیوانی (غولام مورتەزا) میوانداری کردن و لە بازاڕیشدا جاڕی کێشا هەر کەسێك شتێك لەم کاروانە بکڕێ یان پیاوی پیشەزانیان لێ بەکرێ بگرێ خۆی نرخەکەی بۆ دەدا. شێخ لەم بارەوە لەگەڵی دوا کە ئەم ئەرکە قورسە نەخاتە سەر شانی خۆی، ئەویش گوتی جێگای شانازیە ئەگەر بتوانم خزمەتێك پێشکەش بە حاجیانی ماڵی خوا بکەم.

خەڵك لە ئاست هەقدا دڵنەرم و گەردەنکەچ بون، بۆ شەرعیش ملیان لە مو باریکتر بو، لەم سەفەرەی شێخدا سەدان هەزار موسڵمان شەرەفی تۆبە و بەیعەتیان پێبڕا، خەڵك لە هەمو سوچ و کەنارانەوە، لە لادێ و لە شارانەوە، لە دەشت و شاخانەوە پۆل پۆل رویان لە خێر و بەرەکەتی لای شێخ دەکرد، تەنانەت نەخۆشەکانی نەخۆشخانەی شاری (بنارس) بەدوای سەیدیان دا نارد و گوتیان: ئێمەی نەخۆش دیلی سەر جێگەین و ناتوانین تەختی نەخۆشخانە بەجێبێلین و ئامادە بین، جا ئەگەر سەید هەر بۆ یەك جاریش بێ تەشریفی بفەرموێ و سەردانمان بکات ئەوا تۆبەی لەسەر دەستدا دەکەین، سەیدیش وەڵامی دانەوە و سەردانی کردن و بەیعەتی لێ وەرگرتن.

سەید بۆ ماوەی دو مانگ لە شاری (کەلکەتتە)دا مایەوە، ژمارەی ئەو کەسانەی ڕۆژانە دەچون بەیعەتیان پێدەدا بە هەزار کەس مەزندە دەکرا، بەیعەتدانەکە تا نیوەی شەوی دەخایاند، خەڵك ئەوەندە زۆر ببون و سرڕە هێند قەرەباڵغ ببو نەدەکرا یەك بەیەك بەیعەتیان لێ وەربگرێ، بەڵکو حەفت هەشت مەندیلی ڕادەگرت و خەڵك دەستیان پێوە دەگرت و تۆبەیان لەسەر دەستی دەکرد و پەیمانی پەشیمانبونەوەیان لەگەڵ خوا دەبەست، سەید هەمو ڕۆژێ حەڤدە یان هەژدە جار بۆ ئەم کارە دادەنیشت.

هەروەها هەر لە شاری کەلکەتتەدا بۆ ماوەی پازدە یان بیست ڕۆژ وتاری بۆ خەڵکەکە فەرمو. لەم وتارانەدا نزیکەی دوهەزار زانا و شێخ و دەمڕاستی شاران ئامادە دەبون، ئەمە وێڕای خەڵکی ڕەمەکی. هاوەڵەکەشی: شێخ عبدالحي

بوڕهانەوی هەمو ڕۆژانی هەینی و سێشەم لەدوای نیوەڕۆوە تا عەسر ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، خەڵك لەبەر کاریگەری وتەکانی خۆی بۆ ڕادەگیرا و وەك پەپولە بەردەبونەوە، ڕۆژانەش (دە تا پازدە) پیاوی کافر دەبونە موسڵمان.

شاری کەلکەتتە کە یەکێکە لە شارە هەرە گەورەکانی هیندستان و مەڵبەندی ئینگلیزەکانیش بو؛ بەسای ئامۆژگاریەکان و گەڕانەوەی خەڵك بۆ ئاین و ملکەچبونیان بۆ شەرع؛ کڕین و فرۆشتنی عەرەق لە هەرمێن کەوت و بازاڕی نەما، مەیخانەکان چۆل و هۆل بون، عەرەقفرۆشەکان چیتر باجیان نەدایە حکومەت بەو بیانوەی بازاریان بڕاوە و بازرگانی عەرەق خێری نەماوە.

کاتێکیش سەیدی پێشەوا بانگەوازی جیهادی ڕابێرا، خەڵك لە هەمو چین و توێژێك بەوپەڕی حەماسەتەوە وەڵامیان دایەوە و وەدوای کەوتن، جوتیارەکان گاوگاسنیان بەجێ هێشت، بازرگانەکان دوکانەکانیان داخست، خەڵك لە خانوبەرەو زێدی خۆیان دەرچون و خۆیان گەیاندە کاروانی جیهادی ڕێی خوا. کەسیان بۆ ماڵ و حاڵی بە جێماویان نەگەڕانەوە، تا ئەو ڕۆژەی لە دۆڵی بالاکوت لە ساڵی (١٢٤٦ ك) لە پێناو خوا لە نێو سەنگەر شەهیدکران، دنیا نەیتوانی بیانبەزێنێ و لە دین وەریانگەڕێنێ، تەنها کەمێکیان ڕزگار بون و شەهید نەبون، ئەوانیش تا بەسەربەرزی سەریان نایەوە و بۆ لای خودا گەڕانەوە بێ وچان و هەسانەوە لە سەنگەری نێو شاخ و داخانی هیندستان جیهادیان بەرپاکرد و تێکۆشان.

لەگەڵ هەمو ئەوانەشدا ژیاری ئیسلامی لە هیندستان لە ئاوزینگی سەرەمەرگی دابو، حکومەتی ئیسلامی لە داڕوخان و هەرەس دابو، بەڵام خەڵك هێشتا گەردەنکەشێتی ئیسلامیانە و فیزودەماری ئاینییان لە ناودا مابو، بۆ لای خوا دەگەڕانەوە و تەنها لای خوایان پێ تەواو بو، هەر زو وەڵامی بانگخوازانی ڕێی خوایان دەدایەوە و بە بێنرخ لە ژیانی دنیایان دەڕوانی و هەرچی شتی بەهادار بو لە پێناو خوا دەیانهانی.

ئینگلیز پێگەی خۆی قایم کرد، ئەو سیستەمەی بۆ خوێندنی وڵاتیشی بڕیار دابو کە یەکێکە لە سەربازە هەرە بەکارەکانی-هەمو دەمێ بەروبومی بەرهەم

دێنا. بەرەبەرە هزر و ئارەزوی ئینگلیزان خشکەی کردە نێو خەڵك و کاری خۆی دەدی، خەڵکیش بێئەوی هەستی پێبکەن سیستەمی ژیان و هزریان سەرنخون دەبویەوە، خەڵك بۆ دین بێخەمتر دەبون و پشکۆی دڵان خامۆشتر دەبو و مەشخەڵی ژیانی ئاینی کزۆڵە دەبو، حەزو ئارەزو و مونافەسەی سروشتی-کە گەورەترین ئەنگێزەی پێشکەوتن و داهێنانە- ڕوی لە دین و روحانیەت وەرسوڕاند و بەرەو گوزەرانی دنیای ماددەپەرستی ئاراستە بو، هاندەری تێکۆشان بۆ دین و بۆ بوژاندنەوەی روح و دڵ کەم بونەوە، وێڕای ئەمەش هۆکاری ساردکەرەوە و تەوەززەڵی و دژایەتیکردنی دین گەلێك زۆر بون، رەوتی زیرەکایەتی و هەڵکەوتویی و بلیمەتی-کە پێشتر روەو ئاین بو- لە بوارە جیاوازەکانی دین و بەشەکانی زانستی دینی و روحی وەرچەرخا و بۆ ئەوە ئاراستە بو تا لە زانستەکانی گوزەران و بوارە جیاوازەکانی ژیان شتی نوێ دابهێنێ و بەرهەمی زۆر وەبەر بێنی.

بەڵام سەردەمی کۆچکردو هێشتا هەر هەوڵی دەدا نەمرێ و دواهەناسەکانی هەڵکێشێ و ژیانی بەبەردا بمێنێ، هێشتا لە نێو خەڵکیدا گەلێك پیاو مابون بانگەوازیان بۆ لای دین و پاکبونەوەی دڵ و دەرون و وەرگرتنی ڕەوشتی بەرز دەکرد، پیاوی خواناس و دنیانەویست و ئاخیرەتخواز بون، لەسەر ڕێوشوێنی چاکانی پێشان هەنگاویان هەڵدەگرت و، سوننەتپەروەر و خواپەرستی دور لە شرك بون، ئەم جۆرە پیاوانە هێشتا لە نێو خەڵکیدا مابون و بانگەوازیشیان بۆ ڕێی خوا دەکرد، موسڵمانەکانیش پێیان وابو ئەگەر لە بەر سێبەری ئەواندا بن واجبێکی ئاینییان جێبەجێ کردوە و ئەرکی ژیانیان ڕاپەڕاندوە. دەوڵەمەند و کاربەدەست و دنیاداری وا هەبون پتر لە خەڵك بایەخیان بە مەرگی ساڵحانە و کاری دواڕۆژ و دەرونپاکیتی دەدا، بەڵام ئەوانە وەك پرتەپرتی کۆتایی بەر لە کوژانەوەی یەکجاری مەشخەڵ وا بون، چونکە ڕەگی درختەکەی ئاین سیسەڵە ببو و ئاوی ژیانی لێ بڕابو و گەردەلولێکی ئاگرین تێی هەڵکردبو.

جا بەهۆی دەوروبەر و خوێندنی فەرەنگیانەوە[1] خەڵك گومـانی لـە نێوەنـدە دینیەکان و بنەماڵە ڕەسەنەکانی ئاین و زانست پەیدا کرد و متمانەیان بە خـوا و بـە سـیفەت و بەڵێنـەکانی لاواز بـو، باوکـەکان بـۆ دینـداری منداڵـەکانیان کەمتەرخەم بون و قوربانیان بە کات و وزەی خۆیان نەدەدا تا زانستی دینیان فێر بکەن، بەس سەرقاڵی ئەوەبون زانستەکانی گوزەران‌و زمانەکانی ئەوروپاییان پـێ ڕەوان بکەن. ئیتر کەس حـەزی لـە خوێنـدن و فێربـونی زانـستی بەسـود نـەما، خۆسازدان بۆ بەرگریکردن لە ئیسلام ئەنجام نەدەدرا، بەڵکو بە پێچەوانەوە خـەڵك خۆیان لە دین هەڵدەبوارد، لـە مەترسـیەکانی (موسـتەقبەل) دەترسـان، خـەمی ئەوەیان بو موستەقبەلی منداڵـەکانیان بـە فـیڕۆ نەچـێ، خۆیـان دابـوە دەسـت ڕۆژگاری سەقام نەگرتو، ترسی هەژاری باڵی وا بەسەردا کێشابون ئـۆقرەی لەبـەر هەڵگرتبون، ترسی مەرگی برسێتیش لە بەرگی مەرگی هەڵکێشابون.

## ماددیەتی سنور بەزێن و گەدەی فشۆڵ:

دەگێڕنەوە و دەڵێن کاتی خۆی ژنە شاعیری سـەردەمی نـەفامێتی (کەبـشەی کچی مەعد یەکریب) سەرکۆنەی عەمری برای دەکات و توانجی تێدەگرێ چـونکە لە پای خوێنی برا کوژراوەکەیدا پارەی وەرگرتبو، دەڵێ:

**ودع عنك عَمرأ إن عَمرأ مسالم وهل بطن عَمرو غير شبر لمطعم**

واتا: دەتوخوا لە عـەمر گەڕێن، عـەمر پیاوێکە ئاشتی دەوێ! نـازانم بـۆ پـارە وەردەگرێ خۆ ورگەکەی هەرچێی یەك بست خواردن دەگرێ!؟.

تەماشاکە ژنێکی سادەی نەفامیش پێی وانیـە ورگـی مـرۆڤ لـە یـەك بـست گەورەتر بێ، چۆن دەبـو ئەگـەر ئـەم ژنـە گـەدەی ئـەمڕۆی سـەدەی بیـستەمی بدیبایە؟!، کە هێند هەڵمساوە گۆی زەویـش لـە خـۆی دەگـرێ، هێنـد سـنوری بەزاندوە مەگەر بەخۆڵ تەژی ببێ. بەڵێ، گەدەی ژەمبـوردەی مرۆڤـی ئـەمڕۆ وا فشـۆڵ بوە کە بە بڕێك پارە تێر نابێ، خەڵکی ئالودەی وا پەیدا بون کە تاسـەیان

---

(١) فەرەنگی: غەربی.

دانامرکێ، تێنوی شێت و هاری وا دەرکەوتوە کە قەت تاساویان ناشکێ. هەر یەکەو دۆزەخێکی لە دڵ دایەو هەمیشە هەڵدەلوشێ و پێشی وایە هیچ شتێکی قوت نەداوە، وەهاوارانیش کەوتوە و دەڵێ هێشتا بابێ، هێشتا گەلێك شوێنم ماوە. شەیتانی بەرچاوتەنگی و چاوچنۆکی بەسەر تاك و نەتەوە زاڵ بوە و ئەوەندە چلێس‌و خوازەلۆك بونە دەڵێی جنۆکە دەستی لێوەشاندون. مرۆڤ وەك گێژەنی لێهاتوە، هەرچی هەبێ لولی دەدا و قوتی دەدا، قرمی لە گشت شتێ خۆش کردوە و گوێ بەحەرام و حەلاڵان نادا، هێشتاش هەر کەفوکوڵی هەڵدەکفێ و دانامرکێ. هەڵبەت ئۆباڵ بەملی ژیانی ئەمرۆ و سروشتەکەیەتی کە سەرلەبەری بۆتە ژینێکی ماددەپەرستانە و دور لە بڕوای ئاخیرەتی. بێگومان ئەگەر کەسێکیش خۆی بە دنیا هەڵواسی بێ و پێی وانەبێ جگە لەم ژینە ژیانی‌تر هەیە ئەوا ژینی دنیای لێ دەبێتە گەورەترین سەرمایە و مەبەست و ئامانج، تا پێی بکرێ هیچ دەرفەتێك لە دەست نادات و چێژ و خۆشی لێ وەردەگرێ و بەناز و نوز ڕادەبوێرێ، جا لەبەر چ خۆی لە خۆشی هەڵبوێرێ، بۆ کام جیهان دەست هەڵگرێ یان لەترسی چی نەوێرێ؟! خۆ بڕوای بە ژیانی دیکە و جیهانی‌تر نیە.

شاعیری گەنجی نەفامێتی (طەرفەی کوڕی ئەلعەبد) زۆر بەسادەیی و بە ڕاشکاوی تەعبیری لەم جۆرە دەرونەی نەفامێتی کردوە و دەڵێ:

**فان كنت لا تستطيع دفع منيتي فدعني أبادرها بما ملكت يدي**
**كريم يروي نفسه في حياته ستعلم إن متنا غداً أينا الصدي**

مرۆڤی شارستانی ئەمڕۆش —مەگەر ئەوانەی کەخوا بەسای بڕوا پاراستونی— هەمان ڕاو بۆچونیان هەیە و هەمان ڕێبازیان گرتۆتە بەر، بەڵام کاتێك کە جورئەت وەبەر خۆیان دەنێن و دەیانەوێ ڕوی ڕاستەقینەی خۆیان وەدەرخەن ڕەنگە زمانێکی ڕەوانبێژی وەك شاعیریان نەبێ ویژدانی خۆیانی پێ دەربڕن.

هۆی دوەم : بریتیە لەو ئەدەبە هاوچەرخەی-ئەدب بەمانا فراوانەکەی[١]- کە تەنها لە بارەی مادده و ماددەپەرستانەوە دەدوێ و هەمیشە لە ڕاژەی سەرمایەدار و خاوەن کارگەکان دایە و ملکەچی بەرژەوەندیەکانیانە، ملکەچیەکی ئەوتۆ کە هەرگیز شایەن بە ئەدەبی پاك و بەرز نیە، کە ورد ورد ژیانی ماددەپەرستان و سەرمایەداران دەنوسێتەوە و ناو و ناسناویان بە دێڕی ئەستور بلاّو دەکاتەوە، هەر هەناسەیەکی کە دەیدا ستایشێکە بە بەژن و بالاّی ئەواندا، کۆتایی گشت چیرۆك و ڕۆمانەکان ئەنجامێکی ماددیانە وەدەست دەدا و پاڵەوانێکی ماددەپەرست هەڵدەنێ، ڕێبازەکەی (ئەپیکۆرۆس) بۆ خوێنەران دەڕازێنێتەوە، جارێك بەئاماژە و جارێکیش بەڕاشکاوی. گەنجەکان هان دەدات ژیان لە ئامێز بگرن و بەناز و نۆش ڕاببوێرن، پەخشان و شیعر و چیرۆك و فەلسەفە و ڕۆمان و شرۆڤە و تیۆرامانەکانی لە خزمەتی ڕوحی ماددیەت دایە و پیاوی ماددەپەرست بە پیرۆز نیشان دەدات.

کۆمەڵگەش بەس ڕێز لە دەوڵەمەندی گرنگ دەگرێ، هەر چەندی بەدکار و چروك و بەدڕەوشتیش بێ چاوی زەقی لێ دەپۆشێ، مرۆڤێکیش هەر چەندی بەهرەدار و چاکەکارو مەردو ڕەند بێ تانەو تانوتی تێدەگرێ و ڕێز و سەنگی پێنابەخشێ. کۆمەڵگەیەك ئەگەر بەئاماژەو بەڕاشکاوی بڵێ: پیاوی هەژار شایستەی ژین نیە و وەك کەر و ئاژەڵ و ڕەفتاری لەگەڵدا بکات، بێگومان تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیە ئەگەر مرۆی شۆڕشگێڕ نەبن- دەبێ بە ناچاریەوە ملکەچ بن و بۆی ڕاکێشن و خۆیان تێدا بگونجێنن، دەبێ خۆیان بۆ بەرچاوی کۆمەڵگەکە نەك وەك حەزێکی زاتی بە کەشخە دەرخەن.

ئەم جۆرە کۆمەڵگەیە هەر ڕۆژەی بەجۆرە پێودانگێك پیاو بەمەردو ڕەند دەناسێنێ، هەر ڕۆژەی تەرازوێك بەکار دێنێ، هەر ڕۆژەی داخوازییەك دەخاتە ڕو. دەم لە دەم پتر تەنگ بە مرۆڤ هەڵدەچنێ و ناچاری دەکات پەنا وەبەر ڕێی ناڕاست ببات تا بتوانێ هەندێ پارە پەیدا بکات، دوچاری ڕەنج و تێکۆشانی لە

---

(١) واتا: تێڕوانین و بیروبۆچون دەربارەی ژیان و بنەوەر. -وەرگێڕ.

توانا بەدەری دەکات و خەم لەسەر خەمی بۆ دادەبارێنێ و باری گوزەرانی ئەستەمتر دەکا و رەشەبای رەش و رەشتری بۆهەڵ دەکا.

مونافەسەی کارگە و پیاوە بەرهەمهێن و پیشەسازەکانیش هەر بەیەك جار قورەکەیان خەستتر کردوە، هەمو بەیانیەك یەك لافاو بەرهەمی نوێ شار دادەگرێ، نوێترین ترومبێل و جگەرە و جلوبەرگ و کلاو و پێلاو و رۆن و بۆیە و شتی جوان و رازاوە و ئامێری سەیرسەیر بازارەکان سیخناخ دەکەن، هیچیشیان پێویستی زەروری و بنەمای پێویستی ژیان و ژیار نین و کەلێن پڕ ناکەنەوە، چونکە ژیان ئەگەر ئەم شتانەشی لەگەڵدا نەبێ هەر بەچاکی دەگوزەرێ، بەلاّم دیارە تەنها بۆ دەسبەسەرداگرتنی پیشەسازی و وەهەرمێن خستنی بازاری سەرمایەداران برەویان پێ دەدرێ.

لەبەر ئەم هۆیانەو چەندین هۆیتریش خەڵك نرخی پارە و پولی لەبەرچاو بەرز بۆتەوە و بایەخ و رێزێکی گەورەی بۆ دادەنێ و رۆڵێکی گرنگی پێ بەخشیوە، بەشێوەیەك نە پێشان و نە هیچ کاتێکیش لە مێژودا شتی وا نەبوە و روی نەداوە. پارە بۆتە روح و جەستەی مرۆڤایەتی، بۆتە گەورەترین هاندەری جولە و هەوڵی ژیاریانەی خەڵك، بۆتە تاکە ئەنگێزەیەك کە داهێنەران لە پێناو پارەدا شتی نوێ دادەهێنن، پیشەسازان لە پێناو پارەدا پیشەسازی تازە دەسازێنن، سیاسەتمەداران لەپێناو پارەدا وتارەکەیان دەنوسن، خۆ هەڵبژێران لە پێناو پارەدا خۆیان هەڵدەبژێرن، زاناکان لە پێناو پارەدا پەرتوکەکەیان دادەنێن، تەنانەت سەرکردەکانیش لە پێناو پارەدا لەشەڕ بەشدار دەبن، پارە وەك تەوەری لێهاتوە و بەرداشی ژیانی بەدەوردا دەگەرێ، ئوستاد (جۆد) کە مامۆستای فەلسەفە و دەرونناسییە لە زانکۆی لەندەن، دەڵێ: ((تیۆری بالآدەست و باو و بەربلاوی ئەم سەردەمە بریتیە لە تیۆری ئابوری، بەرك و زگ تەرازوی گشت شتێکن، شتێك تا پتر پەیوەندی بە بەرکەوە هەبێ و زێتر کاری تێبکات خەڵك زۆرتر روی تێدەکەن و بایەخی گەورەتری پێدەدەن)).

تۆ ئەگەر گەرەکت بێ سروشت و چەشەی سەردەمەکەت هەڵسەنگێنی، بەلاّم لە جەرگەی ژین نەژی و کەنارگیر بی و هەر تەنها چاو بە نوسین و نوسراوان

دابخشێنی و لە پەرتوکان شت وەخوێنی، بێگومان بەجۆرە خۆت دەخەڵەتێنی و خەیاڵ بە راستەقینە دەردێنی. چونکە کاتێك روپەڕەکانی پەرتوکەکانی فەلسەفە و نوسراوە زانستیە شیکارئامێزەکان هەڵدەدەیەوە خۆت لەسەردەمێکی وا دەبینیەوە کە خاوەن ژیارێکی پێشکەوتو بێ، ڕەوشت و خو تەرازو بێ، ئاسمان بەهەوری گەواڵ گەواڵی جوامێری و چاکەخوازی نەخشا بێ، زەویش ڕوحی ئاینداری و زانستخوازی داپۆشا بێ ، کەچی واقیع وانابێژێ. چونکە دڵنیابە ئەو نوسینەی وا لە ناخی پەڕتوکانە زادەی خەیاڵ و ئەندێشە و هەوەست و چەشەی نوسەرانە، کە جیهانێکی خەیاڵی هێند فانتازی دادەهێنن، هێند بەوەسفی جوان و لەبار دەیڕازێنن، هێند سەری سەرسامت دەسوڕمێنن پێت وابێ بەڵێ خۆی بێ! لەگەڵ ژیانی دەروبەری تۆی بێ! بەڵام ئاشکرایە کە هەوا و هەوەست هەر وابوە بۆ شتی خەیالاوی سەیر چوە.

بەڵام ئەگەر لە نێو جەرگەی ژین بژی و لەگەڵ خەڵك تێکەڵ ببی و بارو دۆخیان لێ وەتۆژی، گوێ بگریە قسەی نێو ماڵ و شەمەندەفەر و سەر بێستانان، لە کاتی نان خواردن و شەوچەرە گوێت بۆ باسوخواسان ڕادێرا؛ ئەو کات دەزانی ئەو دۆزەی کە بە شەو و ڕۆژ زمان و دەرونی پێ فێرە و لە مەجلیسان کوڕی نێرە، تەنها و تەنها پارە و زێڕە، هەر زێڕە لەناو گولان وەك کنێرە، هەر زێڕە ئیش بەدەست و کاریگێڕە.

شاعیرێکی عەرەبی لە دێڕە شیعرێکیدا نەفرەت لەو هەژارانە دەکا کە دید و هزری لە ورگ و بەرگ تێناپەڕێ و دەڵێ:

**لحا الله صُعلوكا مُناه وَهمُّه      من العيش ان يلقي لبوساً ومطعماً**

چۆن دەبو ئەگەر شاعیر ئەم ژیارەی بدیبایە؟! کە فەیلەسوف و سیاسەتمەدار و زانا و دانا و هەڵکەوتو و دەمڕاست و ڕیشسپی و دەوڵەمەند و هەژارەکانی، تێکڕا بۆ خۆراك و پۆشاك هەوڵ دەدەن، جا بەهەر ڕەنگ و ناوێکەوە بێ. چۆن دەبو ئەگەر ئەم ژیانەی بدیبایە کە سەرتاپای بۆتە تێکۆشان.. تێکۆشان بۆ بەرگ و نان؟!.

## داتە پینی خورەوشت و شپرزەبونی کۆمەڵگە :

بێگانەکان هاتن و ڕۆژهەڵاتی ئیسلامییان داگیر کرد و کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامییان دوچاری شپرزەیی و داڕوخانی خورەوشت کرد، پێشتریش نەخۆشیە ڕەوشتی و کۆمەڵایەتیەکانیان بۆ ناردبو کە هۆیەکی هەرەکاریگەر بو بۆ داڕوخانی وڵاتی ئیسلامی و تێکشکانی نەتەوە ڕۆژهەڵاتیەکان. بەڵام لەگەڵ ئەو داگیرکردنە و سەرجەم نەخۆشیەکانیشیدا کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی پەیڕەوی لە گەلێك ڕێبیری بەرزی خورەوشتی و چەندین تایبەتمەندێتی پایەداری کۆمەڵایەتی دەکرد کە لە ناو گەلاندا وێنەی نەبوە، هونەری خورەشت لە لای ڕۆژهەڵاتیەکان بە جۆرێك پێگەیشتبو و گەیشتبوە وردەکاری و ناسکیەکی ئەوتۆ و لوتکەی وا بەرزی بڕیبو؛ کە زیهنی ئەم سەردەمە ناتوانێ بگاتە ئەو ئاستە و پیاوی ڕۆژئاوایی ناتوانێ تەسەووری بکات مەگەر لە شیعر و ئەدەبدا.

پیاو ڕوداو و سەربردەی وا لە بارەی سەروساخت و پەیوەندی نێوان ئەندامەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی و تاکەکانی خێزاندا دەخوێنتەوە، کە بەجۆرێك بە هەناوی کۆمەڵگەدا پەلوپۆی هاوێشتوە و نەوە بۆنەوە و پشت بۆ پشتی خایاندوە و لە گشت بەرژەوەندی و قازانجێکی ماددی خاڵی بوە؛ کە کوڕانی ئەم سەردەمە ناتوانن تەسەووری بکەن. لە بارەی زۆر بابەتدا وەك: سۆزی باوك بۆ کوڕ و چاکەی کوڕ بۆ باوك، ڕێزی بچوك بۆ گەورە و میهری گەورە بۆ بچوك، داوێنپاکی و ئەمەکداری ئافرەتان بۆ مێردەکانیان، دەستپاکی و وەفای خزمەتکار و نۆکەران، سەقام و خۆڕاگری لاوان لە سەر خورەوشت، ڕەفتاری دەمڕاستان لەگەڵ خەڵك، پاراستنی نوێژ و سوننەتەکان، ڕێزگرتنی باو و نەریتان، ڕاستاڵی لە بەرگ و دروشم و خزمایەتیدا، بەهاناوەچونی برادەران و ئامۆژگاری کردنیان، شتی وا دەبیستی و دەخوێنیەوە خەریك دەبێ بڕوانەکەی.

چاکە و گوێڕایەڵی کوڕ بۆ باوك گەیشتبوە ئەوپەڕی لەخۆبوردەیی و کوڕ لە حزوری باوکیدا لە شەرمان دەتوایەوە. ئەم جۆرە هەڵوێستە لەم فەرمودەیەی

پێغەمبەرﷺ وەدەردەکەوێ کە دەفەرموێ: ((أنتَ ومَالُكَ لوالدِك : خۆت و ماڵت موڵکی باوکتن ))[١].

کوڕ چاکە و ڕێز و خۆشەویستی نەك هەر بۆ باوك و دایکی دەردەبڕی بەڵکو کە دەشمرن هەمان هەڵوێستی بۆ برادەر و کوڕ و خزم و کەسی برادەرەکانیشیان هەبو و یارمەتی دەدان و دیارییانی پێدەبەخشین. ئەمەش وەك جێبەجێکردنێك بۆ فەرمودکەی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ: ((ان من أبرّ البرِّ صلة الرّجل بأهل ودّ أبيه بعد أن يولّي: یەکێك لە چاکە هەرەچاکەکان ئەوەیە؛ کەسێك ئەگەر کە باوکی ماڵئاوایی لە دنیا کرد ئەوا چاکە و خۆشەویستی بۆ برادەرانی دەربڕێ ))[٢]. لە بەرامبەردا، دایك و باوکیش ئەوپەڕی دڵسۆزی و خۆشەویستیان بۆ کوڕەکانیان دەنواند و لە پێناو پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان قوربانیان بە گشت هەوەست و ئارەزو و ڕاحەت و چێژی دایك و باوکایەتی دەدا و لەم پێناوەدا -تەنانەت پیاو و ئافرەتی نەخوێندەواریش- چاوپۆشیان لە ڕەفتاری ڕەق و توند و تیژی مامۆستای کوڕەکانیان دەکرد کە جار بوە زیانی جەستەییشیان پێگەیاندون، لە پێناو پێگەیاندنی منداڵەکانیان تاڵیەکی زۆریان دەچەشت و ئارامیان لەسەر خەم و خەفەتان دەگرت. لە پیاوی نەجیمزادە و بەناوبانگەوە بگرە تا توێژی هەرە خوارەوەی کۆمەڵگە گشتیان بەم چەشنە ڕەفتاریان دەکردو ئەگەر پیاوێکیش سەرپێچی بکردایە بە چروك و مەندەبۆریان دەدایە قەڵەم. ئەم هەڵوێستەی (هارون الرشید)یش شتێکی بەناوبانگە لە مێژودا کە ئامۆژگاری هەردو کوڕەکەی (ئەمین و مەئمون)ی کردوە کە خزمەتی (ئەلکەسائی)ی مامۆستایان بکەن.

یەکێك لەو ڕوداوە سەیرو سەمەرانەی کە سروشتی پیاوی ڕۆژهەڵاتی پیشان دەدا ئەوەیە کە دەگێڕنەوە: (تاجەددین ئەڵدز)ی فەرماندەی ئەفغانستانی دوای (سلطان شهاب الدين الغوري)، کوڕەکەی لەلای مامۆستایەکدا دەکاتە قوتابی. ڕۆژێکیان مامۆستاکە زۆری لێدەدا و دەمرێ. جا کە هەواڵ دەگاتە تاجەددین،

---

(١) رواه أبو داود عن عمر بن شعيب عن أبيه عن جده مرفوعاً .

(٢) رواه مسلم عن ابن عمر رضي الله عنه .

بە مامۆستاکە دەڵێ: تا زوە خۆت ڕزگار کە چونکە ناتوانم لە دایکی کوڕە لێت ئەمین بم ڕەنگە زەبرێکت لێ بوەشێنێ.

پەیوەندی نێوان گەورە و بچوک لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بە گوێرەی ئامۆژەکانی شەرع دامەزرابو کە دەفەرموێ: ((**مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صغيرنا ويعرف حقّ كبيرنا فليس منّا**: ئەو کەسەی ڕەحم بە بچوکان نەکات و ڕێز لە گەوران نەنێ لە ئێمە نیە))[٣].

یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانی تری ژیاری ڕۆژهەلاتی؛ ڕاستاڵی و یەك ڕەنگ بون و یەك هەڵوێست نواندنە، ئەگەر یەکێك بە چ هەڵوێستێك دەگەڵ کارێك تێکەڵ بوایە تا کۆتایی هەر هەمان هەڵوێستی دەبو، ئەگەر پابەندی نەریتێك یان جۆرە پۆشاکێك بوایە یان بە جۆرێك مامەڵەی دەگەڵ یەکێك بکردایە هەتا مردن دەیبردە سەر و روداو و وەرز و نەساغی و تەمبەڵی و بەرژەوەندی کاری تێنەدەکرد.

دەمڕاستی و گەورەیی لە ژیانی خێزان و هۆزایەتیدا بە زۆری پارە و پول نەبو. خێزان هەبوە ئاستی داراییان لە نێودا جیاواز بوە، هۆز و عەشیرەت هەبوە پیاوەکانیان لە پارە و پشتدا گەلێك جیاوازییان لەگەڵ یەکتردا هەبوە. دەوڵەمەند و پارەدار و دەستکورت و هەژاریشیان تێدا بوە، بەلاّم لەڕەوشی خێزان و بنەماڵە و کۆمەڵگەدا کەس نەیتوانیوە بە هۆی ئابوریەوە لاف و گەزاف لەسەر کەس لێبدات. ئەگەر یەکێك هەستی بەجیاوازی و ریسوا بون بکردایە وەك شێر دەینەڕاند یان ئەگەر میواندارێك لەگەڵ یەك لە میوانەکانی بێڕێزیەکی بنواندایە گشتیان پێکڕا دەتۆران و هاموشۆیان لەگەڵ بنەماڵەی میواندارەکە دەبڕی. هەمویان لەگەڵ برای مافخوراویان یەك دەست و یەك دەنگ بون.

هەژاری ڕوت و ڕەجاڵ لە نێو هۆزەکەیدا زۆر بە جورئەتەوە روبەڕوی دەوڵەمەند و دەمڕاستانی هەمان هۆز دەبویەوە، ئەویش خۆی پێ پیاو بو و خاوەن ڕێز و شکۆی خۆی بو، بە هۆی هەژاریەوە هەستی بەکەموکورتی نەدەکرد،

---

(٣) رواه ابوداود عن عبدالله بن عمر .

بەڵکو شوێنێکی شایەن بە خۆیان پێ دەبەخشی، بێئەوی لە شێوە شڕۆڵ و بەرگە شڕوشیتاڵەکەی بڕوانن.

لەبەر باری ناڵەباری ئابوری پیاوی باش وچاك وپاك و زانا و دینداریان بەکەم نەدەگرت. هەژاریش گەلێك دەیکرد و دەکۆشا تا نەبونی و دەستکورتیەکەی لە خەڵك بشارێتەوە و خۆی بەزەبون پیشان نەدەدا و بەرگەی دەگرت، زۆریشی پێ ناخۆش بو ئەگەر یەکێك بە هەژاریەکەی بزانیبا.

خەڵك (ویژدانی) زندو بو، وەك دین و ناموس ڕێزی دەگرت، بە هیچ نرخێك نەیدەفرۆشت و دەسبەرداری نەدەبو، پیاو هەبو مەرگی خوێناوی هەڵدەبژارد نەك درۆ و گزیکاریەك لە مردنی ڕزگار بکات.

مێژوی هیندستان لەم بارەوە گەلێك ڕوداوی سەیرو ناوازەمان بۆدەگێڕێتەوە کە هەڵبەت لە مێژوی سەرجەم وڵاتە ئیسلامیەکاندا نمونەی وا گەلێ زۆرن، یەك لەو رودانە ئەوە بو: شێخ (رضی‌الله البداونی) بەوە تۆمەتبار کرا کە لە شۆڕشی ساڵی (١٨٥٧) زاینی دژ بە ئینگلیز بەشدار بوە. لەبەردەم حاکمێکی ئینگلیزدا دادگایی کرا، حاکم لەڕێی چەند برادەرێکی خۆیەوە گوتی پێی بڵێن با تۆمەتەکان رەت کاتەوە ئازادی دەکەم. بەڵام شێخ ڕازی نەبو و گوتی: من کە بەشداریم کردبێ چۆن دەتوانم ئینکاری بکەم؟ حاکمیش ناچار حوکمی ئیعدامی بۆ دەرکرد. کە شێخیان بەرەو پەتی سێدارە دەبرد حاکم گریاو گوتی: ئێستاکەش ئەگەر تەنها یەکجار بڵێی: تۆمەتەکە درۆیە و بێسوچم، هەوڵ دەدەم رزگارت بکەم. شێخ توڕە بو و گوتی: دەتەوێ درۆ لەسەر خۆم بکەم و کردەوەکانم بەهەدەر دەم؟ ئەگەر وابڵێم کەواتە کردەوەکەم پوچەڵ دەکەمەوە، بەڵێ بەشداریم لە شۆڕشدا کردوە و چش دەکەن بیکەن. پاشان شێخ لە سێدارە درا!!.

نەك بڵێی تەنها لەگەڵ خودا ڕاستگۆ و دەمپاك بو بن، بەڵکو دەگەڵ گەل و نەتەوەشدا ڕاست بون، ڕەگەزپەرستی و نیشتمانپەرستی و زەبر و زۆری نەتەوایەتیان نەدەناسی کە ئەمڕۆ بوّتە ئەرکێکی رەگەزی و نیشتیمانی. پێیان وابو درۆ و گەواهیدانی بەدرۆ لەپێناو نەتەوە بێ یان نیشتیمان و گەل؛ بێمروەتی و گوناحێکی گەورەیە. پێیان وابو حوکمەکانی شەرع تاك و نەتەوەو کاروباری

تاکەکەسی و کۆمەڵی دەگرێتەوە و دەستیان توند بە فەرمودەکانی خواوە گرتبو کە دەفەرموێ: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوْ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ: بڕواداران! دادگەرانە گەواهی بدەن ئەگەرچی لەسەر خۆ و باوك و خزمانیش بێت. ﴾النساء:١٣٥.

﴿ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ: خراپەی کەسانێك واتان لێ نەکات تاوانکار بن و دادگەر نەبن، دادگەر بن، دادگەری لە تەقواوە نزیکە، لە خوا بترسن. ﴾المائدة:٨.

﴿ وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ: ئەگەر لەنێو خەڵکدا حوکمتان کرد، حوکمێکی دادگەرانە بکەن. ﴾النساء:٥٨.

﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى: ئەگەر گەواهیتان دا بەڕاست بیدەن با لەسەر خزمانیشتان بێ﴾الأنعام:١٥٢.

ڕوداوێکیتر کە پیرەکان بۆمان دەگێڕنەوە، دەڵێن: جارێکیان لەسەر پارچە زەویەك لە گوندی (کاندیهلە)ی سەر بە بەڕێوەبەرایەتی (مظفر نکر) لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی هیندستان کێشەیەك لە نێوان موسڵمانەکان و هیندۆسەکان پەیدا بو، هیندۆسەکان دەیانگوت پێشان پارچە زەویەکە پەرستگایەکی ئێمە بوە و موسڵمانەکانیش دەیانگوت مزگەوتێکی ئێمە بوە. دادگایان بردە بەردەستی حاکمی ئینگلیزی شار. حاکم لە کێشەکەی کۆڵیەوە و لە بەڵگەی هەردو لای ڕوانی، نەگەیشتە ئەنجام، لە هیندۆسەکانی پرسی: لەو گوندەدا هیچ موسڵمانێك هەیە متمانە بە ڕاستگۆیی و دەمپاکیەکەی بکەن تا ڕای ئەوی تێدا وەرگرم؟ گوتیان بەڵێ فلانە ئیختیار هەیە کە زانایەکی زۆر موسڵمان و پیاوێکی زۆر چاکە. حاکم بە دوایدا نارد تا بێتە دادگا. کە شاندی حاکم چونە لای پێی گوتن: سوێندم خواردوە هەتا مابم نابێ دەموچاوی فەرەنگیەك ببینم شاندەکە گەڕایەوە و باسوخواسیان بۆ حاکم گێڕایەوە، حاکمیش گوتی: قەیناکە بەڵام بابێت ڕای خۆی لە بارەی کێشەکە بدات. شێخ ئامادە بو و پشتی لە حاکم کرد و گوتی: لەم کێشەیەدا هەق بەلای هیندۆسەکان دایە و پارچە زەویەکە هی ئەوانە. حاکمیش

بەگوێرەی ڕای شێخی بڕیار دا و موسڵمانەکان کێشەکەیان دۆڕاند، بەڵام دڵی هیندۆسەکانیان بردەوە و کۆمەڵە هیندۆسیەك بونە موسڵمان.

هەروەها خەڵك زانستیان لە لادا پیرۆز بو و پێیان وابو ئەمانەتێکە و خوا پێی ڕاسپاردون، وەك کەلوپەلی بازاڕان نەیاندەفرۆشت و یارمەتی گوناحکار و ستەمکارانیان پێنەدەدا گوناح و ستەمی پێبکەن، ڕازیش نەبون سیستەمێکی زۆردار یان حکومەتێکی نائیسلامی پشتیان پێ ببەستن.

پیاوی جێباوەڕ بۆی گێڕاوینەوە و لە مێژوشدا خوێندومانەتەوە کە شێخ عبدالرحیم الرامبوری (١٢٣٤ ك مردوە) لە شاری ڕامبور دەرسی بە خەڵك دەدا لە پای ئەوەدا مانگانە موچەیەکی کەمی لە میرنشینە ئیسلامیەکە وەردەگرت کە نەدەگەیشتە (دە) ڕوپیە (واتا کەمتر لە یەك جونیهی میسری). حاکمی ئینگلیزی ولایەتەکە: مستەر هاکنس داوای لێکرد بچێتە کۆلێژی بریلی و موچەیەکی ٢٥٠ روپیەشی بۆ دەبڕێتەوە (واتا نۆزدە جونەیهی میسری) کە دەکاتە پەنجا جونەیهی ئەم سەردەمە. بەڵێنیشی پێدا دوای ماوەیەکی کەم بۆی زیاتریش بکات، شێخیش ڕازی نەبو و عوزری بۆ هێنایەوە و گوتی: من لێرەدا دە روپیە وەردەگرم ئەگەر ئەم پیشەیە بەجێ بێلم لێم دەبڕێ. حاکمی ئینگلیز سەرسام بو و گوتی قەت شتی وەك ئەمڕۆم نەدیوە! من موچەیەکی چەندین جار پتر لەو موچەیەت دەدەمێ کەچی ڕازی نابی!! شێخ عوزرێکی تری بۆ هێنایەوە گوتی: لەماڵەوە دارمۆزێکم ڕواندوە زۆر تامەزرۆی بەروبومەکەیم، ئەگەر بچمە بریلی لێی بێبەش دەبم. حاکمی ئینگلیز دیار بو هێشتا لە مەبەستی شێخ نەگەیشتبو. گوتی من گرێنتیت دەدەمێ بەروبومەکەت لە ڕامبورەوە بۆ بگاتە بریلی. شێخ بۆ جاری سێیەم عوزری هێنایەوە و گوتی من لەو شارەدا چەندین فێرخواز و قوتابی هەن دەرسم لەلادا دەخوێنن، جا ئەگەر لێرە بڕۆم دەرسەکانیان دەپچڕێ. حاکمی ئینگلیز لە گفتوگۆکەیدا بێهومێد نەبو و گوتی: من هەمو ئاسانکاریەکیان بۆ دەڕەخسێنم تا لە بریلی دەرسی خۆیان بخوێنن. ئیتر شێخ دوایین تیری خۆی هاوێشت و نیشانەی پێکا و گوتی: باشە ئەگەر سبەینی خوا لێی پرسیم: چۆن کرێت لەسەر زانست وەرگرتوە چ وەڵامێك بدەمەوە؟ حاکمی

ئینگلیز قسەی بڕا و دەمکوت بو و نەفسیەتی شێخی زانای موسڵمانی بۆ ڕون بویەوە. پاشان شێخ تا مرد هەمو مانگێ هەر لە یەك جونەیهی کەمتر وەردەگرت. دە فەرمو ئەو روحە بەرز و نەفسە گەورەیە کە قبول ناکات زانست وەك کەلوپەل بفرۆشێ و ڕێگە نادات بیروباوەڕ و ڕێز بۆ پارە و دەستکەوتێك لە دەست بدات، دەگەڵ ئەو چروکی و هیچوپوچیەی زانا و هۆشمەند و پیشەسازانی ئەمڕۆ بەراورد بکە، کە زۆربەی هەرە زۆریان زانست و ئاوەزی خۆیان وەك کەلوپەلی بازاڕان ڕانواندوە و بە مەزادێکی ئاشکرا ڕایدەگەیەنن کێ نرخی زیاتریان بداتێ پێی دەفرۆشن، کە بیروباوەڕ و مەبەست و ئامانجیان لەلادا گرنگ نیە و کارەکە لەگەڵ چەشە و مگێزیان بگونجێ یان نا مەسەلەیەك نیە، گرنگ ئەو نرخەیە کە پێی دەدرێ.

ڕۆژانە چەندین خەندەگریەی لەم شێوەیە دەبینین، ئەوەتانێ مامۆستایەك دوێنێکە لە پەیمانگەیەکی ئیسلامی وانەی زانستە ئیسلامیەکان و مێژوی ئیسلامی گوتۆتەوە، کەچی ئەمڕۆ لەبەر موچەیەکی پێنج جونەیهی زیاتر چوەتە کۆلێژێکی کاتۆلیکی و وانەی تێدا دەڵێتەوە!، سەیدا فلان پێشتر لە وەزارەتی پەروەردە بو، گەنجێکی ڕۆشنبیر و زانا بو، ئاواتی لێوەکۆڵین و خوێندن بو، نوسینی زانستی لە گۆڤارە پێشەکوتوەکان بلاّودەکردەوە، کەچی لوت وبزوت چوەتە وەرشەی فرۆکەخانەیەك یان چۆتە ئێزگەیەك و بۆتە کارمەند!، کە لێی دەپرسین: چبو چ وای لێکردی ڕێباز و ڕەوتی ژیانت بگۆڕی؟ دەڵێ: چونکە لەوێدا (دە) جونەیهی پتر وەدەگرم !. فیسارە خانمی باسناس کە مەقالەی لەبارەی تەسەووفی ئیسلامیەوە دەنوسی و لەلای زانایاندا پلەو ڕێزێکی زۆری پەیدا کردبو، کەچی پاشان لەبەر چەند جونەیهێکی زیاتر بۆتە فەرمانبەرێکی وەزارەتی دەرەوە یان بۆتە وەرگێڕی وڵاتێکی ئەوروپایی!. ئایا ئەم هەڵوێستە نەساز و نەشیاوانە لەبەر ئەوە نیە کە قازانجی دارایی بۆتە هەمو شتێك؟!، لەبەر ئەوە نیە کە زێڕی بریقەدار بۆتە تاکە کارگێڕی ژیان و تاکە کۆنترۆڵی روح و ئاوەزان؟!.

لە مێژوی ئیسلامیدا دەخوێنینەوە کە (ئەلمەنسور)ی خەلیفەی بەناوبانگی عەبباسی لە مەجلیسێکدا داوا لە (ئیبن تاوس) دەکات کە مەرەکەبدانەکەی

بداتێ تا شتێکی پێ بنوسێ، ئەویش نایداتێ. خەلیفە لێی دەپرسێ بۆ وێم نادەی و فەرمانی خەلیفەی موسڵمانان جێبەجێ ناکەی؟ دەڵێ: لەوە دەترسم بێشەرعیەکی پێ بنوسی و لە یارمەتیدانی گوناح و دەستدرێژیدا بەژدار بم !!.

بەڵێ بەم ڕەنگە دەستیان بە فەرمانی خواوە گرتبو کە دەفەرموێ: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ: لەسەر چاکە و لە خواترسی هاریکاری یەکتر بکەن نەك لەسەر گوناح و دەستدرێژی﴾المائدة: ٢.

ئەو بابەتە روداوانەی کە زانایان رازی نەبونە لە رژێمێکی گەندەڵ و خراپدا ببنە قازی؛ هێند زۆر و جۆراوجۆرن تەنانەت گەیشتۆتە پلەی تەواتورەوە.

دە فەرمو ئەو هەڵوێستە مەرد و جوانانە کە هاریکاری گوناح و دەستدرێژیان نەکردوە و بەهیچ جۆرێك بەشدارییان لە ڕژێمێکی ناتەواودا نەکردوە بچوکترین یارمەتیشیان پێشکەش نەکردوە ئەگەر خزمەتی ئامانجێکی دژ بە بەرژەوەندی نەتەوەی ئیسلامی کردبێ یان زەرەر و زیانی پێگەیاندبێ یان شەڕوگەڕ و گزی نەتەوەی تێدا بوبێ، دەگەڵ هەڵوێستی ئەو موسڵمانانەی ئەمرۆی بەراورد بکە کە یارمەتی و هاریکاری پێشکەش بە وڵاتانی ئەوروپایی دەکەن و بەهرە و زیرەکی و خامەی ڕەنگین و زمانی پاراوی خۆیان لە پێناو دەست و پێوەند و سود و بەرژەوەندی بێگانان دەخەنە کار و بە ڕاژە[1] و واژەی هەمەجۆرەوە دڵیان خۆش دەکەن.

بەدەیان و سەدان گەنج و نوسەری دەستڕەنگینی موسڵمان هەن لە دام و دەزگاکانی دەرکردنی گۆڤار و ڕۆژنامە بیانیەکاندا کار دەکەن کە هەر لە ڕێی بەهرە و توانستی موسڵمانانەوە پڕوپاگەندەکان لە وڵاتی موسڵمانان بڵاودەکەنەوە و حەقیقەت چەواشە دەکەن و کار لە ئارەزو و دەرونی خەڵك دەکەن.

چەندین کۆمەڵی پایەدار و نەجیمزادەش هەن کە لە نەژادێکی رەسەنی موسڵمانان و لە بنەماڵەیەکی ئیسلامپەروەری شکۆدارن.. کە باب و باپیرانیان لە پێناو سەرخستنی هەق و شکاندنی ناهەق تێکۆشاون و پیاوی وایان تێدا

---

(١) راژە: خزمەت.

هەڵکەوتوە مێژوی پڕ سەروەرییان تۆمار کردوە و کاری گەورە و گرنگیان ئەنجام داوە.. کە خوێنی ئەو کەڵەپیاوانەیان لە جەستە دایە و ئەدگاری ئەو قارەمانانەیان لە ڕەنگ و ڕو دەدرەوشێتەوە؛ کەچی ئەمڕۆ وا لە حکومەتە بێگانەکاندا کاردەکەن و بە زمانی پاك و پاراویان کە قورئانی پیرۆزی پێ دابەزیوە، کە شاندی موسڵمانەکان لە دیوەخانی فارس و ڕۆم پەیامی خۆیان پێ پەیڤیوە[1]، کە بانگەوازی ئیسلامیان پێ دەربڕیوە و دڵی دوژمنانیان پێ بڕیوە، کە سەرکردە ئیسلامیەکان دەنگی جیهادیان پێ هەڵبڕیوە و چەندین داستان و دیمەنی فیداکارانەی پێ ڕاپەڕیوە. ئەو زمانە هەقپەروەر و جیهادئامێز و ڕەوانبێژ و نایابەیان بۆ ڕاژەی حکوماتی بێگانە دابڕیوە، کە وەك یاریزان و تۆپی پێ و وەك منداڵ و بوکۆکە یاری بە موسڵمانان دەکەن و سیاسەت و سەربەخۆیی و بڕوا و ئاوەز و ئابوریان لە دەست داون و بەدەیان پلان و کەین و بەینیشیان بۆ هەڵچنیون.

کەچی کە گوێبیستی هاشوهوشی ئەو حکومەتە بەدفەڕانەش دەبین گوایا لە پێناو ئیسلامەتیدا تێدەکۆشن، بۆ نمونە دەڵێن: (ئێمە روناکی پڕشنگداری ئازادین لە جیهانێك کە باڵی تاریکە شەوی ئەنگوستەچاوی بەسەردا کشاوە)، (بەو خزمەتە زۆر و یارمەتیە مەزنەی ئێزگەی بەریتانیا پێشکەشی دەکات و، بەو کردوکۆشەی کە ڕۆشنبیری ئیسلامی بلاّو دەکاتەوە و مێژوی گەشاوە و ژیاری پێشکەوتوی ئیسلامی بە موسڵمانان دەناسێنی و جیهانی عەرەبی لە ڕوداوان وەخەبەر دێنێ و هەواڵ و دەنگوباسان بە ڕاست و پاکی و وەکو خۆی ڕادەگەیەنێ؛ جیهانی عەرەبی ڕادەپەڕێ و هزر و ڕۆشنبیری و پەیوەندی نێوانیان یەکانگیر و پتەو دەبێ)[1]. گەلێك شڕموبڕم و هاشوهوشی ترمان گوێ لێدەبێ وەکو ئەوەی گوایە ئەو حکومەتانە بڕوایان بە دیموکراتیەتی ڕاست و دروست هەیە و لە پێناو ئاسایشی گشتی و ئاشتی جیهانی و ئازادی گەلانی مافخوراو و چەوساوە و بۆ بەرزکردنەوەی ئالاّی دادگەری و یەکسانی و ستاندنی مافی ستەمدیدان و

---

(١) پەیڤین: قسەکردن.

(١) ئەو قسانەی لە ناو دو کەوانە دان وەك بیستومانە نوسیومانە .

دامەزراندنی هەق و ڕەوا تێدەکۆشن... جا ئەو کەسانەی کە لە پێناو دەستکەوتی ماددیدا لەم دامودەزگایانە کار دەکەن ئەگەر بزانن قسەکانیان دژ بە ویژدانی خۆیانە و پێچەوانەی بەرژەوەندی نیشتیمانی بابو باپیرانە، بەڕاستی ئەمە داڕوخانە، داڕوخانی دەرونی شکۆدارە ..هەڕاجە، هەڕاجی شتی بەهادارە ..فەوتانە، فەوتانی وتەی جوان و واتادارە.. قوڕبەسەربونە، قوڕبەسەربونی زمانی شیرین و جوانکارە. خۆ ئەگەر بە بیروباوەڕ و تێگەیشتن و زانینەوەش بێ؛ نەناسینە، نەناسینی ڕاستەقینەی پڕشنگدارە ..سەرسەختیە، سەرسەختی لە واقیعی بەرچاو و دیارە ..مردنە، مردنی دڵی بێدار و هۆشیارە.

ئەم سەردەمە سەردەمی لێکدژبون و نەسازیە، دەبینی ئەدیبێك یان ڕۆژنامەنوسێك ئەمڕۆ ژیننامەیەك لە بارەی پاڵەوانێك یان تازەخوازێکی ئیسلامی دەنوسێ و لەسەر ئەم ڕێبازە بەردەوامە و مەرەکەبی خامەکەی وشك ناکات، کەچی بۆ بەیانی لە پێناو بەرژەوەندیەکی سیاسی و چەند دەستکەوتێکی ماددیدا نوکی قەڵەمەکەی کۆڵ دەکات و بە شان وباڵی ناپاك و گزیکارێکی دژ بە نەتەوە هەڵدەڵێ یان کردەوەی بێگانە و داگیرکەران ستایش دەکا و بەرەو تەسقی ئاسمانی هەڵدەنێ. پێشی وانیە کارێکی لێکدژ و درۆنگی ڕانوندبێ!.

جارێکیان یەك لە پاشایانی عەرەب داوای لە شاعیرێك کرد کە ئەسپەکەی پێ بفرۆشێ، شاعیرەکەش تەوازۆی خواست و گوتی بە هیچ نرخێك نایفرۆشم، ئەو دێڕە شیعرەشی گوت:

**ابیتَ اللعنَ إنَ سكان علق          نفيسٌ لا تعار ولا تباع**

بەڵام ئەو کەسانەی لەگەڵ حکومەتە بێگانەکاندا یان لەگەڵ حکومەتە بەناو نیشتمانیە ستەمکارەکان کار دەکەن کە هەردەم بۆ ڕیسواکردن و ڕوڕەشکردنی موسڵمانان هەوڵ دەدەن، یان لە ئێزگەکانی دژ بە ئیسلام و موسڵمانان دادەمەزرێن یان لە ڕۆژنامە دەنوسن و پەرتوك و نامیلکان دەردەکەن، هەموش لە پێناو بڕێ پارەی دەستخۆشانەو بڕینەوەی چەند موچەیەکی مانگانە..ئەوانە وەك بڵێی ویژدانیان لە ئەسپەکەی سەردەمی نەفامیش بێنرختر و هەرزانتر بێ

بۆیە ئەو نەیدەفرۆشت و بە کرێی نەدەدا، بەڵام ئەوان دەیفرۆشن و بە کرێی دەدەن!.

سەروساخت و پەیوەندیەکانی ڕۆژهەلات-زۆربەی هەرە زۆری- لەسەر بنچینەی نا ماددی یان ئاوەزی یان روحی و ویژدانی بو. خۆویستی و خۆپەرستی بەشێکی کەمی هەرە کەمی هەبو. ئەم جۆرە پەیوەندیە ئەنجامی وای لێدەکەوتەوە کە قەت نەکرێ بە دیدێکی ماددی یان بە دیدێکی بەرژەوەندیانە لێکبدرێتەوە. پەیوەندیەکان پەلوپۆیان بەهەناوی کۆمەڵگەدا هاوێشتبو. یەك لەوانە پەیوەندی قوتابی لەگەڵ مامۆستاکەی، کە گەیشتبوە پلەیەکی هێند بەرزی دڵسۆزی؛ مێژو پێشتر شتی وای بەخۆوە نەدیبو لەم سەردەمەشدا تەنانەت پەیوەندی و خۆشەویستی کوڕ و باوکیش بەم چەشنە نیە.

جارێکیان دەنگوباس بلاوبۆوە گوتیان ئوستادی بەناوبانگ و زانای فرەزان (نظام الدين اللكهنوي) -١١٦١ ك مردوە- کە دانەری سیستەمی خوێندنی ئێستای هندستان و خوراسانە؛ مردوە، کە هەواڵی مردن بە (سەید کمال الدين العظيم آبادي) گەیشت کە یەکێك بو لە قوتابیەکانی لە خەم و خەفەتان بەزگی دا و مرد، قوتابیەکی دیکەی (ظريف العظيم آبادي) ئەوەندە گریا چاوەکانی کوێر بون. پاشان دەرکەوت هەواڵەکە راست نەبوە[1]. رەنگە زەینی ئەم سەردەمە روداوی وا بڕوا نەکات، بەڵام ئەوەی سروشتی رۆژهەلات بناسێ و بزانێ پەیوەندی و خۆشەویستی قوتابی بە مامۆستاکەی لە چ ئاستێکدا بوە، روداوی وای پێ سەیر نابێ و بەدرۆی ناداتە قەڵەم.

یەکێك ئەگەر بە مێژوی خورەوشت و فەلسەفە ئاگادار بێ دەزانێ چوار سەدە بەر لە زاین قوتابخانەیەك لە ئەوروپادا پەیدا بو، تا سەدەی نۆزدەمی زاینیش رەوشتناس و فەیلەسوفی گەورە گەورە پشتیوانیان بۆ دەردەبڕی. قوتابخانەکە پێی وابو تەرازوی خورەوشت و پێودانی کردەوە بریتیە لە چێژی جەستەیی و، بە قوتابی و شوێنکەوتوەکانیشی دەگوت تا دەتوانن چێژ لە ژیانی دنیا وەرگرن و

(١) نزهة الخواطر للشيخ عبدالحي الحسيني (بەرگی شەشەم).

هەرچی دەرفەتە هەڵیقۆزنەوە. هەوادارنی ئەم قوتابخانەیە بەسەر دو چین دابەش بون. (خۆپەرستەکان) کە دەیانگوت نابێ هیچ پەردە و دیوارێك لە نێوان مرۆڤ و ئارەزوەکانیدا هەبێ تا بتوانی هەرچی مەبەستیەتی وەدەستی بێنێ. تەنها بەجۆرەش دەتوانێ گەورەترین چێژ و تەژیبون لە ژینی دنیا ببینێ. هەروەها دەیانگوت: (ئاسودەیی) بریتیە لە تێرکردنی ئارەزو و بە ئاوات گەیشتنی هەوەست و هێنانەدی مەبەستی نەفس و چنینی گوڵی چێژو خۆشی حازر بەدەست.

چینی دوەمیش (قازانج پەرستەکان) پێیان وابو ئەرکی سەرشانی خەڵك ئەوەیە کە قازانج و کەڵکێکی وا دابین بکەن کە زۆرترین تاکی مرۆڤایەتی بتوانن گەورەترین و فراوانترین چێژ و خۆشی تێدا وەدەست بێنن. خوڕەوشتیش لە دیدی ئەواندا تەنها ئەو جۆرەیان سەنگی هەبو کە چێژو خۆشی بۆ زۆرینەی مرۆڤایەتی دابین بکات. هەروەها دەیانگوت: ئاسودەیی ئەوەیە کە چێژ بۆ خەڵکی ببارێنی و ئێش و ئازار بتارێنی.

خوێنەر هەست و تێبینی دەکات کە چ روحێکی ماددیانەی چێژو خۆشی پەرست لە راوبۆچون و ئەنگێزەکانی ئەو ڕێبازەدا هەیە، لە نزمترین و نشێوترینیانەوە بگرە تا بەرزترین و هەورازترینیان. بەڵام ئەم روحیەتە دەگەڵ سروشتی رۆژهەڵاتی و پەیامە ئاسمانیەکان ئەرزو ئاسمانیان بەینە. هەڵبەت ئەو ڕێبازە ماددەپەرستە کاریگەرێکی قوڵی لەسەر فەلسەفەو خوڕەوشت و ئەدەب و ژیاری رۆژئاوا کردوە و تائێستاکەش بەسەر ژیان و ئەدەبیاتی ڕۆژئاوایی باڵادەستە.

پاشان گەیشتنە راددەیەك هەمو کەڵك و قازانجێك بۆ شتە ماددیەکان بگەڕێننەوە چونکە هەر بە هزر و ئاوەزی ماددەپەرستانەی خۆیانەوە حوکمیان دەدا و بڕوایان بە کەڵك و قازانجێکیش نەبو چێژ و خۆشی وەدەست نەهێنێ، هەڵبەت شتێکی بەرهەستیش نیە و ڕوبەر و ژماردن و سەنگیشی نیە. تەنانەت دامەزرێنەری ئەم ڕێبازەش (ئەپیکۆرۆرس ٢٧١ ی پێش زاین مردوە) بە ڕاشکاوی ڕایگەیاندوە و گوتویەتی: هەڵنرخاندنی کردەوە بە گوێرەی قازانج و

کەڵکە، قازانج و کەڵکیش ئەگەر چێژ و خۆشی بەردەست نەخات نرخی نیە، دەجا وەرە بیر لەم ئاوەز و سروشتە ڕۆژئاواییەی ئەمڕۆ بکەوە کە ماوەی چەندین سەدەی دور و درێژە و نەوە بۆ نەوە بە زەینی ماددیەوە تێی دەڕوانن و تاوتوێی دەکەن، بیری لێ بکەوە ئەوجار دەزانی چ مەرگەساتێکە!.

لە ئەنجامی ئەمەدا زەینی ڕۆژئاوایی و لۆژیکی ئەم سەردەمە وایان لێهاتوە ئەگەر قازانج و کەڵکێك بەرهەست نەبێ و چێژ و خۆشی بەرهەم نەهێنێ نەیناسن. ئاوەزی ئەوروپایی وای لێهاتوە بەس داکۆکی لە ماددەپەرستی بکات و خوڕەوشتێکیش بەو بڕەی کە دەستکەوتی ماددی وەدی دێنێ و بەو ئەندازەیەی کە کۆمەڵگە چێژ و خۆشی پێ وەدەست دێنێ و تاك پێی شاد و تێر و تەژی دەبێ پێیان چاك و دروستە. قازانجی ماددی بۆتە تەرازوی خوڕەوشت و جیاکەرەوەی نێوان شەڕ و خێر. ئەو (خوڕەوشتە)ی کە هیچ سەنگێکی لە تەرازوی ماددەپەرستیدا نیە و جگە لە نرخە ئاینی و خوڕەوشتیەکەی پێشان هیچ نرخێکی نەماوە؛ ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەسەڵاتی لەسەر دڵ وئاوەزدا ون دەکات و پشتیوانی کەمتر دەبێتەوە و وەك دروشمێکی کۆنی لێدێت و وەك یادگاریەکی سەردەمی پێشان یادی دەکرێتەوە. بە نمونە وەك سۆز و خۆشەویستی دایك و باوك بۆ کوڕ و وەفاداری ژن بۆ مێردەکەی و ناپاکی نەکردنیان لە کاتی لە ماڵدا نەبونی مێردەکانیان. ڕۆژبەڕۆژیش توانستی پیشەسازی و داهێنان و بەرهەم و نیشتیمانپەرستی و ڕەگەزپەرستی پتر نرخیان بەرز دەبێتەوە و تای تەرازویان قورستر دەبێ و جێی خوڕەوشت دەگرنەوە.

کۆمەڵگەی هاوچەرخ بەردەوام لەبەریەك هەڵدەوەشێتەوە و پتر دەستبەرداری پەیوەندی نێوماڵ وخزمایەتی و ڕێوشوێنی خوڕەوشتی دەبێ و سیستەمگەلی کۆمەڵایەتی گەلئامێز کە تانوپۆیەکەی بە سیاسەت و پیشەسازی و ئابوری هەڵچنراوە، جێگایان دەگرنەوە.

کۆمەڵگەی ئێستا پێی گرنگ نیە کوڕ چۆن دەگەڵ باوکی یان ژن چۆن دەگەڵ مێردی ڕەفتار دەکات بە مەرجێك لەو چوارچێوە شارستانیە دەرنەچێ کە کۆمەڵگە کێشاویەتی و تێکهەڵشێوان لە ناو کۆمەڵگە و شۆڕش لە دژی ڕژێم

بەرپا نەكەن و كۆسپ نەخەنە بەردەم ڕەوتی شارستانێتی. ئەگەر وابێ ئیتر قەیناكە با كوڕ ئازاری باوكی بدات یان لەگەڵ برادەرەكەی دوشك بێ[1]، یان مێرد لەگەڵ ژنەكەیدا وشكی بنوێنێ یان ئافرەت بێناموسی بكات یان پیاو بەدكاری ئەنجام بدات یان ژن ناپاكی لەگەڵ مێردەكەی بكات.



(١) دوشك: قسەبڕینەوە.

**بەندی یەکەم**

# راپەڕینی جیهانی ئیسلامی

## ئاراستەبونی سەرتاپای جیهان بەرەو نەفامێتی:

لە باسەکانی پێشتردا باسمان کرد کە ئەوروپا لەبەر گەلێك هۆی مێژویی و ئاوەزی و سروشتی پشتی لە نەسرانیەت هەڵکرد و ڕوی لە جاهیلیەتێکی ماددەپەرست کرد و خۆی لە گشت ئامۆژێکی روحی و رەوشتی و چاکەکاری داماڵی و لەسەرجەم ئەو رێبیرانە لاڕێ بو کە پێغەمبەران- درودو سڵاوی خوایان لەسەر بێ- بۆ مرۆڤایەتیان هێنا بو. گەیشتنە رادەیەك کە لە ژیانی تاکەکەسیدا بڕوایان بەس بە چێژ و قازانجی ماددی هەبێ و لەژیانی سیاسیدا بڕوایان بەس بە هێز و زاڵبون هەبێ و لەژیانی کۆمەڵایەتیشدا بڕوایان بەس بە نیشتمانپەرستی سنوربەزێن و نەتەوەپەرستی ستەمئامێز هەبێ. ئەوروپا شۆڕشی لە دژی سروشتی مرۆڤایەتی و رێبیرە رەوشتیەکان بەرپا کرد و هەر خەریکی داهێنانی ئامێرو ئامرازان بو، مەبەست و نیاز و ئامانجیشی خستبوە پشت گوێ و بیری لێنەدەکردەوە. لە پێناو ژیاندا بە بێ وچان هەوڵی دەدا، سەرگەرمی دۆزینەوە و ئەنجامدانی ئەزمونان بو، بەسوك سەیری پەروەردەی ڕەوشت و بوژاندنەوەی روحی دەکرد، بڕوای بە بەرنامەی پێغەمبەران نەمابو، لە مادەپەرستیدا نغرۆ ببو، خاوەنی هێزێکی زل بو، لە رێوشوێنی پێغەمبەران بەدور بو، پەردە و پەرژینی رەوشتی نەما بو، بۆیە وەك فیلێکی شێت و هاری لێهات، مافی زەبونانی پێشێل دەکرد، کشتوکاڵ و خانوبەرەی خاپور دەکرد و مرۆڤ و زیندەوەرانی قڕ دەکرد.

موسڵمانەکان کە دەستی باڵایان کێشایەوە و سەرکردایەتی جیهانیان لە دەست نەما و لە پێشەوایەتی گەلان وەپاش کەوتن و بۆ دین و دنیا کەمتەرخەم بون و بۆ خۆ و خەڵکی بێ بەرهەم بون؛ ئەوروپا سینگی لێ دەرپەڕاند و

کاروباری گەلانی گرتە دەست و جێگەی سەرکردایەتی موسڵمانەکانی گرتەوە و سەوڵی گەمیەی[1] ژین و ژیار کەوتە بەر دەستی ئەوان. جیهان-بەسەرجەم گەل و ژیارەکانیەوە- وەك فارگۆنی شەمەندەفەری نەفامێتی لێهات و بەرەو مەبەستی ماددەپەرستی دەهاژوران. موسڵمانەکانیش-سای گەلانی تر-یەکێك بون لە سەرنشینەکانی ناو فارگۆنەکە. جا ئەوروپا هەرچەندی هێز و خێرایی پتر بێ و ئامێر و ئامرازی پێشکەوتو تر بێ؛ شەمەندەفەرەکە بەرەو مەبەستە جاهیلیەکە خێراتر دەبێ، کە لەوێدا خۆی لە نێو ئاگر و وێرانکاری و ڕکوکینە و پەشێوی و بێسەروبەری کۆمەڵایەتی و داڕوخانی خوڕەوشتی و نیگەرانی ئابوری و مایەپوتی ڕوحیدا دەبینێتەوە. ئا ئەمەیە ئەوروپا کە هێشتا خێراترین شەمەندەفەری پێ هێدیە و دەیەوێت بە خێرایی فڕۆکە بەڵکو بە خێرایی وزەی ناوەکی بگاتە ئامانجەکەی!.

## دەستداگرتنی فەلسەفەی ئەوروپایی بەسەر جیهاندا:

ئەمڕۆ لەسەر زەویدا نە لە ئەوروپا و نە لە ئەمریکا و نە لە ئاسیا و نە لە ئەفریقیادا هیچ گەل و کۆمەڵێك نیە دژ بە بڕیار و تیۆرەکانی گەلانی ڕۆژئاوا بێ و تەنگ بەرەوتەکەی هەڵچنێ و بەرەنگاری بێتەوە و باگۆی[2] ڕێبیر و فەلسەفە نەفامێتیەکەی و سیستەمە ماددەپەرستیەکەی ژیانی بداتەوە. ئەو کێشە و ناکۆکیە سیاسیانەی کە لە نێو گەلاندا هەیە و دەیبیستین یا دەیبینین گشتی لەو پێناوە دایە کە کێ سەرکردایەتی هەمان مەبەست بگرێتە دەست، ولاَتانی میحوەر[1] کە کێشە و ناکۆکی ودژایەتیان دەکرد لەسەر ئەوە بو کە هاوپەیمانەکان لەمێژ بو سەرکردایەتی جیهانیان گرتبوە دەست و خێر و بێر و بازاڕ و پێگەکانیان داگیر کردبو، پێیان وابو خۆشیان چ لە روی هێز و زانست و

---

(١) گەمیە: کەشتی.
(٢) باگۆ: وەڵام.
(١) ولاَتانی میحوەر : ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکانی جەنگی دوەمی جیهانی دەگرێتەوە .

زیرەکیەوە چ لە روی یاساو سیستەم و بلیمەتیەوە هیچی وایان لەوان کەمتر نیـە، بگرە پێشکەوتوتریشن، کە مونافەسەکەیان کرد بۆ ئەوە نەبو مرۆڤایـەتی بـەرەو ئامانجێکیتر رێنوێن بکەن و بانگەوازی مەسیحییان بۆ جێبـەجێ بکـەن و داد و یەکسانی لەسەر زەوی بەرپا بکەن و گەلانی دنیا بۆ دین و تەقوا رزگـار بکـەن و لە ماددەپەرستیەوە بۆ ژینی ڕوحی و رەوشتییان دەرباز بکەن، بگرە ئەمانـەیان هەر بە خەیاڵیش دانەهاتوە.

روسیای شوعیش بەروبومێکی پێگەیـشتوی رۆژئاوایـە و هـیچ جیاوازیـەکی لەگەڵ ولاَتانی ئەوروپا نیە ئـەوە نـەبێ کـە چارشـێوی[1] دوڕوانـە و فێڵبازانـەی لەسەر روی خۆی هەڵماڵیوە و ئـەو دەغـەڵی و چەواشـەکاریەی گـەلانی رۆژئـاوا پیادەی دەکەن و ئەو بیروباوەڕەی چەندین سەدەیە لەبارەی ڕەوشت و کۆمەڵگەوە هەیانە؛ ئەو وەدەری خستوە و روی راستەقینەی خۆی نیشان داوە. روسیا رەوتـی خوانەناسی و بێدینی و بەرەڵلاَیی و ئاژەلاَنەی ماددەپەرستی ئەوروپای پێ لەسەر خۆ بو، بۆیە زوتر قۆناغە دورەکانی بڕی و هەوڵ دەدا خۆی سەرکردایەتی جیهـان بگرێتە دەست و مرۆڤایەتی بەرەو ئـەو ئەنجامـە راپـێچ بکـات کـە خـۆی پێـی گەیشتوە.

## گەل و ولاَتانی ئاسیا:

گـەل و ولاَتـە ئاسـیاییەکان و نەتـەوە ڕۆژهەلاَتیـەکانیش خەریکـە لـە روی سیاسەت و ژیارەوە وەك گەلانی ئەوروپایان لێ بێـت و هـەمان ڕەوشـت و داب و نەریت و باوی کۆمەلاَیەتی ئەوان هەڵگرنەوە و هەمان بیروباوەڕی ئەوان لە بارەی ژیان و گەردون وەرگرن و بەهەمان رێژین و ڕەوشت و پـەروەردە خـۆ بڕازێننـەوە، بەلاَم لەگەڵ ئەمەشدا ڕازی نـابن بێگانـە داگیریـان بکـەن و کاروبـاری ولاَتیـان هەڵـسوڕێنن، نایانـەوێ ئەوروپاییـەکان پێگـە و ئیمپراتۆریـان لەسـەر پـشت دامەزرێنن و بەناوی بریقەدارو فشۆڵەوە لەبەر سـێبەر و پـەنای نیـشتیمانەکەیان

---

(١) چارشێو: جلباب.

راببوێرن، ڕازی نابن ئەوروپاییەکان دەسەڵاتیان لەڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا و ئاسیادا هەبێ، بەڵام هەرگیز نارەزایی لە ماددەپەرستیەکەی دەرنابڕن و دژایەتی ڕەوشت و دابونەریتەکەیان ناکەن و بەرەنگاری فەلسەفەو ڕێبازەکەیان نابنەوە، رەنگە هەر بەخەیاڵیشیاندا تێنەپەڕێ، چونکە گشت ڕەوشت و ئاکارێکی ئەوروپاییان بۆ رازێنراوەتەوە و لەبەر دڵیان شیرن کراوە.

ئەم نەتەوانە هەر کاتێك دەرفەتیان بۆ رەخسابێ و سەربەخۆییان وەرگرتبێ و خۆیان کاروباری وڵاتیان هەڵسوڕاندبێ؛ ڕەوشت و ئاکارو ڕێباز و ڕێژینی ڕاستەقینەی نەفامیانەی خۆیان ئاشکرا کردوە و دزێوترین دیمەنیان لەمێژودا کێشاوە، ئەوپەڕی دڵڕقی و توندوتیژییان بەکار هێناوە و خوێنی مرۆڤایەتیان وەك دڕندە ڕشتوە و ماڵ و موڵکیان بە تاڵان بردوە، خەڵکێکی زۆریان کوشتوە و، خانوبەرەیان خاپور کردوە. هەندێ لەم گەلانەی ئاسیا هەر دوابەدوای ڕزگاربونیان لەحوکمی بێگانە کاری وەحشیانە و نامەردومانەی وایان کردوە دڕندەش پێی دڕندەیی بێ، هەندێ لەم گەلانە بە فیز و دەماری جیاوازی دین و دەمارگیری سیاسیانە ڕەفتاری ناقۆڵا و تاوانی وایان کردوە لەمێژودا وێنەی نەبوە، ساوای شیرەخۆریان کوشتوە و لەشیان لەت لەت کردوە، ئافرەتیان هەتك کردوە و زۆر بە نامەردی و بەبێشەرمیش کوشتویانن، بیری ئاویان ژەهراوی کردوە، خانوبەرەیان ڕوخاندون و ئاگریان تێبەرداون و بە تۆپ بۆردومانیان کردون. ئەگەر چوبونایە نێو هەر گوندێك وێرانیان دەکرد، خەڵکەکەیان ڕیسوا دەکرد، شمشێریان لەسەر مل دادەنان، دڕندە و سەگ و سواریان بەردەدایە خوێن و ئابڕوی خەڵکەکە، تا گوندەکەیان کاول نەکردایە و ئاساریان لەسەر پاتاری نەهێشتایە وازیان لێ نەدەهێنان، بیرەکانیان بەو ئافرەتانە پڕ دەکردەوە کە خۆیان نەدەدایە دەست و ڕازی نەبون هەتك بکرێن، ئەمانە جگە لەوەی کە ئافرەتەکانیان بەشێوەیەکی وەحشیانە و بەڕێگەیەکی نامەردانەی وا دەکوشت لە مێژودا وێنەی نەبێ، بگرە گەلێك کاری نامەردانەی تریشیان دەکرد کە خەڵك بڕواناکەن لە وڵاتی ئیسلامی و ژیارمەندا شتی وا بکرێن.

وێڕای ئەمە ئەو تایفانەی لەو وڵاتانەدا دەژیان لە ڕوی دین و کلتور و کۆمەڵایەتیەوە دەچەوسێندرانەوە و زمان و ئازادی و ڕۆشنبیریان زەوت دەکرا و ناچار دەکران بەزمانی بێگانە بدوێن، خاوەن هێزە زلەکان هەوڵیان دەدا هەرچی ژیار و کلتور و ئاسەواری ئەم تایفانەیە لە ناوی ببەن و درۆ و تاوانیشیان پێ هەڵدەبەستن و هەمو ڕۆژێ چیرۆکی بەرخ و گورگیان دێنایە دی، فەرمانبەرەکانیان فەصل دەکرد و دەرگای بژێوی و بازرگانی و پیشەیان لە ڕودا دادەخستن، دوکان و شوێنە گرنگەکانی بازرگانیان لێ قەدەغە دەکردن و، بە بیانوی چەند هەنجەتێکی نەشیاو و ناڕاست موڵك و ماڵیان زەوت دەکردن.

ئەم نەتەوانە لە ڕوی دین و ڕەوشتەوە مایەپوت و نابوت بونە، خۆشویستنی ماڵ و ماددە هەمو دڵی داگرتونە، شەیتانی خۆپەرستی و چاوچنۆکییان بە سەردا زاڵ بوە، تەنانەت دەسەڵاتیش لە دەستیان وەزاڵە هاتوە و ماندو بوە. نرخی شتومەك و کەرستە بەرز بۆتەوە، ئەگەر حکومەت وەدەنگ دێت و نرخی دیاریکراو دادەنێ، شتومەك لە بازاڕان نامێنێ و خەڵك بەرگ و نانی وەدەست ناکەوێ مەگەر بەو نرخەی کە بازرگانەکان بیانەوێ، بەم جۆرە بازاری ڕەش و قاچاغ پەیدا بون و تاوان و دزی و بەرتیل و ئاودیوکردن (التهریب) بلاو بونەوە. حکومەت و بازرگانەکان وەك دو ئەسپی نێو مەیدانێ لە پێشبڕکێ دان، وەك دو گا لە شەڕەقۆچ دانە و هەریەکە و دەیەوێ ئەویتر ببەزێنێ. خەڵکیش لەم ناوەدا وەك دەنکە جۆی نێوان دو بەرداشی لێهاتوە و حەیران ماوە، نازانی قوڕی کام شوێن وەسەر خۆی بکا.

ئاینخواز و چاکسازیخوازان گەلێکیان هەوڵدا ژیانێکی نوێ وەبەر ئەم نەتەوانە بکەنەوە و ڕوحی ڕەوشت و چاکەکاری و دەسپاکی و ئابورییان ببوژێننەوە، بەلام لە ئەنجامدا داخوڕیان و تەواو لێ ساردبونەوە، زانییان کە ئەگەر سەرلەنوێ نەتەوەیەك دروست بکەنەوە هاسان ترە وەك لەوەی ئەم نەتەوانە ببوژێننەوە و لەسەر ڕاستەڕێ ڕاست بکرێنەوە، چونکە ماکی ژینیان بڕاوەتەوە و تەمەنیان بەسەر چوە و کانیاویان وشکی کردوە.

بەجۆرە جیهان بە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوایەوە دوچاری قەیرانێکی روحی و

ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و ئابوری بوە و وا دەخوازێ بەزوترین کات و بە هەڵەداوان چارەسەرێکی وەها نابێت .

## تاکە چارەسەری قەیرانی جیهانی:

تاکە چارەسەری ئەم قەیرانە جیهانیە بەوە دەبێ کە سەرکردایەتی جیهان و سەوڵی ژیان لە دەستی ڕەش و ناپاك و تاوانبارانەوە بۆ دەستی بێتاوان و ژێهاتی و پاکان بگوازێتەوە.

ئەم واقیعە بە گوازرانەوەی سەرکردایەتی لە دەستی بەریتانیاوە بۆ ئەمەریکا یان لەوانەوە بۆ روسیا هیچ شتێکی لێ ناگۆڕێ، وەك ئەوە وایە کە لەبەر ماندوبون سەوڵ[١] لە دەستی ڕاستەوە بخرێتە دەستی چەپ یان بە پێچەوانەوە، مادەم سەوڵ هەمان سەوڵە و نەگۆڕاوە ڕاست و چەپ جیاوازی نیە، بەریتانیا و ئەمەریکا و روسیا وەك پیاوێکن کە سەوڵی کەشتیەکەی ئەم دەست و ئەو دەست بکات و کەشتیەکە لەسەر هەمان هێل و بۆ هەمان ئاڕاستە بەرەو پێشەوە ببات.

گواستنەوەی بەکاریگەر و ئاشکرا بەوە دەبێ کە سەرکردایەتیەکە لە دەستی ئەوروپاوە -ئەوروپا بەمانا فراوانەکەی کە بەریتانیاو ئەمەریکا و روسیا و گشت نەتەوە ئاسیایی و ڕۆژهەڵاتیەکانیش دەگرێتەوە کە بەهەمان ڕێوشوێنی ئەوروپاوە بەڕێوە دەچن- بۆ جیهانی ئیسلامی بگوازرێتەوە کە موحەمەد ﷺ سەرکردایەتی دەکات و پەیامە نەمر و ئاینە حیکمەتدارەکەی ڕێوشوێنی بۆ دەکێشێ. ئەمەیە گوازرانەوەی ڕاستەقینە کە ئاراستەی مێژو و ڕێڕەوی کاروباران دەگۆڕێ و جیهان لە کارەساتی چاوەڕێدا ڕزگار دەکات .

بەڕاستی جێی خۆیەتی کە جیهانی ئیسلامی خۆزگە بەم پایە ترسناکە بخوازێ و بۆی هەوڵدا، جێی خۆیەتی ولاتێکی ئیسلامی خۆی بۆ ئەم ئامانجە ئامادە کا، جێی خۆیەتی گشت موسڵمانێك لەم پێناوەدا تێبکۆشێ و هەرچی لەتوانایدا

---

(١) سەوڵ: داری درێژی سەرپانە کە بەلەمی پێ دەهاژورێ.

هەیە پێشکەشی کا، چونکە نەتەوەی ئیسلامی هەر لەو ڕۆژەی کە ناوکی بەستراوە و سەری هەڵداوە ئەو ئەرکەی وەك مەدالیایەك بە بەرۆکیدا کراوە.

## جیهانی ئیسلامی و شوێنپێ هەلگرتنی ئەوروپا:

سەیرە کە دەبینین موسڵمانان لەم دوابەدواییانەدا لە زۆربەی ناوچەکانی سەر ڕوی زەوی‌و تەنانەت لە زێدو پایتەختە ئیسلامیەکانیشدا بونەتە هاوپەیمانی جاهیلیەتی ئەوروپایی و وەك سەربازی جانفیدا خۆیان بۆ کردۆتە قوربانی، بگرە هەندێك گەل و وڵاتی ئیسلامی پێیان وایە گەلانی ئەوروپایی-کە چەندین سەدەیە هەر جارەی بەبەرگێکی نوێوە ڕێبەرایەتی بزاڤی نەفامێتیان کردوە و هەمیشە پروپاگەندەی خەستوخوڵیان خستۆتە سەر ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا- بۆ موسڵمانان پشتیوان و بۆ چەوساوان پارێزەر و بۆ جیهانیش وەدیهێنەری دادن.

موسڵمانان لەجیاتی ئەوەی هەوڵ بدەن ببن بە سەرکردەی لەشکرێکی ئیسلامی هەوڵ دەدەن ببن بە زەبونی ژێر دەستی سەربازانی نەفامی. ڕەوشتی نەفامێتی و ڕێبیرە فەلسەفیەکانی ئەوروپایی وەك چۆن ئاو لەناو ڕەگ‌و ریشاڵی درەخت‌و کارەبا بەناو وایەردا دەبزوێ ئەمانیش ئاوەها لەنێو جەستەیان دەبزوێ، وڵاتە ئیسلامیەکان لە گەلێك دیمەن‌و دیاردە و ئاسەوارەکانیاندا ماددەپەرستێتی ڕۆژئاوای تێدا وەدەرکەوتوە، وەك بێبڕواکان کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی و ژیانەوەی دوای ژین نیەو هومێد بە دنیا دەبەستن و عەودالّی چێژ و ناز و نۆشی ژیانی دنیان، لەپێناو پلەوپایە و شانازی دنیایی دەگەڵ یەکتر ڕکئەستور و لێکنەبورن، وەك کەسانێك کە دنیا بە هەمو شت بزانن. قازانج و بەرژەوەندی خۆیان لە سەروی ڕێباز و ڕەوشت داناوە، وەك کەسێك بڕوای بە پێغەمبەر و پەیام و دواڕۆژ نەبێ. بۆ ژین تامەزرۆ ئەویندارن لەمردن قەڵس و بێزارن، وەك کەسانێك کە ژینی دنیا بە تاکە سەرمایە و دوایین هومێدی خۆیان بزانن. بە نەخش‌و فانتازیایە فشۆڵەکانی دنیا خەڵەتاون، وەك ئەو نەتەوانەی کە ڕەوشت و هەقیقەتی هەمیشەیی ناناسن. بۆ مەردوم گەردەن کەچن، بۆ پاشا و کاربەدەست

و قەڵەمڕەوان بەرفەرمانن، پێیان وایە موقەددەسن، وەك ئەو گەلانەی کە دار و بەرد و بت پەرستن.

## موسڵمانان لەگەڵ کەموکوڕی و نەخۆشیەکانیشدا هەر ئەوان هیوا و هومێدی مرۆڤایەتی و نەتەوەی دوارۆژن:

هەرچەندە موسڵمانان توشی گەلێك دەردو لاوازی هاتون بەڵام هەر ئەوان تاکە نەتەوەی سەر روی زەوین کە بتوانن مونافەسەی نەتەوەکانی رۆژئاوا بکەن و لەسەر کێشەی سەرکردایەتی جیهان وەدەنگ بێن. هەر ئەوان دین لەسەریان واجب دەکات چاودێری رەوتی جیهان بکەن و لە رەوشت و کردەوە و ئاڕاستەی گەلان بپرسنەوە و بەرەو چاکەو خواپەرستی و ئاسودەیی و سەرفرازی ژین و ژیانەوە دەستیان بگرن و تا لە تینیان دا هەبێ ئامێزیان بۆ واڵا بکەن و رێی دۆزەخیان لێ گاڵە دەن[1]، هەر ئەوانن کە دین و بارودۆخ و سروشتی خواناسێتی لەسەریان دەکا نەبنە نەتەوەیەکی جاهیلی.

ئەم نەتەوەیە هەمو دەمێ بۆی هەیە لەسەر سیستەمی نەفامێتی ببێتە مەترسی، کە ئەوروپا لە رۆژئاوا و لە رۆژهەڵات گەلێکی هەوڵداوە ئەم نەتەوەیە هەڵوەشێنێتەوە و رەنج و تێکۆشانەکەی بە فیڕۆ بدات.

شاعیرو دانای ئیسلامی: (محمد ئیقبال) لە چامە نایابەکەیدا لەژێر ناوی (پەرلەمانی ئیبلیس) لەسەر زاری ئیبلسدا وەسفی ئەم مەترسیە دەکات و دەڵێ:

((شەیتان و شەیتانپەرستەکان لە ئەنجومەنی راوێژکاریدا کۆبونەوە، رەوتی جیهان و مەترسی و ئاژاوەکانی ئایندەیان تاووتوێ دەکرد و لەو ترسەیان دەکۆڵیەوە کە روبەڕوی سیستەمە ئیبلیسی و ئەرکە ئەهریمەنیەکەیان دەبوەوە. گەلێك ئاژاوەو مەترسیان هێنایە بەرباسان کە مایەی هەڕەشە بو بۆیان، هەرچی رەهەند و ئاسەواری[2] مەترسیەکان هەبو رایاننواند و پرس و ڕای خۆیان لە

---

(١) گاڵەدان: داخستن.

(٢) رەهەند: بُعد. ئاسەوار: شوێنەوار.

بارەوە گۆڕیەوە. یەکێك زۆر بە گرنگ‌و گەورەیی باسی مەترسی سیستەمی کۆماری کرد، بەڵام یەکێکیتر هەڵسایەوەو گوتی: پێت گەورە نەبێ چونکە ئەویش کاڵایەکی ترەو بەباڵای پاشانشینی هەڵبڕاوە، ئێمە خۆمان بەرگی کۆماریمان بەبەر پاشایەتیدا کردوە، ئەوەش کاتێك بو کە بینیمان خەڵك وا خەریکە هۆشیار دەبنەوەو هەست بە ڕێز و حورمەتی خۆیان دەکەن، ئێمەش لەوە ترساین شۆڕش لە دژی پاشایەتی بەرپا بکەن و ئەنجامێکی ناهەمواری لێبکەوێتەوە، بۆیە خەڵکەکەمان بە گەمەی سیستەمی کۆماری سەرقاڵ کرد. خۆ گرفتەکە لە بونی میرو پاشایان نیە، چونکە سیستەمی پاشایەتی ئەوە نیە لە تاکەکەسیدا کۆبێتەوەو تاکڕەوانە دەسەڵات بەکاربێنێ، پاشایەتی ئەوەیە کە مرۆڤ وەك مشەخۆر و میقرۆبێك لەسەر ئەستۆی کەسانیتر بژی و چاو لە ماڵ‌و موڵکی خەڵکی ببڕێ، جا ئەو مرۆڤە گەل بێ یان تاك فەرقی نیە. دیارە سیستەمە کۆماریەکەی ڕۆژئاوات نەدیوە کە روخسارەکەی گەش‌وشاد و ڕەونەقدارە کەچی هەناویشی لە هەناوی جەنگیزخان ڕەشترە؟!.

یەکێکیتر گوتی: قەینا ئەگەر روحی پاشایەتیش بمێنێتەوە، بەڵام ئاخۆ سەرکردەی مەزنمان چ لەبارەی ئەم ئاژاوە تازە باوە دەڵێ کە جولەکەیەکە و کارل مارکسی ناوە و گڕی لەدنیا بەرداوە؟ ڕاستە مارکس پێغەمبەر نیە بەڵام بلیمەتێکە و پەرتوکێکی موقەددەسی بۆ شوێنکەوەکانی هێناوە، ئایا هەواڵتان هەیە کە ئەم کابرایە چۆن دنیای لە زەواق ناوە و کۆیلەی لە ئاغان بەرداوە و لەرزەی خستۆتە ناو کۆشکی میرو پاشایان؟

یەکێکیتر روی وتەکانی ئاڕاستەی سەرۆکی ئەنجومەن کردو گوتی: جەنابی خاوەن شکۆ! جادوگەرانی ئەوروپا ئەگەرچی موریدی دڵسۆزی جەنابتانن بەڵام من بڕواییم پێنەماون، بڕواناکەم وەکو جاران زیرەك مابن، چونکە فەرمو ئەوەتانێ سامرییەکی جولەکە کە دەقاودەق وەك مەزدەك[1] خەریکە دنیا دادەگرێ و مشکی لە خەڵکی کردۆتە فیل، خەڵکی هەژار و زەبونی لە پاشایان کردۆتە ئاگر

(١) مەزدەك: ڕێبەری ڕێبازی سۆشیالیزمی فارسی.

و پاشا و گەدایانیشی کردۆتە یەك شان وپیل. ئێمە پێشتر گاڵتەمان بەم بزاڤە سۆشیالیستیە دەهات کەچی ئەوەتانێ خۆی سەپاند و لە گشت شوێنێ فەرتەنەی ناوەتەوە، ئەوەتانێ زەوی لەبەر ئاژاوەی ئایندەی ئەم بزاڤە وەلەرزە کەوتوە.. گەورەم! ئەم جیهانەی تا ئێستا حوکمت تێدا دەگێڕا وا بەسەرت دادەڕوخێ و سیستەمەکەشی دەگۆڕێ.

ئینجا سەرۆکی ئەنجومەن (ئیبلیس) هاتە ئاخاوتن و گوتی: من خۆم هەوساری جیهانم لە دەستەو بە ئارەزوی خۆم هەڵیدەسوڕێنم. دەبا وابکەم گەلانی ئەوروپا وەك سەگ بەناو یەکتر بکەونو وەك گورگ یەکتر راو بنێن ئەوسا دەبینن جیهان چەند شتی سەیر سەیری تێدا رو دەدا. با ورتە ورتەکانم بچرپێنمە گوێی سەرکردە سیاسیو کەشیش و کاردینالە روحانیەکانی کلێسا ئەوسا دەزانن چ جۆرە کەودەن و هاروهاجێکیان لێ دەردەچێ.

باسی سۆشیالیزمتان کرد، بڕوا بکەن ئەو شەقار و ترازانەی سۆشیالیزم خستۆتیە نێوان مرۆڤو مرۆڤ ژیربێژیەکەی مەزدەکی (فەلسەفەکەی سۆشیالیزمی) تۆزی رێگاشی ناشکێنێ، بۆیە ترسم لەم زەبون و دەربەدەر و کەودەنە سۆشیالیستانە نیە.

من لە نەتەوەیەك دەترسم کە هێشتا ژیلەمۆی ژیانو ئاواتەکانی لە ژێر خۆڵەمێشدا ماوە و هێشتا پیاوەکانی هەر لە هەناوی شەودا لە خوا دەترسن و نوێژ دەکەن و لە بەرەبەیاندا لە ترسی خوا فرمێسك هەڵدەرێژن.. هەمو پیاوێکی زانا و تێگەیشتو دەزانێ کە ئیسلام ئاژاوەی داهاتو و فەرتەنەی ئایندەیە، نەك سۆشیالیزم.

خۆ من دەزانم ئەم نەتەوەیە لە قورئانەکەی تاراوە و وەك نەتەوەکانیتر بە پارەوپول خەڵەتاوە و لەبەر کۆکردنەوەی ماڵی دنیا ئاگای لە هەمو شت بڕاوە، دەزانم شەوی رۆژهەڵات شەوی تاریکو ئەنگەستەچاوە و مەشخەڵی زانا و ناودارانی ئیسلام خامۆش بوە و تاریکیان پێ ناتارێ، بەڵام من لە ترکە و وەیشومەی ئەو رۆژگارە دەترسم کە نەتەوە راهەژێنیو لە حەفت خەوی شیرنیان راپەڕێنێ و بەرەو رێوشوێنەکەی موحەممەد هەنگاویان پێ هەڵگرێ.

هەیاران ! وریا بن، لە دینی ئەو موحەممەدە وریا بن، دینێکە خەڵك لە ئامێز دەگرێ و شەرم و ئابڕویان دەپارێزێ، دینی شانو شکۆ و مەردایەتیو پیاوەتیە، دینی دەم و دەست و داوێن پاکیە، دینی خەباتو تێکۆشانە، دژ بە بەندەگیو زوڵمی زۆردارانە، شوێنەواری مرۆڤپەرستی دەسڕێتەوە، جیاوازی لە نێوان پاشا و گەدا ناکات، قۆچوباڵ لە کاربەدەستان ناڕوێنێ و ڕەش و ڕوتان نارەتێنێ.

ماڵو دارایی لە ژەنگ و ژار مشتوماڵ دەکا، وەك سەرپەرشت لە خاوەن موڵكو سەرمایە دەڕوانێ و دەڵێ ماڵ ماڵی خوایە و مرۆڤیش ئەمیندار و بریکار. کام شۆڕش و کۆدەتا[1] شان لە شانی ئەم دینە دەدا کە هەر لەو ڕۆژەی پڕ بە دەنگ هاواری کرد: زەوی زەوی خوایە نە بۆ سوڵتان و پاشایە؛ گۆڕانکاریو وەرچەرخانێکی گەلێ گەورەی لە جیهانی هزر و کردەوەدا بەرپا کردوە.

جا هەوڵدەن دین لەبەرچاوی خەڵکانو بزر بێ، مزگێنیشتان بدەمێ ئەمڕۆ موسڵمانان متمانەیان بە خوا لاواز بوەو بڕوایان بە ئیسلام کز بوە. جا ئەگەر هەر بە عیلمی کەلام و ئیلاهییاتەوە خەریك بنو سەرگەرمی واتاوێلکردنی[2] ئایەتەکانی پەرتوکی خوا بن؛ زۆر بە باش بۆمان دەشکێتەوە، وابکەن موسڵمانان بێئاگا بن و لە گوێی گادا بخەون چونکە دەنگو بانگی ئەوانە کە دەتوانێ تەلیسمەکانی جیهان بسمێنێو جادوەکانمان هەڵوەشێنێ، هەوڵدەن شەوگارەکەی درێژ بێو سپێدەکەی وەدرەنگ کەوێ. براکانم! وابکەن لە کاری جددی وەدور بێ تا گرەوەکەی لەسەر جیهان بدۆڕێنێ. بۆ ئێمە زۆر چاکە ئەگەر موسڵمانان ببنە بەندەی کەسانیتر و بەناوی زوهدەوە لەم جیهانە کەنارگیر بنو بەو بیانوەی دنیا نەیانخەڵەتێنێ خۆیان لە جیهان دابڕن. بەڵام هاوار لەخۆمان بێکەسێ! ئەگەر ئەم نەتەوەیە بێدار بێتەوەو خۆ دە ئامێزی دینەکەی هەڵکوتێ، چونکە دینە وای لێدەکا بە شەو و ڕۆژ چاودێری دنیا بێ)).

---

(١) کودەتا: انقلاب.

(٢) واتاوێلکردن: تەئویلکردن.

## پەیامی جیهانی ئیسلامی:

جیهانی ئیسلامی ئەو کاتە هەڵدەستێتەوە کە بڕوایەکی راستەقینە بە پەیامەکەی بێنێتەوە و خوێنی خۆی بۆ بکاتە قوربانی، کە هەرچەندی بڵێی پەیامێکی بەهێز و رون و پرشنگدارە و جیهان هەرگیز پەیامی وا دادگەر و چاك‌و بە برشتی بۆ مەردوم بەخۆوە نەدیوە.

بێگومان پەیامەکە هەمان ئەو پەیامەیە کە موسڵمانان لە فتوحاتە سەرەتاییەکاندا هەڵیانگرتبو، هەمان ئەو پەیامەیە کە یەکێك لە موسڵمانان لە دیوەخانی یەزدی گوردی پاشای ئێراندا بە پوختی تەعبیری لێکردوە و دەڵێ: ((خوا ناردوینی تا خەڵك لە بەندەپەرستیەوە بۆ خواپەرستی رزگار بکەین، تا لە تەنگ‌و ناخۆشی دنیاوە بەرەو گەش‌و گوشادی رۆژی دوایی دەربازیان بکەین، تا لەستەم‌و بێدادی دینەکانەوە بەرەو دادو رەوای دینی ئیسلام قوتاریان بکەین)). پەیامێکی کامڵ‌و بێکەمایەسیە[1] و پێویستی بە گۆڕینی تەنانەت یەك وشەو یەك تاقە پیتیش نیە، چۆن لەگەڵ سەدەی شەشەم دەگونجاو رێك بو لەگەڵ سەدەی بیستەمیش رێك و گونجاوە و چارەسەر و وەڵامی داخوازی گشت سەردەمێکشی لەلایە، رۆژگاری ئەمڕۆش دەڵێی هەمان ئەو رۆژگارەیە کە موسڵمانەکان لە دورگەکەیانەوە بە جیهاندا بڵاوبونەوە تا مرۆڤایەتی لە چڕنوکی بتپەرستی و نەفامیتی رزگار بکەن.

خەڵك ئێستاش لەبەردەم چەندین بت‌و پەیکەری داتاشراو و لە دارتاشراو و لە گۆڕنراو و هەڵنراوی جۆراوجۆردا دەوەستن‌و چۆك دادەدەن، ئێستاش (یەکخواپەرستی) کەم بۆتەوە و لەبەرچاوی خەڵکان سەیرو نامۆیە، ئێستاش موسڵمانان ئازار دەدرێن‌و دینی راستەقینە بەربەست و لەمپەری دەخرێتە رێ، ئێستاش خواوەندی هەوەست‌و ئارەزو دەپەرسترێت، ئێستاش کەشیش و مەلاو سوڵتان و پاشاو سەرۆك و خاوەن هێز و سەرمایەدار و رێبەر و پارتە سیاسیەکان وەك خوا دەپەرسترێن و قوربانیان بۆ سەردەبڕدرێ و سوژدەیان بۆ دەبردرێ.

---

(١) بێکەمایەسی: بێکەموکورتی.

جیهان ئـەمڕۆ لەگـەڵ ئـەوەی کـە فـرەوان بـوەو ئامرازەکـانی سـەفەرکردن‌و گواستنەوە ئاسان بوە و پەیوەندی نێوان گەلان بەهێزتر بـوە و تێکـەڵی‌و نزیکـی زیاتر بوە، بەڵام دنیای لە دوێنـێ لـە خـەڵکان تـەنگتر کردۆتـەوە. بـەهۆی ئـەو ماددەپەرستیەی کە تەنها بەرپێی خۆی دەبینێ‌و بڕوای بەس بە قـازانجی مـاددی هەیە و جگە لە چێژ و ئارەزوبازی هیچی‌تر ناناسێ دنیا تەسـك بۆتـەوە، بـەهۆی ئەو خۆپەرستیەی کە ڕێگە نادات دو کەس لـە خـاکێکی بەرهـەراوادا بەیەکـەوە بژین خنکاوە، بە هۆی ئەو نیشتمانپەرستیەی کە هـەمو بێگانەیـەك بـە هـیچ‌و ریسوا دەزانێ و هەرگیز بە شایستەی دانانێ‌و مافی پـێ ڕەوا نابینـێ هەناسـەی لـێبڕاوە.

سیاسەتمەدارەکانیش هەر لەولاوە بوەستن کە دەستی ڕەشیان بەسەر هۆیـەکانی ژیان‌و بژێوی داگرتوەو ژیانی ماددیان تەنگتر کردوە، بە ئارەزوی خۆیـان کێیـان بوێ و چۆنیان بوێ ژینی لـێ تاڵ دەکەن و بژێوی لـێ دەگرنەوە، کێشیان بـوێ و چۆنیان بوێ ژینی بۆ شیرن دەکەن و بژێوی بۆ زۆر دەکەن. بۆیە شـارە فرەوانـەکان لە کونـە مـشکیش تەسـکترن، بۆیـە خـەڵك لـە وڵاتـی خۆیانـدا وەك هـەتیوی لێقەوماویان لێهاتوە و بە بڕ بـژێویان پێـدەدرێ و لـە هـیچ شـوێنی جێگـەیان نابێتەوە و قوڕقوڕاگەیان گـیراوە و کـۆت‌و زنجـیری شـار و وڵاتیـان لـە گـەردەن ئالێنراوە، بۆیە هەمو کاتێك لە مەترسی برسیەتی دەست ئەنقەست[1] و قاتوقڕی سروشتی و ناوەخۆیی و دەرەکی دان، بۆیـە هـەمو ڕۆژ و هەفتەیـەك مـانگرتن‌و ڕێپێوانی ناڕەزایی ئەنجام دەدرێ.

بەڵێ لە ستەم‌و بێدادی دینەکانەوە بەرەو داد و ڕەوای ئیسـلام تەنانـەت لـەم سەردەمە روناك‌و پێشکەوتوەشدا هێشتا چەندین ئاین هـەن گاڵتـە بـە مێـشکی مرۆڤ دەکەن‌و وەك کەرو مانگا دە ژێرباریان دەخەن، ڕەنگە لەپێناو چێڵێك کە لە جەژنی قوریاندا سەربڕا بێ یان لە پێنـاو دارێکـی پیـرۆز کـە لـە گونـدێك لـە

(١) دەستی ئەنقەست: عمداً.

گوندەکان بڕابێتەوە تاوانی کوشتنی سەدان مرۆڤ حەڵاڵ دەکرێو خەڵکی بۆ هان دەدرێ.

دینیتر هەن ناوی دینیان لەخۆ نەناوە بەڵام لە دەسەڵاتی فرەوانو ستەمو دوژمنایەتی و گاڵتەکردن بە مێشکی شوێنکەوتوان و سەیروسەمەرە ناقۆڵاکانی هیچ شتێکیان لە دینە کۆنەکان کەمتر نیە، دینەکانیش بریتین لەو سیستەمە سیاسیو بیردۆزە ئابوریانەی کە خەڵك وەك پەیام و ئاین بڕوایان پێهێناون و پەیڕەویان لێ دەکەن، وەك رەگەزپەرستی و نیشتمانپەرستی، دیموکراتیەتو سۆشیالیزم، دیکتاتۆریەت و کۆمۆنیزم، کە لەچاو دینە جاهیلیەکانی دوێنێ بەرامبەر بەو کەسانەی کە پەیڕەویان لێناکەن کەمتر لێبوردەن و لە بەرامبەر مونافیسەکانیشیان توندوتیژتر و بێ بەزەییترن.

چەوساندنەوە سیاسیەکانی ئەمڕۆ گەلێك لە چەوساندنەوە ئاینیەکانی سەدە تاریکەکان توندوتیژترە، ئەگەر پارتێك لە پارتە نیشتمانیەکان یان رێبیرێك لە رێبیرە سیاسیەکان یان چینێك لە چینە جیاوازەکان لە هەڵبژاردن سەرکەوتن وەدەست بێنێ دەسبەجێ دەرگا لە روی مونافیسان دادەخا و بەوپەڕی توندوتیژیەوە ئازاریان دەدات. شەڕە نێوەخۆییەکەی ئیسپانیا کە ماوەیەکی دورودرێژی خایاند و خوێنێکی زۆری تێدا رژا، شەڕە نێوەخۆییەکەی چین کە لەنێوان کۆماریەکان و کۆمۆنیزمەکان بەرپابو، شەڕەکەی نێوان باکور و باشوری کۆریا، شەڕەکەی نێوان باکور و باشوری ڤێتنام، شەڕەکەی ئەمریکای مشەخۆر لەگەڵ خەڵکی ڤێتنام، هەموی لەبەرچاوانو دیارە کە لە ئەنجامی جیاوازی و ناکۆکی نێوان بیروباوەڕە سیاسیو بیردۆزە ئابوریەکانەوە هەڵایساون.

بەڵام پەیامی جیهانی ئیسلامی بانگەوازە بۆ بڕوابون بە خوا و پێغەمبەر و رۆژی دوایی، خەڵاتەکەی رزگارکردنی خەڵکە لە تاریکستانیەوە بۆ روناکی، لە مرۆڤپەرستیەوە بۆ خواپەرستی، لە تەنگو بەنگی دنیاوە بۆ گەشوگوشادی دنیاو دوایی، لە ستەمو زۆرداری دینە ناڕەواکانەوە بۆ دادی دینی ئیسلامی.
ئەمڕۆ خەڵك پتر لە سەردەمەکانیتر لە ئیسلام و فەزڵی ئیسلام دەگاتو

هاسانتر دەیناسن، نەفامێتیش ریسوا بوە و روی رموزنی[1] وەدەرکەوتوەو تەواوی خەڵکی لێ بێزارە. قۆناغی ئەمڕۆ قۆناغی گوازرانەوەی سەرکردایەتی جیهانە لە نەفامێتیەوە بەرەو ئیسلام، بەڵام دەبێ جیهانی ئیسلام بێدار بێتەوە و هەڵسێتەوە، بە دڵسۆزی و خوێنی گەرمو ورەیەکی بەرزەوە پەیامە پیرۆزەکەی لە ئامێز بگرێتەوە، وای بۆ بڕوانن کە تاکە پەیامێکە و هەر ئەو دەتوانێ جیهان لە داڕوخانو هەڵوەشانەوە رزگار بکات.

## خۆسازدانی روحی:

جیهانی ئیسلامی بەهۆی ئەو دیاردە شارستانیانەی کە ئەوروپای لەگەلانی‌تر پێشکەوتوتر کردوەو بەهۆی لاساکردنەوەی نەشمو شێوازی ژیانی ئەوروپایی؛ ناتوانێ هەڵسێتەوە و ئەرکی پەیامەکەی راپەڕێنێ. بەڵام دەتوانێ بە هۆی ئەو روحییەت و هێزە مەعنەویەوە ئەرکی پەیامەکەی راپەڕێنێ کە ئەوروپا رۆژبەڕۆژ لێی مایەپوتتر دەبێ. ئەو کاتە سەرکەوتن وەدەست دێنێ کە بڕوای بەهێزو پتەو بێ و دنیا بە بێنرخ بگرێ و خۆی لە ئارەزوبازی وەدورگرێ و تامەزرۆی بەهەشتێ بێ و تێکەڵی شڕوشیتاڵی دنیا نەبێ و ئامادەبێ لەپێناو خوا ئێش و ئازار بچێژێ، نیازیشی پاك بێو ئارام بگرێ و خۆڕاگر بێ.خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلاَ تَهِنُوا فِي ابْتِغَاءِ الْقَوْمِ إِنْ تَكُونُوا تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ وَتَرْجُونَ مِنَ اللَّهِ مَا لاَ يَرْجُونَ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا: لە بەرەنگاربونەوەی دوژمنانتان ورە بەرمەدەنو زەبونی مەنوێنن، ئەگەر ئێوە ئازار دەچێژن خۆ ئەوانیش وەك ئێوە ئازار دەچێژن، ئێوە هومێد و هیوا لەخوا دەخوازن بەڵام ئەوان بێهیوان، خوا زاناو دانایە.﴾النساء:١٠٤.

هێز و نهێنی سەرکەوتنی بڕواداران لە بڕوایە، لە هومێدی وەرگرتنی پاداشتی لای خوایە، جا ئەگەر جیهانی ئیسلامی بەچاوی ئەوروپایی لە کاران بڕوانێو کاڵاو واڵای حازربەدەستی دنیا بخوازێو وەك ئەوروپا چڵێسی ماڵی دنیا بێو

(١) رموزن: قبیح.

بەس بڕوای بە ماددە و شتی بەرچاوان هەبێ؛ ئەوا ئەوروپا بۆ سەرکەوتن و سەرکردایەتی جیهان شایەنترە نەك جیهانی ئیسلامی، چونکە لە هێزی ماددیو لە شارستانێتیدا گەلێك لە دوای ئەوروپایە.

جیهانی ئیسلامی رۆژگارێکی بەسەردا هاتوە گاڵتەی بەم هێزە مەعنەویە دێتو خۆی پێ بەهەرمەند ناکا، ئەوەندە هێزە مەعنەویەی ماویشیەتی ناپارێزێ و برەوی پێ نادات، تا لە ئەنجامدا کانی دڵی وشکی کرد. جیهانی ئیسلامی خۆی لە شەڕێکی وا هەڵکێشا کە پێویستی بە بڕوای بەهێز و خۆڕاگرتن و بەرگەگرتنی کاتی تەنگانە و سەختی هەبێ، جا کاتێك لە شەڕەکاندا وەلەرزە کەوت پەنای وەبەر هێزی ناو ناخی موسڵمانان برد، بەڵام هیچی نەدۆزیەوە و گەلای هومێدی هەڵوەری، وەك کابرای تێنوی لێهات کە بە هاکەهاکەوە بەرەو ئاوێکی دور هەڵپە دەکاتو تا دەیگاتێ شەکەت دەبێ کەچی لەوێدا دەبینێ تراویلکەیە[1] و ئاو نیە!. جیهانی ئیسلامی لەم شەڕەدا لە خۆی گەیشت کە تا ئێستا چ تاوانێکی گەورەی دەرهەق بەخۆ کردوە، لەبەرئەوەی ئەم هێزە کاریگەرە مەعنەویەی فەرامۆش کردوە، جا کاتێك بێهومێد بو بە دوای جێدارێك[2] گەڕا بەڵام هیچی لە هەگبەدا نەدۆزیەوە جێی ئەم هێزە بگرێتەوە و بە داماوی نەیهێڵتەوە.

جیهانی ئیسلامی کە خۆی رانایە مەیدانی جەنگ، پێی وابو موسڵمانان قیامەت بەسەر دوژمن دادێنن و بە لێشاو و پۆل پۆل دێن و بۆ بەرگریکردن لە دین و بۆ پاراستنی موقەددەسات روحی خۆیان دەبەخشن و لە پێناو خوا و پێغەمبەر و ئیسلامدا لە تورەییان دەتەقنەوە و وڵاتە ئیسلامیەکانیش دەبن بە گڕی ئاگر و خوێنیان دەکوڵێ و دەماری ملیان گرژ دەبێ!، کەچی وا دەرنەچو و شەڕ هێندە کاری تێنەکردن و بەم جۆرە تورەی نەکردن، خەڵك بە شێوەیەکیتر لە شەڕەکەی دەڕوانی و جیهانی ئیسلامی وەك باوی رۆژانی نە (با)بێ و نە باران هەر لە نێو چێژ وئارەزوبازی جارانی گەوزی دەدا. ئیتر ئەوکات هەستی بەخۆ کرد

---

(١) تراویلکە: سراب.

(٢) جێدار: بدیل.

کە تینو تاوی ئاینیی لاواز بوەو مەشخەڵی جیهادی خامۆش بوە. خەڵك ئەو کات بۆی وەدەرکەوت کە جیهانی ئیسلامی چەند زەبونو کەساس بوە!.

شتی گرنگی هەرە گرنگ بۆ سەرکردەکانی جیهانی ئیسلامی و دامودەزگا دینیەکان و ولاتە ئیسلامیەکان ئەوەیە کە بە پێی بانگەوازی ئیسلامی بڕوا لە دلان بڕوێنن و سۆزی ئاینی هەلگیرسێنن و بانگەوازی خواو پێغەمبەر و ڕۆژی دوایی بۆ خەلك ڕابنوێنن و ئەوەی لە توانیاندا هەیە لەم پێناوەدا بیبزوێننو هەرگیز خەمساردی نەنوێنن و هەمو ئامرازە کۆنو تازەکان و ڕێگای فێرکردنو بلاوکردنەوە بەکاربێنن، بە نمونە با بانگخوازانی ئیسلامی بۆ شارو دێهاتان بنێرن تا خەلك لەبارەی دین بدوێننو لە هەقیقەتیان بگەیەنن، با نوسراو و پەرتوکان چاپ بکەن و بەسەر خەلکی دابەشی کەن، با خەلك هان بدەن ژینامەی پێغەمبەرﷺ و سەربردەی یاوەران و باسوخواسی جیهاد و فتوحاتە ئیسلامیەکان بخوێنن، با ژیان و قارەمانێتی شەهیدانو مەردانی ئیسلامی باس بکرێن و فەزلی جیهاد و پلەوپایەی شەهیدی وەدیار خرێن. با لەم پێناوەشدا ئێزگەو تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و پەرتوکی ئەدەبی و سەرجەم وزەو وەسیلەکانی سەردەم بەکار بێنن.

قورئانی پیرۆز و ڕێژینی پێغەمبەرﷺ دو هێزی مەزنو گەورەن و دەتوانن گڕی بڕوا و حەماسەتی جیهانی ئیسلامی هەلگیرسێنن، هەمیشە باسی شۆڕشی مەزن دەکەن کە بەسەر سەردەمی نەفامێتیدا بکرێ، نەتەوەی دەستەپاچە و خەمسارد و ڕیسوا و خەوالو هان دەدەن و دەیکەنە نەتەوەیەکی زندی و جوامێر و خوێنگەرم و ناڕازی لە نەفامی و دژ بە سیستەمی زۆرداری.

دەردی ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامی ئەوەیە کە بە ژیانی دنیا خۆشنود[1] و ئارخەیانن، خۆیان دەگەل ڕەوشی گەندەل گونجاندوە و زیاد لە پێویست بێدەنگنو بەم شێوە ژینە کامەرانن، بە گەندەلیو خراپەکاری نیگەران نابن، بە لاڕێبون و بێدینی هەراسان نابن، لە مەڕ بەدکاری موگرژ نابن و خولیای ورگێتێر و

---

(١) خۆشنود: ڕازی.

بەرگیجوانن. بەڵام قورئانو ڕێژینی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ڕێگەیان هەبێ بچنە ناو دڵ بار بە جۆرێکیتر دەگۆڕێ، ململانێ پەیدا دەبێ، ململانێی نێوان بڕوا و دوڕوویی، ململانێی نێوان ئاوەر و دودڵی، ململانێی نێوان ژیانی دوارۆژی نەبڕاوەو ژینی دنیای بڕاوە، ململانێی نێوان ئاسودەیی دڵو هەسانەوەی جەستە، ململانێی نێوان شەهیدبونو مەرگی سەرشۆڕی، ململانێیەك کە گشت پێغەمبەرەکان بەرپایان کردوە، بێگومان بەبێ بونی ئەم ململانێیە هەرگیز جیهان رزگار نابێ، تەنها ئەو کاتەش سەرلەبەری جیهانی ئیسلامیو سەرجەم خێزان و وڵاتە ئیسلامیەکان دەبوژێنەوە کە ئەم ململانێیە بەرپا بێ ﴿ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى، وَرَبَطْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لَنْ نَدْعُوَ مِنْ دُونِهِ إِلَهًا لَقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا: کۆمەڵە گەنجێك بون بڕوایان بە پەروەردگار هێنابو بۆیە ئێمەش ڕێنوێنتر و دڵمان سەقامگیرتر کردن، ئەوانیش ڕاپەڕینو گوتیان: پەروەردگارمان پەروەردگاری ئەرزو ئاسمانانە، جگە لەم خودایە هاواری هیچ بەناو خوایتر ناکەین چونکە ئەگەر وا بکەین لە ڕێی ڕەوا لاڕێ دەبین.﴾الکهف:١٣-١٤. تەنها ئەو کاتە یادی بیلال و عەممار خەبباب و خوبەیبو صوهەیبو موصعەبی کوڕی عومەیر و عوسمانی کوڕی مەظعون و ئەنەسی کوڕی نەضر نوێ دەبنەوە، تەنها ئەوکاتە بۆن و بەرامەکەی بەهەشت دێ و سروەکانی سەدەی یەکەم هەڵدەکەنەوە، تەنها ئەوکاتە جیهانێکی نوێ بۆ ئیسلام لەدایك دەبێتەوە کە بە هیچ جۆرێك بە جیهانە کۆنە داڕوخاوەکەی نەچێت.

## خۆسازدانی پیشەسازیو جەنگی:

بەڵام ئەرکو کاری جیهانی ئیسلامی هەر بەوەندە نابڕێتەوە، چونکە جیهانی ئیسلامی ئەگەر بیەوێ بەهۆی پەیامی ئیسلامەوە مەچەكو بازوی بەهێز بێت و بۆ ئەم جارەش سەرکردایەتی جیهان وەرگرێتەوە، دەبێ ئەوپەڕی توانست پەیدا بکات و لە بواری زانستو پیشەسازیو بازرگانی و هونەری جەنگ خۆی ساز بدات و لە هەمو کەلوپەلو پێویستیەکانی ژیانیدا متمانە بکاتە سەرخۆی،

بەخۆی نانو بەرگی خۆی دابین بکا، بەخۆی چەكو تەقەمەنی و کەرستەکانی شەڕ دروست بکاو کاروباری ژیانی خۆی ڕێك بخا، بە زەینو بازوی خۆی هەوڵ بدا گەنجینەکانی ژێر زەوی دەربهێنێ و سودی گەورەیان لێ ببینێ، بە هۆی پیاو و پارەوپولی خۆیەوە حوکمی ولاٌت هەڵسوڕێنێ، بە هۆی کەشتی و گەلەکەشتیەکانی خۆیەوە دەریا پانوپۆڕ و ئۆقیانوسە فرەوانەکان ببڕێ، بە هۆی زرێپۆش و تانكو چەكو تەقەمەنی ولاٌتی خۆیەوە شەڕ لەگەڵ دوژمنانی بکات، نابێ پێویستی بە ڕۆژئاوا بێو لێی بپاڕێتەوە و سەری بۆ دانوێنێ تا بڕێك یارمەتی بدات، نابێ ناچاربێ پەنا وەبەر بەیداخ[1] و سەربازگەی ڕۆژئاوایی ببات.

جیهانی ئیسلامی ئەگەر هەر چاوی لە زانستو سیاسەتو پیشەسازی و بازرگانی ڕۆژئاوا بێ و هەر ڕۆژئاوا خوێنی لێ هەڵمژێو خاکەکەی لێ هەڵکۆڵێ و ئاوی ژیانی لێ هەڵێنجێ و بازاڕی لێ دابگرێ و ئابوریەکەی لێ بدۆشێ، یان ئەگەر هەر پارەو پول لە ئەوروپا بە قەرز وەرگرێ و پیاو و پسپۆری لێ بخوازێ تا کاروباری پێ بگێڕێ و شوێنی گرنگی ولاٌتیان پێ بسپێرێ و مەشقی سەربازییان پێ راسپێرێ و سوپا بە ئەفسەری ڕۆژئاوایی رابهێنێو وەك پەروەردەکار و مامۆستای گەورە و لێزان لە ڕۆژئاوا بڕوانێ و بەبێ رای ڕۆژئاوا هیچ کار و ئەرکێ رانەپەڕێنێ؛ قەت مەحاڵە بتوانێ روبەڕوی ئەوروپا ببێتەوە چجای ئەوەی کە بتوانێ راپەڕینی بەسەردا بکاتو بەسەریدا زاڵ ببێ!.

جیهانی ئیسلامی لەمێژە وازی لە بواری زانستی و پیشەسازی هێناوە، بۆیە دوچاری کۆیلایەتیەکی درێژخایەن بوەو ژیانێکی سەرشۆڕانەی بە بالاٌدا بڕاوە، بۆیە بە دەستی سەرکردە ستەمکارەکانی ئەوروپاوە دەناڵێنێ ک، جیهانیان بەرەو ئاگر و وێرانیو رکوکینە و خۆکوشتن راپێچاوە. جا ئەگەر جیهانی ئیسلامی بۆ ئەم جارەش لە خۆسازدانی زانستی و پیشەسازی کەمتەرخەم بێ و کاروباری ولاٌتی خۆی لەدەست دەسپاکانی خۆی نەبێ، بێگومان هەمیشە کلۆڵی و

---

(١) بەیداخ: ئالاٌ.

بەدبەختی دەبێتە میوانی جیهان و هەرگیز مەینەتو نەهامەتیەکانی مرۆڤایەتی نابڕێتەوە.

## وەرگرتنی رابەرایەتی لە بوارەکانی زانست و لێکۆڵینەوەدا:

جیهانی ئیسلامی رۆژگارێکی درێژە لە پایەی سەرکردایەتی زانستی و ئاراستەگاری[1] خۆی دابەزیوە، سەربەخۆیی هزریی لە دەست داوە و وەك لامژێك لەسەر خوانی رۆژئاوا دانیشتوە و مەلۆموشان[2] هەڵدەلوشێ، لە بواری زمانەوانیو ئەدەبو زانستی زماندا، بگرە لە زانستە ئاینیەکانی وەکو تەفسیر و فەرمودە و فیقهیشدا چاو لە دەستی رۆژئاوان، رۆژهەلاتناسەکان جێگەیان گرتونەتەوە و ئەوان لە بابەتەکانیان دەکۆڵنەوە و دەتۆژنەوە و پەرتوکان دەنوسن، ئەوان بوینە سەرچاوەی بیروڕا و حوکمە ئیسلامیەکان و قسەی قسەبڕ هی ئەوانە، ئەوان بونەتە پێشەنگی حوکمگێڕی و دادوەری، کە گەلێك لەو رۆژهەلاتناسانە یان بەکرێگیراون یان جولەکە و گاوری خۆپەرستن و رکوکینەیان بەرامبەر بە ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ هەیە و گاڵتەیان بە ژیاری ئیسلامی دێو بە تەوسەوە تێی دەڕوانن و بە ناپاکی لەگەڵ دەقو نوسراوەکان رەفتار دەکەن و وشە دەشێوێننو جێی لا دەگۆڕن، تەنانەت هەندێکیان هەن زمانی عەرەبیشیان تەواو نیە و زۆر بە چاکیش لێی تێناگەن، بۆیە بە هەڵە لە دەقەکان دەفامن و هەڵەی رەزاقورس و نابەجێی تێدا دەکەن.

گەلێك لە هزرو بانگەشەکانی ئەم رۆژهەلاتناسانە راخزیوەتە ناو نێوەندە تازە زانستیەکانی جیهانی ئیسلامی و کاریگەری زۆر بە ئاشکرایان لەسەر هزری جوداکردنەوەی دین لە دەوڵەت هەبوە، بۆ نمونە دەڵێن دین کێشەو بابەتێکی تاکەکەسیە و پەیوەندی بە کۆمەڵگاوە نیە، یان دین تەنها بریتیە لە بیروباوەڕ و عیبادەت و رەوشت و پەیوەندی بە سیاسەت و فەرمانڕەواییەوە نیە، هەروەها

---

(١) ئاراستەگاری: توجیە.
(٢) مەلۆموش: قیچە خواردنی لێرە و لەوێ.

کاریگەرییان هەبوە لەوەی کە چەمکی دینو ئەحکامی شەریعەتی ئیسلامی بگۆڕن و لەسەر بنچینەی ژیار و فەلسەفەی رۆژئاوایی لێکبدرێتەوە... بگرە زۆر هێزی تریش کە قوتابی و گوێشۆڕانی رۆژهەڵاتناسەکان لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا جاڕی بۆ دەکێشن.

نوسەرە موسڵمانەکان و هزرڤانانی رۆژهەڵات لە بەرەنگاربونەوەی ژیاری رۆژئاوادا دەستەپاچە بونو نەیانتوانی روبەڕوی ببنەوە و بە ئازادی و ئازایەتی باگۆی بدەنەوەو رەخنە لە پێودان و بنەماکانی بگرن. تەنانەت بیرکردنەوەی لاواز و لاساکاری هەندێکیان گەیشتە رادەیەك پێیان وابێ ژیاری رۆژئاوا ئەوپەڕی قۆناغە کە ئاوەزی مرۆڤ پێی گەیشتبێ و لەدوای ئەم قۆناغەدا هیچ قۆناغیتر نیە. هەندێکیان دەیانگوت دەبێ سەرلەبەری ژیارەکەی رۆژئاوا بە گشت خەوش و نەخۆشیەکانیشیەوە لە رۆژهەڵاتدا پراکتیزە بکرێ، چەند وڵاتێکی ئیسلامی دەیانگوت ئێمە بەشێکی دانەبڕاوین لە کیشوەری ئەوروپا بۆیە دەبێ لە ژیارەکەیدا بتاوێینەوە و کلتوری یۆنان بە کلتور هەڵبژێرین کە بنەڕەتی کلتوری ئەوروپایە[1].

لەنێو چینی هزرمەنداندا بەدەگمەن ((زەبەڵلاح)) دەبینران کە بڕوایان بە ژیار و فەلسەفە و ژیان و پێودانەکەی رۆژئاوا نەبێ و بە بەرچاوڕونی و متمانە بەخۆکردنێکی پتەو و لەسەر بنچینەی زانستەوە رەخنەی لێ بگرن، هەڵبەت هەندێکیش هەبون وەبەر ئەو شاڵاوە نەکەون.

کەواتە-ئەگەر جیهانی ئیسلامی بیەوێ لەسەر قاچی خۆی بوەستێ و بە ئاوەزی خۆی بیر بکاتەوە- دەبێ ئەم ملکەچی و چاو لەدەستبونە رەت کاتەوە، دەبێ زانای فرەزانو نوسەری بلیمەتیان تێهەڵکەوێ و ژیارەکەی رۆژئاوا بخەنە بەر نەشتەری رەخنە و راڤە و توێکاری و، نوسراوەکانی رۆژهەڵاتناسان شەن وکەو بکەنو خراپەکانی لێ دەربێنن، بەجۆرێکی وا لە زانستە ئیسلامیەکان قوڵ ببنەوە کە رۆژهەڵاتناسە گەورەکانی ئەوروپا و ئەمریکا سودیان لێ وەربگرن و

---

(١)لەم بارەوە پەرتوکەکەی د. طە حسن ( مستقبل الثقافة في مصر) بخوێنەوە.

هەڵەکانی خۆیان بەوان ڕاست بکەنەوە، تا وای لێدێ زاناو لیوەکۆڵ[1] و خاوەن بڕوانامە بەرزەکان ڕودەکەنە وڵاتانی جیهانی ئیسلامی وەك کە ئێستا وا ڕاهاتون ڕو بکەنە وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا. چونکە شارە ئیسلامیەکان شایەنترن ببن بە مەڵبەند و ناوەندی ڕۆشنبیری ئیسلامیو زانستە ئاینیەکان نەك پایتەخت و زانکۆکانی ئەوروپا، بەڕاستی ئەمەش جۆرێکە لە بڕوا بەخۆ نەبون و دەرون بەزیوی کە ئەگەر وڵاتە ڕەسەنەکانی زانستو ئاین لە ڕێبەرایەتی زانستی و پایەی سەرەکی خۆیان دابەزن.

## ڕێکخستنی نوێی زانستی:

جیهانی ئیسلامی دەبێ ڕێکخستنێکی نوێی وا داڕێژێ کە لەگەڵ ڕوحو پەیامەکەی بگونجێ. جیهانی ئیسلامی بەهۆی ڕابەرایەتیە زانستیەکەیەوە توانی سەرکردایەتی جیهانی بگرێتە دەست، بەهۆیەوە توانی خۆی ڕاخزێنێتە نێو ئاوەز و کلتوری جیهان و پەل بە هەناوی ئەدەب و فەلسەفەدا باوێژێ، جیهانی شارستان بۆ ماوەی چەندین سەدە بو بە ئاوەزی جیهانی ئیسلامی بیری دەکردەوە، بە خامەی ئەو دەینوسیو بەزمانی ئەویش پەرتوکی دادەنا، نوسەرانی ئێرانو تورکستان و ئەفغانستانو هیندستان ئەگەر بیانویستایە پەرتوکێکی گرنگ بنوسن بە زمانی عەرەبی نەبوایە نەیاندەنوسی، هەندێکیان لە هەوەڵ جاردا پەتوکەکەیان بە زمانی عەرەبی دادەنا پاشان بە زمانی (فارسی) پوختیان دەکردەوە، وەك غەزالیو پەرتوکەکەی بەناوی ((کیمیاء السعادة)).

هەرچەندە ئەم بزاڤە زانستیەی جیهانی ئیسلامی لە سەرەتای سەردەمی عەبباسیەکانەوە سەری هەڵداو لە سەرەتادا بە یۆنان و عەجەم کاریگەر بو و لەسەر بنچینەی هزر و ڕوحێکی پاك و بێگەردی ئیسلامیانە دانەمەزرا و لە لایەنی زانستیو ئاینیدا کۆمەڵێك لاوازی تێدابو، بەڵام بە هۆی هێزو پێز و چالاکیەکەیەوە توانی خۆی بەسەر جیهاندا بسەلمێنیو سیستەمە کۆنە

---

(١) لیوەکۆڵ: محقق.

زانستیەکانیش لە ئاستیدا بپوکێنەوە.

بە هەمان شێوە کاتی خۆی کە ئەوروپا راپەڕی، بەهۆی ئەزمون و رەخنە زانستیە نوێیەکانیەوە توانی سیستەمە کۆنەکەی پەرەم بە پەرەم[1] بکاتو لە وجودی رەش بکاتەوە. توانی سیستەمێکی نوێ بۆ زانست و تۆژینەوە رەنگرێژ بکات، کە دەقاودەق وەك روحو ئاوەزو دەرونە ماددیەکەی بو، هەر قوتابییەك خوێندنەکەی تەواو دەکرد دەرونو ئاوەزی بەم روحە ماددیە تەژی دەبو. بەمجۆرە ئەوروپا دوبارە توانی جیهان بخاتەوە بەر سیستەمەکەی، جیهانی ئیسلامیش چاری ناچار ملکەچی بو چونکە خۆی لەمێژبو توشی داڕوخانی زانستی و ئیفلیجبونی هزری ببو و تەنها لە ئەوروپاوە هاناو هاریکاریی وەدی دەکرد بۆیە سیستەمەکەی خوێندنی ئەوروپای بە هەمو خەوش و نەخۆشیەکانەوە وەرگرت. بەمجۆرە ئەو سیستەم بوە سیستەمی باو و بەربڵاوی خوێندنی سەرجەم جیهانی ئیسلامی.

لە ئەنجامی ئەو سیستەمە سروشتیەدا لە نێوان دەرونی ئیسلامی -کە هێشتا لە دڵی موسڵمانان مابو و ژینگە نەیکوشتبو- و دەرونی نوێدا، لە نێوان رەوتی رەوشتی ئیسلامی و رەوتی رەوشتی ئەوروپاییدا، لە نێوان تەرازوی کۆن و تەرازوی تازەدا ململانێیەك پەیدا بو، هەروەها گومان و دوڕویی کەوتە نێو چینی رۆشنبیران و بێئارامی رەشماڵی هەڵدا و ژیانی دونیا بەسەر ئاخیرەت هەڵبژێردرا و وەك هەرە خۆشەویستێك لە ئامێز گیرا، گەلێك شتیتریش کە لە سروشتی ژیاری ئەوروپا بو سەریان هەڵدا.

جا ئەگەر جیهانی ئیسلامی دەیەوێ ژیانی خۆی ببوژێنێتەوە و لە کۆیلایەتی خەڵکانیتر زرگاری بێو سەرکردایەتی وەرگرێتەوە دەبێ لە پرۆگرامی خوێندنەکەیدا سەربەخۆ بێ بەڵکو رابەرێکی زانستیش بێ، کە کارێکی وا ئاسان نیە بە دو قسان پێك بێ، ئەم کارە پێویستی بە بیرکردنەوەیەکی قوڵو بزاڤێکی بەرفرەوانی ئەرشەفەکردن و نوسین هەیە، پێویستی بە شارەزابونێکی بەرفرەوان

---

(١) پەرەم بە پەرەم: هەپرون بە هەپرون.

هەیە لەزانستەکانی سەردەم بە جۆرێکی وا کە بتوانێ لێکۆڵینەوە و رەخنەکاری ئەنجام بدات، پێویستی بە بڕوایەکی پتەو و روحێکی ئیسلامیانەی گەرموگوڕ هەیە. ئەم ئەرك‌و کارە گرنگە زۆر زەحمەتە و زەحمەت بە کۆمەڵێکی بەهێزیش هەڵبسوڕێ، چونکە ئەمە کارێکی وایە دەبێ حکومەتە ئیسلامیەکان پێی هەڵسن، دەبێ رێکخراوی بۆ تەرخان بکرێ‌و لە هەمو هونەرەکان مامۆستای زیرەك‌و کارامە هەڵبژێردرێ تا سەرلەنوێ سیستەمێکی رێکوپێك بۆ خوێندن دابڕێژن و موحکەماتی قورئان‌و سوننەت‌و حەقیقەتە نەگۆڕەکانی ئاین لەگەڵ ئەزمون‌و تاقیکردنەوە و زانستە بەسودەکان بە یەکەوە کۆبکەنەوە و زانستەکانی سەردەمیش لەسەر بنچینەی ئیسلام و بە روحی ئیسلام داڕێژنەوە و هەرچی لاوان پێویستیانە تێیدا بێ، تا نەوەی پێگەیشتو بتوانن ژیانی خۆیان رێك بخەنەوە و قەوارەی خۆیان بپارێزن‌و لە رۆژئاوا بێنیاز بن و بۆ شەڕ و شۆڕ ئامادە بن، تا بتوانن گەنجینە و خێروبێری خاکەکەیان دەربهێنن‌و سود و کەڵکی لێ ببینن و ئابوری وڵاتی ئیسلامی رێك بخەن، تا بتوانن حکومەتەکەیان بە گوێرەی ئیسلام بەڕێوە ببەن و ببێتە نمونەیەکی بەرزی بەرچاوان و بۆ خەڵکانیش بسەلمێ کە سیستەمی ئابوری ئیسلامی چەند لە سیستەمەکانی ئەوروپایی باشتر و لەبارترە، هەروەها تا بتوانن گیروگرفتە ئابوریەکان چارەسەر بکەن کە ئەوروپا تێیدا دەستەپاچەیە.

جیهانی ئیسلامی ئەو کاتە دەتوانێ هەڵسێتەوە و ئەرکی پەیامەکەی راپەڕێنێ وجیهان لە هەرەسی چاوەڕێدا رزگار بکات کە لە لایەنی روح و پیشەسازی و جەنگدا خۆی ساز دابێ و پرۆگرامی خوێندنی سەربەخۆ بێ. چونکە سەرکردایەتی شتێکی گاڵتەو هەوەنتە نیە، بەڵکو ئەوپەڕی جددیەت و قوڵ لێ‌هەڵماڵینە و کردوکۆش و تێکۆشان و خەبات و جیهاد و خۆ ئامادەکردنێکی توندوتۆڵی گەرەکە:

**كل امرئ يجري الى يوم الهياج بما استعدا**[1]

---

(١)واتا: هەمو کەسێ وا دەچێتە شەڕێ کە خۆی بۆ ئامادە کردبێ.

## ڕۆڵی سەرکردایەتی نوێ:

جیهان-لە ئەنجامی سەرکرایەتیەکەی رۆژئاواوە- چوەتە بەردەمی گەروی بورکانێك کە لە ترکزەی تەقینەوە دایە، چوەتە سەر لێواری خەرەندێك[1] کە خەریکە سەربەرەوخوار دابڕوخێ، هەتا رۆژئاواش لەسەر جیهان باڵادەست و سەرچاوەی ئیرادەو ئاراستەی کیشوەران بێ؛ هەرگیز جیهان چاك ناسازێ و قەت مرۆڤایەتیش لە هەڕەشەی کاولبون دەرباز نابێ. مەرگەساتی وڵاتو حکومەتەکانیش لەولاوە بوەستن کە وەك قونێر رەگو ریشاڵیان لە جەستەی ساغی مرۆڤایەتیدا رەگاژۆ بوە، هەمو ئەو شەڕو ئاژاوە و نیگەرانی و کودەتا و پاشاگەردانیەی کە لەوپەڕی رۆژهەڵاتەوە تا دورترین کەناری جیهانی ئیسلامی رو دەدەن رۆژئاوا سەبەبکاریەتی. تا رۆژئاوا دەسەڵاتی زاڵ بێ هیچ کردوکۆشێکی چاکسازی سەرناگرێ و هیچ حکومەتێکی چاك و سەرراست نایەتە دی و هیچ سیستەمێکی رێڕاست بەرقەرار نابێ. تا سەرکردایەتی و هێز لەدەست رۆژئاوای ماددەپەرستی خۆپەرست بێ-کە نەدەتوانێ مرۆڤایەتی بەختەوەر بکاتو نەدەشیەوێ- نەگوازرێتەوە بۆ دەست کەسێکیتر کە روحو رێوشوێنکی نوێی بۆ جیهان هەڵگرتبێو خۆی لە پێش خوا بە بەرپرس بزانێ و پێی وابێ لە لایەن خواوە ئەم ئەرکەی وەئەستۆ خراوە؛ هەرگیز هومێد و هیوایەك نیە بۆ گەڕانەوەی ئاسودەیی بۆ مرۆڤایەتی.

هەڵبەت هەر موسڵمانە ئەو کەسەی ئەم ئاکارانەی تێدا هەبێ کە جیهان بۆ ئەمجارەش وا لە مێژە چاونۆڕەو بۆ دیداری دەڕوانێ. شاعیری ئیسلام دکتۆر (محمد ئیقبال) سامو هەیبەتێکی زۆر بۆ موسڵمان دادەنێ و دەڵێ:

((تۆ بۆ رازی ئەزەلی پاسەوان و دەسپاکی، بۆ گەورەی گەردون چەپو راستی[2]، دروستبونت لە خۆڵ بو بەڵام راستەڕێبونی جیهان و مانەوەی نەتەوەکان بەهۆی تۆیە. دەی کاسێکی سەررێژ لە یەقین بنۆشە و لە کۆشی گومان

---

(١) خەرەند: کەنداڵ، کەندەڵان.

(٢)واتا: موسڵمان وەك ئامێر و پەرِوباڵی قەدەری خوایە.

و مەزندان راپەڕە و بێرە دەرەوە، دەی زوکە دەسـبەجێ لە خەوی قـوڵ و قورسـت رابە و بێدار بەرەوە.

هاوار لە دەست ئەوروپاییەکان! کە ئاوەزیان بـۆ لای خۆیـان شـەیدا کـردوە و جادویان لە دەرون کردوە. هاوار لەدەست ئەو کەسانەی! کـە جارێـك بـە نـەرم و نیانی و جارێکیتر بە کۆت و زنجیر خەڵك هەڵدەخەڵەتێنن، دەمێك رۆڵی (شـیرین) دەبینن و دەمێکیش رۆڵی (ئەپرویز)[1]. ئەوروپاییەکان لەسەردەمی نوێـدا رۆڵـی جـەنگیزخان و هۆلاکۆیـان نوانـدوە و سـەرتاپای جیهـان بـە شـالاو و هێرشـی ئەوروپاییەکان وێران بوە و جیهان بۆتە کاولگە.

هۆ ئەو کەسەی کە حەرەمت بنیاد نا!، هۆ جێنشینی ئیبراهیم! هەڵسەوە سەر لە نوێ جیهـان بنیـات نێـوە، رابـە لـەو خـەوە قـوڵ و قورسـەت، بەسـە بێـدار بەرەوە[2])).



(١) ئاماژە بۆ چیرۆکێکی کۆنی دڵداریی فارسی دەکات کە ئەدیب و شـاعیرانی ئێـران و هیندسـتان دەماودەم لە یەکتریان گێڕاوەتەوە، شیرین لەم چیرۆکەدا دولبەرێکە و پاڵەوان و جوامێران بۆی بونەتە دێوانە، ئەپروێزیش رۆڵی پادشای بەزەبروزەنگ دەگێڕێ کە عەشقی شیرن بوەو بۆخـۆی زەوتی دەکات.

(٢)( زبور عجم )، ل(١١٦-١١٨) بەدەستکاریەوە. (روائع إقبال) چاپی دوەم . ل(١٠٠-١٠١).

# دوا وتەی وەرگێڕ

پارەکە لە سەرەتای ساڵی (١٩٩٨)دا بەناوی خواوە دەستم بە وەرگێڕانی ئەم پەڕتوکە ئازیزە کرد، وەکو لە پێشەکیدا باسم کردوە گەلێکم لەبەر زەحمەت بو و زۆرجار دڵساردی دەیگرتم و دەمگوت ئەم کارە بە یەکێکی کاڵی وەکو من ناکرێ‌و کەسێکی زیرەك‌و خاوەن ئەزمونێکی درێژی نێو وەرگێڕان‌و کولاّوی نێو زمان‌و ئەدەبیاتی گەرەکە، بەلاّم چبکەم کە ئاو دیار نەبێ ناچار خۆڵ تەیموم هەڵدەگرێ، ئەمە لە لایەك لە لایەکی‌تر نەمدەتوانی سەرومڕ بۆی دانیشم و هەمو کاتێکی بۆ تەرخان بکەم، جار بوە چەند ڕۆژ و هەفتە و مانگ بەجێم هێشتوەو نەگەڕاێمەوە سەری، جار بوە یەك دو لاپەڕەم وەرگێڕاوەو تا کاتێکی‌تر وازم لێهێناوە، بەلاّم هەر لە خولیام بو تەواوی بکەم چونکە زۆر بە زەروریم دەزانی کە خوێنەری کورد لەم پەرتوکە بەهرەمەند بێ.

ئەو نوسخە عەرەبیەی من وەرگێڕانەکەم لەسەر ئەنجام دەدا نۆرەچاپی دەیەم بو، تا نزیکەی لە نیوە زیاترم لەسەر ئەم نۆرەچاپە وەرگێڕا. پاشان کە نۆرەچاپی (سیزدەم)ی یاسایی دەرچو و خەتێکی جوان‌و نەخشەسازیەکی ڕێکوپێك و هەڵەبژێری تێدا کرابو و چەند پێشەکیەکیشی بۆ خرابوە سەر گوڕوتینێکی تری پێدام و لەو شوێنەی کە گەیشتبومێ لەسەر نۆرەچاپی تازە دەستم پێکردەوەو چومە دوێ، بەلاّم بە شێوازێکی جیاواز، پێشتر ئەو بەشەی کە وەرمگێڕا بو شێوازێکی ڕەهاتر بو، بەجۆرێك خۆم لە سنوری مەفهومەکان بە ئازاد دەزانی و گوزارشت و تەعبیرەکانم بە سەبك‌و وشەی جۆراوجۆر و کەم تا زۆرێك جیا لە تەعبیرە عەرەبیەکان دەردەبڕی، بەلاّم دواتر لە کۆیەندی چوارەمەوە بەرەو کۆتایی شێوازەکەم گۆڕی‌و ئەم جارە ئەم جۆرە ئازادی‌و ڕەهابونەم بە خۆ ڕەوا نەدەدی‌و سەبکی نوسەریشم تێکنەدەشکاند، بینیم ئەم شێوازەیان چاکترو خۆشترەو

ئاسانتر دێتە بەر هزری وەرگێڕانەکە و خێراتریشە، ئیتر پێیدا ڕۆیشتم تا بە فەزڵی خوا و سوپاس بۆ خوا تەواوم کرد.

دەتوانم بڵێم لەم شەش مانگەی دواییدا سێ مانگ بەتەواوی بۆی لێبڕام و کارەکەم بە کۆتا گەیاند، بەڵام هەستم دەکرد پەرتوکەکەم بە دو شێوازی جیا وەرگێڕاوە و هی دوەمیان چاکتر و خۆشتر و هاسانترە، جا بۆئەوەی سەرلەبەری وەرگێڕانەکە بکەمەوە یەك شێواز بڕیارم دا پاکنوسێکی لە بەرگ بۆ بەرگی بۆ بکەم، چاپە تازەکەی عەرەبیەکەم هێناو لەگەڵ ڕەشنوسەکەدا پێکم دەگرتنەوە و پاکنوسەکەم دەنوسیەوە، بەڵام متمانەیەکی پترم دەکردەوە سەر عەرەبیەکەو سەرلەنوێ وەرمدەگێڕایەوەو ڕەشنوسەکەشم لەبەرچاو بو و وەك یارمەتیدەرێك تێم دەڕوانی ڕەنگە زۆر جێگەشم هەروەکو خۆی نوسیبێتەوە چونکە پاکنوس خۆی وادەخوازێ کە ئەگەر شوێنێکت بەدڵ بێ نەیگۆڕی، بەڵام دەتوانم بڵێم وەرگێڕانێکی ترم ئەنجامداوە. بەراستی ئێستاکە دوای ئەم پاکنوسە سەرتاسەریە دڵم ئاوی خواردۆتەوە و هەست دەکەم وەرگێڕانەکەم بوەتە یەك شێواز و یەك جۆرە هەناسە و هەست دەکەم توانیومە وەریگێڕم و بیکەمە کوردی، بۆ بەرز و نزمی ئاستی وەرگێڕانەکەشم پێم وایە دەبێ برایانی وەرگێڕ هەڵینرخێننو چاکیو خراپی لێ ڕانوێنن.

باسی یەك جۆرە شێوازم کرد، ڕەنگە لە شێوازەکەدا ناوەناوە هەست بە جیاوازیەکی کەم بکرێ و شێوازەکە لە هەندێ شوێن گەرمو لە هەندێ شوێنیتر سارد بێ، لە هەندێ شوێن خاو و لە هەندێ شوێنیتر بە تینو تاو بێ، لە هەندێ شوێن هەناسە فرەوان و لە هەندێ شوێنیتر هەناسە سوار بێ، ڕەنگە کەم تا زۆرێك نەك هەر لەم وەرگێڕانەی من بەڵکو لە گشت وەرگێڕانێکدا هەست بە شتی وا بکرێ، ئەمەش هەڵبەت هۆکاری زۆری هەیە وەکو: حاڵەتی دەرونی وەرگێڕ، کاتی وەرگێڕان، شوێنی وەرگێڕان، کارو ئیشی ڕۆژانە... هۆکارێکیتر هەیە ڕەنگە بە گرنگتر لە بەرچاو بگیرێ، ئەویش بونی چەند ژێدەرێکە لەناو پەرتوکەکەدا، هەر ژێدەرە و جۆرە نەشمێکی نوسینی تایبەت بە خۆی هەیە، بۆ وێنە ئەو نەشم و زمانەی ئیمام (طـــەبەری) لە مێژوەکەیدا ڕوداوێکی پێ

دەگێڕێتەوە گەلێك لە زمان و شێوازەکەی (خاتو خالیدە ئەدیب) جیاوازە کە باسی مێژوی داڕوخانی عوسمانیەکان دەکات. نەشمەکەی (جۆد)ی ئینگلیزی کە نوسەر خۆی وەریگێڕاوە گەلێك جیایە لەگەڵ ئەم دوانە، پاشان نەشمی نوسەرەکە خۆی دەگەڵ هەمویان فەرقی هەیە. وەرگێڕی زیرەك ئەوەیە کە بتوانێ مەلە لەنێو دەریای هەمواندا بکاتو بتوانێ لە گشتیان کارامە بێ، هۆکارێکیتر جۆری ئەو بابەتەیە کە باسی لێوە دەکرێ، هەڵبەت بابەتێکی ئەدەبی نەشمێکی ناسکتر وەردەگرێ وەك لە بابەتێکی زانستی.

لەم وەرگێڕانەدا گەلێکم هەوڵ داوە واتای هیچ وشەیەکم بەسەردا رانەبورێ و گشتی وەکو خۆی وەرگێڕم، پێم وایە لەم لایەنەوە کەمتەرخەمیم نەکردوە و کەموکوڕی تێدا نیە بەلاّم کەسیش فریشتەی بێ هەڵە و هەوری بێ پەڵە نیە، لە هەر شوێنێك هەڵخزابمو نەمپێکابێ بە سوپاسەوە تێبینیو راستکردنەوەکان وەردەگرمو بە یاریدەی خوا لە چاپەکانی داهاتودا راستیان دەکەمەوە.

سەید ئەبولحەسەنی نەدوی وادیارە لە کۆبەندی پێنجەم بەندێکی بەناونیشانی (زعامة العالم العربي) نوسیوە، دوای تێفکرینێکی ورد و پرسوڕای شارەزایان بە باشم زانی لە وەرگێڕاوەکەی دابڕم و تێی نەخەم -هەرچەندە وەریشم گێڕاوە و نزیکەی (١٨) لاپەڕی عەرەبی دەبێ- چونکە سەید ئەبولحەسەن لەم بەندەدا لەگەڵ گەلیعەرەب دەدوێ و خیتابو روی وتەکانی بەوان تایبەت کردوە، هەڵبەت هەمو گەلێك تایبەتمەندێتی خۆی هەیەو ئەگەر نوسەرێك بتوانێ بە ئیسلامیانەو بێ زێدەڕۆییکردن لەم دەرگایەوە بچێتە ژورەوە بە سەرکەوتنێك بۆی تۆمار دەکرێ، جا رەنگە خیتابی تایبەت بە گەلێك بۆ گەلێکیتر سودی هەبێ، بەلاّم گەلی دوەم قەت نابێتە جێمەبەست و هەست بە خاوەنێتی ناکاتو هەر بە گوێگرێکی میوان دەمێنێتەوە. لە لایەکیتر رەنگە کوردی دڵبریندار و چەوساوەی دەست شوفێنیزمەکانی دەوروبەر نەتوانن وتەکانی سەید ئەبولحەسەن بە نیازپاکیەوە وەربگرن و توشی کاردانەوەی ناڕاست بێن.

لە کۆتاییدا دوای سوپاس و ستایشی نەبڕاوەم بۆ خوای پاکی پەروەردگارم کە فەرمویەتی ﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ﴾ کە إن شاء الله ئێمەش

دەخاتە بەر ئەم ئایەتە پیرۆزەوە، زۆر سوپاسی کاك (ژیوانی گەلاڵی) دەکەم کە گەلێ جار هانی داوم و هاندانەکانی بونەتە گورِوتینو دڵم پێیان خۆشبوە و وایکردوە پتر سور بم لەسەر تەواوکردنی وەرگێرِانەکە .

ئارامی گەلاڵی
هەولێر ١٩٩٩/٩/١٧

## سەرچاوەکان

### سەرچاوە عەرەبیەکان:

١- أيام العرب.
٢- الاغاني، لابي الفرج الاسبهاني.
٣- البداية والنهاية، لأبي الفداء اسماعيل بن عمر بن كثير الدمشقي.
٤- بلوغ الأرب في معرفة أحوال العرب، لمحمود شكري الآلوسي.
٥- بيئة النبي ﷺ من القرآن، لمحمد عزت دروزة.
٦- تاريخ الرسل والملوك، لابن جرير الطبري.
٧- تعليقات الأمير شكيب أرسلان على حاضر العالم الإسلامي، تأليف لوثرب، تعريب عجاج نويهض.
٨- جامع البيان عن تأويل آي القرآن، لأبي جعفر محمد بن جرير الطبري.
٩- حجة الله البالغة، لأحمد بن عبدالرحيم المعروف ب(ولي الله الدهلوي).
١٠- حضارة العرب، لغوستاف لوبون، تعريب عادل زعيتر.
١١- خطط الشام، لمحمد كرد علي.
١٢- الخطط المقريزية، لأبي العباس أحمد بن علي المقريزى.
١٣- زاد المعاد، لابن القيم الجوزية.
١٤- ضحى الاسلام، لأحمد أمين.
١٥- طبائع الاستبداد، لعبدالرحمن الكواكيي.
١٦- طبقات الأمم، لصاعد الأندلسي.
١٧- فتح العرب لمصر، ج.بتلر، تعريب محمد فريد أبو حديد.
١٨- فلسفة التأريخ العثماني، لمحمد جميل بيهم.
١٩- مستقبل الثقافة في مصر، لطه حسين.
٢٠- الملل والنّحل، لأبي الفضل الشهرستاني.

**سەرچاوە بیانیەکان:**

١- The History of Decline and tall Roman Empire. By Edward Gibbon.
٢- A short History of World. by H.G.wells.
٣- The making of Humanity. by Robert Briffault.
٤- The Discovery of India. by Jawahar Lal Nahru.
٥- Islam at the Cross Roads. by Mohammad Asad(Lepold Weiss).
٦- India Civilization and Islam by Jawhar Lal Nehru.
٧- Influence of Islam on Indian Culture. by Dr. Mehta.
٨- A Survery of Indian History. by K.M. Panikkar.
٩-Conflict of East and west in Turkey. by Khalida edib.
١٠- History of the European Morals. by W.E.H Lecky
١١- History of the Conflict between Religion and Science. by Darader.
١٢- Guide to Modern Wickedness. by Joad.
١٣- Philosophy for our Times. by Joad.
١٤- Man the unknown .by Alexis Carrel.
١٥- Historians History of World.
١٦- Encyclopaedia Britain.
١٧- ايران في عهد الساسانيين، لأرتهر كرستن سين، ترجمة الدكتور محمد اقبال من الفرنسية الى الاوردية.



# پێڕست

## کۆبەندی دوەم

## لە نەفامێتیەوە بەرەو ئیسلام ........................ ١٢١

## کۆبەندی سێیەم

## کۆبەندی چوارەم

## کۆبەندی پێنجەم

**وەرگێڕ لە چەند دێرێکدا:**

- لە ساڵی ١٩٧٣ لە شاری هەولێر، لە خێزانێکی خوێندەوارو دیندارو ڕۆشنبیر لە دایك بوە .
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەیی لە شاری هەولێر تەواو کردوە.
- پاشان لە کۆلیژی ئەندازە — بەشی میکانیك وەرگیراوەو لە ساڵی ١٩٩٦ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی وەدەست هێناوە.
- لە ١٩٩٧/٨/٢ بوەتە کارمەند لە رادیۆی دەنگی ئیسلام- هەولێر و کۆمەڵێك بەرنامەی پێشکەش کردوە.

جگە لەم پەرتوکە چەند پەرتوکێکی‌تری وەرگێڕاوە:

١- بیروباوەڕبون بە خودا، د. عمر سلێمان الاشقر
٢- پەیام‌و پەیامبەران، د. عمر سلێمان الاشقر .
٣- قیامەتی گەورە، د. عمر سلێمان الاشقر .
٤- قەزاوقەدەر، د. عمر سلێمان الاشقر .
٥- بەسەرهاتی پێغەمبەران بۆ منداڵ و لاوان، الندوی
٦- لەدیداری محەمەددا، عائض القرنی
٧- تا نەبیتە بارگرانی ، عوض محمد القرنی
٨- هێمن فێری نوێژ دەبێ ، نووسین

## سوپاس و پێزانین

زۆر سوپاسی کاك (نەوا محمد سعید) دەکەم کە بە وەرگێڕانەکەم داچـوەتەوە، هەڵبـەت پێداچونەوەش دڵنیاییەکی گـەورە دەخاتـە دڵی وەرگێڕەوە..

خوا پاداشتی بداتەوە